

چاپی دووەم



# هەڵۆ سوورەکانی قەندیل



فەرەیدون عەبدولقادر

ناوی کتێب: هەڵۆ سوورەکانی قەندیل

نووسین: فەرەیدون عەبدولقادر

دیزاینی کتێب: ئاکام شەمسەدینی

وێنەی بەرگ: فەرەیدون عەبدولقادر

تایپ: سورێن عەلی

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

چاپ: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی دووەم: سلێمانی - پاییزی ٢٠٢٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (١١٢٥)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێ دراوە.

## پێرست

ئەڵێن:
ئەم هەڵۆ سوورانە، لەسەر پشکۆ کڕ ئەکەون
برووسکەیان لەناو هەورا دەرهێناوە و
خستویانەتە دەروونی خۆیانەوە
ئەڵێن:
ئەم هەڵۆ سوورانە بە شەوی زریان و بەفر
هێلانەیان ئەگوێزنەوە
لەسەر لوتکەش نەبێ نامرن
بەچکەکانیان لە ناو گەردەلوولدا نەبێ قەت باڵ ناگرن
دۆستی هەموو بنچکێکن
ئەڵێن:
ئەم هەڵۆ سوورانە
ئەگەر ڕێیان کەوتە گوندێ، تەنها مەلە هەژارەکان
لە زمان و هەڵفڕینی ئەوان ئەگەن

**شێرکۆ بێکەس**

## پیشەکیی

کاک فەرەیدون عەبدولقادر تێکۆشەرێکی گەورە و ناوداری کوردە، کوڕێکی هەڵکەوتووی شاری (سلێمانی)یە، ئێستا زۆرتر لە شاری لەندەن دەژی، ماڵی ئاوا بێت لە دوا سەردانی کوردستاندا، سەری دام و هەواڵی باری نەخۆشی و لەشساغی پرسیم، کتێبێکی چەند سەد لاپەڕەیشی پێ بوو، کە بەشێک بوو لە یادداشتەکانی خۆی، دەڵێم بەشێک بوو، چونکە ڕووداوەکانی تا کۆتایی و تا ئەمڕۆ نەهێناوە، ڕەنگە وای بۆ چووبێ کە (ژیان و تێکۆشان) بە بەرییەوە ماوە و قسەی تری هەیە بیکات، هیوای تەمەن درێژی و بەردەوامی تێکۆشانیمە و ئاواتە خوازم، کە ئەو زانیارییانەی لەلایەتی و ڕەنگدانەوەی ساڵانی دوای یادداشتەکانە، ئەویش بچێتە سەر کاغەز. چونکە بە ڕاستی زۆر کەس، بە تایبەتی دەستەی گەنجان، ئاگاداری هەموو ئەو ڕووداوانە نین و زۆر لەو ناوانەش ناناسن، کە مێژووی ڕۆژانی یادداشتەکەیان دروست کردووە. بۆ نموونە.. چەند کەس وا بە وردی ئەو ناوانە

دەزانن، یان ئەو کەسانە دەناسن، کە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) یان دروست کردووە؟ یان کۆکیی و ناکۆکییی ناو (یەکێتی) دەزانن. لەم یادداشتانەدا لە زمانی یەکێک لەو دامەزرێنەرانەوە زۆر لایەنی ئەو باسە دەخوێنینەوە.
هەرچەندە کاک فەرەیدون لە سەرەتا تا کۆتایی کتێبەکەی هەوڵیداوە بابەتییانە بنووسێ و راستیی رووداوی رابردوو بۆ نەوەی نوێ بگێڕێتەوە، (ئەگەر خوا نەخواستە گوێی لێ بگرن)! بەڵام هەندێک راستی لە پیشەکییەکەدا دەنووسێ، کە ناوی ناوە (وتەیەکی رەوا).
کاک فەرەیدون دەفەرموێ: هەر نووسەرێک ئەرکی نووسینەوە یان گێڕانەوەی رووداوەکان و لە جەرگەی ئەو رووداوانەدا ژیاون، ئەوانە بیانەوێ یا مەبەستیان نەبێت، بە ئاگا و ئەنقەست بێ یان بێ مەبەست بێت، ئەکەونە ژێر زەبری لایەنگیری لەلایەک یان چەند لایەک و تەرە کردنی سۆز و مەیلی نووسەر لە لایەنەکانی تر.
هەر یەکێک لەو زاتانەی، کە ئەو رووداوانەی نووسیوەتەوە و گێڕاویەتیەوە لەو کاتانەدا، لایەک، هەڵوێستێکی سیاسی، ئایدۆلۆجی و بیرو بۆچوونی لایەکی لەلا شیرینتر و دروستتر بووە لەهی ئەوانی تر، ئەنجا بەخۆی بزانێ یان نەزانێ، سۆزی ناخی بە لایەکدا ئەبات لەسەر حسابی لایەنەکانی تر.
بێ گومان وەرگرتنی ئەم هەموو وشە و دێڕانە لە پیشەکییەکەی کاک فەرەیدون لەگەڵ سیستمی ئاکادیمی و لێکۆڵینەوە ناگونجێ، بەڵام لەبەر ئەوەی، کە کاک فەرەیدون وەک لەو چەند لاپەڕەیەدا رێباز و پەیڕەوی بیرکردنەوەی خۆی بە باشی دەردەخات، منیش ناچاری بە درێژی لێوەرگرتنی بووم. ئەم پیشەکییەی کاک فەرەیدون زۆر بە نرخ و رێگە پیشاندەرە، بەڵام هەر لەبەر ئەو هۆیەی باسم کرد دێڕی تری

لێ وەرناگرم و بە ئاواتی ئەوەی خوێنەر خۆی بە وردی هەمووی بخوێنێتەوە.

پاش ئەمە کە دێتە سەر (کۆمەڵە و بیرەوەرییەکانم)، بەسەرەتایەک دەست پێدەکات لە بارەی مێژووی کوردەوە، بە ناوی (کورد، وەک گەلێکی پارچەپارچەکراو و ماف زەوتکراو)، راستە لەم پیشەکییەدا بەچەند لاپەڕە باسی رابوردووی کورد دەگێڕێتەوە بە دەست (رۆم و عەجەم) ەوە، بەڵام بایەخی ئەم پیشەکییە لەوەدایە، کە سەرکردەیەکی ئەمڕۆی بزووتنەوەی کورد کاک فەرەیدون رای هەر وەک ئەوانەیە، کە لەمەوبەر لە بارەی مێژووی کورد و زوڵم لێکردن و دابەش کردنی (کوردستان) یانەوە نووسیوە و باسیان کردووە، خۆ دەبێ ئەمە هەر رای کاک فەرەیدون نەبێ، بەڵکوو رای تێکڕا یان زۆربەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بێت، لە کاتێکدا نووسەر بابەتییانە باس لەم ناکۆکییانەی کورد دەکات. بەڕێزی دێتە سەر خەبات و تێکۆشان و شۆڕشەکانی کورد و بەڕێز لە ئەورەحمان پاشای بابانەوە ساڵی ١٨٠٦ تا شۆڕشی کوردستانی باشوور بە رابەری (مستەفا بارزانی) ١٩٦١ - ١٩٧٥، کە کاک فەرەیدون بە ویژدانەوە دەڵێ: ئەمەیان ( لە هەموو شۆڕشەکانی تر گشتگیرتر بوو، بەشی هەرە زۆری خەڵکی کوردستانی لە دەوری خەبات و دروشمەکانی خۆی کۆکردەوە و توانی حکومەتی عێراق ناچار بکات، کە مافی نەتەوایەتی کوردستان بسەلمێنێت، (گەرچی لەدواییدا بە پیلانێکی نێودەوڵەتی دووچاری شکست هات)!

نامەوێ لاپەڕە بە لاپەڕە دوای یادداشتەکانی کاک فەرەیدون بکەوم، چونکە بە راستی شتی هەمە لایەنە و چرو پڕی تێدایە، بەڵام ئەوەی کە لە هەموو شت زیاتر سەرنجراکێشەرە ئەوەیە، کە ئەم یادداشتە لە خۆیدا مێژووی دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ە بۆ

کەسێک، کە بە دوای مێژووی ئەو ڕێکخراوە تێکۆشەرەی کورد دا بگەڕێت، سەرچاوەی لەمە باشتری دەست ناکەوێت.

بەتایبەتی دیارە بیری تیژی کاک فەرەیدون، کە ناوی هەموو دامەزرێنەرانی (یەکێتی) و تەنانەت ئەندامە بەراییەکانیش دەزانێ، بەش بەحاڵی خۆم شتێک لە بارەی ئەو مێژووەوە دەزانم، بەڵام هەرگیز بەم وردییە ناوی دامەزرێنەرانم نە ئەزانی، زۆرم پێخۆشە کە کاک فەرەیدون هەر کەسە هەقی خۆی داوەتێ و ئەو ناوانەی لێرەدا هاتوون، ناوی ڕاستی ئەو (دامەزرێنەرانە)ن هەقی بەسەر ئەوەوە نییە کە من دەیانناسم یان نا - یا خود خۆشم دەوێن یان نا - بێگومان ناوی (یەکێتی و مام جەلال)، هەمیشە پێکەوە دێن، خۆ ئەگەر چەند هاوڕێیەکی کۆنی (مام جەلال) ناو بهێنێ، دیارە لە ساڵی ١٩٤٧ وە ناوی من دێت و شانازی پێوە دەکەم، بە تایبەتی لە یادداشتی خۆمدا دەبێت باسی ئەو ساڵە بکەم، کە من و ئەو و شەهید (زەبیحی)، پێکەوە لە شام لە ژورێکدا دەژیاین.

ئەم کتێبەی کاک فەرەیدون، دەگمەن و بەنرخە. کارێکە چەند لایەن لەخۆی دەگرێ، لە لایەکەوە یادداشتە، لە لایەکی ترەوە بەشێکە لە مێژووی ژیان و خەباتی نووسەر خۆی. بە گشتیش تۆماری بەشێکی گەورە و بە نرخی مێژووی ئەو گەلی کوردەیە کە ( کۆڵی نەداوە) و دیارە هەرگیز ( کۆڵیش نادا)!

کە جارێکی تر بە کتێبەکەدا چوومەوە هەستم بە دڵسۆزیی نووسەر کرد بۆ (کەرکووک). لە بەشێکی کتێبەکەیدا دەبینم مێژوویەکی ڕەنگینی کەرکووک دەگێڕێتەوە. ئێمە لە دەمێکەوە سوورین کە کەرکووک شارێکە لە کوردستان و شاری کوردە، با هەندێ بەشی میللەتی تریشی تێدا بێ - لەمەدا دەبێ عەرەبە هێنراوەکان لادەین، کە هەقیان نییە لە

کەرکووک بن و دەبێ بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، چونکە بۆ بە عەرەب کردنی کەرکووک هێندراون - !

جا کە باسی ( کوردێتی)ی کەرکووک دەکەین، با سەیرێکی ئەم کتێبە رەنگینەی کاک فەرەیدون بکەین، ئەگەر پێرستێک بۆ ئەو ناوانەی لە کتێبەکەدا هاتووە، ئەوە ناوی دەیان کوردی تێکۆشەری کەرکووکی دەچێتە ناو ئەو پێرستەوە. خۆ نووسەر تێکڕا مێژووشی نە نووسیوە، تا گەلێک لاپەڕەی رەنگین و بەنرخی تر بچێتە ناو کتێبەکەوە. ئەو بۆ سەلماندنی (کوردێتی) کەرکووکی نەنووسیوە، کە زۆر لاپەڕەی تر دەگرێتەوە، بەڵام هەر باسی ئەو کار و تێکۆشانەی خۆی لە کەرکووکدا و ریزکردنی ناوی ئەو تێکۆشەرانەی لەگەڵ خۆیدا، کە بە تێکۆشانەوە خەریک بوون و بە بیری تیژی خۆی ناویانی لەبیرە - با هەندێک ناویشی لە بیر چوبێتەوە - هەر ئەوە بەڵگەی گەورەی (کوردێتی) کەرکووکن، کە ئێمەی کورد زۆرخۆمان بە سەلماندنییەوە خەریک کردووە و وا بزانم تازە براوەتەوە.

کاک فەرەیدون لە دەوری کارەکانی خۆی و هاوڕێکانی دا دەسووڕێتەوە، بەڵام ئەو لە هەموو کەس شایانترە بۆ ئەوەی لاپەڕەی تری مێژوو و رووداو بخاتە سەر بەرگەکانی کتێبەکەی و بەڵگەی تر بۆ کەرکووکی کوردستان بهێنێتەوە.

من لام وایە (کوردێتی و کوردستانی) یەتی کەرکووک براوەتەوە. بەڵام ئەگەر هێندێ بەشی تر بۆ ئەم کتێبە بنووسرێ سوودی زۆرە و کاک فەرەیدون خۆی شایەنی ئەو کارەیە. من کە باسی کەرکووک دەکرێ، مانگرتنی کرێکارانی (گاور باخی)م دێتەوە بیر، هەمیشە (تەکیەی تاڵەبانی) م لە بیرە، کە تا ئێستاش وەک مەڵبەندێکی کوردەواری و کوردایەتیی دیارە.

کتێبەکـەی کاک فەرەیـدون وردییەکـی بـە نرخـی پێـوە دیـارە. لاپـەڕەی بەشـێکی گـەورەی خەباتـی کـورد، نـەک هـەر لـە کەرکـووک، بەڵکـوو لـە پێنجوێنـەوە تـا ( بـەدرە و جەسـان) دەگرێتـە خۆ. وەک کوردێکی هوشـیار و ئـازا دان بـە سـنوورە دەسـتکردەکەی کوردسـتاندا نانێت و دەپەڕێتـەوە ئەوبەریـش و شـتێک باسـی خەباتـی خـۆی و هاوڕێیانـی ئـەو بەریـش دەکات.

خۆزگە کتێبەکـە لـە (یادداشـت) ەوە دەگـۆڕا بـۆ مێـژوو نووسـین و بـەوە کاک فەرەیـدون شـایانی ئەوەیـە، کـە باسـی خەباتـی ئەوبـەری ئـەم سـنوورە دەسـتکردە بـکات. هەرچەنـدە بـە پێـی ڕێـڕەوی یادداشـتەکانی، خـۆی لـە نـاوی هەندێـک تێکۆشـەری گـەورەی ئـەو دیویـش لانـەداوە. شتێک نییـە لـە هونـەردا، لـە نووسـیندا کە پێی بوترێت بێ لایەنی، بە نموونە ڕەنگە لە شـتێکی وەک مۆسـیقادا تۆ حـەز لە گوێگرتـن لە ئامێرێک بگری و حـەز لـە گوێگرتـن لـە ئامێرێکـی تـر نەگـری، ئەمـە خـۆی لایەنگیرییـە. بـۆ ئـەم چەشـنە بابەتـە تێکەڵـەش کـە کاک فەەریـدون نووسـیوێتی، دیـارە لایەنگیریـی دیـارە. بـەڵام پێـش هەمـوو شـت، ڕاسـتگۆییم تێدا دی، واتـە: ئـەو شـتانەی دەیانگێڕێتـەوە هەسـتی ڕاسـتگۆیانەی خـۆی تێدایـە. ڕاسـتە بـە گشـتی تۆمـاری یادداشـتە، بـەڵام لـە توێـی ئـەو گێڕانەوانـەدا هەسـتی کاک فەرەیـدون بەرامبـەر بـە هەمـوو ڕووداوەکان و بەرامبـەر بـەو نـاوە زۆر و زەبەندانەیـە، کـە دەبینـی لـە یادداشـتەکەدا هاتـوون، نـاوی هەنـدێ کـەس هـەر تۆمـاری نـاوە کـە دەبێـت ناویـان تۆمـار بکـرێ، بـەڵام لـە پشـت ئـەو ناوانـەوە هەسـت و هەڵوێسـتی کاک فەرەیـدون دەبینـی. بـۆ نموونـە پێشـتر باسـی ئـەوەم کـرد کـە (مـام جـەلال)ی زۆر خۆشـدەوێت، هـەر ڕەنگـە سـەرکردەیی و دامەزرێنـەری (یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان)، لەلایـەن (مـام جـەلال) ەوە یەکێـک بێـت لـەو هۆیانـەی کاک فەرەیدونـی

بەو خوێن گەرمییەوە بردۆتە ریزی دامەزرێنەرانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) ەوە. بەڵام راستگۆیی و بە ویژدانی نووسەر وای لێدەکات (وەک لەمەوبەر باسم کرد)، کە بە رێز و گەورەییەوە باسی نەمر (مەلا مستەفای بارزان) بکات. کە ئەمە هەستی راستەقینەی خۆیەتی و رەنگە زۆر کەس چاوەڕێی ئەوە نەبووبن. هەر لە ریزی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دا، لەناو دێڕەکاندا دەگەیتە - رای کاک فەرەیدون بەرامبەر هەندێ کەس کە رای سلبی هەیە بەرامبەریان - بەڵام ئەم رایە لەوپەڕی بابەتییانە و بە ئەدەبەوە دەربڕاوە، کە ئەمە یەکێکە لە سیفەتەکانی کاک فەرەیدون.

لە باسی بابەتییانە و راستگۆییدا لای ئەم چەند دێڕەی کاک فەرەیدون دەوەستم:

( بڕیارمان دا کە لێبوردنی گشتی بۆ جاشەکان رابگەیەنین، چونکە ژمارەی جاشەکان لە ٢٠٠ هەزار پتر بوون، ئەگەر ژمارەی کەسوکاریان حساب بکەین زیاتر لە یەک ملیۆن کورد دەبوون. نە دەکرا رژێم بەناوی پێشمەرگە و رێکخستن وبەرگرییەوە نیوەی گەلەکەمان لەناو بەرێت و ئێمەش خۆمان نیوەکەی تری لەناو بەرین، دەرگاشمان ئاوەڵا کرد بۆ ئەو حاڵەتانەی خەڵکی بە بەڵگە شکاتیان لەسەر کوشتنی کەسوکاری پێشمەرگە و تێکۆشەرەکان هەیە، بەهۆی یاساوە ئەو شکاتانە بپرسێتەوە).

ئایا را لەمە بابەتییانە تر هەیە؟ بە راستی من رای تایبەتیم لە بارەی جاش و لێبوردن هەبوو، کە ئێرە جێی باسان نییە، بەڵام ئەم چەند دێڕەی کاک فەرەیدون رام دەگرن.

بێجگە لەوەی بە رێزەوە باسی (بارزانی نەمر) و کاک (نێچیرڤان بارزانی) دەکات، وەک دڵسۆزێک بۆ (بەرەی کوردستانی)، زۆر بە رێزەوە باسی

کاکە (حەمـەی حاجـی مەحمـود) و کەسـانی تـر دەکات و وەک هـاوڕێ و هـاوکار لـە سـەرکردە و برایانـی (یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان)، دەدوێ ! کـە بـەو لاپەڕانـەی پیشـەکییەکەدا دەچمـەوە بـۆ زیاتـر نووسـین، دەبینـم کـە کەرەسـتەی ئـەو لێکۆڵینەوەیـەم هـەر مـاوە، کـە بڕیـارم داوە پـاش دەرچوونـی کتێبەکـە بینووسـم.

ڕەنگـە هەنـدێ کـەس ڕەخنـەی ئـەوە بگـرن، کـە هـەر ستایشـی کتێبەکـەم کـردووە و لـەو لایەنانـە نـەدواوم کـە دەبـێ ڕەخنەیـان لـێ بگـرم، بـەڵام ئەمـە (پیشـەکیی) یـە، هـەر بـە پێـی ئـەو شـێوەی لێکۆڵینەوەیـە- اسـلوب البحـث- ەی کـە خوێندوومـە و بـە دەرس وتوومەتـەوە، دەبـێ (پیشـەکیی)، هـەر لایەنـە باشـەکان نیشـان بـدا و سـتایش بـێ، ئـەم پیشـەکییەش نووسـینی منـە و ڕێبـازی خـۆم هەیـە، بـەڵام کاتێک کـە کتێبەکـە دەرچـوو لێکۆڵینەوەکـەم لەسـەر نووسـی، لەوێدا ڕەخنەشـم دەبـێ و دەشـزانم کاک فەرەیـدون بـەو جـۆرە زانسـتییەی کـە هەیەتـی کـە ڕێبـازی ئـەوە زۆری پـێ خـۆش ئەبـێ.

کاکە فەرەیدون دەستت خۆش بێ بۆ نووسینت، بۆ کوردییە جوانەکەت، بـۆ پەیوەندییـە بەتینەکـەت بـە (کەرکـووک)ی خۆشەویسـتەوە، بـۆ ئـەو گیانـە پڕ لـە ( بابەتـی) یـەی ئـەم یادداشـتانەت پـێ نووسـیوە.

هیوام وایە لە لاپەڕەی تردا یەک بگرینەوە.

**پرۆفیسۆر عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ**

**تشرینی دووەمی ٢٠١٦**

## پێشەکی چاپی دووەم

لە پێشەکی چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسم لەو نوسین و بیرەوەریانە کردبوو، کە هەندێکیان بۆ بەخشینەوەی تۆمەت , یا بۆ تاوانبارکردنی کەسێک یاخود چەند کەسێکی تر ئەینوسن , هەندێکیش بۆ پاکانە کردن لەو هەڵە و هەڵوێست و کارانەیە، کە لە رێرەوی تیکۆشاندا کردویانە. تەقەلایەکی چەوتە بۆ خۆ دەربازکردن لە بەر پرسیارێتی. ئەو نوسینانە لەباتی ئەوە، کە ئاما نجەکانیان بپێکن و بەشدارییەکی راستگۆ لە نوسینەوەی مێژوودا بکەن , زیان بە نوسینەوەیەکی بابەتیی جوان و پوختی مێژوو دەگەیەنن و خوێنەر لە نوسین و تۆمارکردنی بابەتییانەو راست و دروستی مێژوو بەدبین و گومرا ئەکەن.

لەو دەمەدا کە نیازی چاپی دووەمی کتێبەکەم کەوتە بەرنامەی کارەوە , ئاژاوەیەکی گەورە و نوسین و پلاری سەیرو سەمەرەی زۆر لەسەر چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیونی و بڵاوبونەوەی کتێبی (لە بری بیرەوەری) کاک مەلا بەختیار هەژانێکی خستەوە.

لەگێژەنگی هەمو کارو کاردانەوەکان، نوسینێکی کاک ( ئاکۆ وەهبی) دڵی خۆشکردم، کە تا رادەیەکی باش هێمن و بابەتیی نوسرابوو, ئیتر باقیەکەی کاردانەوە و زمانی زبر کارێکی وایکرد، کە راست و ناراست, رەش و سپی، تێکەڵ ببن و بەمەش زۆر رووداو و داستانی جوان و پر لە شانازی ناشیرین کران. خۆزگە نە کاک بەختیار بەو شێوە خراپە رووداوەکانی بگێرایەتەوە, نە پەلاماری قارەمانەکانی کوردایەتیشی بدایە و نە هەقی هاورێ نزیکەکانی خۆشی بخواردایە, نە کاردانەوەکانیش بە هەمان شێوە هێندە تورە و زبر بوونایە.

دیارە ئەم پێشەکیە وەرامدانەوەی کاک بەختیار ناگرێتە خۆ. رەنگە گەلێ شتی چەواشە و لێکدانەوەی دەروونی شێواو یەخەی نە تەنها کەسێک, بەڵکە زۆربەی تێکۆشەرەکانی گرتبێتەوە. بۆیە لەم کاتەدا نامەوێ قسەی لەسەر بکەم، نەک ئاگرەکە خۆشتر بکەم. ئەم پێشەکیەش ناتوانێ جێگەی شیکردنەوە و راستکردنەوەی باسەکانی کاک بەختیار بگرێتە خۆ, لەوە زیاتر کە تەنها ئەمەوێ سوکە بیر خستنەوەیەکی رەوشتی بەرز و نەریتی کوردەواری بێت.

بۆیە نەدەبو کاک بەختیار لەم کاتەدا بەو جۆرە هەلسەنگاندنی بۆ رۆڵی گرنگی کاک نەوشیروان بکردایە. لەوەش زیاتر نەدەبو بەو جۆرە چەواشەیە مێژووی رووداوەکانی جولانەوەی رزگاریخوازانەی کوردستانی تۆمار بکردایە و خۆی بکا بە سەرکردەیەکی بلیمەت و ئەوانی تریش (ئەوانەی، کە کاک بەختیار ناتوانێ وەک هاورێ خۆشی بوێن.) هەمویان وەک کاڵفام و دەست و پێ سپی باس یا خود فەرامۆش بکات و تەنانەت نزیک ترین هاورێی خۆی لەوانە کاک سالار عەزیز، کە هی ئەوەیە کاک مەلا دەرسی لێ فێر ببێ و شانازی پیوە بکات, کەچی بەو جۆرە بیان کات بە ژێر زەبری خۆ هەڵکێشانەوە .

شۆڕشـی کـورد , داسـتانەکانی بەرگـری خەڵکـی کوردسـتان و هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان، کـە بـە خوێنـی هـەزاران ڕۆڵـەی تێکۆشـەری گەلەکەمـان و بـە پشـتیوانی و جـۆش و خرۆشـی جەمـاوەری فراوانـی خەڵک لە شـار و لادێ و ئۆردوگا کاندا و لـە زیندانەکانـی بەعسـیان و لـە شـار و لە شـاخ، بە بەرگەگرتن و گیان بەخشـینی کەم وێنەی تێکۆشـەرانی گەلەکەمـان، کـە بـە خۆراگـری کادر و پێشـمەرگە و فەرماندەکانـی هەمـو هێزەکانـی کوردایەتـی هاتۆتـە دی، هێنـدە گـەورە و پیـرۆزە، کـە بۆتـە ئیلهام بەخش بۆ دەیان شـاعیر و ئەدیبی کـورد و دەیـان چیرۆکـی نایـاب و شـیعری پـڕ لـە بەهـرەی وەک شـیعرە جوانەکـەی شـاعیری گـەورەی کـورد شـێرکۆ بێکەسـی لـێ کەوتۆتـەوە، کـە دەڵێـت:

ئەڵێن: ئەم هەڵۆ سورانە , لەسەر پشکۆ کڕ ئەکەون
بروسکەیان لە ناو هەورا دەرهێناوە و
خستویانەتە دەروونی خۆیانەوە
ئەلێن: ئەم هەڵۆ سورانە بە شەوی زریان و بەفر
هێلانەیان ئەگوێزنەوە
لە سەر لوتکەش نەبێ نامرن
بەچکە کانیان لە ناو گەردە لولدا نەبێ قەت باڵ ناگرن

ئەنجـا حەیـف نیـە، ئـەو خەباتـە پـڕ لـە قوربانیدانـەی گەلەکەمـان و تێکۆشـەر و شـەهیدە نەمـرەکان, ئـەو هەمـوو خۆڕاگریـەی ژێـر زەبـری هێرشـی دڕندانـە و چەکـی قـورس و فڕۆکـە و بۆردومانـی کیمیایـی و ئەنفالـەکان و ئـەو هەمـوو داسـتانە کـەم وێنانـەی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان، بـەو جـۆرە بـاس بکرێـت! ئـەو شـۆڕشـەی لـە خەباتـی دوور و درێـژی گەلەکەمانـدا بـۆ یەکەمیـن جـار سـەرکەوتنی گـەورەی بـە دەسـت

هێنا و قەوارەیەکی فیدراڵی بۆ کورد لە عیراقدا چەسپاند، بەو شێوەیە باس بکرێت.

ئاخر زۆربەی شۆڕشەکانی کورد, جوڵانەوە و ڕاپەڕینەکانی توشی نسکۆ و شکست هاتوون و سەرکردەکانیشی بە دەستی داگیر کەران لە سێدارە دراون، تەنها ئەمجارە و ئەم شۆڕشە, بەم خەباتە پڕ لە قوربانیدانە ئەنجامێکی بوە، ئەمە یەکەمین جارە کورد سەرکەوتنی وا مەزن بە دەست بهێنێ و سەرکردەکانیشی سزادانی دوژمنانی گەل و ئازادی بە چاوی خۆیان ببینن. کەچی کاک بەختیار ئەوە نابینێ و هەندێ شتی ناخۆش و سەلبی لەو مێژووە پڕ سەروەریەدا زەق ئەکاتەوە بە ویژدانتان ڕەوای هەقە ڕووباری خوێنی شەهیدان و بەرگە گرتنی دلێرانەی هەموو گەلی کوردی بەو جۆرە ناشیرینە نیشان بدا! لە کوێ ڕەوای هەقە ئەو هەمو ڕەنج و گیانبازی و پشو درێژیە، بە جوڵانەوەیەکی پڕ لە ستەم و ناڕەوایی و ڕەفتاری ناشیرین وێنا بکرێ!
شاعیر و نووسەرە گەورەکانی کورد و پیاوە هۆشیار و بە ویژدانەکان، هەمیشە ڕوڵی تیکۆشەرە نەبەز و ئازاکانی ئەو دەمەی هەڵسانەوە, هەڵسانەوە و ئاوەدانکرنەوەی سەنگەرە خامۆشەکانی بەرگری و بەرپا کردنەوەی شۆڕش بە (یخ دانی مەحاڵ) ئەهۆننەوە .. ئەو کارە جوانە پڕ لە جوامێریە، کە هەمووومان پێکەوە ئەنجامماندا و هەر یەکە لە شوێنی خۆیەوە شەرەفی گەورەی ئەو داستانە کەم وێنەیەی پێ ئەبرێ و شانازی گەورەی هەموومانە, ئەشێ بەو شێوەیە سەیر بکرێ و بکرێتە جوڵانەوەی ستەم و دیل کوشتن و خیانەت و دزی و تاڵانکردن و ڕاو و ڕووت!

لە پرۆسەیەکی گەورە و درێژی بەرگریی و خەباتی چەکداری بێ وچان و قوربانیداندا، کە خۆی لە خۆیدا وەرامدانەوەی زەبروزەنگی

داگیرکەرە بە (زەبرو زەنگ) لە ناو هێزی فراوان و ناوچەی فراواندا و لە درێژەی ساڵانیکی زۆردا هەڵە و کەم و کورتیش روو ئەدا, ساتمە کردنیش لە سیاسەت و هەلوێستەکاندا سەر هەڵئەدەن، لێرەو لەوێ کاری نەخوازراویش ئەبینرێ. خۆزگە هیچ هەڵەو کەم و کورتیەک لە جولانەوە رزگاریخوازەکەی گەلەکەماندا رووی نە ئەدا. بەلام کێ لە ئێمە هەڵەی نەکردووە و کێ هەموو کار و کردەوەکانی بێ کەم و کورپیە. ئەی کامە شۆرش لە جیهاندا بێ کەم و کورِی بووە, بێ ناکۆکی و ململانێ بووە. بۆ وا ئەکەن, بۆ وا ئەڵین و ئەنوسن؟ ئاخر گەر خۆمان، سەرجەم تێکوشەرەکان بە کەم بگرین و لە نرخی نەبەزی و تێکۆشانیان کەم بکەینەوە، دوژمن دەبێ چیمان پێبلێت!

بۆ یەکیک لە ئێمە خۆی بە شۆرِە سوار و بلیمەت نیشان بدات و رەنج و جوامێری و ئازایەتی کەسانی تر بکا بە ژێر لێوەوە! لە نرخی هاورِێکانی و لە تێکۆشانی گەلەکەی کەم بکاتەوە. هەرچی کراوە بە راست و هەڵەوە, بە لایەنە گەشەکان و حاڵەتە خامۆشەکانیەوە ,هەموو لایەک پێکەوە کردومانە، نە تەنها یەک کەس لە هەڵە و کەم و کورتی بەر پرسیارە, نە کەسیش بە تەنها قارەمانی مەیدان بووە!

راستێکەی بە هەمووان گەیاندمانە ئەو سەرکەوتنە.بەلام گرنگ دوای ئەوەیە، واتە گرنگ ئەوەیە چۆن ئەو دەسکەوتە مەزنە ئەخرێتە خزمەتی خۆشگوزەرانی کۆمەڵ و پێشکەوتنی وڵاتەوە, چۆن عەدالەتی کۆمەلایەتی و داد و سەروەریی یاسا بەرقەرار ئەبێ، چۆن ئەو دەسکەوتە ئەپارێزرێ و گەشەی پێ ئەدرێ! گرنگ ئەوەیە لەمەو دوا چی ئەکەن. جوامێر و پیاو چاک ئەوانەن، کە لەمەدوا بە هەموو توانا هەوڵ ئەدەن دەسکەوتەکانی گەلەکەمان لە دەست نەچێت و ئەزموونەکەمان لە ناشیرین کردن بپارێزرێ.

تێکۆشـەری باش ئەوانـەن، کـە ئازایانـە و خـۆ نەویسـت خەبـات ئەکـەن بـۆ چارەسـەری کێشـەی ژیـان و گوزەرانـی خەڵکی کۆمەڵەکەمـان, کار ئەکـەن بـۆ هێنانـەدی عەدالەتـی کۆمەلایەتـی و پاراسـتنی کۆمەڵەکەمـان لە نـا تەبایی و شـەڕی نەگریسـی برا کوژی. ئەوانـەن, ئـەو تێکۆشـەرانەن گرەو ئەبەنـەوە و ئەتوانن خزمەتکاری ژیر و دڵسۆزی گـەل و نیشتمان بن. ئەوانـە، کـە بەرژەوەنـدی گـەل لـە سـەر و بەرژەوەنـدی شەخسـی و حیزبایەتیـەوە دائەنێـن.

لـە ئەرکـی چاپـی دووەمـی کتیبەکـەدا, یـادی نوسـەری گـەورەی کـورد (دکتـور عیزەدیـن مسـتەفا رەسـول) لـە ویژدانمـدا بـەرز را ئەگـرم. ئـەو پیـاوەی، کـە خەرمانێـک کتێبـی بـە نرخـی بـۆ گەلەکەمـان نووسـیوە وخزمەتـی گـەورەی بـاری رۆشـنبیری گەلەکەمانـی کـرد و پێشـەکی چاپـی یەکەمـی ئـەم کتێبـەش بـە خامـە رەنگینەکـەی ئـەو نوسـرا، تـا بەهایەکـی گـەورە پەیـدا بـکا.

کۆڤیـد-١٩ نەخۆشـی کۆرۆنـای بـۆ مرۆڤایەتـی هێنـا و رۆژانـە عەزیزەکانمـان لـێ ئەفرێنـی و هێنـدەی تریـش بـاری ئابـوری سـەخت کـردووە و ژیـان و گوزەرانـی خەلکـی کوردسـتانی زەحمـەت و ناخۆشـتر کـردووە, کـە ئەویـش تەگبیـری دڵسـۆز و ژیرانـەی ئـەوێ, هۆشـیاری زۆرتـر و وورییایـی زۆری هاوولاتیانـی ئـەوێ. ئەبـێ هیوامـان وابـێ، کـە بـە گیانـی بـەرزی هەسـت کـردن بـە بەرپرسـیارێتی نیشـتمانی سـەرانی هەرێـم هەمـو تواناکان بـۆ گـەل و بـۆ دەربـاز بـوون لـە وەیشـومەی ئـەم پەتایـە و بـێ گوزەرانـی خەڵـک تەرخـان بکـەن.

هێنـدەی جـاری پێشـوو لـەم کتێبـە چـاپ کرابـو هەمووی کەوتـە دەسـت خوێنەرانـی بەڕیـز و هیـچ دانەیەکی لـە بـازاڕدا نەمـا, لـە ئاسـتی خواسـتی خوێنەرانیشـدا بیـر لـە چاپـی دووەم کرایـەوە. سـوپاس بـۆ ئـەو زاتـەی

ئەرکی گرتۆتە ئەستۆ. سوپاسێکی زۆریشم بۆ هەموو ئەو خوشک و برایانە، کە دڵسۆزانە رەخنەیان لە کەم و کورِی چاپی یەکەم گرت و هانیان دام، کە هێندەی لە توانادا بوو راستیان بکەمەوە. رەوای هەقە بە پێزانینێکی زۆرەوە سوپاسی مامۆستای بەڕێز کاک عەبدول کەریم شێخانی بکەم، کە بە سەرتاپای چاپی یەکەمدا چوەوە و هەڵەکانی راست کردەوە تا بیرم بکەوێتەوە، کە رۆژانێک لە خزمەتی ئەو مامۆستایەدا وەک سەر نوسەری رۆژنامەی کوردستانی نوێ بوم و ئەو دەمەش هەر مامۆستا و راستکەرەوەی هەڵەکانی نوسینمان بو. ناشتوانم ئەمجارەش رەنج و برایەتی هاوڕێم کاک ئازاد تۆفیق باس نەکەم و لە دڵەوە سوپاسیان نەکەم . سوپاس بۆ هەمووتان.

**فەرەیدون عەبدولقادر**

**سەرەتای ئۆکتۆبەری ٢٠٢٠**

## وتەیەکی رەوا

گێڕانەوەی رووداوەکانی مێژوو، ئەو رووداوانەی، کە نووسەرەکە خۆی لەگەڵیدا بووە یاخود تێیدا ژیاوە، یا لە دۆکۆمێنت و بەڵگەی لۆژیکی و لە ناواخنی کتێب و لەسەر زاری خەڵکی بڕوا پێکراو و شارەزاوە دەنووسرێنەوە، گەر نووسەر بتوانێ ویژدانی خۆی تێدا ئاسوودە بکات، ئەوا هەرچۆن ئەرکێکی ئەخلاقییە، هاوکات پەیامێکی مێژوویشە! چونکە دەتوانێ ئەو دیاردە و شتانە دیاری بکات، کە روویانداوە یا چۆن و بۆچی روویانداوە!

بۆیە مێژوو بە زمانیکی سادە بریتییە لە تۆماری رووداوەکانی رۆژگارەکانی رابوردوو و باس کردن و وێنا کردنی ئەو دیاردانە و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیان لەبەردەم رۆشنایی رێبازێکی زانستیی بێلایەن، دوور لە هەر چەشنە دەمار گیرییەکی ئایدۆلۆجی، یا حیزبی و سیاسی، تا بەوەش هەموومان بگەینە ئەو راستییەی، کە بتوانین زەمینە سازییەکی لەبار بکەین بۆ ئەوەی بە باشی لە ئێستا بگەین و

هـاوكات پێشـبینییەکی راسـت و دروسـتیش بـۆ ئاینـدە بکەیـن!
کۆکردنـەوە و چین لەسـەر چین هـەڵ چنینی دیوار و دانانی کۆڵەکەکانی تـەلاری رابـوردوو لـە رێـڕەوی مێژوییـی خۆیـدا بـە هەمـوو وردە کارییـە کانیـەوە و وەک خـۆی، سـەلیقە و زانیـاری و کارامەیـی خـۆی گەرەکـە! ئەگینا وەک ئـەو خشت و دار و پـەردووە پـەرش و بڵاوەی لـێ دێت، کە لـەو ناوە کەوتـوون و کەسێ نییە بە جوانی و بە رێک و پێکی بیانخاتـە سـەر یـەک و ئـەو تەلارەمـان بـۆ بەرجەسـتە بـکات، کـە دەمانـەوێ یـا خوازیارینـی!
هـەر نووسـەرێک ئەرکـی نووسـینەوە یـا گێڕانـەوەی مێـژوو بگرێتـە ئەسـتۆی خـۆی، بـە تایبەتـی ئـەو کەسـانەی کـە لەگـەڵ رووداوەکان و لـە جەنگـەی رووداوەکانـدا ژیـاون. ئەوانـە بیانـەوێ یـا مەبەسـتیان نەبێـت، بـە ئـاگاو بـە ئەنقەسـت بێـت، یـا بـێ مەبەسـت، دەکەونـە ژێـر زەبـری لایەنگیریـی لایەک یـا چەند لایـەک و تـەرە کردنـی سـۆز و مەیلی نووسـەر لـە لایەنەکانـی تـر!
هـەر یەکێـک لـەو زاتانـەی، کە لەمەوبـەر ئـەو رووداوانەیـای نووسـیوەتەوە، یـا گێڕاویانەتـەوە، ئـەوا لـەو کاتانـەدا هەڵوێسـتێکی سیاسـی، یـا ئایدیۆلۆجـی و بیـرو بۆچونـی لایەکـی لـە لا شـیرینتر و دروسـتر بـووە لـە هـی ئەوانـی تـر، ئەنجـا بـە خـۆی بزانـێ یـا نەزانـێ، سـۆزی ناخـی بەلایەکیـدا دەبـا لـە سـەر حیسـابیی لایەنەکانـی تـر!
هەنـدی لـەو کتێـب و یادەوەریانـەی، کـە تـا ئێسـتا نووسـراون و کتێبخانەکانیـان رازاندۆتـەوە، سـەرباری ئـەوەی کـە پـڕن لـە رووداو و زانیاریـی وردو و مایـەی رێـز و دەسـت خۆشـین، بـەڵام ناکرێ لێمـان زیـز بـن گـەر بڵێیـن.. زۆر بـە داخـەوە، کـە هەندێـک لـەو بیرەوەرییانـە هێشـتا بـە هەناسـەکانی دوێنـێ نووسـراون و دەڵێـی ئـەو وتـار و نووسـینانەی

ئەوسـان، کـە سـیخناخن لـە تونـد و تیـژی! چونکـە زیاتـر تـوورە بـوون و زبرییەکانـی ڕۆژگاری ڕووداوەکان و ململانـێ خوێناوییەکـەی ڕۆژانـی رابـردووی بـە سـەردا زاڵـە، بۆیـە دەبینیـن، هێشـتا نەیانتوانیـوە خۆیـان لـە هەنـدێ رسـتە و زاراوە ڕەقەکانـی ئـەو سـەردەمە، رزگار بکـەن! هەندێکیشـیان پێ دەچێ بۆ پاکانـە کـردن لـەو تۆمـەت و بەرپرسـیارێتییە مێژووییانـە نووسـرابن، کـە خراونەتـە سـەریان! ژمارەیەکیـش لـەو کتێبانـە بـۆ بـە خشـینەوەی تۆمـەت یاخـود تاوانبـار کردنـی کەسـێکی دیاریکـراو نووسـراونەتەوە، کـە یـادەوەر نـووس بـە دۆسـتی خۆیانـی نازانێـت، یـا حـەزی لـە چارەیـان نییـە! ئەمانـەش هەمـوو دواجـار دەبنـە خەوشـێکی گـەورە بەسـەر ئـەو ئەمانەتـەوە، کـە لـە ئەسـتۆی هـەر یەکێکماندایـە!
نایشـارمەوە چەندیـن یادەوەریـش هـەن، کـە هـەوڵ و تەقەلایەکـی دڵسۆزانەیان پێوە دیارە و هی کەسانێکی بابەتین و ڕووداو و کارەسات و نەهامەتییەکانیـان بەویژدانـەوە نووسـیوەتەوە و خسـتوویانەتە ڕوو، چونکە ئەوانـە خۆیـان سـاڵانێکی دوور و درێـژ شـانیان داوەتـە بـەر بـاری قورسـی ئـەو ئەمانەتـە مێژووییـە و بـە دڵ و بـە کـوڵ هەڵیـان گرتـووە و پێوەی مانـدو بـوون، بۆیـە دەیانـەوێ ئـەو مێـژووە بـە ئەمانەتـەوە بـە نەوەکانـی ئاینـدە بسـپێررێن!
مـن لـە لای خۆمـەوە ئەو مافـە بە خۆم ڕەوا نابینـم، کە بێم بـەو پرنسـیپانە ئـەو بەرهەمانـە پۆلێـن بکـەم و یـەک یـەک لـە خانـەی خۆیانـدا دایانبنێـم و هەڵسـەنگاندنیان بـۆ بکـەم، چونکـە ئـەو مافـە تەنهـا هـی خوێنـەرە و هـی حوکمـی مێـژووە و هـەر ئـەوان دەتوانـن لـە ڕۆژانـی ئاینـدەدا ئـەو دادوەرییـە بکـەن!
مـن کـە ئێسـتا ئـەم یادەوەرییـەم گێڕاوەتـەوە، وەک هاووڵاتییەکـی سـەر ئـەم نیشـتیمانە بەختـم وای هێنـا بکەومـە جەنگـەی ئـەو ڕووداوانـەوە،

کە لەساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردودا بەهۆی چەوساندەوەی نەتەوەکەمان و زەوت کردنی نیشتیمانە کەمانەوە، کە داگیرکەران بواری ئەوەیان نەداوە تەنانەت وەک هاووڵاتییەکی ئاسایی بژیین و بگرە بەردەوام ئازادییەکانی لێ زەوت کردوویین، دەردەسەری و نەهامەتییەکانی بگێڕمەوە! تا بەو هۆیەوە هەرچۆن، نەوەکانی پێش ئێمە کەسانێکی ئازاتر و دڵسۆزتر بوون و بوونە سەر مەشق بۆ ئێمە و هەزارانی وەک من، ئەوا منیش بتوانم بەم نووسینە ببمە شاهیدێک و بەشداریێ بەسەر ئەو رووداوانەوە، کە لەو مێژووەدا دیومن یان کەم و زۆر تیایدا بووم! جا ئەگەر نەتوانم بڵێم، من بۆ خۆم یەکێک لە کەسە بزێوەکانی ئەو رووداوانە بووم، ئەوا دەتوانم بڵێم وەک کەسێکی نزیک ئاگاداری رووداوەکان و هۆکارەکانی رووداوەکانی ئەو رۆژگارە بووم! بەڵام ئاخۆ منیش چەندە توانیومە بێ لایەن و بە ویژدان و راستگۆ رووداوەکان و هۆکارەکانی بگێڕمەوە، ئەوا خۆشم باوەڕم وایە, لەگەڵ نیازی چاکە و تەقەلای زۆر بۆ ئەو مەبەستە خاوێنە و هاوکات تواناکانی خۆم لە تۆمار کردنی ئەو بیرەوەرییانە و ئەو کۆیرە خەتەی کە هەمە، هەر هێندە توانی دەستم بگرێ کە لە گێژەنگی رووداوەکاندا بەرە و هەق و دادپەروەری هەنگاو بنێم و تا ئەو ئەندازەیەی، کە توانیومە بێ لایەن و بە ویژدان ئەو رووداوانە بنووسمەوە و باسیان بکەم.

ئەم کتێبە و باسەکانی دەبنە چەند بەرگێک، یەکەمینیان لە ناوەڕاستی شەستەکانەوەیە تا سەرەتای نەوەدەکان و بەگشتی تا ساڵی یەکەمینی راپەڕینە گەورەکەی گەلی کوردستانە، بەڵام قورسایی گێڕانەوەکە بە تایبەتی شانی لەسەر ئەو چرکە ساتانە داناوە، کە چرۆی هیواکانی شەهید ئازاد هەورامی و هاوڕێکانی لە رۆژگارە هەرە نووتەک

و تاریکەکانــەوە ملــی ڕێ دەگــرن تــا ئــەو زەمەنــەی، کــە ئــەو ئەســتیرە گەشــەی (کۆمەڵــە) لــە ســروودەکەی خۆیــدا ئــاوا دەبێــت!

ئەو زانیاری و باسـانەی کە لـەم کتێبـەدا نووسـیومن، ڕۆمـان یـا چیرۆک و درامـا نیـن، هەموویـان گیانیـان هەیـە و دڵیـان لـێ دەدا! هەموویـان بـە خوێـن و ماندووبونێکـی ئێجـگار زۆری لاوە جوانەکانـی گەلەکـەم و بـە هیمەتـی ئـەو شـەهیدانەی، کـە گەورەتریـن سـەرمایەی ژیانیـان، کـە گیانـی خۆیانـە بەخشـیوە بـەو ڕووداو و کارەسـاتانەی کـە لـەم داسـتانی هەڵـۆ سـوورانەدا تۆمـار کـراون! بۆیـە دەڵێـم ئەگـەر ئـەو گەنجینـە زۆرەی هیـوا و خۆزگەکانـی شـەهیدان و ئـەو پێشـمەرگانە و ئـەو ملیۆنەهـا کەسـە زۆر لێکـراوەی گەلەکەمـان نەبوایـە و هـاوکات سـەرلەبەری ئـەو ڕووداوانـە، ئەمانەتێکـی ویژدانـی و ئەخلاقیـی نەبوایـە لـە ئەسـتۆمدا، ڕەنگـە خـۆم لـە نووسـینی ئـەم کتێبـە و ئـەم یادەوەریـە دوور بگرتایـە!

سـەرەتا لەگـەڵ داوای لێبوردن لـە کـەم و کووڕیەکانـی ئـەم کتێبـە، داوای لێبوردنیـش لـە هەمـوو ئـەو گـەورە پیاوانـە دەکـەم، کـە ژەنـگ هێنانـی بیرەوەریـی خـۆم و تەمـەن لـە یـادی کـردوون، بـۆ هەمـوو ئەوانـە لـە هـەر لا یـەک و لـە هـەر بەرەیەکـدا بـن داوای لێبـوردن دەکـەم! زۆریـش سـوپاس بـۆ ئـەو جوامێرانـەی، کـە لـە کۆکردنـەوە و سـەرلەنوێ پەیـدا کردنـەوەی دۆکۆمێنتەکانـدا دڵسـۆزانە یارمەتیـان دام و ئـەو زاتانـەش، کـە بیرەوەرییەکانیـان زیاتـر لـەلا گەشـاندمەوە!

مـن بۆ خـۆم لـە دەمـێ ساڵەوە حـەزم لە کتێـب و کتێبخانـە و بەڵگـە نامـە و کۆکردنـەوەی ئەرشـیفە، بەلگـە و نووسـراوی زۆرم لا بـوو کـە دەیانتوانـی دۆکۆمێنتـی بەسـوود بـن بـۆ ئـەم بیرەوەرییـە، بـەڵام حەیـف زۆری ئـەو شـتە بـە نرخانـەم لەنـاو چـوون، یەکەمیـن جـار دایـک و کـەس و کارم لـە ترسـاندا و لـە کاتـی زیندانـی کردنمـدا بـە تەنـدور و بڵێسـەی ئاگریـان

سپاردن! دووەمین جاریش لە ساڵانی شاخ و شۆڕشدا فڕۆکەی دوژمن ماڵ و بارەگا و کتێبخانەکەمیان لە گوندی یاخسەمەر بۆردومان کرد و هەموو نووسین و بەڵگەکانم لەگەڵ پەڕو باڵی مریشک و کەڵەشێر و رایەخ و پێخەفی ماڵ و خەلکی هەژاری گوندەگەدا بوون بە قەرە برووت! سێهەمین جاریش هەرچۆن لە شەڕی برا کوژیدا، کورد بە کورد دەکوژرا، ئاواش سەرجەم کتێبخانەکەم و هەرچی بەڵگە و دۆکۆمێنتێکیش هەبوو کەوتنە ژێر دەست و پێی تالانکەرانەوە! بۆیە بۆ سەرلەنۆی پەیدا کردنەوەی هەندێ لەو بەڵگانە پەنام بۆ برای بەڕێز مامۆستا رەفیق سەرپەرشتیاری بنکەی (ژین) برد، کە لەو بوارەدا یارمەتییەکی زۆری دام، پڕ بەدڵ سوپاسی ئەو زاتە و دەزگا بەنرخەکەیان دەکەم، کە وێنەی هەندێ لەو بەڵگانەی بۆ ئامادە کردم! ئامادە کردنی کتێبی یەکەمی ئەم مێژووە بۆ کەسێکی وەک من کارێکی سەخت بوو، خۆ ئەگەر کاک ئازاد تۆفیقی هاوڕێم نەبوایە، بەم جۆرە بۆم نە دەخرایە بەر چاوی خوێنەرانی خۆشەویستی کورد!

کاک ئازاد تۆفیق خۆی یەکێکە لە تێکۆشەرە دێرینە هوشیار و نووسەرەکانی کۆمەڵە و یەکێتی نیشمانی کوردستان، خەڵکی شاری هەڵەبجەیە و خاوەنی چەندین بەرهەمی نایاب و چەندین کتێب و نامیلکە و وتار و دیداری تەلەفزیونە لە زۆر بواری سیاسی و رۆشنبیریی جیاجیادا، کوردی زانێکی بەتواناشە و بە زمانێکی پوختی کوردی دەنووسێ! جگە لە هاوڕێیەتی تێکۆشانی ساڵانی کۆمەڵە، لەم ساڵانەی دواییشدا، کە لێپرسراوی مەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی بووم، ئەو یەکێک بوو لە تێکۆشەرە نزیکەکانم، کە ئەو کاتە لێپرسراوی کۆمیتەی (گەرەکی خەبات) بوو، بۆیە هەم بە برایەتیماندا و هەم لە توانا و کوردییەکەی و هوشیارییەکەیمدا

رائەبینی، بۆیە پەنام بۆ برد، تا لە ئەرکی تایپ کردن و سەرلەنوێ دارشتنەوەی فۆرمی ئەم کتێبەدا هاوکاریم بکات، خوا هەڵناگرێ ئەو هاوڕێ خۆشەویستە زۆر مەردانە هات بەدەنگمەوە! کە پێم وایە هەر لە دڵسۆزی و تێکۆشەرێکی وەکو ئەو دەوەشێتەوە، کە دوو مانگ و نیوی رەبەق رەنج و بەهرە و سەلیقەی خۆی بخاتە گەڕ، تا لە کۆتاییدا ئەم کتێبە بەم شێوە جوانە ئامادە بکرێ! منیش بەو ئەرکە زۆرە قەرزاربارى بووم بۆیە پڕ بە دڵ سوپاسی دەکەم و هیوادارم وێنەی زۆر بێت!

بۆ نووسینی پیشەکیی ئەم کتێبە زۆر ناو و کەسایەتیی کورد بە بیرمدا دەهات، کە پیشەکییی کتێبەکەم بۆ بنووسێت . لە ناو هەموویاندا داوام رووی کردە برای بەڕێز (دکتۆر عیززەدین مستەفا رەسول). ئەو زاتە کەسایەتییەکی ناسراو و گەورەی بواری رووناکبیری و ئەدەب و سیاسەتە : پرۆفیسۆر و مامۆستایەکی دێرینی زمان و ئەدەبی کوردییە، ئەندامێکی کارای یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆڕی زانیاریی کورد بووە، کوڕی مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسوڵە، کە یەکەمین کەس بووە لە رۆژگاری شێخ مەحمودی نەمردا، ئاڵای کوردستانی هەڵ کردووە. ئەوەشی کە لە رووی مێژووییەوە پەیوەندی لەگەڵ مەرام و ئاراستەی کتێبەکەمدا هەیە، ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی کە مامۆستا دۆستێکی دێرینی هەڤاڵ مام جەلال و هاوڕێ و خۆشەویستی خۆشمە و لە نزیکەوە دەزانم، کە چەندە ئاگاداری مێژووی کورد و کوردستان و جووڵانەوەی سیاسی عێراقە، هاوکات زۆریشم لە لا گرنگ بوو تێکۆشەرێکی ئەندامی حیزبی شیوعی عێراقی ناسراو خاوەنی رەخنەو دڵ برینداری رووداوە ناخۆشەکانی قرناقەو و پشت ئاشانی کارەساتەکانی شەڕی

ناوخـۆ، کتێبەکـەم بخوێنیتـەوە بـەر لـە بڵاوبونـەوەی و پیشـەکییی بـۆ بنووسـێت! چونکـە بەلامـەوە هەمـوو ئـەو هۆیانـەی کـە باسـم کـردن، نرخیکـی تایبەتـی بـەو پیشـەکییە دەدات!

جێی خۆیەتی کە لێرەدا سوپاسێکی زۆری هاوڕێ و مامۆستام بکەم بـۆ خـۆ ماندووکردنەکـەی و هیـوادارم بـە سـەلامەتی و خێـر و فـەڕی بـەردەوام تەمەنـی درێـژ بێـت!

**فەرەیدون عەبدولقادر**

**سلێمانی**

**٢٠١٧/١/٢٤**

## (کۆمەڵە) و بیرەوەریەکانم..!

کورد .. وەک گەلێکی پارچە پارچەکراو و ماف زەوتکراو!

کوردستان، زۆر جار سەرزەمینی پەلاماردان و داگیرکاریی بێگانە بووە، قوربانیی ململانێی هێزە زەبەلاحەکانی ناوچەکە بووە، لە دەوڵەتی (ماد)ە تا ئەمڕۆ، کورد هەرگیز دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەخۆیەوە نەدیوە. سەرهەڵدان و پەرەسەندن و خورتبونی هێزەکان و ئیمپراتۆریەتەکانی ناوچەکە، کوردستان و دانیشتوانەکانی کەرت و پەرت کردووە و دووچاری ژێر دەستەیی و چەوسانەوەی کردوون. بەڵام شوێنەوارە نەرێنییەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی لە هەموو کاتەکانی پێشتر، زۆرتر پارچە پارچە و ژێر دەستەی کردوون. بەمەش ژیان و گوزەرانی سەختتر و زەحمەتتر کردوون. هەر لە سەردەمی فراوانخوازیی عوسمانییەکانەوە، کە وەک دەوڵەتێکی سوننە مەزهەبی ئیسلامی لە ساڵی ١٢٩٩ وە دەرکەووتوە، دواتریش پەیدابوون و بەهێز بوونی دەوڵەتی شیعە مەزهەبی سەفەوی لە ساڵی ١٥٠١ دا، ئەوا لە

ئەنجامی پەرەسەندنی ململانێکانی ئەم دوو ئیمپراتۆرییەتە گەورەیە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کوردستانیش بووەتە مەڵبەندێکی خوێناویی ئەو دوو هێزە. بەمەش لە زۆرانبازی و شەڕ و کوشتاری نێوانیاندا، هەرجارەی بە بیانوویەک و پاش هەر لەشکر کێشییەک، ناوچەیەکی کوردستان، تورک نشین یا فارس نشین کراوە و کوردانی ناوچاکەش دەربەدەری ناوچەکانی تر بوون!

لە سەدەی شازدەهەمدا و لە یەکەمین جەنگی گەورەی (چاڵدێران-١٥١٤)، کە لە نێوان ئەو دوو زلهێزە ئیسلامییەدا ڕوویدا، لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا، کوردستان وەک سەر زەمینێکی پتر لە ٤٨٥ هەزار کیلۆمەتری دوجا و کورد وەک نەتەوەیەکی ڕەسەن و دێرینی ناوچەکە، دووچاری دابەشکردنێکی نوێ بوەوە! بەمەش بەشێکی بەر ئیمپراتۆریەتی سەفەوی و بەشە گەورەکەشی بەر دەوڵەتی عوسمانی کەوت!

ئیتر ململانێ و شەڕەکانی عوسمانی و سەفەوی تادەهات زۆرتر پەرەیان دەسەند و زیاتر درێژەیان دەکێشا. لە ساڵی ١٥٣٥ دا لە پەلاماردانەکەی سولتان (سلێمانی قانونی) بە سەرکردایەتیی (ئیبراهیم پاشا) بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی، بەشێکی زۆری کوردەکان لەتاو چەوسانەوەی زۆر و زوڵمی فراوانی سەفەوییەکان، میر و سەرۆکە کوردەکان هاوکاریی هێزەکانی سوڵتانی عوسمانیان کرد، بە هیوای ئەوەی، کە لە چنگی سەفەوییەکان دەربازییان بێت. بەڵام پاش ئەوەی سوڵتانی عوسمانی هەموو ناوچەکانی وان و ئەریوان و شارۆچکەکانی دەوروبەری شاری تەورێزی داگیرکرد، کوردەکانی ئەو دەڤەرە لەباتی ئەوەی لە زوڵمی سەفەوییە شیعە مەزهەبەکان ڕزگاریان بێت، کەچی ڕووبەڕووی کۆچ کردن و چەوسانەوەیەکی نوێتر بوونەوە، لەگەڵ تیاچوونی گیانی هەزاران کەسیان ماڵ و سامانیشیان تاڵان کرا.

ئیتر بەم جۆرە چەندین جار شار و ناوچەکانی تەوریز و ئازربایجان و ئەرزرۆم بوونە گۆڕەپانی جەنگ بۆ داگیرکردن و یاخود بۆ وەرگرتنەوەی سەرلەنوێی ناوچە داگیرکراوەکانیان، جارێ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی و جارێکی تر لەلایەن دەوڵەتی سەفەوییەوە. ناوچەکانی لای کرماشانیش بەهەمان شێوە شەڕە خوێناوییەکانی لای ماهی دەشتی کرماشان لە سالی ١٦٣٠دا و پاش فراوانبونی پەلاماردانەکانی عوسمانییەکان روو لە هەمەدان، هێندەی تر تیرە و هۆزە کوردەکانی ئاوارە و دەربەدەر کرد! بەمەش دابەشکردنی کوردستان بۆ دوو پارچە، بەشێکی بۆ دەوڵەتی سەفەوی و بەشە گەورەکەشی بۆ دەوڵەتی عوسمانی تا دەهات قووڵتر دەبوو!

ئەوی مایەی داخە ئەوەیە، کە کوردانی هەردوو بەشەکەش بۆ خۆیان لە ژێر چەپۆکی داگیرکەراندا هیچیان یەک پارچە و یەکگرتوو نەبوون! بەڵکو نزیکەی ٤٦ میرنشینی پڕ لە ناکۆکیی بوون و زۆریان چاویان لە خاک و دەسەڵاتی یەکتر بوو، دوژمنانی داگیرکەریش بە دەسەڵاتتر بوون و هەمیشە دەیانکردن بەگژی یەکتریدا و بۆ سوودو مەرامی خۆیان و بو توونـد کردنی بەندی چەوسانەوە، بەردەوام ئاگری ناکۆکییەکانی نێوانیانی خۆش دەکرد!

بەڵام ئەوە مانای ئەوە نەبوو، کە کورد لە ژێر باری زوڵم و وەیشومە و نەهامەتیدا لە بیری دەرباز بوون لە ژێردەستەییدا نەبووبن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەدرێژایی ماوەی داگیرکراوی و ژێردەستی، کورد و میرەکانی لە بیرو تەقەلای رزگاریدا بوون، بۆ ئەمەش چەندین راپەڕین و شۆڕشیان بەرپا کردووە تابتوانن بەو ئامانجە بگەن. هەر لە (ئەوڕەحمان پاشای بابان)ەوە لە سالی ١٨٠٦ و (بلباس) ١٨١٨ و (میر محەمەدی رەواندز) ١٨٢٦ و (میر بەدرخانی بۆتان) ١٨٤٢ - ١٨٤٣ و

راپەڕینی (یەزدان شێر) لە ساڵەکانی ١٨٥٢- ١٨٥٥ و شۆڕشەکانی (شێخ عوبێدوڵای نەهری) ١٨٨٠ – ١٨٨٢ و هەکاری ساڵی ١٨٩٥ و شۆڕشی (بەدلیسی شێخ سەلیم) و تەقەلا و راپەڕینی بنەماڵەی بەدرخانییەکان (میر عەبدل رەزاقی بەدرخان) و تەقەلا و کۆششی جەنەرال (ئیحسان نوری پاشا) ١٩١٩-١٩٢٠ و راپەڕینی دەرسیم ١٩٢٧- ١٩٣٧ و راپەڕینی (شێخ سەعیدی پیران) ١٩٢٥ و شۆڕشی (ئاگریداخ) ١٩٢٧- ١٩٣١ (قەدەم خێر) و (جافر سوڵتانی هەورامان) و (سمایل خانی سمکۆ) و راپەڕینی (حەمەرەشید خان) تا کۆماری کوردستان و پێشەوا (قازی محەمەد) ١٩٤٦ – ١٩٤٧ و دواتریش راپەڕین و شۆڕشەکانی (شێخ عەبدول سەلامی بارزان) ١٩١١ - ١٩١٢ و (شێخ سەعیدی بەرزنجی) و راپەڕین و شۆڕشەکانی (شێخ مەحمود) ١٩١٩-١٩٣١ و راپەڕینی (ئیبراهیم خانی دەلۆ) ١٩٢٠ و راپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی ١٩٣٠ و راپەڕین و شۆڕشەکانی تری (بارزان ) لە ساڵی ١٩٣١ وە تا شۆڕشی کوردستانی باشوور بە رابەریی (مستەفا بارزانی) ١٩٦١ – ١٩٧٥، کە لە هەموو شۆڕشەکانی تر گشتگیرتر بوو، بەشی هەرە زۆری خەڵکی کوردستانی لە دەوری خەبات و دروشمەکانی خۆی کۆکردەوە و توانیی حکومەتی عێراق ناچار بکات، کە مافی نەتەوایەتیی کورد بسەلمێنێ ( گەرچی لەدواییدا بە پیلانێکی نێودەوڵەتی دووچاری شکست هات). دواتریش لە سەردەمی شۆڕشی نوێ لە کوردستانی باشوور و بووژاندنەوە و راپەڕین و شۆڕش لە کوردستانی رۆژهەڵات، کە دوابەدوای شۆڕشی گەلانی ئێران سەریهەڵدا، ئەوا شۆڕشی کورد لە کوردستانی باکوور، کە قوربانییەکانیان سەدان هەزار تێکۆشەری کوردستان بووە تا ئەمڕۆ درێژەی هەیە و لە خەبات بەردەوامە!

بەر لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان لە کوردستانی باشوور لەساڵی

١٩٧٦، کـە (کۆمەڵـەی ڕەنجدەرانـی کوردسـتان) ڕۆڵـی کاریگـەری لـە هەڵگیرسـان و سـەرکردایەتیکردنیدا هەبـووە و توانـی قۆناخێکـی بـاش لـە شۆڕشـی ڕزگاریـی نیشـتیمانی ببڕێـت و بـە دابینکردنـی شـێوەیەکی نـوێ لـە بەدەسـتهێنانی مافەکانمـان، کـە سیسـتمی فیدراڵیـە بـگات، کـورد بەردەوام لـە خەبـات و تێکۆشـاندا بـووە! ئێسـتاش کـە چاوێـک بـە مێـژووی بزووتنـەوەی ڕزگاریخوازانـەی گەلەکەمانـدا دەخشـێنین، ئـەوا دەتوانیـن بڵێیـن.. سـەرباری خەبـات و تێکۆشـان و قوربانییەکـی زۆر، کەچـی ئـەو شـۆڕش و ڕاپەڕینانـە، بەر لەشۆڕشـی ئـەم جارەی باشـووری کوردسـتان جگـە لـە هەنـدێ دەسـکەوتی کـەم و کاتـی و دۆکۆمێنتـی مێژوویـی، نەیانتوانیـوە بـە سـەرکەوتن و ئەنجامێکـی دڵ خۆشـکەر بگـەن! بەڵکـو زۆربەیـان بـە کوشـتن و لـە سـێدارەدانی سـەرکردەکانیان و بـە تۆڵـە کردنەوەیەکی دڕندانـە لـە ڕۆڵەکانـی گەلەکەمـان کۆتاییـان هاتـووە! بۆیـە زۆربـەی ئـەو شـۆڕش و ڕاپەڕینانـە دوژمنانـی کوردیـان دڕندانەتـر هانـدا بـۆ پلاندارشـتن بـۆ گۆڕینـی واقیعـی نەتەوەیـی کوردسـتان و دەسـتکردن بـە شـاڵاوی سـووتاندن و خاپوور کردنـی گونـد و ناوچەکانـی کوردسـتان، ڕاگواسـتنی دانیشـتووانی و ڕاگواسـتنی تیـرە و هۆزەکانـی بـۆ دەرەوەی کوردستان و بە تورک کردن و بە عەرەب کردن یاخود بە فارسی کردنی ئـەو ناوچانـە و هەنـدێ جاریـش دروسـتکردنی پشـتێنی ئەمنـی بـە هێنانـی تیـرە و هۆزەکانـی ئـەو نەتـەوە سەردەسـتانەی کـە گەلەکەمانیـان داگیـر و دابـەش کـردووە، کاریگەرییەکـی نەرێـی لەسـەر خـاک و دیموگرافیـای دانیشتوانی کوردسـتان هەبـووە. بۆیـە ئەگـەر بڕوانینـە هەلومـەرج و ژیان و گوزەران و مـاف و وەزعـی کورد و تاکەکانـی لـە ژێـر سـایەی ئـەو نەتـەوە سەردەسـتانە و دەسـەڵاتەکانیان بـە درێژایـی سـەردەمە جیاجیـاکان، بەڕوونـی دەبینیـن کۆمەڵانـی زەحمەتکێشـی کۆمەڵـی کـوردەواری لـەو

شوێنانە لە چ ژیان و گوزەرانێکی سەخت و خراپدا بوون و ژیاون و بۆ ئەوەش بەردەوام دەبوو:

• بەشێک لە بەری رەنجی خۆیان بدەن بە باج و خەراجی داگیرکەر بەهۆی میر و فەرمانڕەواکانیانەوە، بەمەش راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ ناچاربوون سەرانە و باج بە داگیرکەر بدەن و بارگرانی لەسەر ژیان و گوزەرانیان پەیدا بێت!

• لەکاتی جەنگ و شەڕ و شۆڕی دەسەڵاتی داگیرکەراندا، کوردەکان ناچار بوون رۆلەکانیان بە سەرباز و جەنگاوەر بدەن بە لەشکر و سوپای داگیرکەر و رۆڵەکانیان بکەنە قۆچی قوربانی بۆ مەرام و بەرژەوەندی داگیرکەران!

•لە کاتی شکستی داگیر کەراکانیشدا، دەبوو ئەمان باجی بەشێکی ئەو شکستە بدەن و ژن و ماڵ و منداڵ و ئاژەڵ و سەروەت و سامانیان و خاکیان بکەوێتە بەر مەترسی چاوچنۆکی هێزی سەرکەوتوی جەنگەوە، بەوجۆرە لە پێناوی ئامانج و مەرامی دەسەڵاتی داگیرکەردا، هەمیشە رووبەڕوی راگواستن و چەندین شێوەی چەوسانەوە و نەهامەتی ژیان دەبوون!

• زۆربەی کات بە هاوولاتی نزم و پلە دوو تەماشا دەکران و پیاوە دیار و هەڵکەوتوەکانی کورد، لە لایەن دەسەڵاتی داگیرکەرەوە فەرق و جیاوازیان لەگەڵدا دەکرا و بەزەحمەت و بگرە بە دەگمەن لە پۆستە گرنگ و باڵاکانی فەرمانڕەواییدا، یا لە سەرۆکایەتیدا جێگەیان دەکرایەوە.

• میر و سەرانی کورد بە گومانەوە تەماشا دەکران و هەمیشە دەسەڵاتی داگیرکەر تەقەلای دەدا، ناکۆکیی لەنێوانیاندا پەیدا بکات و درزەکانی نێوانیان گەورە و کەلێنەکانیان فراوان و قەبە بکات و

بیانکات بە گژ یەکتریدا و شەڕ لە نێوانیاندا بەرپا بکات! بۆیە دوژمنان زۆر ترسیان لە هاوکاری و یەکگرتنی میر و سەردارانی کورد هەبووە و هەمیشە تەقەلای ئەوەیان دەدا، کە دووبەرەکی بخەنە ناویانەوە. مایەی داخیشە، کورد هەمیشە بۆ خۆی بە ساکاری کەوتۆتە تەڵە و داوەکانی پیلانی دوژمنانەوە!

بۆیە هەر کات فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی داگیرکەر لە میر و گەورە و سەردارێکی کورد کەوتبنە گومانەوە و ناکۆک بوونایە لەگەڵیاندا، بە چەندین ڕێگە و شێوە هەوڵی لاواز کردن و بنکۆڵکردنیان داوە و پیلانیان لێگێڕاوە، یاخود پەلاماریان داوە و کوشتوبڕ و وێرانکارییان لە ناوچەکانیاندا سازکردوە و کوردیان دووچاری ئازاردان و چەوسانەوە کردووە! ئەمانە و چەندین جۆری چەوسانەوەی تر، کە لە شەڕو پەلاماردانەکاندا ڕووبەڕووی گەلەکەمان دەبوونەوە، کوردەکانیان ناچار دەکرد بە گۆڕینی بیر و باوەڕی ئاینییان، کە هەندێ جار بە زۆر و بە زەبر و زەنگ کوردیان لە ئاینی خۆی وەرگێڕاوە! کاکەیی - ئەبێت پارسایی بووبێت - یا زەردەشتی بووبێ، بەزۆر گۆڕیویانە، واتە گەر موسڵمانی سوننە مەزهەب بووبێ بەزۆر کردوویانە بە شیعە، یا مەزهەبی شیعە و ئاینی زەردەشتیان پێ گۆڕیوە بە سوننە و لە ئایین و باوەڕی خۆیانیان کردوون!

دیارە ئەو هەموو چەوساندنەوە و زوڵم و زۆرە کاردانەوەی خۆیان هەبووە. بۆیە کورد و میر و سەرانی کوردیش ناچار بوون بیر بکەنەوە سنوورێک بۆ ئەو بارە گرانە و شوێنەوارەکانی دابنێن و لە ئاستێکی دیاریکراودا لەوە زیاتریان پێ قبوڵ نەکرێت و بجووڵێن و نارەزایی نیشاندەن و کار بکەیەننە راپەڕین و بەرپاکردنی جووڵانەوەی چەکداری و سیاسی و شۆڕش، بەمەش چاو ببڕنە ئامانجە دوور و

نزیکەکانیـان، کـە خـۆی  لـە رزگاری و ئازادیـدا بینیوەتـەوە. ئیتـر بـەم جـۆرە ئـەو هۆیانـە و چەندیـن هـۆکاری تـر لەتـەک سـەرهەڵدان و بـە هێزبونـی جوولانـەوەی نەتەوایەتیـی گەلانـی دەوروبـەر و رزگار بونیـان و پاشـان گۆڕانکارییـە گرنگەکانـی ناوچەکـە و جیهـان، هاوشـان لەگـەڵ پەرەسـەندن و گەشـەکردنی خوێندەواری و رووناکبیریی، کە لـە هـۆکارە سـەرەکییەکانی ئـەو هەمـوو راپەڕیـن و شۆڕشـانەی بـوون، ئـەوا گەلـی کـورد بـە درێژایـی مێـژوو بـە هیـوای دەربـاز بـوون لـە چەوسـانەوە و زۆرداری و رزگار بـوون لـە ژیـان و گوزەرانـی سـەخت و کارەسـات و وەیشـوومەکانی ژیـان، شـۆڕش و بەرخودانـی ئەنجامـداوە! ئەوانـەش هەمـوو ناوەڕۆکـی ئـەو راپەڕین و شۆڕشـانە دیاری دەکـەن، کـە کـورد و جوولانەوەکـەی ناوەڕۆکێکی دیموکراسییانە و پێشکەوتن خوازانـەی هەیـە و بەجوولانەوەیەکی رزگاری نیشتمانی و دیموکراتـی رەنـگ دەڕێژن و بـە بەشـێک  لـە ڕیزی جوولانـەوە پێشکەوتن خـوازە شۆڕشگێڕەکانی جیهانـی دادەنێن. با میر و شێخ و پیاوی ئاینیش سـەرکردایەتییانی کردبێت! بۆیـە هـەر کـەس جڵـەوی سـەرکردایەتیی ئـەو راپەڕین و شۆڕشـانەی کردبێت، ئـەوا هیـچ لـەوە ناگـۆڕێت، کـە ناوەڕۆکەکەیـان بریتـی بـووە لـە:

• مەسـەلەی ژیـان و گوزەرانـی کۆمەڵـی کـوردەواری، بـۆ ئاسـتێکی باشـتری ژیـان و پێویسـتییەکانی چینـە بەرهەمهێنـە زەحمەتکێشـەکانی کـورد، کـە زۆربەیـان لـە لادێ و لەسـەر زەویـی کشـتوکاڵی و ئاژەڵـداری ژیـاون، ئـەوەش لەئەنجامـدا خـۆی دەبەسـتێتەوە بـە (کێشـەی زەوی)و بـە مەسـەلەی سەربەسـتی نەتەوایەتـی و ئازادییەکانـی تاکـی کـوردەوە، تاچیتـر بـە زۆر و بـە زەبـرو زەنـگ باوەڕەکانـی خـۆی پـێ نەگـۆڕن و هـاوکات بـێ گوێدانـە راو بیـر و قەناعەتیـان، سـەردار و فەرمانـدە و فەرمانڕەوایـان بـۆ دیـاری نەکـەن و بەسـەریاندا نەسـەپێنن و بـە زۆر

لە شوێنی کار و لە زەوی و خاکی باو و باپیرانیان دەریان نەپەڕێنن و رایان نەگوێزن! هەروەها بە چاوی سووک و بە هاوولاتیی پلە دوو تەماشانەکرێن و لەگەڵ خەڵک و تاکی نەتەوەی سەردەست جیاوازییان لەگەڵدا نەکرێت!

• جوولانەوەی رزگاریی کوردستان، مەسەلەی نەتەوایەتی و رزگاریی نیشتیمانە، ئەمەش لەدوا شیکردنەوەیدا، رزگاریی کورد و کوردستان و رزگاریی نەتەوە و خاکی کوردستانە!

راستە کوردستان و کۆمەڵی کوردەواری پاشکەوتوو بووە و شاری گەورە و پیشەسازی بەوجۆرە گەشەی تیا نەکردوە، تا چینی بۆرژوازی نیشتمانی تیایدا لە شێوەی ولاتانی پیشەسازی ئەوروپا پەرە بسێنێ و گەشە بکات و بەشێوەی سروشتی لە قۆناخی فیۆدالییەوە بۆ قۆناخی سەرمایەداری هەنگاو بنێت. ئەمەش مانای وایە کۆمەڵی کوردەواری و کوردستان هەرگیز وەک ئەو ولاتانە گەشەی نەکردووە و بەشێوەیەکی سروشتی و ئاسایی بە قوناخەکانی خۆیدا نە خەملیوە و نە کامل بووە و نە تێپەڕیوە و تەنانەت کوردستان وەک ئەو کۆمەڵ و ولاتانەش قۆناخ و سەردەم و چینی فیۆدالی بەخۆوە نەدیوە و بەو شێوەیەش نەپەڕیوەتەوە بۆ قۆناخی سەرمایەداری، تا ویست و داوا و گوتاری نەتەوەیی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتی بە ئاراستەی گەشەکردنی هۆشیاری نەتەوەیی گەشە بکات! بەلام هەر لە سەرەتاوە و لە ئەنجامی ئەو هەموو جۆرە لە ستەم و چەوساندنەوە، ئەوا وردە وردە هەستی نەتەوایەتی لە کۆمەڵی کوردەواریدا سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە! بەمەش ئامانجەکانی راپەڕین و شۆڕشەکانی کورد و ناوەڕۆکی جوولانەوەکەی، هەمیشە دەرباز بوون بووە لە زوڵم و چەوسانەوەی نەتەوایەتی و کۆمەلایەتی و هاوکات ویستی تاکی کورد

بووە بۆ ئازادی و رزگاری! کرۆکی ئەم مەسەلەیەش خۆی لە رزگاری مرۆڤی کوردا دەبینێتەوە بۆ فەرمانڕەوایی کردنی دەسەڵاتی سیاسی خۆی لەلایەن خۆیەوە. دیارە ئەمانەش هەموو ناوەڕۆکی جووڵانەوەی کورد دەکات، بە ناوەڕۆکێکی دیموکراتی و پێشکەوتنخواز، گەرچی سەرکرایەتییەکەشی شێخی ئاینی و میر و خێڵەکیش بووبن!

راستە زۆرجار و زۆر لە سەرکردە کوردەکان نەیانتوانیوە وەک گەلانی دیکەی ناوچەکە داوای مافی سەربەخۆیی و وڵاتی سەربەخۆی خۆیان بکەن! بەڵکو زۆرجار داخوازی و دروشمەکانیان روویکردۆتە دامەزراندنی کیانێک لە سایەی دەوڵەتێکی گەورە و داگیرکەرێکی بەهێزدا. دیارە ئەمەش بە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ پاشکەوتن و نەبوونی هوشیاری نەتەوەیی، یاخود لاوازی دەرکی ئەو سەرکردە و رێبەرانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. بەڵکو بەشی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ باری سەختی جیۆپولیتیکی کوردستان و دابەش بوونی بەسەر هێز و دەوڵەتانی گەورەی ناوچەکە و هاوکات گوێ نەگرتنی زلهێزەکانی جیهان لە داوا و مافە رەواکانی کورد. وەک ئەوەی، کە چۆن دیمان لەدوای یەکەمین جەنگی جیهان، بەریتانیا و نوێنەرە سیاسییەکانی بەهۆی چاو تێبڕینیان لە نەوتی ناوچەکە، کە تازە دۆزرابوویەوە، چۆن چاو و گوێی خۆیان لە ئاستی داواکانی کوردا داخستبوو! (ئەرنۆلد ویلسون)ی بەریتانی بە راشکاوی دەیگوت.. دەبوو ئێمە ئاوڕدانەوە لە کوردەکانی دەرەوەی ویلایەتی موصڵ نادیدە بگرین و تەنها بیر لە ویلایەتی موصڵ بکەینەوە!

سەرەڕای هەموو ئەوانەش، ئەوا دەتوانین بڵێین ناوەڕۆکی جووڵانەوەی کورد، جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی رەواو پیشکەوتوو بووە و هەمیشە روو لە پێشخستنی کۆمەڵی کوردەواری بووە! هەرچەندە کورد لەگەڵ

ئەو هەموو کۆڵنەدان و نەبەزین و گیانبازییەی رۆڵەکانیدا، هێشتا هەر بە سەرکەوتنی گرنگ نەگەیشتوە و خواستەکانی مرۆڤی کورد لە ئازادی و رزگاری یەکجارەکیدا وەدی نەهاتووە! دیارە ئەمەش لە خۆڕا و بێ هۆ نەبووە ، واتە هەر لەخۆوە نەبووە، کە ئەو هەمووە شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کورد بە سەرکەوتن نەگەیشتوون و ئامانجەکانیان نەهاتوونەتە دی و بە ناکامی و بە کارەساتی ناخۆش و خوێناوی کۆتاییان هاتووە! هەرچەندە هەندێ لەو هۆیە سەرەکییانە هۆکاری بابەتین و لە دەستی کورد خۆیدا نەبوون و هەلومەرجی جیهانی و ناوچەیی فەرزی کردووە بە سەریدا، یاخود نالەباری و هەڵکەوتەی جیۆسیاسی و جیۆپۆلەتیکی کوردستان بوون، کە بوونەتە هۆی ناکامی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان، ئێمە لێرەدا بە چەند خاڵێک ئاماژە بە هۆکارە بابەتی و خۆییەکان دەدەین .

## هۆکاره بابەتیەکان!

• سـەختیی شـوێن و بـاری جوگرافیـی کوردسـتان و شۆڕشـەکانی، کـە گەمـارۆ دراوه لەلایـەن داگیرکەرانـی کوردسـتانەوه، لـە هـۆکاره نەرێیەکانـی ئـەو شکسـتانەن!

• لـە رووی جوگرافییـەوه بێبـەش بوونی خاکی کوردسـتان لە دەروازەیەکی دەریایـی، تـا بەئاسـانی دەسـتی بگاتـە دۆسـتەکانی و دەنگـی بگاتـە ناوەندەکانـی جیهـان، بـۆ ئـەوەی لـە کات و سـاتی پێویسـتدا هـاوکاری بکـەن و بەتەنگیـەوه بێـن!

• کاریگەریـی نێگەتیڤـی دەوڵەتانـی زلهێـز لـە ململانێـی هاوسـەنگی هێـزدا لـە جیهـان و ناوچەکـەدا، کـە لـە ئەنجامـی تێکپرژانـی بەرژەوەندییەکانیـان لـە گەلێـک زەمـان و زەمینـدا، بـە قازانجـی داگیرکـەران و بـە زیانـی جوولانـەوەی رزگاریخـوازی کـورد شـکاوەتەوە! بـۆ نموونـە دۆزینـەوەی نەوتـی کەرکـووک لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانـی، هۆکارێکی کاریگـەر بـوو لـە چاوتێبڕینـی زلهێـزان بـۆ ئـەو سـامانە سروشـتییە! بـۆ ئەمـەش

بەریتانییەکان تەقەلای زۆریان دا تا بەزۆر کوردستانی باشووریان لکان بە عێراقی پاش جەنگەوە! بۆیە پشتوانییان لە بەغدا و لە حکوومەتی ناوەندیی عێراق کردو و سەرجەم ئەو پەیماننامە و ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییانەی، کە بە قازانجی دۆزی کورد بڕیاریان لەسەر درابوو، کردە قوربانی نەوت و داهاتی نەوت لە کێشەی (ویلایەتی موصل)دا! بگرە بەوەشەوە نەوەستان و سەرباری پێشێلکردنی مافە ڕەواکانی گەلەکەمان، پەلاماری کوردستانیان دا و بەهێزی ئاسمانی بۆردومانی لیوای سلێمانیان کرد!

• بوونی بەرژەوەندیی سیاسی و ئابووری زۆرێک لە دەوڵەتان لە ٢٢ وڵاتی عەرەبیدا و نەبوونی بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ دۆزی کورد و ئامانجەکانی کورد لە رزگار بوون و سەربەخۆییدا، لە هۆکارە کاریگەرەکانی هێشتنەوەی کورد بوو بە نەتەوەیەکی چەوساوە و داگیرکرا و لە هەر چوار پارچەکەی کوردستاندا!

• دواکەوتویی نەتەوەی سەردەست و وڵاتانی نەیار و داگیرکەری کوردستان لە رووی سیاسی و ئابووری و رووناکبیری و کۆمەڵایەتییەوە، کوردیان ژێردەستەی هەر سێ نەتەوەی (تورک و عەرەب و فارس) کردووە! بۆیە ئەگەر ئەو نەتەوە داگیرکەرانەی کوردستان، لە رووی کلتووری دیموکراسی و فەراهەمکردنی ئازادییەوە بەراورد بکرێن بە کلتووری دەوڵەتانی خۆرئاوا، ئەوا هەست بە پاشکەوتووییەکی کلتوریی گەورە دەکەین! چونکە داگیرکەرانی کورد و کوردستان بە چەندین چەمکی وەک مافی مرۆڤ و مافی چارەی خۆنووسین و سیستەمی دیموکراسی و بەها مرۆڤایەتییەکان نەک هەر نامۆن، بەڵکو بە ئاشکرا فەرامۆش و پێشێلیش دەکرێن! ئەمەش مانای وایە هەمیشە تێڕوانینی شۆڤێنییانە زاڵ بووە بەسەر رەفتار و سیستەمی فەرمانڕەواییاندا.

بۆیـه تێگەیشـتن لـه مافـی ڕەوای کـورد و سـەلماندنی ئـەو مافـه لـه ژێـر بـار و دۆخێکی ئـاوا دواکەوتـووی داگیرکەرانـدا، کارێکـی هـەروا ئاسـان نەبـووە!

• فاکتــەری ئایینــی و تێگەیشــتنی ئایینــی کارێکــی کــردووە بــڕوا بــەوە بهێنیـن، کـه سـنوور لـه ئاینـی ئیسـلامدا نییـه و جیابونـەوەی کـورد لـه عـەرەب، یـا کـورد لـه تـورک یاخـود جیابونـەوەی کـورد لـه فـارس- واتـه جیابونــەوەی کــورد و ڕزگار بوونــی لــه داگیرکەرانــی- لــه تێگەیشــتن و قەناعەتـی ئاینیـی دەسـەڵاتدارانی داگیرکەرانـی کوردسـتاندا جێگـەی نیهـی و کارێکـی پێچەوانەیـه، بـا سـنووریش لـه نێـوان ٢٢ دەوڵەتـی عەرەبـی ئیسـلامی و سـنوور لـه نێـوان هەمـوو وڵاتانـی جیهانـی ئیسلامیشـدا هەبـن، بـەڵام بـۆ کـورد ئـەو سـنووره بڤـه و حەرامـه! دیـاره هـەر لـەم سۆنگەیەشــەوه بــووه کــه ســەرکردەیەکی نــاوداری کــورد بەهــۆی کاریگـەری فاکتـەری ئاینییـەوه، ژیانـی خـۆی تەرخانکـرد بـۆ نەبـەرد و جەنگی پاراسـتنی دەوڵەتـی ئیسـلام، بێ ئـەوەی بـه بیریـدا بێـت کارێـک بـۆ سـەروەری نەتەوەکـەی خـۆی ئەنجـام بـدات!

## هۆکارە خۆییەکان !

• لەلایەکەوە پاشکەوتوویی کورد لە رووی سیاسی و رووناکبیری و کۆمەڵایەتییەوە و لەلایەکی دیکەوە ، کورد پێشووتر ناوەندی سیاسی یەکگرتوی نەبووە و بەمەش کلتووری دەوڵەتداری و حکومەت سازکردن و بەڕێوەبردنی لاواز بووە، لە هۆکارە نەرێیەکانی شکستی بزووتنەوەکانی کورد بوون! لە رووی ئابوریشەوە بەو حوکمەی، کە کۆمەڵی کوردەواری هەرچەندە کۆمەڵێکی کشتوکاڵی بووە، کەچی کشتوکاڵ بە ئەندازەیەک تیایدا گەشەی نەکردوە بگاتە ئاستی کومپانیا و سنعەتی خۆراکی و پیشەسازی، تا گەشەکردنی بۆرجوازی وەک چینێکی نوێ، کە تێگەیشتنی دروستی بۆ کێشە و مەسەلەی نەتەوایەتی هەبێت، بێتە سەر شانۆی سیاسەت و ئەرکەکانی خۆی بەجێ بهێنێت! هاوکات دواکەوتویی و دابەشبوونی کۆمەڵ بەسەر خێڵ و هۆز و تیرەی جیاجیادا، کارێکی کردووە کە تێگەیشتنی خێڵەکییانە زیاتر زاڵ بێت بەسەر تێڕوانینی نەتەوەیی و لۆژیکیدا !

• نەبوونی ستراتیجێکی دروست و یەکگرتوو بۆ قۆناغی رزگاریی نیشتمانی و نەبوونی تێگەیشتنێکی ورد و بەجێ لەسەر هێڵە گشتییەکانی ئەو ستراتیجە لە جووڵانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کوردا، زۆرێک لە بزووتنەوە و راپەرینەکانی بەلارێدا بردووە! بۆیە دەبینین زۆر لە راپەرین و شۆرشەکان بێ ستراتیجێکی روون بوون و نەخشە رێگەیەکی دروست و دیاریان نەخستۆتە بەرچاوی تێکۆشەر و جەماوەری گەلەکەیان، تا بە بەرنامەیەکی رێکوپێک، دۆست و دوژمن و هێزە کاریگەر و سەرەکییەکانی بزووتنەوەکە و هێزەکانی دی دیاری بکرێت، بۆ ئەوەی لەگرتنە بەری هەرجۆرێ لە هاوپەیمانیدا سەرکەوتن مسۆگەر بکرێت!

• نەبوونی سەرکردایەتیی بەتواناو کارا و بە ئەزموون. سەرکردایەتییەک، کە لەناو یەکدا رێک و تەبا و هاوبیر و یەک دڵ بن، سەرکردایەتییەکی گونجاو لەگەڵ سروشت و ناوەرۆکی جووڵانەوەی رزگاری نیشتمانیی کوردستان، کاریگەری نێگەتیفیان لەسەر دۆزی کورد بە درێژایی مێژوو جێهێشتووە! بۆیە دەبینین زۆربەی سەرکردایەتییەکانی راپەرین و شۆرشەکانی کورد، سەرەرای ئازایەتی و نەبەزییان، سەرەرای دڵسۆزی و گیانبازی زۆر و زەوەندیان، کەچی هێشتا نەیانتوانیوە لە کاریگەری ئەقلیەتی خێڵەکی بە دوور بن و نەیانتوانیوە لە هەموو گێژەنگەکاندا بەرچاو روون و مێشک کراوە بن و بزانن چۆن کارتەکان بەکار دەهێنن و هاوکات چۆن بە ئاسانیش کارتە سیاسییەکان بەفیرۆ نەدەن، تا بەمەش هەڵسەنگاندنی راست و دروست بۆ ئەگەرەکان بکەن و مەیل و ئارەزووە تاکی و شەخسییەکانی خۆیان تێکەڵ بەو هەڵسەنگاندنە زانستییە نەکەن! دیارە هەمیشە جەماوەری راپەریوی و شۆرشەکان، خەڵکی زەحمەتکیشی کوردستان بوون و

هـەر ئـەوان لەشـکر و سـووتەمەنی شـۆڕش بـوون، کەچـی خۆیـان و داخوازییەکانیـان بێڕەنـگ و بـۆ کـراوە و خواسـت و ئارەزوییـان لـە بیـرو بەرنامـەی سـەرکردایەتییەکەدا ڕەنگـی نەداوەتـەوە! ئەمـەش کەلێنێکـی گـەورەی خسـتۆتە نێـوان هێـزی سـەرەکی شـۆڕش و پێکهاتـە و عەقڵـی سـەرکردایەتییەکەیدا. نایشـارینەوە ئاسـتی گەشـەکردنی بارودۆخـی (سیاسـی، ئابـووری، کۆمەڵایەتـی و ڕووناکبیـری)ی کۆمەڵـی کوردسـتان، کاریگەریـی گـەورەی بەسـەر ئـەو دیاردەیـەوە هەبـووە! کـورد واتەنـی (لـەو قـوڕە هـەر ئـەو تـۆزە هەڵدەسـتێ)!

• وەلانـان و تێنەگەیشـتنی قـووڵ لـەو ڕاسـتییەی، کە سروشـت و پێکهاتـەی مەسـەلەی ڕزگاریـی نیشـتیمانی کوردسـتان، یـەک مەسـەلەیە و چەنـد مەسـەلەیەک نییە و ناکرێ و ناشـێ پارچـە پارچـە بکرێ و وەک پارچـەی جیاجیـا تەماشـا بکرێت و نەخشـەی بـۆ دابڕێژرێت، لـەو مەسـەلە سیاسـی و فیکرییـە گرنگانەیـە ، کـە تـا ئەمڕۆش نوخبـەی سیاسـیی کـورد گفتوگـۆی لەسـەر دەکـەن و یـەک تێڕوانینـی یەکگرتوویـان بـۆی نییـە! بۆیە لـە زۆربەی سـەردەمە جیاجیاکانـدا بـە کاریگەریـی ئـەو تێگەیشـتنە هەڵەیـە، زۆر جـار هێـزە کوردییـەکان ناکۆکیی و ململانێکانـی نـاو خۆیـان بە جۆرێکـی وا خراپ ئاراسـتە کـردووە، لـە جیاتـی سـوود وەرگرتـن لـە قووڵایـی سـتراتیجیی خاکـی یەکتـر و لـە هێـزو توانـای یەکتـر، کەچـی بەربوونەتـە گیانـی یەکتـر و دەرفەتەکانیـان لەدەسـتداوە. لـە ئەنجامـدا ئـەوەی دوژمـن ئـارەزووی کـردووە، ڕێـک ئەوەیـان بـە یەکتـرو بـە جووڵانـەوەی کـورد کـردووە!

• ڕاسـتە کـە هەڵکەوتـەی جیۆسیاسـیی کوردسـتان سـەخت بـووە و هەمیشـە لـە نێـوان گەمـارۆی داگیرکەرانـدا لـە مەنگەنـە دراوە، بـەڵام کـە هەلیشـی بـۆ ڕەخسـاوە، نەیتوانیـوە سـوود لـە ناکۆکیی نێوان دوژمنەکانی وەربگرێـت و بەهرەمەنـد بێـت لـە یارمەتیـی یەکێـک لـەو دەوڵەتـە دوژمنانـە

و هاوكات لە قووڵایی كێشەكانی نێوانیان تێبگات و كاری لە سەر بكات! بەڵكو خۆی بەجۆرێ ناچار كردووە، كە ئەو پشتیوانییە كاتیی و یارمەتییەی كە دەیدرێتێ، بە و مەرجە وەرگرێت، كە لەدژی جووڵانەوە و تێكۆشەرەكانی ئەو پارچەیە بوەستێت كە دەوڵەتە داگیركەرەكە داوای لێكردوە !ئەمەش دواجار ناسنامە و هەڵوێستی ئەو حزبەی خستۆتە ژێر پرسیار و لەكەداریشی كردووە! وەك ئەوەی بەرامبەر یارمەتیدانی ئێران لە دژی تێكوشەرەكانی كوردستانی رۆژهەلات، كە لە سالانی رابردوودا دیمان!

• ناكۆكیی بێجێ و ناتەبایی و نەگونجانی سەركردە و پێكهاتەكانی كورد و جووڵانەوەكەی ، لە یەكتر قبووڵ نەكردن و رێز نەگرتن لە بۆچوون و بیروڕای جیاواز و تێكۆشان و خەباتی یەكتر، هاوكات نادیدە گرتنی توانـاو لێهاتویی و نەسەلماندنی مافەكانی یەكتر، لەو دیاردە ناشیرین و دزێوانە بووە، كە بەدرێژایی مێژوو لەناو جووڵانەوەی كورد و لەناو سەركردایەتییەكەیدا بۆتە دیاردەیەكی دیارو باو! دواجار ئەم دیاردەیەش بۆتە هۆی پەكخستنی هەر جووڵەو هەنگاوێ، كە ئاراستەیەكی بەسوودی بۆ جووڵانەوەكە هەبوبێت و تەنانەت هەندێ جار شەڕی ناوخۆشی لێكەوتۆتەوە ! بۆیە لە گەرمەی ناكۆكییەكانی باڵەكانی جووڵانەوەی چەكداری شۆڕشی كورد لە كوردستانی باشوور، ئێمە وەك كۆمەڵێك لە گەنجان و لاوانی خوێندەوار و خوێن گەرمی كورد، كە كوێرە خەتێكمان هەبوو، كەوتینە بیركردنەوە لە داهێنانێكی نوێ بۆ نەخشە رێگایەكی نوێ، بە بیرو بەرنامە و سەركردایەتییەكی نوێ و شێوەیەكی نوێی كاركردن و تێكۆشان! هاوكات بە جیهانبینییەكی نوێ و تایبەت، بە رێكخراو و پرەنسیپی نوێ، بە پەیوەندیی ناوخۆی تێكۆشانی هاوچەرخ. لەوانەش زیاتر بە زات و گوڕ و تین و تاوێكی

بە هێزەوە، کەوتینە بیرکردنەوە لە کۆکردنەوە و رێکخستنی زۆرترین بەشی لاوە هوشیارەکانی کۆمەڵ لە کوردستانی باشووردا، ئەویش بیرکردنەوە بوو لە دامەزراندنی ( کۆمەڵە ی مارکسی - لینینی کوردستان) .

سەرەتا ئەو لاوانەی کە ماوەیەک بوو بیریان لە بابەت و باسەکانی کارێکی وا دەکردەوە، بە ژمارە کەم نەبوون! لە بەغدا و لە سلێمانی و هەولێر و بگرە لە هەموو شارەکانی تری کوردستان، کۆڕ و کۆمەڵی تایبەت بۆ گفتوگۆ و لێدوانیان لەمەڕ ئەو مەسەلەیە هەبوو. لەناو رێکخراوی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) دا و بەتایبەتیش لەناو رێکخستنەکانی زانکۆی بەغدا، زەمینەیەکی بەپیت و فەڕ لەلای لاوانی ئەو رێکخراوە بۆ ئەو جۆرە بیرو بۆچونە هەبوو! لە سلێمانیش گۆڤاری (رزگاری) کە (نەوشیروان مستەفا) سەرنووسەر و داینەمۆکەی و (شازاد سائب)، خاوەن ئیمتیازەکەی بوو، رۆڵێکی گرنگیان گێرا لە بڵاوکردنەوەی تیژ و باسەکانی بیری نوێ و لە کۆکردنەوەی لاوە نووسەرو خوێندەوارە لاوەکان. جگە لەو تێکۆشەرانەی، کە لە ریزی حیزبەکانی تردا بە هێڵی گشتی سیاسی و رێکخراوەیی حیزبەکانیان رازی نەبوون و بۆچوون و لێکدانەوەیان لەو بیرە نوێیە نزیک بوو! ئەم گفتوگۆ و باسانەش هەموو لە هەلومەرجێکی تایبەتی و لەباردا بوو، کە خۆی بۆ خۆی زەمینە سازییەکی باشی خوڵقاند بۆ گەشەپێدانی ئەو باسانە بە ئاراستەی دامەزراندنی رێکخراوێکی نوێ، کە ئەرکەکانی خەبات لە کوردستاندا و لەو قۆناخەدا بگرێتە ئەستۆ!

## هەلومەرجی ئەو کاتە!

لە کوردستانی باشووردا ناکۆکیی و ململانێیەکی خوێناوی لە ساڵی ١٩٦٤ وە رووی کردبووە (پارتی دیموکراتی کوردستان)، کە سەرکردایەتی شۆڕشی تیا دەکرد. (پارتی دیموکراتی کوردستان)، پاش تەقەلاکانی (پارتی شۆڕش)، لە ساڵی ١٩٤٤ و (پارتی رزگاری)، لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزرا، لە دۆخی شڵۆقی ئەو کاتەدا ، کە سەرهەڵدانی چەندین حیزب و رێکخراوی لێکەوتبویەوە، (مەلا مستەفای بارزان) و چەندین ئەفسەری (لیژنەی ئازادی) لەوانە (نوری ئەحمەدی تەها و میرحاج و عیزەت عەبدول عەزیز و خەیروڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی) هاندا، کە حیزبێکی سیاسی لە شێوەی ئەو حیزبەی کوردستانی ئێران، کە ناوی (حیزبی دیموکراتی کوردستان)ە پێکبهێنن!

گەرچی لە یەکەمین تەقەلاکانیدا و لە یەکەمین کۆنگرەدا، کە لە ١٦ اب ١٩٤٦ لە بەغدا بەسترا، (هەمزە عەبدولا) و نوێنەرانی حیزبی (شۆڕش و رزگاری) لە کارەکاندا بوون، بەلام (مەلا مستەفا) بە سەرۆک و

(شێخ لەتیفی شێخ مەحمود و کاکە زیاد)ی کۆیی بە جێگری یەکەم و دووەم و ( هەمزە عەبدوڵا) بە سکرتێری ئەو حیزبە هەڵبژێران و سەرکردایەتییەکەشی کە ١٥ ئەندام بوو، پێکهاتبوو لە (مستەفا خوشناو و عەلی عەبدوڵا و نوری شاوەیس). دوای ئەوە لە دووەمین کۆنگرەی (پارتی) لە بەهاری ساڵی ١٩٥١ دا، (ئیبراهیم ئەحمەد) بە سکرتێری (پارتی دیموکراتی کوردستان) هەلبژێرا. ئەوی دەبێ لێرەدا ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە، کە لەم کۆنگرەیەدا دوو بەرەی ناتەبا دەرکەوتن، یەکێکیان بە ڕێبەری (هەمزە عەبدوڵا) و دووەمیشیان (ئیبراهیم ئەحمەد) نمایندەی دەکرد، کە لە ئەنجامدا ئەو ناتەباییە بوو بە یەکەمین کەرتبوونی (پارتی دیموکراتی کوردستان)! (هەمزە عەبدوڵا) کەرتی خۆی ناونا (پارتی دیموکراتی پێشکەوتوی کوردستانی عێراق). لە کۆنگرەی سێهەمیشدا، کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٣ لە کەرکووک گیرا، پارتیی (مارکسیزم لینیزم)ی وەک ڕێ نیشاندەری خۆی دیاریکرد! لەم کۆنگرەیەدا، بەسەرۆکایەتی (مستەفا بارزانی)، کە لەو کاتەدا لە یەکێتیی سۆڤیەت بوو، (ئیبراهیم ئەحمەد) بە سکرتێر و هەر یەکە لە (جەلال تاڵەبانی و عومەر دەبابە و عەلی عەبدوڵا و نوری شاوەیس)، بە سەرکردایەتی (پارتی) هەڵبژێردران! (پارتی) بۆ دووەمین جار دووچاری دووبەرەکی بوەوە : لە ساڵی ١٩٥٨ دا لەنێوان بەرەی (هەمزە عەبدوڵا)، کە باڵی مارکسی (پارتی) بوو، (جەلال تاڵەبانی)ش، کە زۆربەی ئەندامانی کوردایەتیخوازیی کۆمیتەی ناوەندی پشتییوانییان لێدەکرد، هەرچی (ئیبراهیم ئەحمەد) یشە، گەرچی یاوەری گەڕانەوەی (مستەفا بارزانی) بوو بۆ بەغدا، بەلام بەدەم جۆرێ لە دوو دڵیەوە پشتیوانی لەلایەنی (تاڵەبانی) دەکرد! (بارزانی)ش لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩دا کارێکی وایکرد، کە (هەمزە عەبدوڵا)، بە سکرتێری (پارتی)

هەڵبژێرێت و جێگەی (ئیبراهیم ئەحمەد) بگرێتەوە! یەکەمین بڕیاری (هەمزە عەبدوڵا)ش لە کار خستن و سڕ کردنی (جەلال تاڵەبانی) بوو! لەدواییشدا جووت بوونی هەڵوێستی (پارتی) لەگەڵ (حزبی شیوعی عێراق) و گرتنەبەری چەندین هەڵەی گەورە لەمەڕ ڕووداوەکانی موصڵ و کەرکووک بە مەبەستی هاوکاری و پشتیوانیی (حزبی شیوعی)، (پارتی) یان تووشی هەڵەی مێژوویی کرد! تا (بارزانی) لەحوزەیرانی ١٩٥٩دا، بەدەنگی ١١ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (هەمزە)یَ لەکار لاداو (جەلال تاڵەبانی) گێڕایەوە، ئەمەش ڕێگای خۆشکرد بۆ بەستنی چوارەمین کۆنگرەی (پارتی)! کۆنگرەی چوارەمیش لە بەغداد و لە ئۆکتوبەری ساڵی ١٩٥٩، کە (بارزانی) خۆی تیایدا ئامادە بوو بە دەرکردنی (هەمزە عەبدوڵا) و هاوڕێکانی کۆتایی هات و ( ئیبراهیم ئەحمەد) یشی بە سکرتێری (پارتی) هەڵبژاردەوە!

هەرچی کۆنگرەی پێنجەمیشە، کە بە کۆنگرەی بێزاریی (بارزانی) لە (ئیبراهیم ئەحمەد) دەناسرێت. (بارزانی) هەوڵیدا کە (عەونی یوسف) بکاتە سکرتێری (پارتی) و لە شوێنی (ئیبراهیم ئەحمەد) دایبنێت!. بەڵام بۆی نەکرا لەو کونگرەیەدا جێگە بە (ئیبراهیم ئەحمەد) لێژ بکات، بەمەش (بارزانی) ویستی دەست لە سەرۆکایەتی (پارتی) هەڵگرێت، بەڵام بواریان پێنەدا و بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر ئەنجا توانرا بەر بەو کارە بگیرێت! ئەوی گرنگە لەو کۆنگرەیەدا توانرا بەتەواوی شوێنەواری کارتێکردنی (حیزبی شیوعی عێراق) لەسەر هەڵوێستەکانی (پارتی) بەتەواوی پاک بکرێتەوە !

(پارتی) بە سەرۆکایەتی (مستەفا بارزانی) لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ دا، لە گێژەنگی هەندێ ڕووداوی ئاڵۆزدا جڵەوی جموجوڵەکانی هەندێ لە هۆزەکانی کوردستانی عێراقی گرتە دەست، بۆ ئەمەش شانی

دایە بەر سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی کورد لە دژی حکومەتی عێراق، کە ئەوکاتە (عەبدولکەریم قاسم) سەرۆک وەزیرانی بوو! لە ئەنجامدا توانی سەرکردایەتیتیەکەی بەو شۆڕشە قایل بکات و ڕێبەری جووڵانەوەیەکی گەورە لە کوردستانی باشوور بکات و هەست و سۆزی زۆربەی جەماوەری گەلی کورد بەلای شۆڕشدا رابکێشێت! بەڵام زەمان و رۆژگار نە بە قازانجی بزووتنەوەی کورد و نە بە قازانجی (بارزانی) نەشکانەوە و کورد و جووڵانەوەکەی تووشی دوو کەرت بوونێکی تر بوونەوە و (پارتی) بوو بە دوو باڵی لە یەکتر جودا و لە یەکتر جیاواز! باڵی (بارزانی)، کە لەناو خەڵکیدا بە (مەلایی) و باڵی (ئیبراهیم ئەحمەد) بە (جەلالی) دەناسران، ئەو دوو تۆنە گەرمەی ناو تابلۆ خوێناوییەکەی کوردایەتی بوون! ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، هەر دوو باڵە جیاواز و ناتەباکەی (پارتی) خاوەنی سەرکردایەتیی ژیر و کارامە و بە ئەزمونیش بوون، کە ئەو نەهامەتی و دووبەرەکییەیان تووش بووە! لایەکیان (مستەفا بارزانی)، سەرکردایەتیی دەکرد، کە سەرکردەیەکی نەبەزی جووڵانەوەی کورد بووە و لە بنەماڵەیەک بوو، کە (شێخ عەبدول سەلامی بارزانی) تەمەنێکی زۆری خۆی بۆ بەرگری لە کورد و لە دژی چەوسانەوەی کورد تەرخان کردووە و ساڵانی ١٩١١ - ١٩١٢ لە دژی داگیرکەرانی کوردستان راپەڕیوە و خەباتی چەکداری کردووە! (شێخ ئەحمەد)ی برای (مستەفا بارزانی)یش، لە ساڵانی ١٩٣١ - ١٩٣٢ رۆڵێکی بەرچاوی گێڕاوە لە سەرکردایەتی کردنی بەرگری لە دژی رژێمی داگیرکەری عێراق و هێزە پشتیوانەکەی، کە خۆی لە هۆزی بارزاندا دەبینیەوە و هەمیشە بۆ پشتیوانی (بارزانی) لە سەنگەری خەبات و شۆڕشدا بوون! (بارزانی) خۆیشی لەو بنەماڵە شۆڕشگێڕە بوو، کە خاوەنی ئەزمونێکی باش بوون لە بەرگری و خەبات دژی

داگیرکەری کوردستان! جگە لەوەی لە قۆناغێکی خەباتدا، نەک هەر بە ئەرکی خۆی زانیوە کە بەوپەڕی تواناوە بەشداری لە پاراستنی کۆماری کوردستاندا، بکات! بەڵکو ئەو کاتەش کە کۆمار دەڕووخێت و سەرکردەکانی دەکەونە بەردەستی دوژمن و زیندانی دەکرێن و لە سێدارە دەدرێن، ئەوا (بارزانی) رازی نەبووە بە هیچ شێوەیەک خۆی بەدەستەوە بدات، یاخود بگەڕێتەوە بندەستی رژێمی عێراق! بەڵکو بە هەڵوێستێکی مەردانەوە روو لە غەریبی دەکات و تاراوگە هەڵدەبژێرێت! هەرچەندە (بارزانی)، دانیشتووی کوردستانی رۆژهەڵات نەبوو، تا وەک سەرکردەکانی تری (کۆماری مەهاباد) شارەزای هەموو ناوچەکان و رێگا و بانەکانی ناو ئێران بێت، هاوکات هیچ یەکێک لە خزم و تیرە و هۆزی لەوێ نەبوو، تا بەدەمیەوە بێن. بەڵام توانی بێ کۆڵدان ژمارەیەکی زۆر لە بارزانیەکان و خێزانەکانیان بە سەلامەتی بگەیەنێتە شورەوی و نزیکەی ١٢ ساڵ بمێنێتەوە، بێ ئەوەی بوار بدات یەک خێزان و تەنانەت یەک کەسیش لە هێزەکەی هەڵبوەرێ و تارومار بێت!

تا لەئەنجامدا بینیمان چۆن لە ساڵی ١٩٥٨ دا، بە سەربەرزی گەڕایەوە کوردستان و هاتەوە ناو گەلەکەی خۆی! لە باڵەکی تریش پیاوی شارەزا و زیرەک و رووناکبیری وەک (ئیبراهیم ئەحمەد) ی تیابوو، کە پارێزەر و ئەدیبێکی گەورە و سیاسییەکی خاوەن ئەزموون بوو، هاوکات لاوی هەڵکەوتووی وەک (جەلال تاڵەبانی) و پیاوی هێمن و لەسەرخۆی وەک (عەلی عەبدوڵا)ی لەگەڵدا بوو، جگە لە پیاوی دلێری وەک (عەلی عەسکەری)! جا ئێستا کە ئاوڕێک لە دوێنێ و لە مێژوو دەدەینەوە، دەڵێین شتێکی سەیرە، چۆن لەتەک بوونی ئەم هەمووە سەرکردە ژیر و پاشخانە دەوڵەمەندەی خەباتی ئەو تێکۆشەرانە، کەچی بەوجۆرە

ناکۆکییەکان لە نێوانیاندا تەقیونەتەوە و دوو بەرەکی و شەڕی ناوخۆ یەخەی پێگرتوون!
ئەم دوو کەرتبوونە، بە شێوەیەکی وا ناپەسەند و بێمانا پەرەی سەند و گەشەی کرد، هەردوولا بوون بە دوژمنی خوێنە خۆی یەکتر، بەمەش ناکۆکییەکی خوێناوی سەخت لە نێوانیاندا درێژەی کێشاو، هەزاران رۆڵەی تێکۆشەری کورد لە هەر دوولا بوونە قوربانیی! ئیتر بەم جۆرە ئەو حاڵەی نیوانیان درێژەی کێشا و تا رێککەوتنی ئاداری سالی ١٩٧٠ ی خایاند!
شارەزایان و رۆژنامەنوسە بە ئاگاکان لە مێژووی جووڵانەوەی کورد، کەسانی وەک (دەیڤید ئادامسون و ئیریک رۆڵۆ)، کە خۆیان سەردانی (بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەد) و زۆرێکی دی لە سەرانی کوردییان کردووە دەڵێن: (بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەد) پێکەوە نە دەسازان و ناکۆکییەکانیان هەر لە سەرەتای گەڕانەوەی (بارزانی) لە سۆڤیەتەوە بۆ عێراق و بۆ سەرۆکایەتیی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، دەستی پێکردوە! (ئیبراهیم ئەحمەد) کە سکرتێری (پارتی) بوو، بڕوای بە دیسپلین و رێ و شوێنی کاری حیزبی هەبوو، بڕوای بەوە بوو، کە هەموو جووڵانەوەی کورد دەبێت لەلایەن (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە سەرکردایەتی و رێبەری بکرێت، لەکاتێکدا (بارزانی)، وەک ئەو بیری نەدەکردەوە و بڕوای وابوو، کۆمەڵی کوردەواری و جووڵانەوەکەی لە حیزب گەورەتر و فراوانترە، بۆیە خێڵ و هۆزەکان، کە پێکهاتەیەکی گرنگی کۆمەڵی کوردەوارین و هەروا بە ئاسانی لە قاڵبی حیزبایەتیدا ئۆقرە ناگرن و بۆ حیزب گوێڕایەڵ نابن، نابێت نادیدە بکرێن و وەلانرێن! بۆ ئەم مەبەستەش لای باشتر بوو بۆخۆی هەم سەرۆکی کۆمەڵی کوردەواری و هەم رێبەرایەتیی جووڵانەوەکەیش بکات، نەک بە تەنها

سـەرۆکی حیـزب بێـت!
(ئیبراهیـم ئەحمـەد) و هەڤاڵەکانـی بـە پێچەوانـەوە بیریـان دەکـردەوە، پێیانوابـوو.. ئەگـەر بـەر بـۆ خێڵ و هۆزەکانـی کوردسـتان بـەرەڵا بکـەن، ئـەوا دوورنییـە دەرەبەگایەتـی بژێتـەوە و بەهێـز بێتـەوە! (بارزانـی)ش لای وابـوو، هێشـتا خێڵ و هـۆزەکان بایەخـی خۆیـان لـە کۆکردنـەوە و ئاراسـتە کردنـی خەڵکیـدا هەیـە، بۆیـە نابێـت هـەروا بـە ئاسـانی دەسـتبەرداریان ببیـن، بەڵکـو دەبێـت لـە دەوری شـۆڕش کۆیـان بکەینـەوە و سـوودیان لێببینیـن!
سـالی ١٩٦٤ (بارزانـی)، ناوبانگ و کاریزمایەکـی زۆری پەیدا کرد بـوو. لـە رووی بابەتییـەوە (پارتـی) وەک حیزبێکـی خـاوەن ئـەرک و بەرپرسـیارێتی هێشـتا پێویسـتی زۆری بـەوە هەبـوو، کـە سـوود لـە ناوبانـگ و هێـز و کاریزمـای (بارزانـی) وەربگرێـت، کەچـی هەندێـک خوێندنەوەیـان بـۆ کۆمەڵـی کـوردەواری و بـۆ توانـاو کاریزمـای (بارزانـی) هەڵـە بـوو، بابەتیـی و ژیرانـە لـە رۆڵـی سـەرکردە نـە دەگەیشـتن! لەبـەر ئـەوە لـە ملاملانێدا لەگەڵ (بارزانـی) نەتوانیـی خـۆی بپاریـزێ و نەتوانیشـی خـۆی و جووڵانـەوەی کـورد لـە زیانـی گـەورە بپارێزێـت!
ئـەم دووبەرەکـی و ململانـێ خوێناوییـە باڵـی (جەلالـی) ناچـار کرد لـە ژێر کاریگـەری هەلومەرجێکـی ئاڵـۆز و نالەبـاردا، دەسـت بخاتـە نـاو دەسـتی رژێمـی بەغـداوە و لـەو سـەنگەرەوە شـەڕێکی چەنـد سـاڵە دژی (بارزانـی) و جووڵانـەوە چەکدارییەکـەدا بـکات، بەمـەش بکەوێتـە بەرەیەکـی نابەجـێ و هەڵـەوە! لـە ئەنجامـدا بـە هەڵـەی هـەردوو لایەنەکـە، شـەڕی ناوخـۆ و شـەڕی بـرا کـوژی هەڵگیرسـا و سـەدان تێکۆشـەری جووڵانـەوی رزگاریخوازانـەی کوردسـتان لـە رۆڵـەی زەحمەتکێشـی گەلەکەمـان بوونـە قوربانـی و گیانیـان لـە دەسـتدا! دواجـار ئـەو شـەڕەماڵوێرانکـەرە

بووه هۆیەکی گرنگی لاواز کردنی شۆڕشی کوردستان و بەرگرتن لە گەشەکردن و بۆ پێشەوە چوونی جووڵانەوەکەی!
ئەو کارەساتە خوێناوییەی شەڕی برا کوژی و هەڵوێست و هەنگاوەکانی هەر دوو باڵەکە، توانی هۆیەکی گرنگ بێت لە وروژاندنی چەندین پرسیاری تایبەت بە هەلومەرجی کوردستان، دەربارەی سروشت و پێکهاتەی سەرکردایەتی هەر دوو باڵەکەی (پارتی) و تەنانەت بەرامبەر باڵەکانی (حیزبی شیوعی) و ڕەوتی بۆ پێشەوە چوونی ڕووداوەکانی ئایندە و دوارۆژی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بە گشتی! لەناو باڵی مەکتەبی سیاسی (باڵی جەلالی)دا، یەکێک لە کارە چاکەکانی (جەلال تاڵەبانی) باوەشکردنەوە بوو بۆ تێکۆشەرەکانی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) و شۆڕشگێڕەکانی ئێران و حەوانەوە و پشتیوانی لێکردنیان. لەوانەش تێکۆشەرەکانی (سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران) بوو، کە ڕۆڵێکی دیاریان گێڕا لە بڵاوبونەوەی بیرو باوەڕی (مارکسی) و ڕەوتی چەپ لە کوردستاندا. لە بەرامبەریشدا (بارزانی)، لەکاتی لێقەومانی (شیوعی)ەکانی عێراقدا، بە سنگی فراوانەوە پێشوازی لێکردن و لای (بارزانی) هەمیشە دەیانتوانی بە ئاسانی بحەوێنەوە! بەڵام باڵەکەی تر بە کۆنە قینی رابردوو رەفتاری لەگەڵ دەکردن و لە ڕووی سیاسییەوە بەلادەر لە ڕێبازی مارکسی و لە ڕووی پێشمەرگایەتیشەوە دژایەتیانی دەکرد! ئەمانەش هەموو بۆخۆی لە دوارۆژدا کاریگەریی و ئاسەواری نێگەتیفی لەسەر کورد و جووڵانەوەکەی بەجێهێشت! هەرچی کاری خراپی باڵی (بارزانی)شە، تەنگ هەڵچنین بوو بە تێکۆشەرەکانی کوردی ئێران و بگرە لەناوبردنی هەندێ لەو تێکۆشەرانە بوو. کە ئەمەش لە دوایین شیکردنەوەدا بە زیانی گەلەکەمان شکایەوە!
لە گێژەنی ئەو ململانێ خوێناویەدا (بارزانی) توانی سەرکەوتنێکی

گەورە و گرنگ بەدەست بهێنێت و باڵە نەیارەکەشی دووچاری شکست بکات! ئەویش بەوەی لەگەڵ رژێمی بەعسی عێراق رێککەوتنی ئاداری مۆر کرد! دەتوانین بڵێین رێککەوتننامەی ١١ ئاداری ١٩٧٠، داننانی رەسمی دەوڵەتی عێراق بوو بە مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد لە کوردستانی باشووردا. چونکە راگەیاندنی مافی ئۆتۆنومی و سەلماندنی ئەو مافە بۆ گەلی کورد، بە دەستهێنانی دۆکۆمێنتێکی مێژوویی گرنگ بوو بۆ گەلەکەمان! بەمەش (بارزانی)، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا و باڵەکەی تریش توشی شکستێکی گەورە بوو، کە لە ئەنجامدا شکاوەکانی ئەو باڵە ناچار بوون جارێکی تر بە سەرکرایەتی (بارزانی) و بەهەمان بیر و هێڵی گشتی سیاسی و رێکخراوەیی (بارزانی و پارتی) - کە هۆی جیابوونەوەکە بوو- قایل ببن و بگەڕێنەوە ریزەکانی (پارتی)!

لە کوردستاندا ئەو رێککەوتنە دۆخێکی نوێی بۆ کاری سیاسی و بگرە سەندیکا و رێکخراوە جەماوەرییەکان هێنایە کایەوە. لە عێراقدا، حیزبی (بەعس) لە سەرەتاوە دەستیدایە سیاسەتی پاوانکردنی سەرجەم جومگەکانی دەسەڵات و سەرکردایەتیی هەموو کەیسە سیاسی و ئابورییەکانی وڵاتی گرتە دەست، تا وردە وردە جێپێی خۆی قایم کرد! ئیتر کەوتە تەنگ هەڵچنین بە حیزبە ناسیۆنالیست و دیموکرات رەوتەکانی عێراق! بەمەش تادەهات خۆی بەهێزتر دەکرد و چنگی لە گەرووی هەموو جووڵانەوەیەکی سیاسی و دیموکراتی وڵات گیر کرد! سەرکردە و تێکۆشەرەکانی لایەنەکانی تری خستە زیندانەوە و لە سەرداب و ژێر زەمینە تاریک و تەنگەکانی توونـد کردن! زیندانەکانی (قصر النهایة) و (الأمن العامە - ئاسایشی گشتی) لەو شوێنە مەرگ چێنانە بوون، کە ناوبانگێکی خراپ و ترسناکی بۆ لایەنە سیاسییەکان

دروست کردبوو! رژێمی (بەعس)، لە سەرەتاوە کەوتە قەڵاچۆکردنی سەرکردە نەیارەکانی (صدام حسین)، ئەوانەی کە لە کودەتا شومەکەی ١٧ تەموزی ١٩٦٨ دا هاوڕێی خۆی بوون! ئیتر بەو چەشنە بەرەبەرە دەستیکرد بە تەختکردنی کۆسپەکانی ناوخۆ و بەمەش زەمینە سازییەکی تەواوی کرد بۆ پیادەکردنی سیاسەتی شۆڤێنیانە و دیکتاتۆرییەت لە وڵاتدا!

لە سەرەتاوە تاکتیکی خۆ بەهێز کردنی رژێمی عێراق رووی کردبووە هەندێ هەنگاوی ریفۆرمخوازانە، لەوانە یاسای چارەسەری کشتوکاڵ و مەسەلەی زەوی و هەنگاونان بۆ بەستنی پەیمانێکی نێودەوڵەتیی درێژخایەن لەگەڵ (یەکێتیی سۆڤیەت) ی جاران و زەمینە خۆشکردن بۆ خۆماڵیکردنی نەوت! هەرچەندە هەندێ لەو کارانە و دۆستایەتی کردنی یەکێتیی سۆڤیەتی، بە خێرو سوودێکی زۆر بۆ خۆ قایمکردن و تۆکمە کردنی دەسەڵاتی سیاسی (بەعس)، گەڕایەوە، بەڵام دوارۆژ و رۆژگارەکانی دوایی رووی رەشی ئەو رژێمەی بۆ هەموو دنیا دەرخست! هەرچەندە لە سەرەتاوە و لە چوارچێوەی تاکتیکی خۆسەپاندندا و لەژێر چەتری دۆستایەتیی یەکێتیی سۆڤیەتدا تەقەلای فریودانی (حیزبی شیوعی عێراق)ی دا، بەڵام ژێر بەژێر ئەویشی دەرزی ئاژن کرد و بەردەوام و بە نهێنی خەریکی تیرۆر کردنی سەرکردە و کادرە دیار و چالاکەکانی بوو! بە رواڵەت دۆستایەتی (حیزبی شیوعی) دەکرد و بە نهێنیش زەبر و ئازاری دەدان، تا لە مانگی تەمموزی ١٩٦٨دا، باڵێکی (حیزبی شیوعی)، بە سەرکردایەتی (عزیز الحاج ) و بە هاوکاری (کازم صفار و متی هیندی و ئەحمەد حەلاق و سالح عەسکەری و موسلیح جەلالی)، بەو بارودۆخەی حیزب و بە سیاسەتەکانی سەرکردایەتیی حیزبەکەیان (حیزبی شیوعی عێراق)،

رازی نەبوون! بۆ ئەمەش لە ئاستی سیاسەتی چەوتی سەرکردایەتیی حیزبەکەیاندا، سیاسەتی سازشکاری و خۆ بەدەستەوەدانی کۆمیتەی مەرکەزی، راپەرین و بە ناوی (قیادەی مەرکەزی)، خۆیان لە گۆڕەپانی سیاسی عێراقدا ناساند و کەوتنە دوژمنایەتی کردنی حیزبی (بەعس) و دژی رژێم دەستیاندایە چالاکیی شۆڕشگێرانە! هەرچەندە ماوەیەک زۆر ئازایانە چالاکیی باشیان نواند، بەڵام دواجار لە نێوان مەنگەنەی سەرکردایەتیی (حیزبی شیوعی - لیژنەی مەرکەزی - ) و دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمی بەعسدا، لە بارودۆخێکی گران و ناخۆشدا، ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەرە ئازاکانی گیران و لە ژێرزەمینە تاریک و نووتەکەکانی بەعسدا لەناوبران! ئیتر بەم جۆرە گرتن و کوشتنی کادر و سەرکردەکانی ئەو باڵە شۆڕشگێڕە بووە هۆی لاواز بوونی ئەو بزوتنەوەیە، تا لە ئەنجامدا سەنگ و پێگەیەکی ئەوتۆیان لەسەر جووڵانەوەی سیاسی و رەوتی گۆڕانکارییەکان لە وڵاتدا نەما! بەڵام لەتەک ئەوەشدا دەتوانین بڵێین.. ئەو تێکۆشەرانە توانییان لایەنە چەوتەکانی هێڵی گشتی سیاسیی (حیزبی شیوعی عێراق)، ئاشکرا بکەن و مەترسی حیزبی (بەعس) و رەوتی تاکڕەوی و دیکتاتۆری (بەعس) دەربخەن! توانییان هوشیارییەکی باش بڵاوبکەنەوە و هەڵایەکی گەورە ساز بکەن دژی سەرکردایەتیی (حیزبی شیوعی عێراق)، بەوەی کە ئەو سەرکردایەتییە نەک هەر لادەرە لە (مارکسیزم - لینینیزم )و رەوتی شۆڕشگێرانەی پرۆلیتاریا و جووڵانەوەی نیشتمانی عێراق، بەڵکو لەسەر ئاستی جیهانی بۆتە کلکی شورەوی و ریڤیژینیستی جیهان و لەناوخۆشدا بۆتە پاشکۆی رژێمی (بەعس) و زەلیلی سیاسەتەکانی بەعس بووە!

ئەو رۆژگارە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، جگە لە چەندین شۆڕش و جووڵانەوەی شۆڕشگێرانەی وەک جووڵانەوەکانی ئەریتیریا و زەفار

و خواروی سودان، ئەوا کێشەی فەلەستینیش یەکێ بوو لە کێشە هەرە گەرم و گرنگەکانی ئەو قۆناغە، کە ببووە مەسەلەی سەردەم و ناوەندێکی گەورە بوو بۆ بڵاوبونەوەی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە و تێزەکانی بیری چەپ! نووسەران و بڵاوکراوەکانی بوبوونە بڵند گۆیەکی گرنگ بۆ دەنگی شۆڕشگێڕانە! نووسەرانی وەک (منیر شفیق و ناجی علوش و جورج ترابیشی) و دەیان نووسەر و لێکۆڵیاری چەپڕەوی دی، کە لە گۆڤارەکانی وەک ( الدراسات العربیە ) و ( الهدف )دا نوسیین و وتارەکانیان بڵاو دەکردەوە، سەرچاوەیەکی باشی بیری چەپ و مارکسی بوون! ئیتر بەوجۆرە لە رۆژهەڵاتی عێراقەوە و لە ئێران جووڵانەوەی چەپ تینوتاوێکی باشی سەند بوو.. چەندین رێکخراوی شۆڕشگێڕی وەک (سازمان ئینقیلابی حیزبی تودەی ئێران) و (رێکخراوی تۆفان) و (چریک) و (گرووپی فەلەستین)، لە شەقام و لە ناو زیندانەکانی ئێرانەوە زایەڵەی دەنگ و بۆچوونەکانیان دەگەیشتە کوردستان!

لەسەر ئاستی جیهانیش ناکۆکییەکانی ناو جووڵانەوەی سۆسیالیستی، ناکۆکییەکانی بەرەی چین لەگەڵ بەرەی شورەوی، کە ببووە هۆی بەرپابوونی مشتوومڕێکی فیکری گەرم لەسەر جووڵانەوەی سۆسیالیستی جیهان و ریسوا کردنی خەتی ریڤیژینیستی و هێڵە سیاسی و هەنگاوە پر لە هەڵەکانیان و هاوکات دروست بوونی چەندەها رێکخراوی شۆڕشگێڕ و چەپ، کە جیاواز لەخەتی سۆڤیەت و هاوبیرەکانی لە ئەورووپا بیریان دەکردەوە، لەتەک هەندێ تێز و بۆچوونی تری گرنگی وەک تێزەکانی (ماوتسی تۆنگ)، ئەوا هەمو ئەوانە زەمینە سازییەکی باشیان کردو و دۆخێکی لەباریان لە کوردستاندا رەخساند، بە ئاراستەی ورووژاندنی هەست و سۆزی لاوان بۆ بەپیرەوەچوونی بیرو و بەرەی چەپ!

## بارودۆخی ئەوسای کوردستان!

ململانێی سەخت و خوێناوی و شەڕی براکوژیی نێوان هەر دوو باڵی ناکۆکیی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، (مەلایی و جەلالی) تادەهات زۆرتر و سەختتر کوردستانی باشووری ناخۆش دەکرد! (بارزانی) تادەهات پەیوەندی لەگەڵ ئێران و (شاە) قووڵتر دەبوو، لەکاتێکدا رژێمی ئێران بە ئاشکرا نکۆڵی لە هەموو مافێکی نەتەوەیی و مرۆیی کورد و کوردستان دەکرد و بە هەموو توانایشی بەگژ جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی کوردستانی رۆژهەڵاتدا دەچوو، تێکۆشەرەکانی قەڵاچۆ دەکرد و دەیکوشتن و لە سێدارەی دەدان! باڵی (جەلالی) یش بە هەمان شێوە تادەهات زیاتر لەگەڵ رژێمی عێراق دەستی تێکەڵ دەکرد! بێ ئەوەی سیاسەتە شۆڤێنیەکانی ئەو رژێمە، کە چۆن درندانە پەلاماری هێزی پێشمەرگەی دەدا و گوندەکانی کوردستانی تۆبباران و کاول دەکرد، لە بەرچاو بگرێت! ئەو رژێمەی کە بەردەوام هەوڵیدەدا جووڵانەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان لە باشووری کوردستان لەناوبەرێت، بێ

ئـەوەی هەمـوو ئـەو کارە شـۆڤێنییانە رێ لـە تێکـەڵ بـوون و هاوکاریـی باڵـی (جەلالـی)، لەگـەڵ رژێـم بگرێت! بەڵکـو هـەردوو باڵـی جووڵانـەوەی کـورد، بـە هەمـوو توانایانـەوە خەریکـی لەناوبردنـی یەکتـر و سـڕینەوەی یەکدی بوون! ئەمیان ئـەوی بە جاشـی ئێران و ئەویش ئەمی بە جاشـی عێراق نـاوزەدە دەکـرد!

ئیتـر بـەم جـۆرە سـێ فاکتـەری فیکـری و سیاسـی لـە ناوچەکـەدا، هـەر یەکـەی لـە قوڵێکـەوە کار و شـوێنەواری خۆیـان کـردە سـەر بیـرو ئاراسـتەی سیاسـی لاوانـی کوردسـتانی باشـوور. ئـەو سـێ تەوژمـە فیکـری و سیاسـییە، کـە لەیـەک دەچـون و بەیـەک ئاراسـتەدا ئاقـاری خۆیـان دیـاری دەکـرد، هـەر هەموویـان رەوتـی شۆڕشـگێڕ بـوون و بڕوایـان بـە خەباتـی چەکدارانـەی گـەل هەبـوو، ئاوێتـەی بیـرو بۆچونـی (ماوتسـی تۆنـگ)ی چیـن بـوون و لـە پارتـە کۆمۆنیسـتە کانـی وابەسـتە بـە یەکێتـی سـۆڤیەت تـووڕە و بێزار بـوون و هیـچ هیوایـان بـە سیاسـەتی راسـتڕەو و سازشـکارانەی ئـەو حیزبانـە نەمابـوو!

* لـە ئێرانـەوە، لـە کوردسـتانی رۆژهەڵاتـەوە تێکۆشـەرەکانی (حیزبـی دیموکراتـی کوردسـتانی ئێـران)، ژمارەیەکـی زۆر لـە سـەرکردەکانیان، نموونـەی ( غەنـی بلوریـان و جلیـل گادانـی ) و باقـی تێکۆشـەرەکانیان لـە زیندانەکانـی (شـا) ی ئێرانـدا لـە ژێـر بـاری ئەشـکەنجەدا بـوون و رۆژگارێکـی سـەختیان لـە زینداندا بەسـەر دەبـرد! ئەوانـەی لـە دەریشـەوە بـوون هەمیشـە لـە هـەوڵ و کۆششـی ئـەوەدا بـوون، تـا بەشـێوەیەکی سـەرکەوتوو خۆیـان رێـک بخەنـەوە و خەبـات بکـەن. بـەڵام ئـەو حیزبـە وەک رەحمەتـی (دکتـۆر قاسـملۆ) دەیگـوت.. دوچـاری گرفتـی گوێزانـەوەی ناوەنـدی سـەرکردایەتی و بڕیـار بـۆ کوردسـتانی باشـوور بـوون و لـە ئەنجامـدا بەهـۆی کێشـەکانی (عەبـدوڵای ئیسـحاقی - ئەحمـەد تۆفیـق -)

ەوە نەتوانرا ئەو حیزبە تۆکمە و خورت رابگرن، بۆیە دەستەیەک لە تێکۆشەرەکانی ئەو حیزبە ناچار بوون، کە (کۆمیتەی شۆڕشگێری حیزبی دیموکراتی ئێران) پێکبهێنن. لە تێکۆشەرە ناسراوەکانیان (ئیسماعیلی شەریفزادە، حەمەدەمین سیراجی، مەلا ئاوارە، عەبدولای موعینی، سلێمانی موعینی، سەنار مامەدی و سالاری حەیدەری ) بوون و لە ناميلکەی (تیشک) دا، بیروباوەڕی خۆیان بڵاودەکردەوە!

لە نێوان سالی ١٩٦٦ - ١٩٦٧ دا، ئەو کۆمیتەیە لە هەلومەرجی سەختی کوردستانی رۆژهەلاتدا ، کەوتنە سەر ئەو باوەڕەی، کە دەتوانن لەناو کوردستانی رۆژهەلاتدا خەباتی چەکدارانە رێک بخەن. بۆ ئەمەش و بە یارمەتی و پشتیوانی (مام جەلال) و حیزبەکەی جموجولی چەکدارانەیان بۆ ١٨ مانگ درێژە پێدا و زۆر ئازایانە و چاو نەترسانە خەباتی پێشمەرگانەیان کرد! تا لە ئەنجامدا زۆربەیان گیانی خۆیان بەخشی و بوونە قوربانی ئەو رێبازە! دواتریش هەندێ لە تێکۆشەر و پشتیوانیشیان، کە سەرکردە و تێکۆشەری ناوداری (حیزبی دیموکرات) و کوردی رۆژهەلات بوون، بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی خەبات روویان کردبوە کوردستانی باشوور، لەوانە (هاشم ئەقەل ئەلتولاب )، (قادر شەریف) کە لە سلێمانی بەدەستی ساواک لە مزگەوتێکدا تیرۆریان کرد! ئیتر ئەوانەیش کە روویان کردە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (بارزان)ی، جگە لە ( ئەحمەد توفیق) و یاوەرەکانی، کە زۆر نزیکی خودیی (بارزانی) بوون، هەموویان تەسلیم بە رژێمی شا کرانەوە!

هەردوو تێکۆشەر (دکتۆر قاسملۆ و عەبدولا حەسەن زادە) دەڵێن.. بۆ مێژو دەبێ بووترێت، کە بەداخەوە هاوکاری سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کوردی عێراق لەگەڵ رژێمی کورد کوژی (حەمە رەزا شا)، گەیشتە ئەو جێگایە، کە پێشمەرگەی کوردی عێراق لە نێوخۆی

کوردستانی ئێراندا، شان بە شانی هێزە نیزامی و ئینتیزامی و نیوە نیزامییەکانی شا، راوی کوردی ئێرانیان دەکرد و لە کوردستانی عێراقیش، تەڵە بۆ تێکۆشەرانی حیزبی ئێمە دادەنرا، بۆ ئەوەی بگیرێن و بە زیندویی بێت یا بە مردوویی بدرێنەوە بە جەلادەکانی رژێمی شا ! (کورتە مێژوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ل ٢٣٩)، ئیتر بەم جۆرە چەندین سەرکردەی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلەکەمان لە کوردستانی رۆژهەلات یەک بە دوای یەکدا بە دەستی رژێمی ئێران شەهید بوون! بەوجۆرە رێکخراو و تەشکیلاتی (حیزبی دیموکرات)، نەمابوو زەبری بەرنەکەوێت و دەزگاکانی رژێم بەدوایەوە نەبن، بۆیە (حیزبی دیموکرات) لە حاڵێکی خراپ و شپرزەدا بوو. دکتۆر (عەبدولڕەحمان قاسملۆ)، کە ئەو کاتە مامۆستا بوو لە یەکێک لە زانکۆکانی رۆژهەلاتناسی ئەوروپا و وانەی دەوتەوە، لەوێوە هاتە بەغدا و کەوتە کۆکردنەوەی کادرە باش و بە تواناکانی حیزب، تا توانییان لە کۆنگرەیەکدا گیان بە بەری (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران،دا بکەنەوە و خەبات دژی رژێمی ئێران گەرم بکەن!

* هەر لە ئێرانەوە و لە هاوینی ساڵی ١٩٦٨ دا، دەستەیەک لە تێکوشەرەکانی رێکخراوێکی ئێرانی شۆڕشگێڕ کە ناوی (سازمان ئینقلابی حیزبی تودە ئێران) بوو، هاتنە کوردستانی باشوور و لە سلێمانی و لە بەکرەجۆ و هەڵەبجە دەستیان بە چالاکی کرد!

ئەو ریکخراوە لە ریشەدا تودەیی و لە (حیزبی تودەی ئێران)دا بوون! بەلام سەبارەت بە سیاسەتی راستڕەویی سازشکارانەی سەرکردایەتی (حیزبی تودە) و پاشکۆیەتی ئەو حیزبە بۆ سیاسەتەکانی سۆڤیەت و حیزبی کۆمونیستی شورەوی، بێ هیواو ناڕازی بوون! بۆیە دەستەیەک لە تێکوشەرە لاوەکانیان لەو سیاسەتە هەڵگەڕانەوە و رێکخراوێکی

شۆڕشگێڕی چەپیان پێکهینا، کە زۆرتر وەک دریژەدەری ئەو خوێندکارە شۆڕشگێڕانە وابوو ، کە لە ریزی کونفدراسیۆنی خوێندکارانی ئێرانی لە ئەوروپا کەوتبوونە خولیای بیری چەپ و بۆچوونەکانی (ماوتسی تۆنگ) ! تێکۆشەرە دیارەکانی ئەوانەش بریتیبوون لە.. ( کۆرشی لاشایی) کە پزیشکێکی دەرچووی زانکۆیەکی ئەڵمانیا بوو، دکتۆر (علی سادقی)، کە ئەمیشیان دکتۆرای لە فیزیکدا هەبوو لە جنێف دەرسی تەواو کردبوو. (سیاوەشی پارسا نژاد)، ئەویش هەر پزیشک بوو، ( ئیرەجی کەشکوڵی)، کە کوڕی سەرۆک تیرەیەکی هۆزی قەشقایی بوو، (عەتای کەشکۆلی) ئەویش لە خزمانی ئیرەج بوو، (موحسینی خاتەمی) ئەویش هەر لە ئەوروبا خوێندنی زانکۆی تەواو کردبوو، ( خوسرەوی سەفایی) کە ئەندازیاری تەلارسازیی لە رۆمای ئیتالیا خوێند بوو، چەند کەسێکی تر بە ناوەکانی (موحسینی ریزوانی، فریدون کشاورز، پەرویزی واعیز زادەی مەرجانی، بێژەنی قەدیمی، محمود مقدم و بەهمەن قەشقایی و پرویز نیکخواه). زۆربەی ئەوانە لە چین و لە کوبا و لە ئەلبانیا، یا دەرسیان خوێند بوو یا مەشقی سەربازییان کردبوو! ئەمانە کۆمەڵێ کەسی زیرەک و بەتوانا بوون، کە زۆرجار کۆنفرانس و کۆبونەوە فراوانەکانیان لە تیرانای ئەلبانیا و لە ئیتالیا ئەنجام دەدا! چونکە (فریدونی کشاوەرز)، هاوڕێی کاتی خوێندنی (ئەنوەر خوجە) بوو، کە لە زانکۆی مۆسکۆ بوون. بۆیە لە تیرانا کار ئاسانی زۆریان بۆ دەکرا! ئەوانەی هاتنە کوردستانی باشوور بۆ لای ( مام جەلال). (کۆرشی لاشایی)، کە ناوی (دکتۆر جەلال)ی لەخۆ نابوو، ئەوانی تریش (ئیرەج، کاک ئیسماعیل) و (عەتا، ناوی سەفا) و (علی سادقی، ناوی مامۆستا ئیبراهیم)ی لەخۆ نابوو! ئەوانە باوەڕیان بە بیرو باوەڕی (ماوتسی تۆنگ) هەبوو، دەرسی تیۆری و پارتیزانییان خوێند بوو، لە

تەکبیری ئەوەدا بوون، چۆن لە ئێران دەست بە خەباتی چەکدارانە و جەنگی گەل بکەن! هەر لەو رۆژگارانەدا لە ئێران جوولانەوەی رەوتی چەپ لە هەڵچوون و دەنگدانەوەیەکی باشدا بوو. چەندین رێکخراوی تری وەکو (تۆفان) و (گروپی فەلەستین) دروست بووبوون. کە دواتر هەندێک لە سەرکردەکانیان وەکو( شکراللەی پاکنەژاد، بهرۆز و حسین ریاحی، عەلی رەزای رەزایی، عەباس سابیری و ریزوانی جەعفەری)، چوونە ریزی سازمانی ئینقلابیەوە! هەرچەندە لەدواییدا رووداوەکانی ئەو دەمە خراپ هاتنە پێشەوە و لە ئەنجامی ئەو هەلومەرجەی ئەو کاتەدا، دوو کەس لەو سەرکردانە لەلایەن سازمانی (ساواک)ەوە گیران! سازمانی (ساواک)، کورتەی ناوی - دەزگای ئەمنی و زانیاری ئێران - بوو! دەزگایەکی زەبەلاحی بەدناوی (شا)ی ئێران بوو، هەردەم بە هاوکاری دەزگا سیخورییەکانی ئەمریکا بە شوێن کەسانی چەپ و مارکسیدا دەگەڕان! ئەم دەزگایە لەپاش ئەشکەنجەدانێکی زۆر ئەو تێکۆشەرە چەپڕەوانەی دا، بە دادگا. (شکراللەی پاکنەژاد)، لەبەرگری خۆیدا، بەجۆرێکی ئەوتۆ رەوان و جوان و ئازایانە بەرامبەر دادگا هاتە گۆ، کە قسەکانی لەدواییدا لە شێوەی نامیلکەیەکدا چاپکرا بوون، سەدانی وەک ئێمە بە تاسوق دەستمان دەکەوت و بە شەوقەوە دەمانخوێندەوە !

(جەلال تاڵەبانی)، ئەمانەی بەهۆی (ئیسماعیلی شەریفزادە) وە ناسی و گرتنیە خۆی. لای حکومەتی عێراق وای نیشاندا، کە ئەمانە ئەفسەری ئێرانی و تێکۆشەری دژی (شا)ی ئێرانن! لە ساڵی ١٩٦٨ بەدواوە ناکۆکیی ئێران و عێراق رۆژ بە رۆژ توندتر دەبوو. رژێمی عێراق (جەنەراڵ تەیموری بەختیار و جەنەراڵ پەناهیانی) لە بەغدا راگرتبوو، پشتیوانی دەکردن و هەوڵی بەهێزکردنی دەدان، جگە لەوەی وەک کارتێکی

گوشـار بـەکاری دەهێنـان، تـا ئەندازەیەکیـش دڵـی پـێ خـۆش کردبـوون، کـە بتوانێـت هانیـان بـدات بـۆ جووڵانەوەیەکـی کاریگـەر! هـەر بەونیـازە لەگـەڵ (رادمەنشـی )، سـکرتێری (حیزبـی تـودەی ئێـران) کۆبوونـەوەی بـۆ رێـک دەخسـتن تـا نەخشـە دابنێـن و کودەتـا دژی (شـا) سـاز بکـەن! بۆیـە کۆکردنـەوەی تێکۆشـەر و ناڕازیـی و ئۆپۆزیسـیۆنی ئێرانـی، سـەرانی رژێمـی عێراقـی خۆشـحاڵ دەکرد بـا لەلایـەن (تاڵەبانـی) شـەوە بێـت! (مـام جـەلال)، توانـی حەوانـەوەی ئـەو تێکۆشـەرانە بۆخـۆی ئاسـان بـکات و لەدواییشـدا پەیوەنـدی و کار ئاسـانییان لای رژێمـی عێـراق بـۆ دابیـن بـکات!

* لـە فەلەسـتین و لەنـاو تێکۆشـەرەکانی (بـەرەی گەلـی رزگاری فەلەسـتیندا)، کـە (جـۆرج حبـش) سـەرکردایەتی دەکـردن و دواتریـش (بـەرەی دیموکراتـی رزگاری فەلەسـتین)، ژمارەیەکـی زۆر لـە نووسـەر و خاوەن بیـری عەرەبـی کە سـوری و ئەردەنـی بـوون، رەوتێکـی فیکـری و سیاسـییان گەشـە پێـدا، کـە رەوتێکـی شـۆڕشـگێڕ بـوون و بڕوایـان بـە خەباتـی چەکـداری گـەل و بـە تێـز و بۆچوونەکانـی (ماوتسـی تۆنـگ) هەبـوو! ئەوانـە کەڵـە نووسـەر و شـاعیری وەک (سـمیح القاسـم و منیـر شـفیق وجـۆرج ترابیشـی) تێـدا بـوو!

لـەو ساڵانەشـدا حیزبـی (بەعسـی عێـراق) و رژێمەکـەی، کـە خۆیـان بـە سۆسیالیسـت لـە قەڵـەم دەدا و بـە رواڵـەت پشـتیوانیان لـە جووڵانەوەیـی فەلەسـتین دەکـرد، لـەو رێـڕەوەدا لـە بەغـدا گرووپـە فەلەسـتینییەکان توانییـان نووسـینگە و بـارەگای خۆیـان هەبێـت و چالاکیـی جۆراوجـۆر بنوێنـن، بەتایبەتـی رێکخـراوی ( الجبهـة الشـعبیة)ی (جـۆرج حبـش) کـە بارەگایـان لـە بەغـدا هەبـوو! ئێمـەش ئەوکاتـە بەهـۆی (مـام جـەلال) ەوە، ئاشـنایەتیمان لەگەڵیانـدا پەیـدا کـرد بـوو. ئیتـر لـە شـاری بەغـدا و لەنـاو

لاوە رووناکبیرەکاندا، بەهۆی گۆڤارەکانی ( الهدف ) و ( الدراسات العربیە ) و نووسینەکانی (منیر شفیق و جۆرج ترابیشی و ناجی علوش) و چەندەها بەرهەمی تری نووسەرانی ئەو ر ەوتە شۆڕشگێرەوە، گفتوگۆی گەرم و مشتومڕی فیکریی و سیاسی تادەهات گەرمتر دەبوو، ئەمەش رۆڵی خۆی لەسەر هاندانی لاوە کوردەکان بۆ بەپیرەوەچونی ئەو رەوتە هەبوو!

* لە عێراقیشدا نابێت ئەو راستییە لەبیر بکەین، کە سەرهەڵدان و گەشەکردنی باڵەکانی (حیزبی شیوعی عێراق)، لە مێژووی تێکۆشانی پڕ لە شانازی خۆیدا، رۆڵێکی گرنگی لە بڵاوکردنەوە و زەمینە سازی شەپۆلی فیکری پێشکەوتنخوازیدا هەبوو! دەنگدانەوەی هەڵوێستی ئازایانەی تێکۆشەرە گەورەکانی وەک (فەهد) و هاوڕێکانی لە زینداندا، یا ئەوانەی لە باڵە جیاجیاکانی ئەو حیزبەدا کاریان دەکرد، وەک (بەهادین نوری و جەمال حەیدەری و سلام عادل) و دەیان تێکۆشەری تر ، عیشقێکی زۆریان بۆ گیانبازی و خەبات دروست کرد! هەرچەندە لە ناوەڕاستی ساڵەکانی شەست بەدواوە لەناو هەناوی (حزبی شیوعی عیراق،دا، چەند رێکخراوێکی نارازی بە هەڵوێست و کردار و سیاسەتەکانی ئەو حیزبە سەریان هەڵدا! بۆ نموونە ساڵی ١٩٦٧ دەستەی (خالید ئەحمەد زەکی)، بە ناوی (بەرەی خەباتی چەکداری میللی)، کە لە راستیدا بەشێک بوون لە (قیادەی مەرکەزی) و ئەمانە لەو کەسانە بوون، کە بڕوایان بە خەباتی چەکداری هەبوو، بۆ ئەمەش چەندین دەستەی چەکدارییان دروست کرد و لە چەندین جێگای باشووری عێراقدا پەلاماری دامەزراوەکانی پۆلیس و سوپای عیراقیان دا!

لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦٧ دا، بە سەرکردایەتی (عزیز الحاج)، کە کوڕی

(حاجی علی) گەورە دەوڵەمەندی بەغدا و ناسراو بوو بە پیاو چاک و خێرخوا و بە کەسێکی خزمەتگوزار بە خوێندکاران و زیندانییە سیاسییەکان دەناسرا، چەندین سەرکردە و کادری هەڵکەوتووی (حیزبی شیوعی)، ڕێکخراوێکی شۆڕشگێری کۆمۆنیستیان پێکهێنا، بە ناویی (سەرکردایەتی ناوەندی حیزبی شیوعی عێراق)، کە بە (قیادەی مەرکەزی)، ناویان دەرکرد بوو! ئەو ڕێکخراوە بە گوڕ و تەوژمێکی بەتینەوە هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسیی وڵات و باوەڕیان بە خەباتی چەکدارانە و بە بیروباوەڕی (ماوتسی تونگ)، هەبوو! هاوکات (حیزبی شیوعی عێراق) و کۆمیتە ناوەندییەکەیان بە راستڕەو و سازشکار و ریڤیژنیست لە قەڵەم دەدا! ئەو ریکخراوە چەندین تێکۆشەری چەپی ئازای کوردیان لەگەڵدا بوو، لەوانە (ئەحمەد حەلاق، صالح عەسکەری، موسڵیح مستەفا و حەمەمین پێنجوینی و حسێن عارفی چیرۆکنووس و فاروقی مەلا مستەفا و دکتور عیزالدین مستەفا رەسول و مستەفا چاو رەش و ئەکرەم محەمەد ئەمینی سابونکەرانی) و هتد.. ئەو ڕێکخراوە سەرەتای کارەکانی بە دەست وەشاندن لە کاربەدەست و نۆکەرانی رژێم دەستی پێکرد و بەشێوەیەکی دراماتیکی سەریان هەڵدا و پاشان زۆرێ لە سەرکردەکانیان لەناوچوون و گیران و ئەوانیشی کە مانەوە، پەنایان بردە بەر شاخەکانی کوردستان و بەر سێبەری (بارزانی)! دیارە ئەم رەوتەش لەو رۆژگارەدا، بێ کاریگەری نەبوون لەسەر بیروبۆچونی لاوانی کوردستان، بە ئاراستەیەکی باشدا!

ئیتر بەم جۆرە هەموو ئەو رووداوە سیاسییە گەورانە و ئەو شەپۆلە بەهێزەی، کە لەدەریای قووڵی ژیانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و رووناکبیری ناوچەکە و عێراق و کوردستاندا شەپۆلی دەدا، دۆخێکی لەباری سازکرد بۆ بیرکردنەوە لە نوێخوازی و لە هەنگاوی سیاسیی

نویێ! بۆ ئەمەش لەو هەلومەرجەدا چەند دەستە و کۆڕی نزیک لە یەک، یاخود لەیەکچوو لە دوو شوێنی سەرەکیدا لە سلێمانی و لە بەغدا لەناو لاوانی کوردا سەریان هەڵدا. کۆڕی سلێمانی (نەوشیروان مستەفا و شازاد صائب و مەحمود مەلا عیزەت و مامۆستا رەفعەتی مەلا و سمکۆ فتح اللە و فوئاد و فەهمی ئەنوەر قەرەداخی) و ژمارەیەکی زۆر لاوانی رووناکبیری تر بوون، کە لە دەوری گۆڤاری (رزگاری)، کۆبوبونەوە! دەستەیەکی تریش هەر لە سلێمانی لەوانە.. (ئاوات عەبدولغەفور و سالار عەزیز و عومەری سەید عەلی، ئاسۆ شێخ نوری و حەمە سابیر و جەمال تایەر و ئەکرەم قەراخی و ئەشرەف تاڵەبانی و جەباری حاجی رەشید و مامۆستا جەمال تایەر و حەمەمین پۆڵا و جەمالە رەش و فوئاد مەجید میسری و حەمە جەزا و حەمە قادر و بەختیار زوهدی و ئازادی مستەفا خۆشناو - کە ئەوکاتە چوبووە هەندەران - و جەمال بەکر و عەلی کەمال) و ژمارەیەکی تر لە لاوان بوون!

لە بەغداش (فازیلی مەلا مەحمود، شاسوار جەلال - شەهید ئارام - بەکر حسەین و ئەمیری عەلی ناجی و دارۆی شێخ نوری و دلێر سدیق، ئەرسەلان بایز، عەبدولرەزاق فەیلی، حەمید بڵباس، عەزیز مەحمود و حەمە جەزا - ئەندازیاری نەوت - و نەرمین عوسمان، محەمەد قەرەداخی و پرشنگ مەمەند و شێخ محەمەدی چینی و دلێر تایەر و هەڵۆ ئیبراهیم ئەحمەد، بەختیار نەجمەدین، فازیل تەیب، یاسین کەرکووکی، هۆشمەند عەبدول مەجید، نەریمان خانەقینی، دڵخواز بڵباس و خەرامان مەستی، مامۆستا ئەحمەد حەمەلاو و سەعیدی برای محەمەد عوزێری و حەمە قەرەداخی، جەعفەر عەبدول واحید و فەرەیدون عەبدول قادر) و دەیان لاوی تر لە هەولێر و خانەقین و بادینان نموونەی ئەو لاوانە بوون، کە لەو رۆژگارەدا خاوەنی هزر و بیرکردنەوەی پێشکەوتنخوازانە بوون!

## سەرەتاکان!

ساڵی ١٩٦٧ لە خانویەکدا، لە گەڕەکی (بەتاوین) کە لە بەغدا گرتبوومان، من و (بەکر حسەین) پێکەوە بووین، لەگەڵ خێزانێکی (گاور) کە ناوی (باوکی ماجید) بوو، دەژیاین! (بەکر حسەین) ئەوکاتە لە کۆلێجی ئەندازیاری قوتابی بوو، منیش لە کۆمەڵناسی لە زانکۆی (مستنصریە) دەمخوێند و هەردووکمان لە (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) دا، کارمان دەکرد! کاتەکانی پشوو لە بارەی بارودۆخی کوردستان و رووداو و رەوتی جووڵانەوەی رزگاریی کوردستان و نەهامەتیەکان و قۆرتەکانیەوە گفتوگۆمان دەکرد! هەردووکمان ناڕازی بووین لەو جۆرە تەنگژەیە، کە باڵی (مەکتەبی سیاسی)، یاخود وەک ئەوەی لەناو خەڵکدا پێیان دەووت (جەلالی)، تێی کەوتبوو! (بە کر حسەین)، لاوێکی زیرەک و ژیر بوو، لەچاو ئێمەدا نووسەریکی باش و لاوێکی بە تواناو هەڵکەوتوو بوو! ئەو کاتە ئێمە ئەو هەڵوێست و کارانەی باڵی (مەکتەبی سیاسی)مان بۆ قووت نەدەچوو، بە کارێکی هەڵە و

خراپمـان دەزانـی، کـە ئـەو باڵـە چـۆن لـە ژێـر چەتـری ڕژێمـی عێراقـدا هێـزی چەکداری خـۆی هەیـە بـە نـاوی پێشـمەرگە! ئاخـر ئـەو پارتـە و هێزەکـەی پـارە و یارمەتـی و چەکیـان لـە حکومەتـی عێـراق، واتـە لـە دوژمنەکانـی مەسـەلەی نەتەوایەتـی کوردسـتان وەردەگـرت و لـە هەمـان کاتـدا شـەڕیان لەگـەڵ هێـزی پێشـمەرگەی سـەر بـە باڵـی (بارزانـی) دا، دەکـرد! ئیتـر ئـەم حاڵەتـە بارودۆخێکـی ئێجگار ناخـۆش و تفت و تاڵـی هێنابووە ئاراوە، بارودۆخێ کە وای کرد بوو، کورد کوردی دەکوشت و دەسـتیان بـە خوێنـی یـەک سـوور دەبـوو !

ئێمـە هـەر تەنها ڕەخنەمـان لە باڵـی (جەلالی) نەدەگرت، بەڵکو ئەوەشمان زۆر لا ناخـۆش بـوو، کـە دەمانبینـی باڵەکـەی تـری جووڵانـەوەی کـورد، باڵـی (مەلایـی)، ئەسـپی خـۆی لەگـەڵ ئێرانـدا تـاو داوە و بـە پشـتیوانی و یارمەتـی (شـا)ی ئێـران دەیەوێـت ئـەو باڵـەی مەکتەبـی سیاسـی لەناوبەرێت و پێشمەرگەکانیشیان بکوژێت! دیـارە ئـەم کارەش بەپێودانـی سیاسـیی ئـەو ڕۆژەگارە، نـەک هـەر کارێکـی هەڵـە بـوو، بەڵکـو (پارتـی) خستبووە بەرەیەکـی خراپ و دوژمنـی ناوچەکەوە! بەرەیـەک، کە ناکۆک بـوو لەگـەڵ تەوژمـی ئـەو شـەپۆلە پێشـکەوتنخوازەی، کـە تـا دەهـات لـە ناوچەکـەدا بـرەوی پەیـدا دەکـرد! ئەمانیـش وەک بەشـێک لـە سـەنگەری ڕژێـم بەرامبـەر (بارزانـی) سـەنگەریان لـە یەکـدی گرتبـوو!

مـن بۆخـۆم لـەو ڕۆژگارەدا، هاوڕێیەتیـم لەگـەڵ هەریەکـە لـە (شاسـوار جـەلال - ئارام - ) و (فازیلـی مـەلا مەحمـود و دارۆی شـێخ نـوری)، خـۆش بـوو. ئـەو دەمـە سـاڵی ١٩٦٨ لێپرسـراوی هەرێمـی بەغـدای (یەکێتیـی قوتابیانـی کوردسـتان) بـووم و کۆبونـەوە و کاریـی ڕۆژانەمـان زۆر بـوو. لەبەرئـەوە پێکهاتیـن هەمـوو لـە خانوویەکـی سـەربەخۆدا لـە گەڕەکـی (وەزیریـە)ی بەغـدا بژین! سـاڵێکی تـەواو لـەو خانووەدا ماینـەوە، هەمیشـە

پێکەوە بووین و گفتوگۆکانمان جگە لە کارەکانی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) و چۆنێتیی گەشەپێدانی، بریتی بوو لە هەمان قسەو باس، کە زۆرجار لەگەڵ (بەکر حسەین و نەرمین عوسمان - نەرمین عوسمان، کە بەهۆی دارۆ و جەعفەرەوە دەمناسی هاورێیەکی نزیکم بوو، کچێکی زیرەک و زۆر باش بوو- و جەعفەر عەبدول واحید) پێکەوە دەمانکرد! گفتوگۆکانیش بەگشتی بریتی بوون لە باسکردنی ناکۆکیی و شەڕی لایەنەکانی کورد و دۆخی ناخۆش و ناهەمواری باڵی (مەکتەبی سیاسی) و چۆنێتیی هاوکارییان لەگەڵ بەغدا و جووڵانەوەی کورد و لایەنە گەش و خامۆشەکانی و کەم و کورتییەکانی بوو! زۆر جاریش لەسەر جووڵانەوەی سۆسیالیستی جیهان و ناکۆکیی نێوان چین و سۆڤیەت و لادانی حیزبە کۆمۆنیستەکان لە ڕێبازی راستەقینە و شۆڕشگێڕانەی خۆیان، هەروەها باسی بیروبۆچوونەکانی (ماوتسی تۆنگ) و ئەو لایەنە گەشەی تێزەکانیمان دەکرد، کە چۆن بایەخ و تایبەتمەندییەکی زۆری داوە بە مەسەلەی نیشتمانی و خەباتی نیشتیمانی دژی داگیرکەرانی وڵاتەکەیان!

ئەو کاتە ئێمە هەموومان لەگەڵ (جەعفەر عەبدول واحید) ی هاوڕێی خوێندن و لایەنێکی گەورەی ژیانم، هەموو لەگەڵ باڵی (مەکتەبی سیاسی) بووین، بەڵام ناڕازی بووین لە هەڵوێستەکانی و زۆر پرسیارمان لەسەر ئەوە دەکرد، کە ئاخۆ ئەو باڵە دەبێت لە رووی بابەتییەوە لەگەڵ باڵی (بارزانی)، نزیکتر بێت و لە دژی رژێمی عێراق لە ململانێدا بێت، یاخود ئەوەی دوژمنایەتی لەگەڵ بکات و هێزە چەکدارەکەی لەگەڵ (بارزانی) شەڕ بکات! ئاخۆ ئەو هاوکارییەی ئەوان لەگەڵ رژێم کارێکی راستە، بەوەی لەگەڵ (بارزانی) دا، لەململانێی خوێناویدا بن و بەمەش جووڵانەوەی کورد ناچار بکەن بە ئاقارێکی نادروستدا رێ

بکات!

نایشـارینەوە ئـەو دەسـتەیە هەموومـان، لەنـاو سـەرکردەکانی ئـەو باڵـەی (پارتـی)دا، جۆرێـک لـە نزیکـی و خۆشەویسـتیمان بەرامبـەر (مـام جـەلال) هەبوو. لای ئێمـە (مـام جـەلال)، پیاوێکی زیـرەک و لێهاتـوو خـۆش مەشـرەف و کاریگـەر بـوو، ئەویـش حـەزی بـە ئاشـنایەتیی ئێمـە دەکـرد و لـە زۆربـەی سـەردانەکانی بەغدایـدا کـۆی دەکردینـەوە و لـە ریسـتورانتی خـۆش داوەتـی دەکردیـن و کتێبـی بـۆ دەهێنایـن! ئێمـەش حەزمـان دەکرد زوو زوو سـەردانی بکەین. چونکە هەمیشـە بـە راشکاوی بیرو بۆچوونەکانی خۆمـان بۆ باس دەکرد و مشـتومڕمان لەگـەڵ دەکرد! (مـام جـەلال) لـەو باسـانەدا زۆرتـر بـەلای بیروبۆچونەکانـی (ماوتسـی تونـگ) و لایەنـە تایبەتییـە نیشـتمانییەکەی چینییەکانـدا باسـەکانی دەبـرد، هـەر ئەویش ئێمـەی بـە تێکۆشـەرەکانی (سـازمانی ئینقلابـی ئێران)ی ناسـاند و لـە ئەنجامـدا بوونـە هاوڕێمـان!

## ئاشنایەتی و هاوڕێیەتیم لەگەڵ (مام جەلال) !

(مام جەلال)، پیاوێکی کاریگەر و خاکیی و دۆستانە بوو، پیاوێکی زیرەک و حازر جواب و دەم بە خەندە و نووکتە خوان بوو. مێژوی ژیان و خەباتی جگە لەو هەڵوێستەی، کە لەگەڵ باڵی (مەکتەبی سیاسی)، بە ناچاری لە دژی (بارزانی) تێی کەوتبوو، ئەگەر رەخنە و هەڵوێستیشمان لەسەری هەبووبێت، ئەوا لە دوایین شیکردنەوەدا مێژوویەکی پڕ لە شانازی و پڕ لە تێکۆشانی هەبووە. (مام جەلال)، لەو رۆژەوە لە (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان)، کاری کردووە، تا ئەو کاتەی لە سەرکۆماری عێراقدا نەخۆش دەکەوێت و بە کردەوە لە گۆڕەپانی کاری دەوڵەتی و سیاسی دادەبڕێت، نموونەی تێکۆشەرێکی گەورە و بە توانا و ژیر و ئازا و چالاک بووە! تەنانەت توانی کارێکی وابکات، کە هەموو لایەنە عێراقییەکان بە شیعە و سوننە و بە کورد و عەرەب و تورکمان و کەمە نەتەوایەتی و ئاینییەکانی ترەوە، بە ئێران و ئەمریکا و وڵاتانی دراوسێشەوە، شاهیدی ئەوەی بۆ بدەن،

کە پیاوێکی باش، سەرۆکێکی سەرکەوتوو، سیاسەتمەدارێکی ژیر، بووە! لە گێژەنی ململانێی سەختی ئایینی و حیزبی و دەستە گەری عێراقییەکاندا، توانی راگرێکی ژیری هاوسەنگی نێوان لایەنەکان بێت و زامنی تێکنەچوونی پێکهاتە جیاجیاکانی عێراق بێت!

کاتی خۆی (مام جەلال)، گەنجترین ئەندامی سەرکردایەتیی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بووە و فەرماندەیی هێزێکی گەورەی پێشمەرگەی وەک (هێزی خەبات)ی کردووە! لە سەرەتاکانی شۆڕشی کورد و کاتی نەبوونی و دەستکورتی شۆڕشدا، توانیویەتی لە نەبەردێکدا بۆ یەکەمین جار چەردەیەکی گەورەی پارە بۆ جووڵانەوەی کورد بە دەست بهێنێت! ئەو کاتە هێنانی ئەو بڕە پارەیە بۆ شۆڕش و هێزی پێشمەرگە کارێکی گرنگ بوو!

(مام جەلال)، وەک خۆی هەموو جار بۆی دەگێڕامەوە.. نێوانی لەگەڵ (مەلا مستەفای بارزانی)دا زۆر خۆش بووە، لە هەموو سەرکردەکانی تری (پارتی) نزیکتر بووە لە (بارزانی) و خاوو خێزانی (بارزانی) یەوە! سەرەڕای رەخنەی تایبەتی لەسەر شێوەی کار و لێکدانەوەکانی (بارزانی)، خۆشەویستی تایبەتی بۆی هەبووە! لە سەردەمی لاوێتی خۆی و دووری (بارزانی) لە وڵات، کە لە روسیا بووە، هەوڵیداوە بتوانێت سەردانی بکات و نامەی بۆ بنێرێت! لەگەڵ خواڵێخۆش بوو (حەمایل) خانی خێزانی (بارزانی)دا، نێوانی خۆش بووە و بە وتەی خۆی وەک کوڕی ماڵەکە وابووە !

(بارزانی) ش بۆ گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٦٣، کە لەگەڵ دەسەڵاتی ئەو زەمانەی (بەعس)دا، کردی بە سەرۆکی شاندی (پارتی)! بەعسییەکانیش نیازی ئەوەیان بوو لە بەغدا تیرۆری بکەن و لەناویبەرن، بەڵام لە سەردانی هەندەران مایەوە و بەردەوام بوو تا گۆڕانکاری لە بەغدا

روینـەدا، نەگەڕایـەوە! لـە چاوپێکەوتنـی (جمـال عبدالناصـر) ی سـەرۆکی میسـر لـە نزیکـەوە ڕەوایـی داواکانـی کـورد و ڕاستییەکانی جووڵانـەوەی کـوردی بـۆ (عبدالناصـر) و سـەرانی میسـر بـاس کـرد و بەمـەش توانـی هـەم نێـوان جووڵانـەوەی کـورد و هـەم نێـوان خـۆی و پەیوەندیـی دۆستانەی لەگەڵ سـەرانی میسـر دروسـت بکات! دواجـار ئـەو چالاکی و پەیوەندییـەش کاریگەرییەکـی باشـی لەسـەر وەزعـی جووڵانـەوەی کـورد لە جیهانـی عەرەبیدا دروستکرد! لـەوەش زیاتـر بـە شـداریی (مـام جـەلال)، لـە سـاڵی ١٩٦٤ لـە کۆنگـرەی (سۆسیالیسـتەکانی عـەرەب)، لـە جەزاییـر و وتـارە بـاش و بـە پێزەکانـی کـە بـە عەرەبـی و بـە نـاوی (سۆسیالیسـتی و سۆسیالیسـتە عەرەبـەکان و مەسـەلەی کـورد)ەوە پێشکەشـی کـرد، توانـی توخمـی لێنەزانین و فەرامۆشـکردنی مەسـەلەی ڕەوای کـورد لـەلای سۆسیالیسـت و ناسیۆنالیسـتە عەرەبـەکان کاڵ بکاتـەوە و سـەرنجی حیزبـە سۆسیالیسـتەکانی عـەرەب ڕابکیشـێ و ببێتـە ئـاڵا هەڵگری برایەتـی کـورد و عـەرەب! لـە ڕووی کوردسـتانی بوونیشـەوە، (مـام جـەلال) هەمیشـە بـە ئەقڵێکـی کـراوەوە تەماشـای مەسـەلەی نەتەوایەتیـی گەلـی کـوردی کـردووە و لـە زۆر سـەردەم و قۆناخـی جیـادا پشـتیوانیی تێکۆشـەرەکانی پارچەکانـی تـری کوردسـتانی کـردوە و بەلایـەوە کارێکـی هەڵـە بـووە بـۆ وەرگرتنـی کۆمـەک و پشـتیوانی ئێران، دژایەتـی خەبـات و تێکۆشـەرەکانی کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات بـکات!

جگە لـەوەی کـە ڕۆڵێکـی دیـاری هەبـوو لـە بڵاوبونەوەی بیروباوەڕی چەپ و پێشـکەوتنخوازیدا، بە گوفتار و بە وتار و نووسینەکانیشـی لە پشـتیوانی کـردن و دامەزرانـدن و گەشـەکردنی (کۆمەڵـە)دا، نەخشـی بەرچـاوی هەبوو! هـەروەها لـە دامەزراندنـی (یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان)دا، ڕۆڵـی سـەرەکی و کاریگـەری نوانـد. دوای هەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش و لـە

گەرمەی خەبات و تێکۆشانی ساڵانی خەباتیدا، لە شەڕ و گفتوگۆکاندا، لە کاری سیاسی و دیپلۆماسی و نێودەوڵەتیدا، لە قسە کردن لەگەڵ سەرانی عێراق و وڵاتانی دراوسێدا، هەمیشە پیاوێکی ڕەوانبێژ و ئازا و خاوەن هەڵوێست بووە! لە شاخیش هێندە کاریزمای بەهێزی بەسەر (کۆمەڵە) و (یەکێتی) و سەرکردەکان و ڕووداوەکانەوە هەبووە، کە کەس نەیتوانیوە ڕۆژێ لە ڕۆژان نادیدەی بگرێ! تەنانەت لەم ساڵانەی دواییدا و لە ڕۆژانی سەرکۆماریدا نەخشی بۆچوون و هەڵوێستەکانی (مام جەلال)، بەسەر عێراق و عێراقییەکانەوە وەک ڕۆژی ڕوون دیار بووە! بۆیە لەتەک وەزعی تەندروستی ئەمڕۆیشیدا، کە لەسەر کورسی (ویلچەر)یشە، هێشتا ناتوانرێ فەرامۆش بکرێت! لە بێگانە و لە عەرەب و ئێرانی و تورک و لە هەموو لایەکەوە دەچنە سەردانی و دەخوازن بزەیەکی ڕەزامەندی لەسەر لێوی و بریسکەی سۆز لە چاوەکانیدا ببینن! لەم دواییەشدا لە کاتی ڕێککەوتنی (گۆڕان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان)دا، هەر دوو لایەنەکە دڵنیا نەبوون، کە بەبێ دەرکەوتن و ئامادەیی (مام جەلال)، لەکاتی ئیمزاکردندا دەتوانن ڕەزامەندی لایەنگرانی (یەکێتی) و جەماوەرەکەی مسۆگەر بکەن!

کاتی خۆی زۆر جار ڕێک دەکەوت لە سەفەر و هاتوچۆ و کارەکاندا لە نزیکەوە لەگەڵیدا بووم، بەچاوی خۆم ئازایەتیی کەم وێنەم لەو زاتە دیوە! ڕەنگە شەڕەکەی لەگەڵ (تاریق عزیز)، سەرۆکی شاندی حکومەتی بەعس لە ساڵی ١٩٨٤دا، یەکێک بێت لە نیشانەکانی بوێریی ئەو زاتە! ئەو باسە لەلایەن (نەوشیروان مستەفا) وە لە کتێبی (خولانەوە لەناو بازنەدا ١٩٨٤ - ١٩٨٨) باسکراوە، منیش لە شوێنی خۆیدا جارێکی تر بە درێژی لەم کتێبەدا باسی لێ دەکەمەوە. لە شەڕەکانی پەلاماردانی سەرکردایەتیی لە ناوچەکانی قەندیل و سەری مامەندە،

ئەو شاخەی بە پشت بارەگاکانی خۆیەوە بوو، چەند جارێکی تریش بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، لە ناوچەکانی یاخسەمەر و دۆلی جافایەتی و زۆر شەڕ و نەبەردی تردا، هەمیشە بە نموونەی سەرکردەیەکی ئازا و خۆگر و ورە بەرز بە قامەتی بڵندەوە وەک شاخ راوەستاوە!

سەرەتای دۆستایەتیم، گەرچی ئێمە هەموو (مام جەلال) مان دەناسی، ئەویش چەندین جار منی لەگەڵ شەهید (عەلی عەسکەری)دا، بینی بوو، بەڵام بۆ یەکەمین جار گەرم بوونی پەیوەندیمان بەهۆی نامەیەکی (عەلی عەسکەری)ەوە بوو، کە بۆ یارمەتیدانم لە گۆڕینی کۆلێژی زانکۆی خوێندنم، تا لای دۆستە عەرەبەکانی هەوڵێکم بۆ بدات، کۆلیژەکەم لە زانکۆ بۆ بگۆرن! سالی ١٩٦٧ کاک (عەلی)، لە نامەکەیدا جگە لەوە، کە نیشانی دابوو من بە خزمایەتی و برایەتی ئاشنای ئەوم، خوا هەڵناگری هەندێکیش ستایشی کردبووم. منیش نامەکەم بۆ (مام جەلال) برد لە بەکرەجۆ و دامە دەستی. پاش خوێندنەوەی نامەکە هەندێ بە قسەی خۆش رووی پێدام و پرسیارێکی زۆری لێکردم لەبارەی خوێندن و دۆخی بەغدا و (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان)ەوە و هەواڵی هاورێکانمی لێ پرسیم، منیش لاوێکی قسە قوت و بزێو بووم، دوای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئەو، لێم پرسی: ئەرێ (مام جەلال) بەم بارو دۆخەی کورد و بەم هەموو ناکۆکیی و ململانێیەوە لەناو ئەو هەمووە دوژمن و داگیرکەرەدا، هیوای بە رزگار بوونی کوردستان هەیە! ئەویش بە نوکتەیەک وەڵامی دامەوە و وتی: بۆ خۆشی نوکتە دەڵێن.. رۆژێک سەرۆکی (یەکێتی سۆڤیەت) دەچێتە حزووری خودا، لێی دەپرسێ کە ئاخۆ کەی سۆسیالیستی سەردەکەوێت و چیتر دونیای سەرمایەداری و چەوسانەوەی چینایەتی نامێنێت؟ لە وەرامدا خودای

گەورە پێیدەڵێت.. ئەو هیوایە لە تەمەنی تۆدا نایەتە دی، ئیتر ئەو سەرۆکە دەست دەکات بە گریان و دێتە دەرەوە! پاش ئەو سەرۆکی (ئەمریکا) دەچێت و دەپرسێت.. ئەی ئاخۆ کەی کۆمۆنیستی تێکدەشکێت و هەموو دونیا دەبنە دۆستی جیهانی سەرمایەداری! بەویش دەڵێت ئەوە لە تەمەنی تۆدا نابینرێت، ئەو سەرۆکەش بە گریان دێتە دەرەوە! ئەنجا سەرۆکی (فەلەستین) دەچێتە حزوری و دەپرسێت.. قوربان ئەی ئێمە کەی رزگار دەبین! خودا بۆی دەگری و دەفەرموێ، ئەوە لە تەمەنی منیشدا نیە! بە قاقایەکی خۆشی پێکەنین، وتی کاری تێکۆشەر ئەوە نییە گرنتی رزگار بوون بە کەس بدات، دەتوانێت بەڵێنی تێکۆشان و کۆڵنەدان بە خەڵکی بدات و هیچی دی! پاشان نامەیەکی بۆ نووسیم بۆ (دکتور عبدالله سلوم السامرائی) و وتی نامەکەی بۆ بەرە لە کۆلێژی (الشریعة) دەیدۆزیتەوە. ئەویش هەرچی بتوانێت بۆ کارەکەت یارمەتیت دەدات! جگە لەوەش وەڵامێکی نامەکەم بۆ دەنوسێتەوە بۆ خۆمی بهێنەرەوە! ئیتر گەڕامەوە بۆ بەغداد و کابرام دۆزیەوە و ئەویش پاش تەواوبوونی وانەکەی، کە بەخوێندکارەکانی دەوتەوە بە رۆژێک کارەکەی بۆ کردم و بۆ رۆژی دواییش لەسەر داوای خۆی چوومەوە و بە سواری ئۆتۆمبیلێکی کۆنی (ئۆپل)، کە مۆدیلی ١٩٥٨ بوو، لەگەڵ خۆی بردمی و وەڵامی نامەکەی بۆ (مام جەلال) نووسیەوە و منیش هێندەی بۆمکرا بە پەلە بردمەوە بۆی! دواتر تێگەیشتم هەندێ بیروڕا و بڕیارەکانی حیزبی (بەعس)ی بۆ باس کرد بوو، کە بە باشە لەسەر دۆزی کورد بڕیاری لێدرابوو!

لەو کاتەوە ئیتر بەرە بەرە پەیوەندیم لەگەڵ (مام جەلال)، پەرەی سەند! تا جارێکیان بۆ سوپاس سەردانم کردەوە، شەو لە بەکرەجۆ گلی دامەوە و لەسەر گەلێ باسی جیاجیا قسەی لەگەڵ کردم. بۆ

ئەوکاتە و بۆ منی خوێندکارێکی زانکۆ و ئەویش سەرکردەیەکی ناودار و خۆشەویست پەیوەندییەکی گرنگ و ساتێکی خۆش بوو!
لە ساڵی ١٩٦٨ دا، جاروبار کە دەهاتە بەغدا، کاتێک دەرفەتێکی دەست بەتاڵی دەبوو، حەزی دەکرد  لەگەڵ خوێندکارەکان تێکەڵ بێت و بۆ ئەوەش  دەینارد بە شوێن ( فازیلی مەلا مەحمود  و ئارام و  دارۆی شێخ نوری) و مندا، داوەتی دەکردین بۆ نان خواردن و لەوێش قسە و باسی زۆری دەربارەی جووڵانەوەی خوێندکاران و جووڵانەوەی رزگاری نیشتیمانیی کوردستان و شۆڕشی چین و گەلێک بابەتی تری لەگەڵ دەکردین! دواتر لە ساڵی ١٩٦٩ دا، ئەو چاوپێکەوتنانە و سەردانەکانی ئێمەش بۆ لای ئەو لە بەکرەجۆ، گەرمتر و دۆستانە تر پەرەی سەند! سەردەمی هەواڵەکانی وتووێژی بەعس و (بارزانی)، (مام جەلال)، هاتبوو بۆ بەغدا، دەورەیەکی کادیرانی بۆ کادرە حیزبی و خوێندکارییەکانی بەغدا رێکخست، لەو دەورەیەدا لە خوێندکاران (فازیل و دارۆ و کاک ئارام، فازیل تەیب و حەمە قەرەداخی و حەمید بلّباس و محەمەد عوزێری، عبد الرزاق فەیلی، سەربەست بامەڕنی، مامۆستا ئەحمەد و شێخ محەمەدی چینی و جەعفەر عەبدول واحید) و من و هەندێکی تریش ئامادە بوون!  جگە لە وانەش کاک (شەهابی شێخ نوری) و کوڕێکی تر بەناوی ( ئیبراهیم میرانی) ئامادە بوون! (مام جەلال) وانەی پێ دەوتینەوە و زۆر بابەتی گرنگی بۆ شەرح دەکردین، بەتایبەتی مەسەلەی چۆنیەتیی کۆکردنەوەی هێزە نیشتیمانییەکان لە قۆناغی رزگاری نیشتیمانی کوردستاندا و هاوکات تێزەکانی (دیمترۆف)، کە کتێبێکی لەسەر (الجبهە الوطنیە المتحدە) نوسیبوو، داوای لێکردم  بە تایب و رۆنیۆ بۆ بڵاوکردنەوە  بۆی تایپ و ئامادە بکەم! منیش هێندەی لە توانامدا بوو، عەسران چەند سەعاتێک خەریکی دەبووم و لە

ماوەیەکی کەمدا تەواو ئامادەم کرد! لەکاتی چاپکردن و راستکردنەوەی نووسینەکانی کتێبەکەدا لەگەڵ (مام جەلال) و پێکەوە بوونی زۆرم لەگەڵیدا، هێندەی تر پەیوەندی نێوانمان پەرەی سەند! ئیتر دوای ئەو ماوەیە (مام جەلال)، کتێبی زۆری دەدامێ بیخوێنمەوە، تەنانەت کاتی پشوودان و پاش نیوەڕوان بانگی دەکردمە لای خۆی و ئەو کتێبانەی لێ دەپرسیمەوە و باسەکانی بە وردی لەگەڵم تاووتوێ دەکرد! (مام جەلال) سەرەڕای سەرقاڵی خۆی کاتێکی زۆری بۆ پەروەردە کردنی من تەرخان کرد بوو، منیش بەوە شاد و خۆشحال بووم و بە پێزانینەوە باسم دەکرد! ئیتر لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا، زیاتر شارەزای (مام جەلال) بووم و لەوە تێگەیشتم، کە بەشێکی ئەو خۆ ماندوو کردنەی بۆ ئەوە بوو، کە هەوڵی زیاتر بدات و زۆرتر بەو باسانەدا بچێتەوە تا باشتر لە مێشکیدا بچەسپێت! (مام جەلال) خوویەکی هەبوو، کە کتێبێکی دەخوێندەوە، ئەو باسانەی لای گرنگ بوو لەگەڵ خەڵکی نزیکی خۆی دووبارە باسی لێدەکردنەوە، تا لە مێشکیدا بچەسپێت! زۆری ئەو کتێبانەش بریتی بوو لە کتێبە وەرگێڕاوەکانی (ماوتسی تۆنگ) بە زمانی عەرەبی! منیش ئەو چاکەیەی ئەوم هەرگیز بیر ناچێ، کە نەک هەر هانی دەدام بۆ کتێب خوێندنەوە، بەڵکو یارمەتیشی دام بەو شێوەیەی خۆی لە مێشکمدا بچەسپێت و بیرم نەچنەوە!

هەر لەو ساڵەدا (مام جەلال)، ئەرکی یارمەتیدان و شاردنەوەی هەندێ کەسی هاوڕێی ( عەبدول الاە نصراوی) پێسپاردم.(نصراوی) ئەمینی گشتی (جوولانەوەی سۆسیالیستی عەرەب)ی بوو، یەکێک بوو لە سەرکردە مارکسیەکانی جوولانەوەی سۆسیالیستی عەرەب و کەسایەتیەکی ناسراو بوو، هاوڕێیەکی نزیکی (مام جەلال) بوو! بە ئەرکی خۆی دەزانی یارمەتی ئەو تێکۆشەرە پێشکوتنخوازانەی عەرەب

بدات! منیش بە باشی بەو ئەرکە هەڵسام و جگە لە شاردنەوەی (جواد الدوش)، ماڵی براکەی (نصراوی)ش، کە (ستار)ی ناو بوو، دۆزیمەوە و لە نزیکەوە هەواڵی ئەومان پەیدا کرد و بەردەوام ئاگاداری حاڵ و وەزعی خانەوادەکەیان بووم و لەسەر هەموو شتێکیان (مام جەلال)م ئاگادار دەکردەوە. بەو کارەش تادەهات هەنگاوێکی تر پەیوەندی و دۆستایەتیم لەگەڵ (مام جەلال) بەهێز تر دەبوو!

## شەهید (شەهابی شێخ نوری) !

کاریگەریی هاوڕێیەتیی (مام جەلال) لەلایەک و هی ئەو دەستە شۆڕشگێڕەی (سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەی ئێران)، لەسەر هەموومان بەگشتی و لەسەر من بەتایبەتی، کاریگەری زۆریان دانا! (مام جەلال) خۆی و ئەو تێکۆشەرانەش کەسانی خوێندەوار و پڕ زانیاری و شارەزا بوون، کەسانی خاوەن بەهرە و بەتوانا بوون! ئێمە ئەو کاتە شارەزایی و زانیارییەکی کەممان لەسەر (مارکسیزم - لینینیزم) هەبوو، ئەوان لەچاو ئێمەدا دەریایەک زانیارییان هەبوو، زۆربەیان ساڵەهای ساڵ بوو لە وڵاتانی ئەوروپا لەگەڵ ناوەندە فیکرییەکان و ڕێکخراوە چەپەکانی ئەو وڵاتانەدا ئاشنایەتی و تێکەڵیيان هەبوو، بە چەندین زمانی ئەوروپایی کتێب و سەرچاوەی زۆریان خوێندبووەوە و چەندین کۆرسی تایبەتیی تیۆرییان لەمەڕ ئەو بابەتانە لە چین و کوبا خوێند بوو! خۆشیان بە ئەرکی خۆیان دەزانی چەندە بکرێت ئەو بیروباوەڕە بڵاوبکەنەوە و تەقەلا بدەن بنکە و ناوەندی

شۆڕشگێڕانە لە شوێنی جیاجیادا دابنێن! ئەوانە کەسانی سەروزمان خۆش و ڕەفتاریان جوان و پەیوەندییان هاوڕێیانە و توندوو تۆڵ بوو! لە ئاکاریاندا هەمیشە ڕەوشتێکی بەرزیان نیشان دەدا! هەموو ئەو شتانە بۆ ئێمە جیگەی سەرنج و ڕاکێشانی هەستمان بوون! ئاخر بۆ ئێمە دیاردەیەکی نۆی بوو، ببینین تێکۆشەری لەوجۆرە دێنە کوردستان و وەک پێشمەرگە لەکاتی تێکەوتندا ئازایانە ڕەفتار دەکەن! لەپاڵ کاری پزیشکیدا هاوکاریی خەڵکیان دەکرد و بە مەبەستی کاری ڕێکخراوەییش سەردانی کوێت و وڵاتانی کەنداو و ئەفغانستانیان دەکرد و ماندو بوونیان نەدەناسی! زۆر جار ئێمە لە بەکرەجۆ سەردانمان دەکردن و گەلێ جاریش هەندێ لەوان سەردانی بەغدایان دەکرد و لەگەڵیان کۆدەبووینەوە و گفتوگۆمان دەکرد. (کورشی لاشایی، ئیرەجی کەشکۆلی و خەسرەوی سەفایی)، هەندێ جار دەهاتن لە ماڵەکانی ئێمەدا لەگەڵماندا دەمانەوە! (ئیرەجی کەشکۆلی) لەوانی تر زۆرتر خەریکی فراوانکردن و بایەخدان بوو بە پەیوەندییەکانی، دواتریش پەیوەندی و هاوڕێیەتییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ (شەهابی شێخ نوری) دا، پەیدا کردبوو! (خەسرەو)یان، کەسێکی تایبەتی بوو، تێکۆشەری وەکو ئەو لە مێژودا بە دانسقە پەیدا دەبێت، ژیر، هوشیار، خاکی و و پڕ لە زانیاری و شارەزایی! ئەم هاوڕێیە ئێجگار خۆی خۆشەویست کرد بوو! ناوی خۆی نابوو (قوباد )! ( مام جەلال) لە خۆشەویستی ئەو، دووەم کوڕی خۆی ناونا (قوباد) - قوبادی مام جەلال ئێستا جێگری سەرەک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە - لەناو ئەوانەدا کاک (شەهاب)، پەیوەندییەکی توندو تۆڵ و هاوڕێیەتی لەگەڵ (ئیرەجی کەشکۆلی - کاک ئیسماعیل - ) دا، پەیدا کرد بوو!

ئەگەرچی من هەر لە کۆنەوە هاتووچۆی ماڵی (شێخ نوری شێخ سالح)

م دەکـرد لـە سـلێمانی، (دارۆی شـێخ نـوری)م  لـە سـەرەتای منداڵییـەوە دەناسـی! هـەر لەمنداڵییـەوە (دارۆ و شاسـوار جـەلال و فازیلـی مـەلا مەحمـود) و مـن ناسـیاو بوویـن و خێزانەکانمـان یەکتریـان دەناسـی و دواتریـش بوییـنـە هاورێـی هەمیشـەیی و نزیکـی یەکتـر! (دارۆ) پووریکـی هەبـوو بەڕێوەبـەری قوتابخانـەی (زەهـرا )ی سـەرەتایی کچـان بـوو لـە سلێمانی، باوکـم ویسـتی لـە قوتابخانـەی سـەرەتایی وەربگیرێـم، ئەوکاتـە وەرگرتـن لـەو تەمەنـەدا یاسـایی نەبـوو، لـە ماڵـەوە هەوڵیانـدا تەمەنـم سـاڵێک گەورەتـر بنووسـن، دواییـش لەبـەر کەمـی تەمەنـم قبووڵیـان نەکـردم، ( دارۆ) ش  هەمـان کێشـەی هەبـوو، ئیتـر لەگـەڵ باوکـم چووینـە لای پـوری کاک (شـەهاب)، هەردووکمانیـان بـە گوێگـر لـە قوتابخانـەی (زەهـرا )ی کچـان  قبـوڵ کـرد! لـە سـەرەتادا لـە پۆلەکەدا، واتـە پۆلـی (یـەک) جێگەمـان نەبـوو، بۆیـە لەسـەر دۆشـەکڵە دایاننیشـاندین تـا دواتـر مێزیکـی تەختەیـان بـۆ پەیداکردیـن، بۆیـان دانایـن! پـوری کاک (شـەهاب)، ژنێکـی باشـی نموونەیی و مامۆسـتایەکی دڵسـۆزی بـواری پـەروەردە و فێرکـردن بـوو. ئێمـەی قـەرزاری دڵسـۆزیی خـۆی کـرد!

پـاش ئـەوە مـن رۆیشـتمە خوێندنگـەی سـەرەتایی (گۆیـژە) و دواتریـش چوومـە قوتابخانـەی (فەیسـەڵیە)ی کـوڕان لـە سـلێمانی، ئیتـر (دارۆ) و مـن هەمـوو خوێندنـی سـەرەتایی و ناوەنـدی پێکـەوە بوویـن و هەمیشـە هاوڕێـی یـەک بوویـن و لـە زۆر قۆناغـی تریشـدا پێکـەوە بوویـن و تێکـەڵاوی خێزانیشـمان بـەردەوام بـوو! لـە دوورەوە وەک و برایەکـی گـەورەی (دارۆ)، کاک (شـەهاب) کێشـە و گرفتەکانـی کاری سیاسـی ئـەوم بـەر گـوێ دەکـەوت، بـەڵام هاوڕێیەتـی راسـتەوخۆ و دۆسـتایەتیم لەگـەڵ کاک (شـەهاب) لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٠ لـە بەغـدا دەسـتی پێکـرد! ئـەو دەمـە ئـەو لـە بەسـرەوە گەڕابـووەوە بـۆ بەغـدا. چەنـد جـارێ رێکـەوت

لە سەردانی (مام جەلالـدا، گفتوگۆی فراوان و هەمە لایەنەمان دەکرد، گفتوگۆ و بابەتی قسە و باسەکانمان بووە هۆی فراوان بوونی پەیوەندی و چاو پێکەوتنی زیاترمان لەگەڵ یەکتر! من لەگەل کاک (شەهاب)، هاوبیروڕا بووین و دەربارەی هەڵەی هاوکاری (مەکتەبی سیاسی) لەگەڵ حکومەتی بەعس، رەخنەمان لە سەرکردایەتیی جووڵانەوەی کورد و لە هەر دوو لایەنەکە وەک یەک و بە هەمان ئاراستە بوو! یەک دوو مانگ بەر لە ڕێککەوتننامەی ١١ ئاداری ١٩٧٠، هەندێ وتار بۆ زەمینە خۆشکردنی پەیوەندی و گفتوگۆ لەنێوان بەغدا و (بارزانی) لە رۆژنامەکاندا بڵاوکرابوونەوە. چەند وتارێک لەسەر مەسەلەی کورد لە (الثورة العربیة)ی تایبەتی (بەعس)دا، لەگەڵ وتارێکی (حەمید عوسمان) کە بەناوی (سلیم سوڵتان) ئەینووسی، لەو وتارانە بوون، کە ئەو کاتە بڵاوبوونەوە! ئێمەش بەتایبەتی کاک (شەهاب) و من وەک باقی خەڵکی، هەمیشە دەروازەی قسە و باسەکانمان لەمەڕ چۆنیەتیی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بەو ئاراستەیە دەخستە ناو خەڵکەوە! بۆیە زۆربەی جار چاوپێکەوتنەکانمان لەگەڵ کاک (شەهاب)دا، باسی مەسەلەی کوردمان تاوتوێ دەکرد و لە ئەنجامی شیکردنەوە و لێدوانی دوو قۆڵیدا هەردووکمان گەیشتینە ئەو بڕوایەی، کە ئەوە دەبێتە بەرەبەیانی گفتوگۆکردن لەگەڵ (بارزانی)دا و پشتکردنە باڵی (مەکتەبی سیاسی) و بگرە بە تەواوبونی رۆڵی ئەو لایەنە و دوایین گێمی ئەو یاری و هاوکاری و دەست تێکەڵ کردنە کۆتایی دێت! بۆ ئەو مەبەستە لە دەرفەتێکدا هەردووکمان پێکەوە سەردانی (مام جەلال) مان کرد و ئەو بیروڕایانەی خۆمانمان بە راشکاوی لەگەڵ باس کرد! دیار بوو ئەو زانیاری زۆرتری لابوو، باسی کرد، کە بەڵێ بە کردەوە جموجووڵێک بەو ئاقارەدا دەستی پێکردوە و (عەزیز شەریف) و رووسەکانیشی

تێدایە و پێیشی وابوو، کە ئەو جمووجووڵە بە رێککەوتنی هەردوولا کۆتایی دێت، کە دواتریش دەرکەوت وا دەرچوو!
ئیتر بەرەبەرە هاورێیەتی کاک (شەهاب) و من و هەردووکمان لەگەڵ (فازیلی مەلا مەحمود)، پەرەی سەند و بەمەش لەسەر مەسەلە سیاسییەکان و دەنگ و باسەکانی رۆژ پێکەوە قسەمان دەکرد و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و بۆچونەکانمان دەکرد! ئیتر بەو چەشنە رۆژ لە دوای رۆژ هەڵسەنگاندمان بۆ دیاردە و رووداوە سیاسی و ئابورییەکان تا دەهات لەیەکتر نزیکتر دەبونەوە و لە ئەنجامدا لە زۆر روەوە بەتەواوی هاوڕا بووین!
بیرم دێت ئەو سەردەمە من و کاک (شەهاب)، زوو زوو باسی ساڵی رابوردوو و رووداوەکانی ڤێتناممان دەکرد. ئاخر ئەو کاتە زەمان زەمانی (ریتشارد نیکسۆن) بوو، بۆیە باسەکان بە گەرمی خۆیان هاوێشتبووە ناو شەڕی ڤێتنامەوە، چونکە تا کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ زیاتر لە ٥٤٠٠٠٠ پێنج سەدو چل هەزار سەربازی ئەمریکی، فرێدرابونە دۆزەخی ئاگری شەڕی ڤیتنام و بەمەش لەوپەڕی دنیاوە شەڕێکی زۆر خوێناوی و درندانە لەگەڵ گەلێکی ئازادیخواز بەرپا بوبوو! دیمەنی ناشیرینی ئیمپریالیزم لەو ساڵەدا، کە ئەیلوولی رەشی دژی فەلەستینییەکان تیا روویدا و هاوکات لە مانگی تشرینی هەمان ساڵدا ئیسرائیل بە رۆکیت توپبارانی بارەگای (رێکخراوی رزگاری فەلەستین)ی کرد و پێدانی ٢٥٠ تانکی جۆری (سنتریون) لەلایەن بەریتانییەکانەوە بە ئیسرائیل، لەو رووداو و کارەساتە ناخۆش و گەورانە بوون، کە دژ بە جووڵانەوەی گەلانی ئازادیخواز بەرپا بوبوو! کاک (شەهاب) بەو رووداوانە بە چەشنێک گڕی گرتبوو، بەجۆرێ لە مەسەلەکان دەدوا، وایدەزانی باسی کورد دەکات و پەلاماری سلێمانی دراوە! ئیتر بەردەوام گفتوگۆی

جۆراوجۆرمـان دەکـرد و هــەر جـارەی باســی مەســەلەیەکمان دەکـرد! دەمێک مەسـەلەی لیبیـا و شۆڕشـی فاتیحـی (قەزافـی) و لادانـی پاشـای لیبیـا ( ئەدریـس ) لـەو مەسـەلە گەرمانـەی رۆژ بـوو، کـە ئێمـە لێـی دەدوایـن! ئیتـر قسـەو باسـمان تاووتوێکردنـی رووداو و دەنـگ و باسـەکانی ئـەو کۆبوونەوانـە بـوو، کـە لەگـەڵ (عبدالناصـر) دەکـرا! کاک (شـەهاب) ئـەو رووداوانـەی بـە نیشـانەی پاشـەکشێی قەڵاکانـی زۆرداری و چەوسـاندنەوە لـە قەڵـەم دەدا و بـاس هـەر باسـی ئـەوە بـوو، کـە ئاخـۆ حوکمـی نـوێ چـۆن دەبێـت! کاک (شـەهاب) دەیگـوت هەرچۆنـی بێـت هەنگاوێکـە بـۆ پێشـەوە! رۆژێکیـان لـە گەرمـەی ئـەو قسـانەدا بوویـن، کاک (شـەهاب)، برسـی بـوو،، وتـی بابچیـن بـۆ لای (ئەبـو یۆنـان) لـە (علویـە) هەمبورگـەرە خۆشـەکەی بخۆیـن، ئیتر ئەوەندەی نەبرد بـە سـواری پاسـی پۆلۆنـی خۆمـان گەیانـدە لای (ئەبـو یۆنـان) بـۆ کوبـە خـواردن!

## ڕێککەوتن و بەیانی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ !

حیزبی (بەعس)، لە سەرەتادا حیزبێکی گەورە نەبوو، رابوردوو و ناوبانگێکی جوانی نەبوو! تاقیکردنەوەکانی ساڵی ١٩٦٣ و کودەتاکەیان بەسەر (قاسم)دا و کارە توندڕەوەکانیان دژ بە هەموو هێزە پێشکەوتنخوازەکانی عێراق و دژ بە (شیوعی)ەکان و گەلی کورد، لەو تاوانە هەرە دزێو و کارە قێزەونانەی (حەرەس قەومی)یەکانی بەعس بوون، کە هێشتا بیر نەچووبوونەوە! بەعسییەکان سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ لاوازیی حکومەت و دەسەڵاتی (عبدالرحمن عارف)ی سەرکۆماریان بە هەل زانی، بۆ ئەوەی کودەتا بکەن و جارێکی تر لە عێراقدا دەسەڵات بگرنە دەست! بۆیە..

- لەگەڵ (پارتی دیموکراتی کوردستان)، سەرکردایەتی (بارزانی)، قسەیان کرد تا هاوکاری و بەشدارییان بکەن، بەڵام (بارزانی) رازی نەبوو!

- لەگەڵ سەرکردایەتیی پارتی (باڵی مەکتەبی سیاسی)، قسەیان کرد

و شەخسی (احمد حسن بکر) قسەی لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی) کرد بۆ ئەوەی هاوکارییان بن و هەوڵ بدەن لەگەڵ (عەزیز محەمەد) قسە بکەن، تا هاوکاری و پشتیوانی ئەوانیش بە دەست بهێنن، بەڵام هیچ لایەکیان رازی نەبوون! ئیتر حیزبی (بەعس) بە سەرۆکایەتیی (احمد حەسن بکر) و بە یاوەری ( صالح مهدی عماش) و بە هاوکاری تاقمی (عبدالرزاق النایف)، کە ئەو کاتە ئەفسەری سوپا بوو - جێگری سەرۆکی هەواڵگری سەربازیی عێراق - بوو، (ابراهیم الداود) فەرماندەی گاردی کۆماری و (حردان تکریتی) توانان کودەتا بکەن و دەسەڵات بگرنە دەست! لەکاتێکدا ئەو پێکهاتەیە، کە پێکەوە کودەتاکەیان کرد ئاوس بوو بە چەندین ناکۆکیی ناوخۆیی توند!

ئیتر بەو چەشنە رۆژی ١٩٦٨/٧/١٧ بە بەیانی ژمارە ١٩ ناوی کابینەی حکومەتە نوێکەیان راگەیاند و هەر یەکە لە (موسلیح نەقشبەندی بە وەزیری داد، ئیحسان شێرزاد بە وەزیری کار و شارەوانییەکان، دکتور عەبدوڵا نەقشبەندی بە وەزیری ئابوری و موحسین دزەیی بە وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکوور و ساڵح یوسفی وەزیری دەوڵەت) دیاریکران! کە هەر هەموویان کورد بوون!

زۆری نەخایاند، پاش دوو هەفتە لەو کودەتایە بۆ جاری دووەم بە کودەتایەکی تر لە ٣٠ تەموزی ١٩٦٨ دا ، (حیزبی بەعس و احمد حسن بکر) هەر یەکە لە (عبدالرزاق نایف، سەرۆک وەزیران و ئیبراهیم داود، وەزیری بەرگری) و هەندێ لە هاوکارەکانی تریان لادا و بەمەش حیزبی (بەعس) بۆ خۆی بەتەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست! لە گۆڕینی کابینەی نوێی حکومەتەکەی (بەعس)دا، دوو پلەداری سەربازیی گەورە، جگە لە (بکر) هەر یەکە لە (حردان تکریتی و صالح مهدی عماش) بە جێگری سەرەک وەزیران دانران و (موحسین دزەیی و ئیحسان شێرزاد)

یش، لە نوێنەرانی (بارزانی)، بە وەزیر دانرانەوە! ئیتر لەو رۆژەوە (صدام حسین)، بە ئاشکرا دەرکەوت و پلە پلە بە هەنگاوی گەورە پێشی هاورێکانی دایەوە، تا لەماوەیەکی کورتدا بوو بە ئەندامێکی دیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و لە ئەنجامدا ساڵی ١٩٦٩ بوو بە جێگری سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە، کە سەرکردایەتیی دەسەڵاتی عێراقی دەکرد!

پاش ئەوەی سەرکردایەتیی حیزبی (بەعس)، توانی شەریکە ناودارەکانی کودەتاکەی لەناوبەرێ، بەڵام هێشتا ترس و دڵەڕاوکێ بنبڕ نەبوبوو! چونکە لەلایەکەوە هێشتا پاشماوە هاوسۆزەکانی ئەو ئەفسەرە نەیارانەیان مابوو، لەلایەکی تریش ناکۆکییەکانی باڵی مەدەنی دژی باڵی سەربازی ناو خودی دەسەڵاتی بەعس، تا دەهات روو لە زیاد بوون بوو! بۆ نموونە یەکێ لە نەیارە دیارەکانی(صدام) و باڵی مەدەنی، کە (حردان تکریتی) بوو، ئەوکاتە فەرماندەی هەموو هێزی ئاسمانی عێراق و ئەندامی ئەنجومەنی شۆڕش و ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی (بەعس) و بریکاری فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی عێراق بوو، تا ١٩٧٠/١٠/١٥ لە پۆستە باڵاکانیدا مایەوە و لە ١٩٧١/٣/٣٠ لە کوێت بە دەسیسەی (صدام حسین) تیرۆر کرا! داهاتی نەوتیش لە عێراقدا وەک (دکتور فەخری قدوری ) لە کتێبی (رحلە ٣٥ عاما فی حزب البعث)دا، نووسیویتی، لە ١٧٠ ملیۆن دینار تێپەری نە دەکرد! لەلایەکی تریشەوە رژێمی عێراق نەیتوانیبوو جێگەی خۆی لەناو کۆڕی دەوڵەتانی عەرەبیدا خۆش بکات! سوریا و میسر و دەوڵەتانی گرنگی عەرەبی شیر و تیریان لێ دەسوویی و هەرچی هێزە ناسیۆنالیست و دیموکراتەکانی ناو عێراقیش هەبوون، بە چاوی بەدبین سەیری (بەعس) و هەنگاوەکانیان دەکرد! لەگەڵ (بارزانی) و کوردیشدا هێشتا

گیروگرفتی زۆری مابوو. ئەوانە هەموو لەتەک هەڵویستی (شا)ی ئێراندا لەو هۆیانە بوون، کە بواریان نەدەدا (بەعس)، بێمنەت هەلوێست لە کورد و جووڵانەوەکەی وەرگرێت! بۆیە زوو کەوتنە بیرکردنەوە لە لادانی ئەو مەترسییە گەورەیەی، کە پێیوابوو لە درێژە کێشانی کێشەکەدا ئێران و ئەمریکا زیاتر و فراوانتر دەستی تێوەر دەدەن!

بۆ ئەو مەبەستەش (احمد حسن بكر)، خۆی سەردانی (تاڵەبانی) و پاشان (ئیبراهم ئەحمەد )ی کرد و داوای بەشداری لە کابینەی وەزارەتدا لێکردن! ئەوانیش بەدەم گومان و دڵە راوکێوە لە دەرەوەی بازنەی حیزبەکەیان، دوو کەسایەتی ناسراوی ئەو کاتەیان بەرەوڕوو کردنەوە، کە ئەوانیش بریتیبوون لە (تەها محی الدین مەعروف و فەوزی سائب)! حیزبی (بەعس) بەتەنها یەکەمیانی لێ قبوڵ کردن و دووەمیانی فەرامۆش کرد! لە هەمانکاتدا داوایان لە (بارزانی)ش کرد، بە دوو وەزیر بەشداری حکومەتەکەیان بکات. ئەوانیش لە سەرەتادا رازی بون، بەڵام دوایی کە بە مەسەلەی (تەها محێدین )یان زانی، لە رقی ئەوەدا (موحسین دزەیی)ان، لە بەشداریکردن کێشایەوە!

دەسەڵاتی (بەعس)، رۆژی ٣ ی ئابی ١٩٦٨ بە (بارزانی) یان راگەیاند، کە بڕوایان بەچارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەی کورد هەیە و بۆ ئەمەش دەتوانن راگەیاندراوی ٢٩ حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ بکەنە بناغە ! (بارزانی) ش پاش چەند رۆژێ لای خۆیەوە رایگەیاند، کە: بەیانی ٢٩ حوزیران ناتوانێت خواستەکانی گەلی کورد دابین بکات و بە بێ دیموکراسیش مەسەلەی کورد چارەسەر ناکرێت! ئیتر بەوجۆرە خواستەکانی باڵی (بارزانی)، بەهۆی شاندەکەی (پارتی) و (موحسین دزەیی)ەوە گەیشتە دەست سەرانی دەسەڵاتی عێراق، بێ ئەوەی گفتوگۆی نێوانیان بە سەرکەوتن بگات! بەمەش شەڕ دەستی پێکردەوە

و گەمەی دوژمنانی کوردیش گەرمتر بوو! واتە لەم لاوە بەعسییەکان یارمەتی باڵی (جەلالی)ان دەدا و لەولاشەوە ئێران و هاوکارەکانی یارمەتی (بارزانییان) دەدا و چەک و تەقەمەنییەکی زۆریان بۆ نارد و یارمەتییەکی زۆری مانگانەشیان بۆ هێزەکەی بڕیەوە! ئەمریکاش ٦ ئەفسەری بۆ مەشق و راهێنان بۆ ناردن، کە یەکێکیان جەنرال (دیڤری) بوو! بەو جۆرە تا دەهات شەڕ گەرمتر دەبوو، تا کار گەیشتە ئەوەی سەرکردایەتیی (بارزانی)، نەخشەی پەلاماردانی بیرە نەوتەکانی کەرکووک دابڕێژن و بۆ ئەمەش بە سەرکردایەتیی (سامی عەبدول رەحمان)، هێزێ بنێرنە ناوچەکە و نزیکەی دوو سەعات بە هاوەن تۆپبارانی دامەزراوەکانی نەوت و بەشی ترومپاکانی غاز بکەن و زیانێکی زۆری پێ بگەیەنن! هەر زوو دوای ئەوە شەڕی سەخت رووی کردە ناوچەکانی قەڵادزە و و مەرگە و سووورداشی نزیک سلێمانی، بەڵام (بارزانی) توانی باڵا دەستی نیشان بدات!

گرمەی ئەو تۆپبارانە و هەندێ سەرکەوتنی هێزەکانی (بارزانی)، لەتەک گوشاری سیاسی ئێراندا، کە یەک لایەنە لای خۆیەوە (شا) ی ئێران بڕیاری نیسانی ١٩٦٩ ی سڕیەوە، ئەو بڕیارەی، کە بریتی بوو لە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی پەیمانی دیاریکردنی سنووری سالی ١٩٣٧، ئەوا ئەو رووداوانە سەرانی بەعسیان راچڵەکاند و ناچاریان کردن، کە بیر لە رێگەی کەمکردنەوەی مەترسییەکانیان بکەنەوە! بۆیە دەستیان کرد بە زەمینە سازی و باس لە چارەسەری بنەڕەتیی کێشەی کورد لە عێراقدا، ئەوەش زەمینەی بۆ رێککەوتنی ١١ ئاداری ساڵی ١٩٧٠ ساز کرد. ئیتر بەمە سەرکردە مەدەنییەکانی حیزبی (بەعس)، شکستی چارەسەری زەبرو زەنگی سەربازییان قۆستەوە! ئاخر ئەو سەرکردانە هەر لە سەرەتاوە دەرکیان بەوە کرد بوو، کە بۆیە باڵە

سەربازییەکەی بەعس دەیەوێ ڕێگەی چارەسەری سەربازی لە دژی جوولانەوەی کورد بگرێتە بەر، تا بەو هۆیەوە خۆی بەهێز بکات و دەسەلاتی خۆی فراوانتر بکات و بەمەش لەناو دەسەلاتی سیاسیدا بالا دەستی مسۆگەر بکات! پاش ئەوەی ئەو راستییە دەرکەوت، کە زەبر و زەنگ و ڕێگەی سەربازی نەک هەر نەیتوانی جوولانەوەکە کز بکات و لەناوی بەرێت، بەڵکو مەترسی زیاتر و کێشەی گەورە تریشی بۆ رژێمەکەیان دروست کرد. ئەمانەش هەموو فرسەتێکی باشی بۆ مەدەنییەکانی بەعس خۆش کرد، کە دۆخەکە بۆ بالا دەستی خۆیان بەکاربهێنن و بەر بە مەترسییەکان بگرن!

لە نیسان و مارتی ١٩٦٩ دا، سەرکردایەتیی مەدەنی (بەعس)، چەند وتارێکی گرنگیان لە گۆڤاری ( الثورة العربیة) ی ناوخۆ، کە بلاوکراوەیەکی ناوخۆ و زمانحالی حیزبی (بەعس) بوو، تایبەت بوو بە کادر و ئەندامانی حیزبەکەیان، بلاوکردەوە! لەو وتارانەدا رای خۆیان بەوجۆرە دەربڕیبوو، کە دەبێت بە ڕێگەی ئاشتی و سیاسی و بەشێوەی مافی ئۆتۆنۆمی کێشەی کورد چارەسەربکرێ، بە ئەنقەستیش وایان کرد، ئەو ژمارانە بکاتە دەست هاوولاتیان! دواتریش یەکێتیی سۆڤیەت هاتە سەرخەت و بەهۆی (دارا توفیق) ەوە، نامەیەکیان ئاراستەی (بارزانی) کرد و (عەزیز شەریف )ی کەسایەتیی چەپ و نیشتمانپەروەری ناودار و دۆستی سۆڤیەت بەدەستی خۆی نامەیەکی (احمد حسن بکر)ی گەیاندە (بارزانی) و ئەویش هەر بەو زاتەدا نامەی وەرامی گەیاندەوە (بکر) ی سەرکۆمار! پاش ئەوە گفتوگۆ لەنێوان رژێمی عێراق و (بارزانی)دا دەستی پێکرد. رووسەکانیش هەم سەفیری رووسیا لە بەغدا و هەم (پریماکوف)، کەسایەتیی ناوداری سۆڤیەتی راستەوخۆ، وەک زامنی گفتوگۆ بە گەرمی خۆیان تێکەلی ئەو کارە

کـرد !
تشرینی دووەمی سـاڵی ١٩٦٩ شـاندێکی حکومەتی عێراق بە سەرۆکایەتیی (سمیر عزیز نجم) و بە یاوەری (عزیز شریف و فوئاد عارف)، بیروڕای سـەرکردایەتیی بەعسیان بـە قبووڵکردنـی مافـی ئۆتۆنومـی بـە (بارزانـی) ڕاگەیانـد! پـاش سـەردانی (دارا توفیـق)، نوێنـەری (بارزانـی)، بـۆ بەغـدا، شـاندێکی ڕژێمـی عێراق بـە سـەرکردایەتیی (عبدالخالق سامرائی)، گەورە لێپرسـراوی ناسـراوی حیزبی (بەعس) و بە یاوەریی چەند لێپرسـراوێکی تـری گرنـگ، لەوانـە (مرتضـی عبـد الباقـی وەزیـری دەرەوە و حمـادی شـهاب سـەرۆکی ئەرکانـی سـوپا و سـعدون غیـدان و عزیـز شـریف)، گەیشـتە لای سـەرکردایەتیی (بارزانـی). لـە کۆبونـەوەی ئـەو سـەردانەدا هـەردوولا ڕێککەوتـن لەسـەر مافـی ئۆتۆنۆمـی بـۆ گەلـی کـورد!
(بارزانـی) شـاندێکی گـەورەی بـۆ تەواوکردنـی گفتوگـوکان نـاردە بەغـدا، کـە جگـە لـە (دکتـۆر مەحمـود عوسـمان) هـەردوو کوڕەکـەی (بارزانـی)، (ئیدریـس بارزانـی و مەسـعود بارزانـی)، یـاوەری وەفدەکـە بـوون! گفتوگۆکانـی بەغـدا هەرچەنـدە پێچـاو پێـچ و هـەوراز و نشـێوی هەبـوو، زۆریـش پەشـیمان بوونـەوە و خۆدزینـەوەی (بەعس)ی لـە ڕێککەوتنەکـە بەخـۆوە دی، گەرچـی چەنـد جارێـک رووسـەکان هاتنـەوە سـەرخەت، بـەڵام تـا سـەردانی (صـدام حسـین) لـە ١٩٧٠/٣/٨ بـۆ چۆمـان و کۆبوونـەوەی لەگـەڵ (بارزانـی)دا، گرفتـەکان چارەسـەر نەبـوون و خاڵـە جیـاوازەکان هـەر جیـاواز بـوون! تـا لـە ١٩٧٠/٣/١٠ ڕێکەوتنـی (بارزانـی و صـدام) ئیمـزا کـرا و ڕۆژی ١١ ئـاداری سـاڵی ١٩٧٠ بـە هـۆی میدیـاوە ئـەو هەواڵـە ڕاگەیەنـرا بـۆ هەمـوو خەڵـک و لیژنـەی ئاشـتی هاوبـەش دامـەزرا و (بارزانـی) بـە پێنـج وەزیـر بەشـداری کابینـەی حکومـەتـی کـرد!
ئێتر بەو بەیان و ڕێکەوتنە :

• رژێمی عێراق بە فەرمی دانی بەوەدا نا، کە پارتی بە سەرۆکایەتیی (بارزانی) تەنها نوێنەری نەتەوەی کوردە لە کوردستانی باشووردا!

• رژێمی عێراق رازی بوو (بارزانی)، بە ناوی پاسەوانی سنوور، هێزی پێشمەرگە بهێڵێتەوە و مووچەشیان بۆ دیاری بکرێت!

• پێنج وەزیری کورد لە کابینەی حکومەتی عێراقدا بەشداری بکات!

• بەڵام وردەکاری سنوور و دەسەڵاتەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان و گەلێ شتی گرنگی دی، بە هەڵپەسارددەیی هێڵرانەوە، تا دوای چوار ساڵ تەجروبەکە بە باشی دەخەملێت، ئەوسا جێبەجێ بکرێت! کە بەڕای من ئەمە کەلێنە گەورەکەی ئەو رێککەوتنە بوو، چونکە جگە لە سروشتی رژێمی بەعس و نەخشە رێگەی بۆ پاش چوار ساڵ، ئەمانە هەموو دەرفەتی ئەوەیان خۆشکرد، کە رژێم بە تەواوی خۆی بەهێز بکات و کێشەکانی ئاسان و گرفتەکانی بێرەنگ بکات! ئەوسا ئەوەی کرد، کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا کردی. ئەویش پەشیمان بوونەوەی بوو لە هەموو بەڵێن و گفتەکانی و بگرە بە شەڕێکی خوێناویش وەڵامی داواکارییەکانی کوردی دایەوە!

رێککەوتن و بەیانی ١١ ئاداری ١٩٧٠ دەسەڵاتی شارەکانی کوردستانی خستە ژێر دەستی پارتی دیموکراتی کوردستان و هێزەکانیەوە، بەمەش نوێنەرەکانی (بارزانی) لەو شوێنانەدا باڵادەستیی تەواویان پەیدا کرد! لە تەموزی ئەو ساڵەدا کابینەی حکومەت گۆڕا و چوار وەزیری (بارزانی) لە کابینە نوێیەکەدا دانران. ( نوری شاوەیس بە وەزیری ئیسکان، محەمەد مەحمود عبدالرحمن - سامی - بە وەزیری گەشەپێدانی باکور، ئیحسان شێرزاد بە وەزیری شارەوانییەکان و نافیز جەلال بە وەزیری کشتوکاڵ ) دانران و لە ساڵانی دواتریشدا، دوو وەزیری حیزبی شیوعی خرانە کابینەی حکومەتەوە!

مـن ئەوکاتـە باوکـم (جەلالـی) بـوو، پـاش ماوەیەکـی کـەم لـەو ڕێککەوتنـە و سـەربارى خۆشـی و شـادی خەڵک ، هەندێ ڕووداوی بچووکی لێرە و لەوێ کاریگەریان کرد، کە باوکم نەیدەتوانی لە شاری سلێمانی بمێنێتەوە. بۆیـە ماڵـی هێنایـە بەغدا و لەوکاتەدا منیش ماڵـم لـە بەغدا و لـە گەڕەکـی (ڕاغبـە خاتـون) بـوو! هـەر لـەو گەڕەکـە باوکـم خانوویەکـی بەکـرێ گـرت و بەمـەش خوشـک و براکانـم لێـم نزیـک بونـەوە! ئیتـر پێویسـتی نەدەکـرد منیش زوو زوو بچمەوە بۆ سلێمانی. لەو کارانەی کە بەهـۆی گۆیزانـەوە و جێگیـر بوونـی ماڵـی باوکـم ڕووی تێکـردم، هـاوڕێ نزیکەکانـم (فازیلـی مـەلا مەحمـود و جەعفـەر عەبـدول واحیـد و شاسـوار جـەلال و دارۆ ) زۆر یارمەتییـان دام!

ڕۆژێـک لـە ڕێکخسـتنی ماڵـی باوکمـدا ( فازیـل ) زۆر خـۆی مانـدوو کـرد بـوو  یارمەتـی زۆری باوەڕنمـی دەدا، هێنـدەم نەزانـی بـە پرتـاو و بـە باوەشـێک تەختـەوە خـۆی کـرد بـە هۆڵەکـەدا، گوایـا دەیـەوێ ڕەفەیـەک دروسـت بکات، کاتیش  کاتی نیوەڕۆ بوو، نزیکی ئەوەبوو لەسـەر سفرە برنـج و فاسـۆلیا خۆیـان دەرخـەن و ئێمـەش بێڕەحمانـە بکەوینـە ویـزەی، کـە (فازیـل) قاچـی لـە بەڕەیەکـی لولکـراو گیربـوو، بەشـێوەیەک بـەرەو پەنجەرەکە کشا، دەتووت نیشانەی لە پەنجەرەکەی بەردەمی گرتۆتـەوە! هێندەمانزانـی هـاڕەی لـە سـێ تەبـەق شوشـە هەسـتان و دەلاقـەی مـاڵ کەوتـە سـەر کـۆڵان! ئیتـر خـوا بـۆ (دارۆ ) ی ڕەخسـان گاڵتـەی پـێ بـکات و وتـی : خێرا برۆ لەسـەر ئـەو سـووچەی ئەوسـەری شـەقامەکە، شوشـە فرۆشـێکی لێیـە، تـا زووە بیکـڕە و بیهێنـەرەوە. چەنـدە پێیـان گـوت، کـورە بـۆ کـۆی دەچـی دانیشـە جـارێ، دوایـی چاکـی دەکەینـەوە، بـەلام (دارۆ) هـەر دوو پێـی لێکـردە کـەوش و وتـی.. کاکـە دەڵێـی لـە کـۆڵان دانیشـتووین، هەردەبێـت بـڕوات! لـەم بـرۆ و مەڕۆیـەدا (فازیـل) بـەدەم چـاو داگرتنـەوە

ڕۆیشت و دیار نەما. ( دارۆ ) وتی بەخوا فرسەتە ئەو نەوسنەم بۆیە دوورخستەوە، تا بەشەکەی ئێمەش لە قوبڵی و فاسۆلیاکە نەخوات! ئیتر بوو بە پێکەنین و دایکم وتی : شەرتە نەهێڵم کەستان دەمی لێدەن تا (فازیل) نەگەڕێتەوە. (دارۆ ) ش وتی.. ئینجا وابێ هەموو لەبرسا دەمرین، بابە من دەچم بانگی دەکەمەوە. (دارۆ) بەپەلە چووە دەرەوە و بە هەنگاوی خێرا شوێنی کەوت، ماڵەکەمان دەرگایەکی لە پشتەوە هەبوو، دیارە (فازیل )، کە چوبووە دەرەوە پێچی کردبوە و نەڕۆیشتبوو لە دەرگای پشتەوە هاتبوە ژورەوە و چوو فاسۆلیاکەی هێناو داوای کرد یەکێک سفرەکە رابخا و برنجەکەش بهێنێ و وتی.. تا (دارۆ) نەهاتۆتەوە فەرموون تێر بخۆن!

هاوڕێیەتی ئێمە (ئارام و دارۆ و فازیل) و کاک (شەهاب)، تا دەهات گەرمتر دەبوو، زۆری نەبرد (دلێر سدیق) یشی هاتە سەر و کۆڕەکەمان فراوانتر بوو، لە دوای ئەو ماوەیە (فوئاد قەرەداخی)، بە زانیاری و قەڵەمە جوانەکەیەوە کۆڕی هاوڕێیەتیمانی گەرمتر و خۆشتر کرد. لەولاشەوە لەگەڵ شەهید (جەعفەر عەبدول واحید)، تا دەهات هاورێیەتیمان خۆشتر و و بە هێزتر دەبوو!

لەگەڵ ئەوەدا، کە بەهۆی ڕێککەوتنی ١١ ئادارەوە هەلومەرجی سیاسی تاڕادەیەک ڕووناکی تێکەوت و کورد لە هەموو شوێن و تەنانەت لە پارچەکانی تری کوردستان، خۆشحاڵ بوون بەو ڕێککەوتنەو بەو دەسکەوتەی جووڵانەوەی کورد، بۆ ئەمەش ئاهەنگ و شایی زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتبووەوە. بەڵام دڵەڕاوکێ و سامێکی نادیار ریزەکانی کادر و ئەندامانی ڕێکخستن و لایەنگرانی باڵی (مەکتەبی سیاسی - جەلالی -) گرتبووەوە. ئەگەرچی (حیزبی شیوعی)، سەردانی (ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی)یان کرد بوو، دڵنیاشیان کردبوون،

کە (بارزانی)، هیچ نیازێکی خراپی نییە دەرهەق بەوان و بگرە لەباتی تۆلە کردنەوە، بیر لە چارەسەری کێشەکان دەکاتەوە! دواییش بیستم، کە هەندێ لێپرسراوی (بارزانی)ش لەسەردانیاندا بۆ لایان هەمان قسەیان بۆ دووپات کرد بوونەوە! بەڵام هێشتا هەر متمانە بە تەواوی نەگەڕابوویەوە دڵی زۆربەیان!

کاک (شەهاب و فازیل ) و من لە جاران زیاتر پێکەوە بووین و لەو بابەتەوە قسە و باسی زۆرمان دەکرد و لە درێژەی بیرکردنەوە و گفتو گۆکانماندا، دواجار بەم ئەنجامانە گەیشتین:

* (بارزانی) لە ئەنجامدا واز لە دوژمنایەتیی کردنی باڵی (مەکتەبی سیاسی)، دەهێنێ و دەیانگرێتەوە خۆی. چونکە (بارزانی)، هیچ دەسکەوتێکی لە درێژەدان بەململانێ لەگەڵ ئەم باڵەی ئەم لادا نییە! بۆیە گەر بە نەرم و نیانی بجووڵێتەوە و بە هێمنی بیانگرێتەوە خۆی، ئەوا وردە وردە (پارتی)، قوتیان دەدات! دیارە ئەمەش لەوە باشترە بیر لەهەر جۆرە تۆڵە و توند و تیژییەک بکاتەوە، چونکە بەم کارە هەم خۆی پێ بەهێز دەبێت و هەم ئەمان زووتر هەڵدەوەرێن و لەناو دەچن! هاوکات بۆ (بارزانی)ش ئاسان نییە، باوەڕ بە (بەعس) بکات، چونکە تاقیکردنەوەکانی پێشوو ئەوەی بۆ سەلماندووین، کە ئایدیای (بەعس) و سروشتی چینایەتی ئەم رژێمە هی ئەوە نییە بوار بە شەریکایەتی لەگەڵ (بارزانی) و لەگەڵ هیچ لایەنێکی تر بدات، ئاخر ئەوانە باوەڕیان بە دیموکراسی و چارەسەری دیموکراسییانەی کێشەکانی ناوخۆیان نییە، ئێستا چۆن بەرانبەر نەیارەکانیان لە دەرەوە هەنگاوی دیموکراسیانە دەنێن!

* ریککەوتنی ١١ ئادار بە ئەنجام ناگات و رژێم و (پارتی)، ناتوانن تاسەری بەرن! چونکە هەم سروشتی ئەو رژێمە پاوانخوازە و هەم

ئەو حیزبە شوفێنیستە بوار بە درێژە کێشانی ڕێککەوتنی نێوانیان و جێبەجێکردنی بەڵێنەکان و ناوەڕۆکی زیندوی ڕێککەوتنەکە نادات! (بارزانی)ش ناتوانێ هەروا بە ئاسانی دەس لە ئێران بەربداو پشتی تێبکات! ئەمەش مانای وایە (بارزانی)، پەیوەندییەکانی خۆی ناپسێنێ و چۆلەکەیەکی ناو دەستی نادات بە چۆلەکەیەکی سەرداری دورە دەست! بە کوردی و بە کورتی لە خۆڕا نەگوتراوە..دوو کاڵەک بەیەک دەست هەڵناگیرێ! سەرکردایەتیی (پارتی)ش پاش ئەو دوو کەرت بوونە و مانەوەی کەم ئەزمونەکانیان تیایدا. هی ئەوە نییە بتوانێت تاسەر سەرکردایەتیی ئەم جووڵانەوەی کورد بکات و بە سەرکەوتنیشی بگەیەنێت!

* هەلومەرجی نێودەوڵەتی و ململانێ و بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکانی جیهان، لەسەر زەمینی عێراق و ناوچەکە، بوار نادەن، کە ئارامی و پێشکەوتن جێگەی ناسەقامگیری و ململانێی ناوچەیی بگرێتەوە!

ماوەیەکی زۆر گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتانە لەگەڵ هەموو هاوڕێکانی ترماندا درێژەی کێشا، قسەکردن لەسەر ئەو باسانە لە ناوماندا بزر نەئەبوو، تاپێکەوە لەسەر هەڵسەنگاندنی حیزبە کاریگەرەکانی گۆڕەپانی کوردستان گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە :

• باڵەکەی (مەکتەبی سیاسی - جەلالی)ش بە کەڵکی جووڵانەوەی کورد و سەرکردایەتی نایەت، نە ڕێبازی و نەپێکهاتەی و نە کردەوەکانی ئەوە نییە بتوانێت خۆی لە ئاستی تەوژمی ڕووداوەکاندا بگرێت و ئەرکی دیموکراسی و پێشکەوتنخوازی جووڵانەوەی کورد بە ئەنجام بگەیەنێت، بۆیە زۆر ناخایەنێ و هەڵدەوەشێتەوە!

• هەرچی (پارتی)شە بەو فۆرمە لە سەرکردایەتی و بە سروشتی چینایەتی و بیرو ڕەفتاری شێوە خێڵەکییەوە، توانای سەرخستنی

جووڵانـەوەی کـوردی نییـە و سـتراتیجێکی ئەوتـۆ و دیاریشـی نییـە، تـا بتوانـێ بەشـێوەیەکی سـەرکەوتوو ئیـدارەی ناکۆکییـەکان بـکات و کـورد و کوردسـتان رزگار بکات! بۆیە (پارتی)، بە شکستی باڵەکەی تر و بەو سـەرکەوتنەی ئادار لەخۆی بایی دەبێت و بەمـەش عەقلی پلان دارشـتن و تەگبیرکـردن بـۆ تەنگانـە لەدەسـت دەدات و توانـای یاریکردنـی لەنـاو گەمـە و ناکۆکییە هەرێمایەتییەکان لەدەست دەدات! هـاوکات پاشـکەوتویی سیاسـی و مالیی، کارێکی کردووە کـە سبەی فریـای پەشـیمان بوونـەوە لـە فیـڵ و تەڵەکانـی رژێمـی (بەعـس) نەکەوێـت!

• (حیزبـی شـیوعی)ش، جگـە لـەوەی، کـە کێشـەی نەتەوایەتـی کـوردی نەکردۆتـە کار و ئامانجـی سـەرەکیی خـۆی، ئـەوا حیزبێکیشـە لـە بیـرو رێبـازی (مارکسـیزم - لینینـزم) لایـداوە و ئـاوس بـووە بـە چەندیـن کێشـە و ململانێی سیاسـی و فیکـری و رێکخراوەیـی ناوخـۆ و هێڵـی سیاسـی و هەڵوێسـت و کـرداری ریڤیژنیسـتی گرتۆتـە بـەر!

بۆیـە پرسـیاری (دەبێـت چـی بکەیـن !) بووبـوو بـە پرسـیاری زۆربـەی هاورێکانمـان و رۆژانـە قسـە و مشتومرِی گەرممـان لـەو بارەیـەوە دەکرد و تەنانـەت زۆرجـار لەگـەڵ کاک (شـەهاب)، هـەر گـەران بـوو بـە دووی وەرامـی ئـەو پرسـیارەدا! ئیتـر وردە وردە زۆربەمـان گەیشـتبووینە سـەر ئـەو بـاوەرەی، کـە هێنانـە دی رێکخراوێکی سیاسـی نـوێ بۆتـە ئەرکێکی مێژوویـی و هەنووکەیـی و هـاوکات دەتوانـێ وەلامدەرەوەیەکـی راسـتەقینەی قۆناخەکـە بێـت!

لـەو سـەردەمەدا، کـە ئـەو رووداو و باسـە گەرمانـە روویانـدا، مـن بـۆ خـۆم کارمەنـد بـووم لـە بەشـی (یاسـا و گرێبەسـت - الحقـوق والعقـود -) لـە وەزارەتـی شـارەوانی لـە بەغـدا، لەگـەڵ هـەر یەکـە لـە (لەتیـف گلـی کەرکووکـی و سـەعدی بەرزنجـی و ناهیـز عەبـدول واحیـد و سـوهام

دەباغ) لەو بەشەدا فەرمانبەری میری بووم !
بیرمە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ بوو، ڕۆژێکیان لە ژوورەکەی خۆمدا بەتەنها مابوومەوە و کارم دەکرد، کە کاک ( شەهاب و فازیل)، خۆیان کرد بە ژووردا، دیارە ئەوە یەکەم جار نەبوو لەو شوێنەدا سەردانم بکەن، بەڵکو زۆرجاری تر هاتبوون بۆ لام! لە دانیشتنەکەدا هاتنە سەر باسی ئەوەی، کە ئیتر کاتیەتی و با دەست پێبکەین و تا ڕۆژێک زووتر دەست پێبکەین درەنگە! با ئیتر لە قسە و باسەوە بگوێزینەوە بۆ کردار و ڕێکخراوێکی چەپی مارکسی بۆ واقیعی کوردستان دابمەزرێنین، ڕێکخراوێک پڕ چەک بێت بە بیرو باوەڕێکی پێشکەوتنخوازی نیشتمانپەروەر، کە ڕوانین و بەرنامەی لە بەرژەوەندییەکانی ڕەنجدەرانی کوردستان دوور نەکەوێتەوە! ئای چ چرکە ساتێکی مێژوویی و چ ساتێکی گرنگ و هەستیار بوو، ساتەکانی بازوو هەڵماڵین بۆ دروستکردنی ڕێکخراوێکی مارکسی، کە بتوانێ ئەرکەکانی قۆناغ بگرێتە ئەستۆ! ئێستاش کە بیر لەو ڕۆژە و لەو ساتە وەختە دەکەمەوە، تەزوو بە ڕۆحمدا دێت و موچڕک سەرتاپای جەستەم دەگرێ! ئیتر ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی، کە لە نزیکترین کاتدا دانیشتنێک ئەنجام بدەین بۆ ڕەنگ ڕشتنی نەخشەی کەوتنە جووڵە و هەنگاوەکانی ئایندە! لەو کۆبوونەوە سێ قۆڵییەدا، لە ئەنجامی تاوتوێ کردنی هەلومەرجی گشتی و ئەو کەسایەتی و هێزەی، کە بەکەڵکی کارێکی گرنگی وا مێژوویی دێن، پێکهاتین لەسەر ئەوەی کە:

ناکرێت کەسێکی وەک (مام جەلال) و ئەو هێزەی لە دەوری گۆڤاری (ڕزگاری) و خودی کاک (نەوشیروان مستەفا) کۆبونەتەوە و بۆ کارێکی لەو جۆرە پێویستن، نادیدە بکرێن! جگە لەو هەموو هاوڕێ زۆرەی، کە لە بەغدا و هەولێر و سلێمانی و خانەقین و دهۆک هەمانە

و باشیان دەناسین. ئیتر بەو گیانە پڕ جۆشە و و بەو بۆچوونە زانستییەوە کەوتینە پەیوەندی کردن و سەرەتاش پەیوەندیمان بە (مام جەلال) ەوە کرد، ئەویش بە گەرمی پێشوازیی لە بیرو بۆچوون و هەنگاوەکانمان کرد و رازی بوو، کە بە زوویی دەست پێبکەین و بۆ ئەوەش لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا)، قسە بکەین! ئێمەش کەوتینە قسە کردن لەگەڵ هەموو ئەو هاوڕێیانەی، کە ناومان هێنان! شان بە شانی ئەو پەیوەندییانە لە ماڵی ئێمە لە بەغدا و لە گەڕەکی (راغیبە خاتون) کۆبوونەوەیەکمان بە ئامادەبونی (مام جەلال) کرد، کە (شەهابی شێخ نوری و فازیلی مەلا مەحمود و دلێر سدیق) و بەندە ئامادەی بوون! بە باشی بیرم نەماوە، کە ئاخۆ لەو کۆبوونەوەیەدا بوو یا لەکۆبوونەوەیەکی تردا، کە (حەمە جەزا) ی ئەندازیاری نەوت ئامادە بوو! (مام جەلال)، جارێکی تر قسە کردنی لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا) و هاوڕێکانی ترمانی لێ دووپات کردینەوە! ئێمەش (فازیلی مەلا مەحمود)مان، بۆ ئەو مەسەلەیە راسپاردەوە، کە قسەی لەگەڵدا بکات! کە (فازیل) گەڕایەوە وای باسکرد، کە (نەوشیروان مستەفا ) وتوویەتی : مادام بە (مام جەلال) تان وتوە، من نایەم و ئیش لەگەڵ (مام جەلال)دا ناکرێ، لەبەرئەوە منی تێدا نابم! بەڵام ئەوەی راست بێت من خۆم لە (نەوشیروان)م بیست، وتی راستە (مام جەلال) کەسێکی گرنگە، بەڵام لەم قۆناغەدا شتێکی باش نییە (مام جەلال) مان لە گەڵدا بێت. چونکە کەسایەتیی ئەو وایە، کە بوونی دەبێتە هۆی ئەوەی، کە پشت بە خۆمان نەبەستین! بۆ نموونە گەر ئێمە بمانەوێ سکرتێرێک بۆ ئەم رێکخراوە هەڵبژێرین، ئەوا تا (مام جەلال)، لە ناوماندا بێت، ناشێ کەسی تر هەڵبژێرین! یان ئەگەر بمانەوێ سەرۆکی شاندێک دابنێین، ئەوا هەر دەبێت ئەو سەرۆک بێت! هەروەها گەر بمانەوێت

بیرو بۆچوون و لێکدانەوەی خۆمان داڕێژین یا لێکۆڵینەوەیەک، یا بەیاننامەیەک بنووسین، ئەوا تائێمە لاپەرەیەکی لێ ئامادە دەکەین، (مام جەلال) هەموی تەواو دەکات، بەو جۆرە بە شێنەیی دەبین بە رەنگدانەی ( مام جەلال) و بیرو بۆچوونەکانی ئەو و هیچی تر! بەڵام من کە خۆم نایەم و کار ناکەم، هەموو هاوڕێکانم رادەسپێرم، کە بێن لەو رێکخراوەدا لەگەڵتان کار بکەن! قسەکەشی راست دەرچوو، بە زوویی هەموو هاوڕێکانی هاتن و لە ریزەکانی ئەو رێکخراوەدا کاریان کرد و بەشدارییان کردا!

شایەنی باسە لەوکاتەدا لە سلێمانی بەهۆی کارێکەوە، کە پێشمەرگەیەکی سلێمانی رووداوێکی ناخۆشی لە دەست قەوما، ئەو رووداوە لە قەوارەی خۆی گەورەتر و قەبەتر کرا و پریشکیشی (نەوشیروان مستەفا)ی گرتەوە! ئیتر ئەویش ناچار بوو زۆر خۆی دەرنەخات و لە شارەزوور لەناو خزمە شاترییەکانیدا بمێنێتەوە، تا کاری سەفەری بۆ مەیسەر کرا! لەو ماوەیەدا خوالێخۆش بوو (ئاوات عەبدول غەفور)، جاروبار سەردانی دەکرد و لە هەواڵەکانی ئێمە ئاگاداری دەکردەوە! تا دوایی چوو بۆ ڤیێننا بۆ تەواوکردنی خوێندنی بالا، لەوێ خەریکی خوێندن بوو ، ئیتر لەگەڵمان نەهات و بە عەمەلی لە (کۆمەڵە) دوور کەوتەوە !

## بیرو بۆچوونەکانی (ماوتسی تۆنگ)!

لە شوێنێکی تردا باسم کرد، کە لەئەنجامی هەلومەرجەکانی کوردستان و عێراق و ناوچەکەدا، لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێدوانی شەپۆلەکانی تێز و لێکۆلینەوەکانی ناکۆک و دژ بە یەکتر و جیاوازیی هەر دوو بەرەی جوولانەوەی سۆسیالیستی جیهان، (خەتی ماوتسی تونگ بەرامبەر خەتی سۆڤیەت و ریڤیژینیستەکان)، سێ دەستەی چەپ و نزیک بە یەکتر، لە بەغدا و لە سلێمانی پەیدا بووبوون. یەکێکیان ئەوانە بوون، کە لە دەوری گۆڤاری (رزگاری) کۆبوبونەوە، ئەو گوڤارە (نەوشیروان مستەفا)، سەرنووسەر و قەڵەمە بەبرشتەکەیان بوو! (شازاد سائیبی) خوالێخوش بووش ماوەیەک خاوەن ئیمتیازی بوو! (فوئاد قەرەداخی) ش، بەڕێوەبەری نووسینی بوو! ئەو دەستەیە، کاک (نەوشیروان و مەحمودی مەلا عیزەت و حەمە چاوشین) دیارەکانیان بوون! هاوڕێکانی گروپەکەی (مام جەلال) یش، بریتی بوون لە (فوئاد قەراخی و نورەدین عەبدولڕەحمان و بەکر حسەین و مامۆستا رەفعەتی مەلا)، ئێمەش کە دەستە یا گروپەکەی بەغدا بووین،

بریتی بووین لە (شەهاب شێخ نوری، فەرەیدون عەبدولقادر، فازیلی مەلا مەحمود، شاسوار جەلال - ئارام - دارۆی شێخ نوری، نەرمین عوسمان، پرشنگ مەمەند، پاکیزە مستەفا، عەبدولرەزاق فەیلی، جەعفەر عەبدول واحید، ئەرسەلان بایز، ئەحمەد صالح، کە بە ماموستا ئەحمەد ناسرا بوو، دلێر سدیق، هۆشمەند عەبدول مەجید هەورامی، عەزیز مەحمود، هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد، خوالێخۆش بوو یاسین کەرکووکی، دکتور حەمە سابیر، حەمە قەراخی، هەڵۆ ئیبراهیم ئەحمەد، فازیل تەیب، حەمید بڵباس، خەرامان مەستی، دڵخواز بڵباس، محەمەد عوزەیری، شێخ محەمەدی چینی، شکور زەنگەنە، بەهزاد خانەقینی، نەریمان مەحمود، ئیبراهیم باجەلان، سەربەست بامەڕنی، عەلی مستەفا، ئەمیر عەلی ناجی و حەمە حەسەن زاخۆیی و نەسرەدین، مەجید کەریم – غاندی - ) و چەندین هاوڕێ و تێکۆشەری تریش، کە بەداخەوە ئێستا ناوەکانیانم لەبیر نەماوە! ئەو سێ دەستەیە لەیەکتر نزیک بووین و زۆربەشمان باوەڕمان بە (مارکسیزم - لینینیزم) و بیرو باوەڕی (ماوتسی تۆنگ) هەبوو! زۆریش مشتومڕ و قسەمان لەسەر دەکرد و لە سەرمان دەخوێندەوە!

زۆربەی زۆرمان لەسەر بیروباوەڕی (ماوتسی تونگ) و ڕێبازەکەی کۆک بووین، بۆیە بەپێی ئەو گفتوگۆ و لێدوانانەی پێش لە دامەزراندنی (کۆمەڵە) دەمانکرد، گەیشتبووینە ئەو باوەڕەی کە (مارکسیزم) ئەگەرچی ئایدیا و دونیابینییەکی نوێیە و بەرنامەیەکی گشتگیرە بۆ راڤە کردن و لێکدانەوەی زانستییانەی کۆمەڵ و واقیعی مروڤایەتی وڵاتانی دنیا، هاتۆتە ئاراوە و هاوکات ڕێگایەکی راستە بۆ گۆڕانکاریی بنەڕەتیی لە جیهان و لە کۆمەڵیشدا، بە ئاراستەی فەراهەمکردنی ئازادی و یەکسانی بۆ کۆی مروڤایەتی! بەڵام دەبێ باش لەو راستییەش بگەین، کە ئەم زانستە بەشێوە گشتییەکەی بۆ واقیعی ئەوروپا و بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی کۆمەڵی ئەوروپایی و

خاسیەتەکانی ئەو کۆمەڵە رەنگی رێژراوە! واتە ( مارکسیزم - لینیزم )، بە پلەی یەکەم تیۆری و تاکتیکی شۆڕشی پرۆلیتاریایە لە وڵاتانی پێشکەوتووی ئەورووپا، بۆ دامەزراندنی سۆسیالیزم! هەرچی بیروبۆچوونەکانی (ماوتسی تونگ) یشە، ئایدیایەکە، کە لە ئەنجامی ئەزمونی وڵاتی (چین) ەوە هەڵقوڵاوە و لە هەلومەرج و خاسیەتەکانی ئەو کۆمەڵەوە سەرچاوەی گرتووە! بە کوردییەکەی ئێمە وا لە بیرو بۆچونەکانی (ماو) گەیشتبووین، کە (ماویزم) تیۆری بنەڕەتی (مارکسیزم - لینینیزم) ە و بە پراکتیک لە ئەزمونی شۆڕشی ( چین ) دا، بەرجەستە بووە! واتە لە وڵات و کۆمەڵێکی دواکەوتوی کشتوکاڵیدا و بە رێگەی خەباتی چەکداری و جەنگی گەل، لە شۆڕشی رزگاریی نیشتمانیدا بە پیادەکردنی تاکتیکی بەرەی یەکگرتوو دژی دوژمنانی گەل!
باوەڕمان بەوە هەبوو، کە بەڕاستی و لە ناوەرۆکدا (ماوتسی تۆنگ) مارکسییە، بەڵام بە هەست و بەرنامەیەکی میللی و نیشتمانی وا، کە رەنگدانەوەی کۆمەڵی (چین) خۆیەتی! واتە ( ماوتسی تۆنگ) باوەڕی وایە، تێگەشتن لە واقیع و راستییەکان و خاسیەتەکانی واقیع، بەردی بناغەی گۆڕانکارییەکانن، نەک خەیاڵ و خەوی زەردو سوور و تیۆری وشک و بێ گیان! بۆیە هەوڵدان بۆ گۆڕینی هەر واقیعێکی دیاریکراو، ئەوا سەرەتا پێویستی بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی دروست و زانستییانەی ئەو واقیعە هەیە، کە تیایدا دەژی، نەک رەدوو کەوتنی تێز و باوەڕی نێو لاپەڕەی کتێبەکان و دوور لە واقیع! نەک تیۆرییەک، کە بۆ زەمان و زەمینێکی تر هاتۆتە ئاراوە، کە دوورە لە واقیعی کۆمەڵەکەی خۆت و نامۆیە بەو خەسڵەتانەی، کە کۆمەڵەکەی خۆت پیا گوزەر دەکات!
دیارە وڵاتی(چین)، لەو قۆناغەدا وڵاتێک و کۆمەڵێکی کشتوکاڵی پاشکەتوو بوو، بە درێژایی مێژوویەکی ناخۆش و نالەبار لەژێر باری پارچە پارچە کراوی و داگیرکاری بێگانەدا و لە ئاستێکی نزمی گوزەراندا، ژیانێکی ژێردەستی و

پڕ لە چەوساندنەوەی بەسەر بردووە! بۆیە لەو واقیعە تایبەتەدا (چین)، نە وەکوو وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریی پێویستی بە شۆڕشی پرۆلیتاریا هەبوو، نە ناکۆکیی سەرەکیش لەو کۆمەڵەدا ناکۆکیی نێوان (کار و سەرمایە) بوو! بەڵکو ناکۆکیی سەرەکی وڵاتی (چین) و کۆمەڵی (چین)، بە پلەی یەکەم دژی داگیرکەر و دژی ئیمپریالیزم بوو، کە ئەو وڵاتەی پارچە پارچە و داگیر کردبوو! ئەمەش مانای وایە ناکۆکیی سەرەکی لەو قۆناغەدا، لە نێوان گەلانی (چین) و هێزی داگیرکەری بێگانەدا بوو! دیارە ئەرکی سەرەکیش لەم قۆناغەدا چارەسەرکردنی کێشەی کشتوکال و کێشەی زەوی بوو، کە ئەویش خۆی لەچاککردنی گوزەرانی خەڵکدا دەبینیەوە! بۆیە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی (چین) بینیمان چۆن تا ماوەیەکی زۆریش، ئەرکە یەکەم و گرنگەکانی شۆڕش، رووی لە پێشکەوتنی رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و باری تەندروستیی خەڵک و بونیاتنانی ژێرخانی ئابوریی پیشەسازی و دواتر یەکلا کردنەوەی کێشەی نێوان کار و سەرمایە بوو! کە ئەمەش کت و مت چەندە لەتەک واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریی کۆمەڵی کوردەواریدا دەگونجێ، هێندەش بە خاسیەت و خەسڵەتەکانی کۆمەڵی ئەڵمانی و ئیتالی و فەرەنسی جیاوازە! ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو راستییەی، کە بەپێی ئەرکەکانی قۆناغ ئەرکەکانی خەباتیش دەگۆڕێت و جیاواز دەبێت! جا ئیتر بەو تێگەیشتنەی ئێمە، بیرو بۆچوونەکانی (ماوتسی تونگ)، بۆ وڵات و بۆ کۆمەڵەکەی ئێمە و بۆ خەباتی خەڵکی کوردستان لە پێناوی ئازادیی گەل و رزگاریی کوردستان و پێشکەوتندا، لە پێناوی دیموکراسی و گەشەکردنی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتوری کۆمەڵی کوردیدا، زۆر بەباشی دێتەوە و بەکەڵک دێت! واتە ئایدیای ئامادە کراوی خەیاڵی و دوور لەواقیعی کوردستان بۆ ئەم قۆناغەی، کە گەلی کوردی پیا تێدەپەڕێت هیچ سوودێکی نییە!

## (کۆمەڵە)، لە ١٩٧٠/٦/١٠ دا، چۆن دامەزرا!

پاش پەیوەندی کردن و قسە کردن لەگەڵ هەر سێ دەستەکە و هاوڕێکانیان، پاش یەکەمین کۆبونەوەی تاوتوێ کردن، ئەوا کۆبوونەوەیەکی ڕێکوپێک کرا بۆ بڕیاردان لە دامەزراندن و ڕەنگ ڕشتن و نەخشە ڕێگای کارکردن و داڕشتنی هێڵە گشتییەکانی بەرنامەیەک لە ١٠ -٦-١٩٧٠. بۆ دروستبوونی ڕێکخراوێکی سیاسی نوێ، کە بتوانێ شان بداتە بەر ئەرکەکانی قۆناغ، لە هەلومەرجی ئەوکاتەی کۆمەڵی کوردستاندا! ئەو کۆبونەوەیەش لە بەغدا و لە گەڕەکی (راغیبە خاتون) و لە ماڵی ئێمە بەسترا! ئامادەبووانیش بریتی بوون لە (مام جەلال، شەهاب شێخ نوری، فازیلی مەلا مەحمود، فوئاد قەرەداغی، دلێر سدیق، ڕەفعەتی مەلا و فەرەیدون عەبدولقادر).

لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو لەسەر ئەوە ڕێککەوتین و بەگشتی بڕیارماندا..

- ڕێکخراوێکی (مارکسی - لینینی) دابمەزرێت!

• لەبەر رۆشنایی ئایدیای (مارکسیزم - لینینیزم، بیروبۆچونی - ماوتسی تۆنگ) کاربکات!

• بۆ کوردستانی باشوور بێت و تەنانەت وترا کوردستانی عێراق! لە شارەکانی (سلێمانی و بەغدا و کەرکووک و هەولێر و بادینان و خانەقین)، دەست بە ڕێکخستن، بکات !

• ڕێکخستن و کارەکانی نهێنی بێت!

• ئەم ڕێکخراوە باوەڕی بە گرێدانەوەی خەباتی (چینایەتی و نەتەوایەتی)یە پێکەوە!

• دامەزراندنی پێویستە، چونکە بڕوای وایە نە (پارتی دیموکراتی کوردستان) بە ڕێبەری (بارزانی)، دەتوانێت سەرکردایەتی جوولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بکات و بە سەرکەوتنی بگەیەنێ، نە پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی (مەکتەبی سیاسی - جەلالی)ش، دەتوانێ هەمان ئەو ئەرکە راپەڕێنێت! یەکەمیان لە رووی چینایەتییەوە پارتێکی بۆرجوازی خێڵەکییە و دوەمیشیان پارتێکی وردە بۆرجوازییە و ناتوانێ خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی پێکەوە گرێ بدات و تاسەر بە ڕێگەی سەرکەوتندا ئاراستەی بکات!

• (حیزبی شیوعی عێراق)، پارتێکی راسترەوی سازشکاری هەڵگەڕاوەیە لە ڕێبازی چینی کرێکار و لە (مارکسیزم - لینینیزم)، واتە پارتێکی ریڤیژینیستە!

• حکومەتی عێراق، حکومەتی رژێمی حیزبی (بەعس)ە، کە حیزبێکی ناسیۆنالیستی وردە بۆرجوازیی توند ڕەوە و لە ناخیدا باوەڕی بە مافی چارەی خۆنووسینی کورد نییە، بۆیە تا سەر وەفادار نابێت بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنی ١١ ی ئادار و مافەکانی گەلی کورد لە ئۆتۆنۆمیدا ناسەلمێنێت!

• بڕیاردرا کە بەزوویی کۆبوونەوەیەکی تر بکرێت، بە مەبەستی تەواوکردنی کارە سەرەتاییەکان و هاوکات بەوردی هەڵسەنگاندنەکان و داڕشتنی تەواو بۆ دیاریکردنی هێڵە گشتییەکانی دەستووری (کۆمەڵە)، دابنرێت!

ئیتر دوای ئەو کۆبوونەوەیە جموجووڵی گەرم دەستی پێکرد و بۆ زیاتر فراوانکردنی پەیوەندییەکان بەو هاوڕێیانەوە کە ناویان دیاری کرا، چ ئەوانەی لە بەغدا هەڵسووڕاوی سەرەکی بوون لە (شەهاب شێخ نوری، فوئاد قەرەداغی و دلێر سدیق و شاسوار جەلال - ئارام - داڕۆی شێخ نوری، عەزیز مەحمود، یاسین کەرکووکی، شێخ محەمەد و محەمەد عوزەیری و عەبدولڕەزاق فەیلی، هۆشمەند عەبدول مەجید و نەرمین عوسمان و پرشنگ محەمەد مەمەند و خەرامان و فازیلی مەلا مەحمود و دواتریش (جەعفەر عەبدول واحید)، هات! منیش هاوکاریان بووم تا هەریەکەمان لە شارێکی تر کاری بۆ دیاریکرا ! لە سلێمانی (فوئاد قەرەداغی و شەهاب شێخ نوری و فازیلی مەلا مەحمود - هاوکار - سالار عەزیز و ئەشرەف شەرەف و ئاوات عەبدول غەفور و عومەری سەید عەلی و عومەر فەتاح و جەبار و ئیبراهیم عەلی و فوئاد مەجید میسری و دلێر تایەر و جەمال تایەر و عارف کەریم، کەمال عەلی، دڵشاد محەمەد و محەمەد صابیر، حەمە فتح اللە، حەمە سەعید فەقێ عەلی و شێرزادی برای و جەمیل و حەمە ئەمین و شێخ عەلی و ئەحمەد ئابلاخی و هیوا غەفور و دلێری سەید مەجید و عەلی کەمال عەبدولا، عەبدولڕەحمان سدیق و مامۆستا ئەحمەد و حەمە هوشیاری شێخ محەمەد، ئازاد مستەفا و لە خانەقین جەبار فەرمان، مەجید کریم (شەهید غاندی) و موحسین عەلی ئەکبەر و دواتریش مەلا بەختیار و شەهید جوامێر، عەلی شامار لەو هاوڕێ

سەرەکییانەی (کۆمەڵە) بوون، کە ئێستا من ناوەکانیانم بیر ماوە! منیش ئەندامی ناوەندی (کۆمەڵە) بووم و وەک هەر یەکە لە هاوڕێیانی تر لە هەموو شارەکان و بەتایبەتی لە بەغدا و لە سلێمانی کارم دەکرد، تا ئەو کاتەی، کە (ناوەندی کۆمەڵە)، لەسەر پێشنیاری (مام جەلال) بڕیاریاندا، من بچم لە کەرکووک رێکخستنی (کۆمەڵە) دابمەزرێنم و لەوێ بمێنمەوە و خەریکی دروستکردن و گەشەپێدانی (کۆمەڵە) بم!

## دەستووری (کۆمەڵە)!

لە کۆبونەوەیەکی ناوەندی (کۆمەڵە)، وابزانم سێیەم کۆبوونەوەی بوو، لە (بەغدا جدیدە) لە ماڵی کاک (شەهاب) کە پێشتر هێڵە گشتییەکانی باس کرابوو. لەو کۆبونەوەیەدا، کە هەموو هاوڕێیانی کۆبوونەوەی پێشوو ئامادەی بوون، بە تێرو تەسەلی و بۆ زیاتر لە چەند سەعاتێک، زۆر مەسەلەی گرنگ و زۆر بابەتی هەستیارمان باس کرد و خاڵ بە خاڵی کاری ڕێکخراوەییمان تاوتوێ کرد! لەپاشدا هاتینە سەر نووسینی یەکەمین ئامۆژگاری ڕێکوپێکی ڕێکخراوەیی، کە چۆن بە نهێنی کار بکرێت و پەلە نەکرێ لە ڕاکێشانی ئەندامانی نوێدا، بەتایبەتی ئەو کەسانەی، کە زۆر بە باشی نایانناسین! شایەنی باسە دەتوانم بڵێم : (مام جەلال و فوئاد قەرەداغی)، لەو کۆبونەوەیەدا زۆر چالاک و کاریگەر بوون! ئیتر بۆ داڕشتنەوە و نووسینەوەی دەستووری (کۆمەڵە) و ئامۆژگاریەکان، (فوئاد قەرەداغی) و من ڕاسپێردراین، دوای کۆبونەوەکە من و کاک (فوئاد) چووینەوە لە ماڵی باوکم بە

شێوەیەکی ڕێکوپێک ئەوی خرابوویە ئەستۆمان بەجێمان گەیاند و ئامادەمان کرد، خوا هەڵناگرێت زۆربەی دارشتنەکەش لەلایەن کاک (فوئاد) ەوە نووسرا و دوای ئەوەی نیشانی (مام جەلال) ماندا و پاش هەندێ دەسکاری بچووک، لە کۆبوونەوەی دواتردا پەسەند کران و من ١٥ دانەم لێ چاپکردن! چونکە ئەوکاتە بڕیار وابوو، کە هیچ نووسین و بڵاوکراوەیەکی (کۆمەڵە)، بە ژمارەی زۆر چاپ نەکرێن و نە نووسرێنەوە، بەڵکو هەوڵ بدرێت زۆرتر دەستاو دەست بکرێن و بخوێنرێنەوە! چونکە ئەو کاتە زۆر وریای ئەوە بووین، کە بەر لە تەواو دارشتنی کارەکان و توندوتۆڵ کردنی ڕێکخستنەکانمان، هەڵس و کەوت و چالاکی و دەنگ و ڕەنگی بڵاوکراوەکانی (کۆمەڵە)، لە دەزگا سیخوڕیی و ئەمنیەکانی ڕژێمی عێراق بپارێزین و هاوکات بواریش نەدەین بکەوینە داوی دەزگای پاراستنی (پارتی دیموکراتی کوردستان) ەوە !

ئەوەی تا ئەمرۆ لە هێڵە گشتییەکانی دەستوورەکە و ئامۆژگارییەکە بیرم ماوە، لە خوارەوە دەیخەمە بەردیدەی خوێنەران و بەهیوای ئەوەشم کاک (فوئاد قەرەداغی)، بتوانێت لە دەرفەتێکدا لای لێ بکاتەوە و کەموکورتییەکانی تەواو بکات:

ناوی ڕێخکراوەکە: کۆمەڵەی مارکسی - لینینی کوردستانی عێراق، کە بەبیرو باوەڕی (ماوتسی تۆنگ) گۆشکراوە.

بیرو ئایدیۆلۆژیای (کۆمەڵە) : مارکسیزم - لینینیزم و بیروباوەری (ماوتسی تۆنگ)ە.

شوێنی چالاکی و کارکردنی : کوردستانی عێراق و ئەو شارانەی کە کوردیان تیا نیشتەجێیە، وەک شاری بەغدا.

(کۆمەڵە) بڕوای وایە، کە نەتەوەی کورد، نەتەوەیەکی ستەم لێکراو و

دابەشکراوە، بە درێژایی مێژوو چەوسانەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی بەسەر کۆمەڵەکەیدا سەپێنراوە، جارێک دوای شەڕی چاڵدێران و جارێکی تریش لە ئەنجامی یەکەمین جەنگی جیهانیدا، بە پیلانی ئیمپریالیزم و بە شێوەیەکی نوێ بەسەر هەر یەکە لە دەوڵەتەکانی (عێراق، ئێران، تورکیا و سوریا) دابەشکراوە! ئیتر لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ کوردستان و نەتەوەی کورد دابەش و داگیرکراوە و هەموو مافێکی نەتەوەیی و مرۆیی لێزەوتکراوە و بەمەش لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتورییەوە، رێگەی پێشکەوتن و گەشەکردنی لێ گیراوە! بەڵام لەتەک ئەوەشدا نەتەوەی کورد ملی بەو داگیرکارییە نەداوە و هەمیشە لە خەباتێکی بێوچانی پڕ لە قوربانیداندا بووە بۆ رزگاریی نیشتمان و ئازادیی نەتەوەکەی و بۆ دەربازبوونی لە دەستی تاڵانکاریی داگیرکەران، کە چۆن بەدرێژایی مێژوو سامان و بەری رەنجی زەحمەتکێشانی چینە چەوساوەکانی گەلەکەمانیان بردووە و بە فیڕۆداوە!

لەو کات و سەردەمەشەوە، کە رەنجدەرانی کوردستان بوونەتە بەشێک لە پێکهاتەی چینایەتیی کۆمەڵی کوردەواری، ئەوا کرێکارانی کوردستان لەگەڵ جووتیاری زەحمەتکێشی هاوپەیمانی و لەگەڵ توێژە نیشتمانپەروەرەکانی تری کۆمەڵدا، لە گیانبازی و قوربانیدانی بەردەوامدان بوون، بۆ رزگاری و دیموکراسی و گەشە پێدانی کۆمەڵی کوردەواری و دابین کردنی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و فەراهەمکردنی یەکسانی! بەڵام لەتەک هەموو ئەو قوربانی و تێکۆشانەشدا و سەرەڕای چەندین راپەڕین و شۆڕش، کەچی بەهۆی سەرکردایەتی کردنیانەوە لەلایەن چینی بۆرجوازی و خێڵەکییەوە و هاوکات لە هەلومەرجی سەخت و دژواری جیۆسیاسی و هەڵکەوتەی نالەباری کوردستان و

بەهۆی گەمارۆدانی لەلایەن داگیرکەرانەوە، نەیتوانیوە بە سەرکەوتن و بە رزگاری یەکجاری و بە ئامانجەکانی خۆی بگات! ئەویش بەڕای ئێمە و هۆکاری یەکەم، سروشتی چینایەتی ئەو سەرکردایەتییە بووە، کە نەیتوانیوە لەگەڵ ناوەرۆکی پێشکەوتنخوازانەی جووڵانەوەکەدا بێتەوە! بۆیە ئەرکی (کۆمەڵە) لەم قۆناغەدا، خەباتێکی بێ پشوو و کۆڵنەدانە، تابتوانێت ئەو بارە نەگونجاوە راست بکاتەوە! دیارە ئەمەش پێویستی بە سەرکردایەتیەکی شۆڕشگێڕ و گونجاو هەیە، کە بتوانێ بە تاکتیک و ستراتیجی راست و دروست و بە هاوپەیمانی کرێکاران و جووتیاران و باقی هێزە شۆڕشگێڕەکانی تری کوردستان، لە کۆڕی هاوپەیمانی و یەک سەنگەری خەباتدا، لەگەڵ جووڵانەوەی رزگاریخوازی گەلاندا و یەک سەنگەر لەگەڵ شۆڕشی سۆسیالیستی جیهانیدا، بە سەرکەوتن و دەرباز بوون لە داگیرکاری و چەوسانەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی بگات!

• شۆڕشی سۆسیالیستی جیهان دژی ئیمپریالیزمی جیهانی، شۆڕشێکی رەوایە بۆ رزگارکردنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی و دابینکردنی دونیایەکی بێ زەبر و زەنگ و چەوساندنەوە! ململانێی شۆڕشگێڕانەی دوور لە ریفۆرم و سازشکاری وڵاتانی سۆسیالیزم دژی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم و هاوکات خەباتی کرێکارانی هەر وڵاتێکی سەرمایەداری دژی سەرمایەدارانی وڵاتانی خۆیان و شۆڕشەکانی گەلانی رزگاریخواز لە پێناوی رزگاری و دیموکراسیدا، سەرچاوەکانی شۆڕشی سوسیالیستی جیهانن ، کە ئاشکراشە شۆڕشی رزگاری و دیموکراسی خەڵکی کوردستان، بەشێکی نەپساوەی ئەو شۆڕشە جیهانییەیە!

هەرچەندە رژێمی عێراق بەو رێککەوتنەی ١١ ئاداری ساڵی ١٩٧٠، کە لەگەڵ (بارزانی) دا، کردوویەتی و سەلماندنی مافە دیموکراتییەکان و

مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و هەنگاوەکانی لە بواری چاکسازیی کشتوکاڵ و موڵکایەتی زەوی بۆ جووتیاران و پشتیوانی گەلی فەلەستین و خۆماڵی کردنی نەوت، بە هەنگاوێکی گرنگ و لایەنێکی باشی ئەو رژێمە دەدرێ لە قەڵەم، کە ئەمەش سروشتی بۆرجوازیی بچوکی ناسیۆنالیستی عەرەبە، بەلام پێمان وانییە ئەم هەنگاوانە جیددی و تاسەربن! بۆیە دەبێت بە سیاسەتی )ململانێ و پشتیوانی – الوحده والصراع) بەگژ لایەنە خراپەکانیدا بچین و بۆ هەر هەنگاوێکی باش، هانی بدەین و وریای گیانی پیلانگێڕی و هەڵگەڕانەوەی بین لە بەڵێنەکانی!

دیدی (کۆمەڵە) بۆ ئەو حیزبە کۆمۆنیستە کلاسیکییانەی، کە لەدەوری فەلەکی یەکێتی سۆڤیەت دەسووڕێنەوە و بە شێوەیەکی دیار کلکایەتی بۆ دەکەن، دیدێکی رەخنەگرانەیە و ئەوانە بە سازشکار و ریڤیژینیست تەماشا دەکات و پێیوایە زیان بە خەباتی راستەقینەی چینی کرێکاران دەگەیەنن!

• ئەمانە بە گشتی هێڵە گشتییەکانی بەرنامەی دەستووری (کۆمەڵە) بوون، نەک دەقاو دەقی دەستوورەکە ! بەشەکەی تریشی پەیڕەوی ناوخۆ و دارشتنی تەلاری رێکخراوەیی و ئۆرگانەکانیی بوو، کە بەداخەوە هەموو ئەو نووسراوانەی (کۆمەڵە)، بە دەستوورە کەشیەوە لام نەماون و فەوتاون! ئەویش لەبەر ئەوەی کە من بۆ خۆم چەند جارێک بەهۆی بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکانی بەغداوە ماڵ و کەلوپەلم سووتاون و زۆر شتم بۆ دەرنەچووە و هاوکات کەسوکاریشم لە ترسی شالاو و پەلاماردانی رژێمی بەغدا سووتاندوویانە، یا لە رووداوە ناخۆشەکانی ۳۱ ئاب و شەڕی برا کوژیدا لەناو چوون! هەرچەندە دڵم بەوە خۆش بوو، کە نوسخەیەکم بە هاوڕێ (ئیحسان نەجم کەرکووکی -

ئەبـو شـەهاب - و یەکێکی تریشـم بـە ( ئیبراهیـم جـەلال) شـک دەبـرد، کەچـی پێدەچێـت نوسـخەکانی لای ئەوانیـش لـە رووداوەکانـدا فەوتابـن و نەمابـن! (عەبدولـرەزاق سـێگرتکان) یـش، کـە لـە نەبەردیەکانـی ئـازاد کردنـی کەرکووکـدا قارەمانانـە شـەهید بـوو، نوسـخەیەکی لابـوو! ئیتـر بەم جۆرە لـە هەمـوو ئـەو دیکۆمێنتانە بێبەش بووین! بە راستی شـەهید بوونـی ئـەو تێکۆشـەرە گەرچـی لـە نەبـەردی پرۆسـەیەکی زۆر گـەورە و گرنگـی وەک رزگارکردنـی کەرکووکـدا بـوو، بـەڵام خەسـارەتیکی ئیجـگار گـەورە بـوو، چونکە (عەبدولـرەزاق) تێکوشـەرێکی زۆر قارەمـان بـوو، کە هەرگیـز لەبیـر ناچێتـەوە! بەداخـەوە هەرچـی سـۆراخمان کـرد، لای کـەس و کارەکەشـی هیـچ پەیـدا نەبـوو! ئیتـر زۆربـەی ئـەو هاوڕێیانـەی تریـش، کـە دەبـوو لایـان دەسـت بکەوێـت، هەمـوو لـە کـۆڕی خەباتـی نهێنیـی رێکخسـتندا لەلایـەن دوژمنـەوە گیران و لـە سـێدارە دران و شـەهید بـوون، یـا لـە نەبـەردە سـەختەکانی بەرگـری و رزگاری کوردسـتاندا رۆحـی نەمریـان لـە ئاسمانی خەبـات و تێکۆشـاندا، بۆ هەتـا هەتایە فڕین و دایان لەشـەقەی بـاڵ و شـەهید بـوون! دیـارە لـە خەباتـی بـێ وێنـەی (کۆمەڵـە) دا، ژمارەیەکـی زۆر و لەشـکرێک لـە هاوڕێـی خەباتمـان شـەهید بـوون و گیانـی خۆیـان کـردە قوربانـی ئـەم دەسکەوتانەی ئەمڕۆی کوردستان، بەڵام رۆیشـتن و بۆشـاییەکی گـەورە و و پـڕ لـە سـوێیان لە ژیانی ئێمـەدا دروسـت کـرد!

هەرچیـش پەیوەنـدی بەسـەر ئامۆژگارییەکانـی ئەوکاتـەی (کومەڵـە) ەوە، هەیـە. لێـرەدا کاکڵەکـەی بـە چەنـد خاڵێـک بـۆ خوێنـەری خۆشەویسـت دەخەمـە روو!

• پێویسـتە لـە هەمـوو هەڵسـوکەوت و پەیوەندی کردنێکدا بـە نهێنـی و بـە وریاییەکی تـەواو مامەڵـە و رەفتـار بکـەن و لەخۆیانـەوە زۆر قسـە نەکـەن

و نهێنی نەدرکێنن!

• لە هەڵبژاردنی خەڵکی نوێدا ورد و وریا بن و ئاگاداری تەڵەی دوژمن بن! چونکە پەلە کردن لە راکێشانی کەسانی نوێدا، هەم مەترسی بۆ سەر هاورێیان خۆیان و هەم مەترسی گەورەش لەسەر سەرجەم ریکخستن دروست دەکات! بۆیە دەبێت ئەو کەسەی کە رایدەکێشین بۆ رێکخستن، پێویستە زۆر باش و بەهۆی چەند هاورێیەکی رێکخستنەوە هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت و لێی دڵنیا بن، ئەوسا باسی (کۆمەڵە) ی لەگەڵ بکەن!

• هەوڵی تەواو بدرێت، هەموو هاوڕێ نوێیەکان و ئەندامانی تازە بە شێوەی تەنها و دانە دانە بێت، واتە بە شێوەی (تەسبیح)، نەک بە شێوەی (هێشویی)، رێک بخرێن!

• پێویستە قۆناخی یەکەمینی رێکخستن، ئەلقەی رۆشنبیری بێت، بۆ پەروەردە کردنیان بە گوێرەی بەرنامەیەکی دیاریکراو!

• نابێت هیچ کەس نامە و بڵاوکراوەی (کۆمەڵە)، لای خۆی گل بداتەوە یا لەگەڵ خۆی بیگێرێت! پاش خوێندنەوە و تەواوبونی، باش وایە کە بسووتێنرێ! هەروەها دەبێت بایەخێکی زۆر بدرێت بە رەوشت بەرزی! ئەمانە و هەندێ شتی تر، کە رەنگە هەموویم بیر نەما بێت، لە ئامۆژگارییەکانی ئەو کاتەی (کۆمەڵە) بوون، کە بە نووسراو دابەزیبووە خوارەوە بۆ هاورێیانمان!

## کتێبخانەی بیری نوێ!

بیرم دێت یەک دوو جار لەگەڵ (فازیل) و کاک (شەهاب)، چووینە سەردانی بەشی رووناکبیریی سەفارەتی چین لە بەغدا ، بۆ داوای هەندێ لە کتێبەکانی (ماوتسی تۆنگ)، کابرایەک دەهاتە پێشوازیمان ناوی (لی) بوو، زۆر کتێبی پێداین. جارێکی تریش چوینەوە بۆلای، خوا هەڵناگرێ زۆر هاوکاری کردین و ژمارەیەکی زۆری کتێب و نامیلکەی تری پێداین، ئێمەش دامان بە رێکخستنەکان بۆ ئەوەی سوودی لێ وەر بگرن.

جارێک لە سەردانێکی (مام جەلال)دا، کاک (شەهاب) داوای لێکرد، کە هەوڵ بدات کتێبخانەیەک بکەینەوە، تا ببێتە کلاورۆژنەیەک بۆ ئەوەی تیشکی بیری نوێ بلاوبکاتەوە و هەم شوێنێک بێت بۆ کۆکردنەوە و بۆ یەکگرتنەوەی تێکۆشەرەکانی بەغدا و ئەوانەشی کە جارجار لە شارە دوورەکانەوە دێن و شارەزانین!

(مام جەلال)، بیرۆکەکەی لا پەسەند بوو، بیرمان کردەوە کە بە ناوی

کاک (دارۆ) وە بکرێتەوە و ئەویش جێگەیەک پەیدا بکات! پاش گەڕانێکی زۆر لەسەر شەقامی سەعدون لە شوێنێکی زۆر باش جێگەیەک پەیدا کرا. (مام جەلال) یش، قسەی لەگەڵ چینییەکان کرد، کە کتێبمان بدەنێ بڵاوی بکەینەوە بەناو لاوانداا هاوکات لەگەڵ سەنتەرێکی لوبنانیش رێکەوتنێک کرا بۆ پەیداکردنی کتێبی باشی نووسەرانی پێشکەوتنخوازی عەرەبی و لوبنانی! کاک (شەهاب و دارۆ)، زۆریان هەوڵدا، دواجار هەندێ سەرچاوەی تریان پەیدا کرد و (مام جەلال) یش، زۆر یارمەتی داین و پارەی بۆ پەیدا کردین! ئیتر کتێبخانەکە بە شێوەیەکی تازە و جوان، کاری دیکۆری بۆ کرا و پڕ کرا لە کتێبی نایاب و نوێ! هێندەی نەبرد بوو بە جێنزرگەی لایەنگرانی (کۆمەڵە) و شوێنی یەکگرتنەوەی هاوڕێیان! لەو کتێبخانەیەدا (دارۆی شێخ نوری و عەلی مستەفا)، کاریان تێدا دەکرد. لە دواییدا سوودێکی زۆری گەیاند و توانی چەندین کتێبی نوێ بە ناو لاوان و خەڵکی تریشدا بڵاوبکاتەوە و کتێبخانەکە ناونرا کتێبخانەی (بیری نوێ). لەو کتێبخانەیەدا جگە لە هەموو نووسینە وەرگێڕاوەکانی (ماوتسی تۆنگ و لین پیاو و شۆئەن لای)، ئەوا بە زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزیش گەلێ بابەتی باشی تێدا بوو، هەروەها بەرهەمەکانی (ناجی علوش، جۆرج ترابیشی، منیر شفیق، مارکس، ئنگلز، هیگل، لینین، ستالین، روزا لۆکسمبورگ، ترۆتسکی، تۆماس مۆر، رۆجیە غارودی و لوکاش و کاسترو و جۆن رید، ماکسیم گورگی، گیڤارا، کیم ئیل سونگ، جۆن براون، سیمون دی بوڤار، جاک لەندن، جورج حاوی و خالد بکداش و نایف حواتمە و الیاس مرقس و سمیح القاسم) و زۆرێ لە ئابووریناسانی وەک (ئادەم سمیث)ی تێدا بوو! ئەو کتێبخانەیە هەتا مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٤ بڕی کرد و کاریگەرییەکی باشی لە بڵاوکردنەوەی بیر

و ئەدەبیاتی نوێدا هەبوو، دواتر لەگەڵ پەلاماردانەوەی سەربازی و سوپای عێراق بۆ سەر کوردستان، ئیتر بەرەبەرە ئەویش کەوتە ژێر زەبر و زەنگی بەعسییانەوە و لە ئەنجامدا داخرا!

رۆژێکیان لەگەڵ (فازیلی مەلا مەحمود)، سەردانێکی (مام جەلال) مان کرد، ئەویش پێی وتین: بگەڕێن لە شوێنێکی باش، لە گەڕەکێکی بێدەنگ و چەپەک کە هاتووچۆو سەرنجی خەڵکی رانەکێشێت، خانوویەک پەیدا بکەین تا بیکەینە شوێنی کار کردن و نووسین! ئیتر ئێمەش دوای ئەو راسپاردەیە کەوتینە گەڕان، تا دواتر توانیمان لەگەڵ (فازیل) پێکەوە لە گەڕەکی (عەرەساتی هندیە)، کە دانیشتوانەکەی خەڵکی خۆشگوزەرانن، خانوویەکی دوو ژور و یەک هۆڵیمان دەست کەوت و بەکریمان گرت! کرێکەشی بۆ ماوەی شەش مانگ (مام جەلال) بۆیداین! ئیتر ئێمەش زۆربەی کۆبوونەوە و کارەکانمان گوێزایەوە بۆ ئەو خانووە!

باڵی (مەکتەبی سیاسی - جەلالی )، کە پێشتر ناوی خۆیان گۆڕی بە (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)، لە دوای رێککەوتنی ئاداری ١٩٧٠، کەوتە دۆخێکی ناهەموارەوە، پاش شەش ساڵ ململانێی توند و خوێناوی و ململانێی فیکری لەگەڵ (بارزانی)دا، لە ئەنجامدا (بارزانی)، بە رێکەوتنێکی سیاسی ئاشکرا و راگەیەندراو لەسەر ئاستی ناوچەیی و جیهانی و پێشوازیی زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان، سەرکەوتنێکی زۆری بەدەست هێنا! بەمەش باڵی مەکتەبی سیاسی (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان)، کەوتە بارێکی نالەبار و دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ پەیدا بوو، لە ئەنجامدا لە ناویاندا دوو رەوتی جیا سەریهەڵدا:

یەکێکیان بیری لە پاراستنی ئەو رێکخستنە دەکردەوە، کە چەند ساڵە هەیانە و کاری بۆ دەکەن، ئەوی تریشیان بیری لە هەڵوەشاندنەوەی دەکرد!

ئێمە ئەوانەی بیرمان لە دامەزراندنی (کۆمەڵە) کردبوەوە، بە هەموو تواناوە لە کاردا بووین بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پارتە! چونکە جگە لەو هەموو سەرنج و رەخنانەی کە لێیمان هەبوو، وەک کۆسپ و رێگرێکیش لەبەردەم گەشەکردنی (کۆمەڵە)دا، کە لە هەنگاوەکانی یەکەمیدا بوو دەمانبینین! ئیتر کاک (شەهاب و من و فازیل و دلێر سدیق و فوئاد قەرەداخی)، لەچەند چاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ (مام جەلال)، رێککەوتین، کە کار بکەین بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پارتە! بەڵام رۆژێکیان لەناکاو و بێ ئاگادار کردنەوەی کەسمان، (مام جەلال)، بزر بوو دیارنەما، تومەز سەفەری کردوە و رۆیشتووە! ئێمەش هەموو کەوتینە ترس و گومانەوە، تا دوای ماوەی چەند رۆژێک سەری هەڵدایەوە و رۆژێک پێش بەستنی کۆنگرەی ئەو پارتە هاتەوە بۆ بەغدا! لە کونگرەکەشدا بە پێچەوانەی بڕیاری (کۆمەڵە) و بە تەقەلایەکی زۆر کاری بۆ هێشتنەوەی کرد! بەڵام خۆش بەختانە ئەندامان و لایەنگرانی (کۆمەڵە)، زۆرینە و بەکار بوون و توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن. لە ئەنجامدا زۆربەی ئەندامانی کونگرەکە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پارتەکەیان دا! ئەو بڕیارەش بۆ ئێمە لەو سەردەمەدا، تاحەز بکەی کارێکی باش بوو! چونکە لە دوولاوە کاری کردە سەر رەوتی رووداوەکان! لە لەلایەک کاری (بارزانی) ئاسانکرد بۆ وەرگرتنەوەیان لەناو پارتەکەی خۆیدا، لەلایەکی تریشەوە کۆسپی لە بەردەم گەشەکردنی (کۆمەڵە)دا، تاڕادەیەکی باش تەخت کرد و لابرد! ئیتر وردە وردە ساڵی ۱۹۷۰ ساڵی گەشەکردنی بەردەوامی (کۆمەڵە) و بەرفراوانیی رێکخستنەکانی بوو! بەمەش ئەرکی پەروەردەکرن و رووناکبیریش لە ریزەکانیدا تادەهات لەبرەودا بوو، لێدوانە ناوخۆییەکانی خۆشمان مەسەلەیەکی تازەی وروژاند، مەسەلەی عێراقی بوونی خەبات، یا کوردستانی بوون!

بەداخـەوە ئـەو مەسـەلەیە (کۆمەڵـە)ی لـە قۆناخـی سـاواییدا، دووچـاری گرفتێکـی گـەورە کـرد، لـە ئەنجامیشـدا بـە دوور کەوتنـەوەی ١٥ – ٢٠ هاوڕێـی تێکۆشـەر و کارامـەی (کۆمەڵـە) کوتایـی هـات !

## کێشەی عێراقچێتی!

ڕۆژێکیان کاک (شەهاب) لەسەردانێکی تایبەتدا هات و وتی : دەزانی (فازیلی مەلا مەحمود) و هەندێکی تر مەسەلەیەکیان ورووژاندوە بە دووکەرت بوونی (کۆمەڵە) تەواو نەبێت، باشە ! سەرم سوڕما.. پێم وت : کەرت بوونی چی! (فازیل) ئەم ماوەیە لە سلێمانی بوو خۆ لێرە نیە، ئیتر چۆن و لەکوێ ئەو قسانەی کردووە. لە وەڵامدا باسی کرد و وتی.. لە سلێمانی هاتۆتەوە، دوێنێ هاتە لام و باسی لە یەکێتی خەباتی پرۆلیتاریا دەکات لە سنووری یەک وڵاتدا، لای وایە کە دەبێت (کۆمەڵە)، وابکات و ڕوو بکاتە یەکخستنی خەباتەکەی و ڕێکخستنەکانی لەگەڵ باقی پرۆلیتاریای عێراقدا تێکەڵ بکات! چونکە چینی کرێکاری یەک وڵات یەک مەسەلەی هاوبەشیان هەیە و دەبێت پێکەوە ڕێکخرێن و ئەرکەکانیان بەو پێیە یەکبخەن! بۆ سەلماندنی ئەو قسانەیشی چەند دەقێکی لە نووسراوەکانی (لینین) هێناوە و دەیخوێنێتەوە !

وتم: کاک (شەهاب) ئەوە دەڵێی چی، خۆ ئێمە چەند ساڵێکە زۆربەی

وەخت پێکەوە بوین و گفتوگۆ و بیر کردنەوەمان ئەوەندەی پەیوەندی بە جووڵانەوەی کوردستانەوە هەبووە، هێندە پەیوەندی بە یەکێتیی ڕێکخستنی چینی کرێکاری عێراقەوە نەبووە! خۆ ئەگەر وابوایە (قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراق) هەیە. وا بوایە دامەزراندنی (کۆمەڵە) هەر پێویست نەدەبوو!

وتی: دەڵێت مەسەلەی ڕزگاریی گەلان و مەسەلەی دیموکراسی، کە مەسەلەی خەڵکی کوردستانە بەبێ ڕیکخستن و یەکخستنی چینی کرێکاری عێراق و بێ هاوپەیمانی کردن لەگەڵ خەڵکە نیشتمانپەروەرەکانی تری عێراق مەحاڵە و سەرناگرێ، چونکە ئەو مەسەلانە هەموویان پێکەوە بەستراون و یەکێتیی ڕێکخراوەیی چینی کرێکاری عێراق و ڕێکخراوێکی عێراقی و سەرتاسەری پێویستە!

ڕۆژی ئایندە لە ماڵی خۆمان لەگەڵ (فازیل و فوئاد قەرەداخی و کاک شەهاب و دلێر سدیق)، کۆبووینەوە و مشتومڕ لەسەر ئەو باسە گەرم بوو. ڕای (فازیل) وابوو، کە ئەگەر ڕێکخستن و خەبات کوردستانی بێت، ئەوا مانای خۆ ڕێکخستنە لەسەر بنچینەی نەتەوەیی و ناسیۆنالیستی، نەک لەسەر بنەمای ( مارکسیزم - لینینیزم) و پێویستییەکانی خەباتی چینی کرێکار و سۆسیالیستی! واتە ئەوەی یەکەمیان کارێکی ناسیۆنالیستییە و کەرتکردنی چینی کرێکار و خەباتەکەیەتی!

ئێمەش بۆمان باس کرد، کە چین و (ماوتسی تونگ) مارکسیزم - لینیزمیان، خستۆتە قاڵبێکی نیشتیمانی (چینی)یەوە، تا هەم بتوانن چینی کرێکار ببزوێنن، هەم هاوپەیمانیی کرێکاران و جووتیاران بکەنە بنچینەی بەرەیەکی یەکگرتوو بۆ ڕزگارکردنی ولاتەکەیان و پێشکەوتنی کۆمەڵەکەیان! خۆ ئەگەر وا بوایە چینییە کانیش ئەو هەموو ساڵە خەباتی ڕزگاریی ولاتەکەیان نە دەکرد و شۆڕشی (کار

دژی سەرمایە) یان، بۆ چینی کرێکاری خۆیان بەرپا دەکرد و بەمەش دەسەڵاتی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریان دەکردە دروشم و ئامانج، کەچی بە پێچەوانەوە ئەوان دەسەڵاتی دیموکراتیی گەل و حوکمڕانی گەلیان کردۆتە ئامانج! ئێمەش مافی خۆمانە لایەنی تایبەتمەندیی واقیعی گەلەکەمان و کۆمەڵی کوردستان لەبەرچاو بگرین، کە دیارە ئەویش لەگەڵ باقی کێشەکانی عێراقدا جیایە، بەمەش ئێمە ئەرکەکانمان و ئامانجمان جیایە، چونکە قووڵایی ستراتیجی جووڵانەوی گەلەکەمان لە پارچەکانی تری کوردستاندایە، نەک لە عێراق! هاوکات خەباتی چینی کرێکار و چینە شۆڕشگێڕەکانی عێراق، هاوپەیمانی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستان و هی هەموو کوردستانە!

کرێکاران و رەنجدەرانی کوردستان - کە هێشتا کرێکارانی وەکو یەک چین، چینێکی تەواو کامڵ و خەملیو قەوارەی نەگرتووە و لە کوردستاندا بە هەمووی ١٠ – ١٢ کارگەی نیمچە گەورەی تیایە - ئەرکی کرێکاران لێرە بە پلەی یەکەم، ئەرکی رزگاری نیشتمانییە، ئەرکی رزگاربوونە لە داگیرکاری و ئەرکی پێشکەوتن و دیموکراسییە، نەک شتێکی تر! کورد و کوردستان لە چوار لاوە بە دوژمن گەمارۆ دراوە و مافی چارەی خۆنووسینی لێ زەوتکراوە! لە کاتێکدا عێراق و چینی کرێکار لە عێراقدا ناکۆکییان لەگەڵ کۆمپانیەکانی نەوت و پاشماوەی گرێبەستە ئیمپریالییەکانی ئینگلیز و هاوپەیمانەکانیدا هەیە. بۆیە رەنگە چینی کرێکاری عێراق و هاوپەیمانەکانی لەگەڵ حوکومەتی عێراق و حیزبی بەعسدا، تارادەیەک بتوانن لەم قۆناخەدا خاڵی هاوبەشیان هەبێت و هاوپەیمانی بکەن، بۆ ئەوەی لەژێر زەبری ئەو گرێبەستانە بێنە دەرەوە و یارمەتیی رژێم بدەن نەوت و کۆمپانیای نەوت خۆماڵی بکات! بەڵام چینە شۆڕشگێڕەکانی ئێمە هەرگیز خواستەکانیان لەگەڵ ئەو رژێمانەدا

نایەتــەوە، چونکــە ململانێیــان لەگــەڵ دەوڵەتانــی داگیرکــەری کوردســتانە، نــەک لەگــەڵ یــەک رژێم و یــەک حکوومــەت، بەڵکو دەوڵەتانــی (تورکیــا و ئێران و ســوریا و عێراق) دەوڵەتــی داگیرکــەرن! بۆیــە ململانێی خەڵکی کوردســتان لەســەر رزگاریی گەلی کوردســتانە، بۆ رزگاریی کوردستان و ئازادیی گەلی کورد! ئەوانــەش کە ئەم مافانە ناســەلمێنن و رێگرن لــە بەدیهێنانــی و بــە ئاگر و ئاســن و بــە کوشــتن و بڕیــن مامەڵــەی لەتەکدا دەکــەن، ئــەوا بــەو کارەیــان خۆیــان کــردووە بــە دوژمنــی گەلەکەمــان و چینــە شۆڕشگێڕەکەشــی، کــە کرێکارانی کوردســتانە! بۆیــە ئــەو ناکۆکییە ناکۆکیــی نێــوان (کار و ســەرمایە) نیــە، ناکۆکیــی نێــوان کرێــکاران و ســەرمایەداران نییــە، واتــە ئەرکــی شۆڕشــی سۆسیالیســتی نییــە. بەڵکو ئــەو ئەرکە، ئەرکی شۆڕشــی رزگاریی نیشتمانیی کوردســتانە و ناکۆکییە لــە نێوان (گەلــی کورد) و (داگیرکــەر)دا، کە زەوتکــەری خــاک و مافەکانی کۆمەڵەکەیەتــی! (فازیــل) بــاوەڕی بــە بۆچوونەکەمــان نەهێنــا و هــەر ســوور بــوو لەســەر بۆچوونەکانــی خــۆی! نایشــارمەوە (فوئــاد قــەرەداغ) یش، دوو دڵــی نیشــان دەدا!

پــاش دوو رۆژ (مــام جــەلال)، داوای کۆبوونــەوەی (ناوەنــدی کۆمەڵــە)ی کــرد، لــە کۆبوونەوەکــەدا باســی بیــروڕای ئــەو هاوڕێیانــەی کــرد، کــە لــە ســلێمانیش هاوشــێوەیان هەیــە! وتــی: ئــەوە مەســەلەیەکی زۆر گرنگــە و دەبێت بەشــێوەیەکی دیموکراسی و بە زووترین کات چارەســەری بکەین، دەنــا بــەم وەزعــەی ئێســتاو بــەم دوو بۆچوونــە، کــە لەســەر دووڕیانێکی لەیەکتر جیاوازین، یەکێک عێراقی و ئەوی تر کوردســتانی، کار نــاڕوات بەڕێــوە! ئیتــر بــەو چەشــنە مەســەلەکان زۆر تاوتــوێ کــران، لێدوان و گفتوگــۆکان زۆر درێژەیــان کێشــا، چەنــد ســەعاتێکی خایانــد بــێ ئــەوەی گۆڕانکارییەکــی کەمیــش بێــت، لــە فیکــری هیــچ لا رووبــدات! ئــەوان رای

خۆیان نەگۆڕی، (مام جەلال) داوای کرد کۆبوونەوە کانمان نەپسێنین و بەردەوام بین و لە ڕۆژانی ئایندەدا زیاتر کفتوگۆی لەسەر بکەین! بە (فازیل و فوئاد) یشی وت.. وا باشە هەردووکیان سەردانی بکەن و پێکەوە قسەی تر لەوبارەیەوە بکەن!
دیار بوو هاوڕێ و هاوبیرەکانیان لە سلێمانی زۆر ترو گەرمتر لەکار و گوفتاردا بوون! کێشەکە و چارەسەری گرفتەکە ئاسان نەبوو، تا دەهات زۆرتر دەنگی لێ پەیدا دەبوو! ئاخرئەوان لەگەڵ هەر کەسێک، کە پێشتر هاوڕێیەتی راستەوخۆیان هەبووبێت، دەچوون لەو بارەیەوە قسەیان دەکرد و بۆچوونی خۆیان بۆ باس دەکردن! تا بە بەشداریی (مام جەلال)، بڕیارێکمان دەرکرد، کە پاش یەک دوو هەفتە لە مشتومڕ و تاوتوێکردنی لایەنی تیۆری و پراکتیکی ئەو مەسەلەیە، هەموو کۆمیتەکانی هەرێمەکان هەڵسن بە گشت پرسی و را وەرگرتن، بەمەرجێ تەنها ئەندامان بەشداربن و لەدواییدا ئەنجامەکەی بنێرنەوە بۆ (ناوەندی کۆمەڵە). دواتر دەرکەوت ئەوانەی ئەو بیرو بۆچونە (عێراقچیە)یان هەیە، ژمارەیەکی کەمن و هەر نزیکەی ١٥ کەس دەبن و ئەوەش مەترسییەکی زۆر گەورە نییە! دواجار هەر دوو هاوڕێیان (فوئاد قەرەداخی و فازیلی مەلا مەحمود)، بە بڵاوکراوەیەکی (ناوەندی کۆمەڵە)، پاش ئاگادارکردنەوەی خۆیان لە رێکخستنەکانی (کۆمەڵە) دوورخرانەوە! ئیتر ماوەی چەند مانگێک مقۆمقۆ هەر مایەوە بەتایبەتی لەسلێمانی، بێ ئەوەی ئەم مەسەلەیە لە ریشەوە کۆتایی پێبێت، لە ئایندەشدا هەر چەند ساڵ جارێک دەستەیەکی چەند کەسی و هەندێ جاریش بە ژمارەی زۆر سەریان هەڵدەدا و بە ناوو بە رەنگی جیا جیا (رەنجدەران، رەوتی کرێکاری و کۆمۆنیست، کۆمۆنیستی کرێکاری) پەیدا دەبوونەوە و ئیدیعای ئەو مەسەلەیان دەکرد. بەڵام دواجار

دەرکەوت، کە مێژو و واقیع لە تیۆری وشک و بێگیان گەورەترە، بۆیە هیچ یەکێ لەو بۆچوونانە نەیتوانی لەسەر ئەرزی واقیع گەشە بکات و لەسەر پێی خۆی بوەستێ!

پەیدا بوونی ئەم جۆرە بۆچوون و رەوتە چەپڕەو و بان چەپانە لە مێژووی جوولانەوەی چەپ و مارکسییەکاندا کارێکی کتوپڕ و چاوەروان نەکراو نیهی! زۆر هۆکاری خۆیی و فیکری و تەنانەت توندڕەویش هەن، کە ئەم دیاردانەیان لێ دەکەوێتەوە! بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی پێکهاتەکەی، کە لەسەر بنەماو پرانسیپی ئایدیایەکی دیاریکراو دامەزراوە و ئایدۆلۆژیا رۆڵی گەورەی لە رەنگڕشتنی تەلاری رێکخراوەکەدا هەیە و بەشێکی تریشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەم جۆرە رێکخراوانە بزێوتر و زیندووترن و مشتومڕ و بیرکردنەوە و گفتوگۆی فیکری لەناویاندا لە هەندێ رێکخراوی تر زۆرترە! بۆ نموونە (حیزبی شیوعی عێراق)، لە چەند ساڵێکی کەمدا بەر لە ساڵی ١٩٤٥ دەستەیەک بە ناوی (الی الامام) و یەکێکی تر بە ناوی ( الشرارة) و یەکێک بە ناوی (وحدة النضال) و یەکێک بە ناوی (حیزبی شیوعی کوردی) و ئەوی تریش بە ناوی (کۆمۆنیستە عێراقییەکان) لێی جیابوونەتەوە! (حیزبی شیوعی سوریا)ش بە هەمان شێوە لە سالی ١٩٧٢ دا، هەندێک بە ناوی مەکتەبی سیاسی دەستەی (ریاز تورک) و جارێکی تر دەستەی (موراد یوسف) و سالی ١٩٨٦ یش، دەستەی (یوسف فەیسەل - کۆمۆنیستی یەکگرتوو) و دواییش ( قەدری جەمیل)، بە ناوی (رێکخراوی دیمەشق)، جیا بوونەتەوە!

## خەباتی (کۆمەڵە) لەکەرکووک!

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠دا، کە سەردەمی سەرهەڵدان و پەلوپۆ هاویشتنی (کۆمەڵە) بوو، لە کۆبونەوەیەکی ناوەندی (کۆمەڵە)دا، لە دابەشکردنی کارەکاندا پارێزگای کەرکووک بەر من کەوت، لە سەرەتادا (کاکە شەهاب)، بۆ بەغدا و دهۆک و خانەقین و (فوئاد قەرەداخی)، بۆ هەولێر و (فازیلی مەلا مەحمود)، بۆ سلێمانی و (دلێر سدیق )، بۆ بادینان دیاریکران و منیش رەوانەی کەرکووک کرام.

لە بەغدا و لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و خانەقین، شانە و ئەڵقەی تێکۆشەری (کۆمەڵە) هەبوون، بەڵام لە کەرکووک هیچ کەسێکی دیارییکراو بە من نە ناسرا! چونکە من ژن و ماڵم هەبوو خێزاندار بوم، ئیتر بڕیاردرا ماڵ و کارەکەم بگوێزمەوە بۆ کەرکووک! ئەو کاتە دوو منداڵم هەبوو بە ناوەکانی (بێستون و شوان). دروستکردنی رێکخستن لە کەرکووک لە خاڵی سفرەوە خۆتەرخان کردن و ماندووبونی دەویست. بە راستیش بڕیارێکی ئاسان نەبوو، چونکە من بۆ خۆم نە پێشتر

لە کەرکووک ژیاوم و نە کەسوکارێکی وایشم لەو شارەدا هەبوو، لە هەندێ هاوڕێ و ناسیاوی سەردەمی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) بەولاوە و لە ئوتێلەکەی (عەبەی دەروێش کەریم و ئاسۆی مەکتەبە) بەولاوە، کەسی ترم نە دەناسی!

پاش چەند ڕۆژێ بە دڵێکی خۆش و شەوق و زەوقێکی زۆرەوە، جانتام پێچایەوە و بەرە و کەرکووک و بۆ ئوتێلی (عەبەی دەروێش کەریم)، کە لە ناوەندی شاردا بوو، کەوتمە ڕێ و لەوێ دابەزیم! ناوی ئوتێلەکە، هەم (سەلام) ی شاعیر و چوارینە جوانەکانی (عومەر خەیام) ی بیرخستمەوە - شیعرەکانی خیام کە (سەلام) ی شاعیر بە زمانێکی کوردی پاراو وەریگێڕابوون- هەم سەلامی ئاشتی و کۆنگرە و تەقەلاکانی ئاشتی و شەڕو شۆڕی دنیا و (سلام عادل)ی حیزبی (شیوعی)، دەهێنایەوە یادم. لە ئوتێلەکەدا کوڕێکی جوانخاسی باڵا بەرزی روو گەش، کە ناوی ( عبدالرزاق) بوو بە گەرمی و دۆستانە پێشوازی لێکردم، بە بایەخێکی دیارەوە و بە ئارەزوی دڵی خۆم ژوورێکی بۆ دانام! پاش ڕێکخستنی کەلوپەلی ناو جانتاکەم و هەڵواسینی جلەکانم بۆ حەوانەوەیەک چوومە سەر جێگاکەم بە دەم چا خواردنەوە جار جار دڵە ڕاوکێ و جارجاریش بە دڵی خۆش کەوتمە بیرکردنەوە لەو کار و ئەرکەی پێمسپێراوە!

کەرکووک شارێکی زیندووی شۆڕشگێڕە، مەڵبەندێکی گرنگی خەباتە و مێژوویەکی تایبەتیی هەیە. لە پاش ڕێکەوتننامەی (سایکس پیکۆ) و دابەشکردنەوەی ناوچەکە و پاش گفتوگۆی ئینگلیز و فەرەنسا بە ئاگاداری روسیا، نەوتەکەی کەرکووک بووە هۆی بە زۆر لکاندنی بەشێکی کوردستان، بە شاری کەرکووکیشەوە بە عێراقی عەرەبییەوە! ئیتر لەوساوە ململانێ و خەبات دژی ئینتیداب و ئینگلیز،

دژی کۆمپانیای نەوت و گرێبەستەکانی و جوولانەوەی چەپ لەم شارەدا بە چەندین ڕێگەی هەوراز و نشێودا ڕۆیشتووە تا شەقڵی تایبەتی خۆی گرتووە! لەلایەکەوە کارەکانی کۆمپانیای نەوت لە دەرهێنان و پالاوگە و چەوسانەوەی کرێکاران و لەلایەکی تریشەوە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و بێ مافی، هەموو ئەوانە زەرورەتی پێکەوە گرێدانی خەباتی نیشتمانی و چینایەتیی لێکەوتەوە و کەرکووکی کردۆتە مەڵبەندی ڕاپەرینە پڕ شکۆکەی گاور باخی! لەلایەکی تریشەوە بەهۆی خێر و خێراتی زۆرو زەوەندی ئابوورییەوە، هەمیشە جێگەی چاو تێبڕینی نەتەوەی سەردەست بووە، بۆیە لە مێژوی نوێدا سیاسەتی تەعریب کردنی کەرکووک، لەتەک دۆزینەوەی نەوتەوە سەری هەڵداوە! هەرچەندە کەرکووک نەتەوە و ئاینی جۆراو جۆری تیایە : کورد، تورکمان، عەرەب، ئاشوری و کلدانی و موسولمانی سوننە و شیعە، گاور و بەهائی و کاکەیی و (ئەهلی هەق) و تەنانەت لە کۆندا جوولەکەشی تیا ژیاوە، بەڵام ئەم دیاردەیە چەندە مێژوو کردە، هێندەش عەرەبە سەردەست و شۆفێنیەکان ترش و خوێیان کردووە، بۆ ئەوەی سیمای کوردانەی ئەم شارە لە بنەڕەتەوە بسڕنەوە و بیکەنە شارێکی عێراقی و بگرە شارێکی عەرەبیش! ئیتر ئەم شارە بووەتە مەڵبەندێکی دیاری ململانێی چینایەتی و نەتەوایەتی و ئاینیی و بەمەش ماوەیەک مەڵبەندی ململانێیەکی دورو درێژی نیشتمانی بووە دژی ئستیعمار و کۆمپانیا نەوتییە مۆنۆپۆڵەکان! بۆیە لە درێژەی ئەم ململانێیەدا و لە ڕۆژگارەکانی حوکمی پاشایەتیدا، ڕژێم هۆزەکانی (عوبێدی و جبوریان) بۆ خوارو و ڕۆژئاوای کەرکووک هێناوە و لەوێ نیشتەجێیان کردوون! هەرچەندە (سەعید قەزاز)ی وەزیری ناوخۆی ئەو سەردەمە، هەوڵێکی زۆریدا، تا هۆزە کوردەکان بۆ ئەو ناوچانە و

بە تایبەتی بۆ ناوچەکانی حەویجە و ریاز بهێنێ، بەڵام هۆزە کوردەکان بە قسەیان نەکرد و بەمەش یەکەمین سیاسەتی تەعریب کردن جێپێی خۆی خۆش کرد. دواتریش لە بۆتەی ئەو خەبات و ململانێیەدا کەڵە پیاوی گەورەی وەک ( شێخ مارف بەرزنجی) تیا لە سێدارە دراوە! ( شیخ مارفی بەرزنجی، لەگەڵ (ئیبراهیم ئەحمەد)ا، یەکێک بوو لەو نیشتمانپەروەرانەی جووڵانەوەی نیشتمانی لە کوردستاندا، کە بۆ ململانێکانی هەڵبژاردنی پەرلەمان کاندیدیان کرد و دوا تریش بووە سەرۆکی شارەوانی شاری کەرکووک)!

ئەم شارە تابلۆیەکی مۆزاییکی هەمە رەنگە و سیخناخە بە ئازار و زوڵمی هەمە رەنگ! ئازارەکانی نەتەوایەتی، چینایەتی، ئایینی و مەزهەبی، سیمای رەنگە جیاوازەکانی زوڵم و چەوساندنەوەن لەم شارەدا! بۆیە دەکرێ کەرکووک بۆ (کۆمەڵە) و خەبات زەمینێکی بە پیت و فەڕ بێت! کەرکووک بۆ کورد پڕە لە یادگارو بیرەوەری تاڵ و شیرین، کە بە داخەوە ململانێ و شەڕی خوێناوی برا کوژی نێوان هێزە کوردییەکان، رەنگی ئەم پارێزگایەی ژاکاندوە. ئێستا ئیتر بۆ من لە رووی مێژووییەوە کەرکووک ئەم شارە گرنگ و گەورەیە و لە رووی سیاسیشەوە ئەو شارە فرە رەنگ و فرە دەنگەیە، ئیترچۆن دڵم بە هاتنەکەم و بە ئایندەی کارەکانم و (کۆمەڵە) خۆش نەبێت!

یەکەمین رۆژ بوو لە بێتاقەتیدا چوومە لای کاتبی ئوتێلەکە، کە کوڕێکی رەشتاڵەی ئەسمەر بوو بەناوی ( عبد الرزاق) بۆ ئەوەی هەم هەندێ کات بەسەربەرم، هەم بە شێوەیەکی گشتی لەسەر barودۆخەکە شتێ وەربگرم! هەر لە یەکەم بینینمەوە ئەو کوڕەم چوو بە دڵدا! ئەو پیاوە گەورەیەی، کە لە شوێنی ترو قۆناغی جیا جیادا باسی دەکەم چ رۆڵێکی گرنگی گیڕاوە و سەد حەیف هەر لە پرۆسەی ئازاد کردنی

کەرکووکیشدا گیانی خۆی بە رزگار کردنی ئەو شارە بەخشی! ئەو زاتە بە گەرمی پێشوازی لێکردم و خولقی کردم بۆ چا خواردن! سەرەتا بە باسی پاک و خاوێنی ئوتێلەکە دەستمان کرد بە قسە کردن، تا باس گەیشتە سەر چۆنێتیی کار و کاسبی و رۆڵی ئەو دوو خزمەی تری خۆی، کە لە ئوتێلەکەدا پێکەوە کار دەکەن و بۆ قەڵەباڵغی ئوتێل و کاری سەخت و سەعاتی کاری دوور و درێژ و مووچەی کەم و بازاڕ و بازرگانی لە شارەکەدا و بەمەش قسەکانمان بۆ گەلێ باس و خواسی هەمە جۆر پەلی کێشا، لەوانە باسی تری وەک رێکەوتنی ئادار و ئەگەرەکانی پەیوەندیی (جەلالی و مەلایی) و رژێم و حیزبی (بەعس) و (شیوعی)یەکان و شوێنەواری رووداوەکان لەسەر باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و روناکبیری لە پارێزگای کەرکووک دا!

لەم دانیشتنەدا من (عبدالرزاق)م وەک کوڕێکی هۆشیار و چەپڕەو هاتە بەر چاو، ئەمەش بۆ من لەوکاتەدا وەک ئەوەیە هەنگوینم لە کلۆری دارا دۆزیبێتەوە! (جەلال)ی ئامۆزاشی، کە کرێکار بوو لە ئوتێلەکەدا و جاروبار لە شوێنی ئەو دادەنیشت، هەر دوو خۆش بەرخورد و دۆستانە بوون، یەکێکی تریش کە هەر خزمی ئەوان بوو، بەداخەوە ئێستا ناوەکەیم لەبیر نەماوە، کوڕێکی باش بوو!

ئەو رۆژەی کە دەمەتەقێکەم لەگەڵ (عبدالرزاق) کرد، دەمەو ئێوارەکەی چووم بۆ (مەکتەبەی ئاسۆ) کە خاوەنەکەی کوڕێکی ناسیاوم بوو بە ناوی (جەبار)، مەکتەبەکە کەوتبووە سەر شەقامی (جمهوری). لە راستیدا هەم بۆ سەردانێکی کاک (جەبار) رۆیشتم و هەم ویستم بزانم هەندێ کتێبم دەستناکەوێ! کاک (جەبار) زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردم و بەدەم قسەو باسەوە بە هەر یەکە لە (حەمە شوکر و عەلی

کەریم و جیهاد زۆراب - دڵپاک - ) ی ناساندم ! ئەم دوو تێکۆشەرە لە ئایندەدا بوونە دوو هونەرمەندی گەورە و ناسراو! لە کەرکووکیش بە ڕێنوێنی (کۆمەڵە) شانۆگەری (تەقینەوە)، یان لە میهرەجانێکی گرنگ و گەورەدا و لە هەلومەرجێکی سەختدا لە بەغدا پێشکەش کرد و لە دەنگدانەوەیەکی کەم وێنەدا پلەی یەکەمیان بەدەستهێنا! هەر ئەو دەمە کاک (جەبار) خوڵقی داوەتی نانخوارنی ئێوارەی داهاتوی کردم! قسە و باسیان زۆر دڵی خۆشکردم و تا دەهات دڵم بە هاتنەکەم خۆشتر دەبوو. لەوێ دانسقەیەکی کتێبەکەی (سەلام)ی شاعیر و چوارینەکانی (خیام)م دەسکەوت، لەگەڵ کتێبێکی نووسەری چەپڕەوی فەلەستینی بە ناوی (ناجی علوش) لەگەڵ خۆم هێنامنەوە بۆ ئوتێل.

ئیتر وردە وردە لەگەڵ (عبدالرزاق) بووینە هاوڕێی نزیک و لەگەڵ (جەلال)ی ئامۆزایشی بووینە ئاشنا. بەهۆی ئەوەوە لەگەڵ زۆر لاوی باش و تێکۆشەردا ئاشنایەتیم پەیدا کرد و بوومە هاوڕێ. لەوانە (عەلی بچکۆل و قادری مەلا عومەر و مامۆستا حەمید). بیرمە بەهۆی (عەلی بچکۆل)ەوە (حەمیدە سوری پۆلیس و ئیحسان نەجم و عەلی کەریم و جیهاد دڵپاک و مەلا ناسیحە سور و کوێخا جەلال و ئەحمەد کرێکار) مان ڕێکخست و مامۆستا (هۆشمەند)م دۆزیەوە، (ئازاد)ی برای، کە دەکاتە (ئازاد هەورامی)، بووە هاوڕێم، کە لە قۆناخێکی دواتردا بووە هاوڕێ و کۆڵەکەیەکی گرنگی (کۆمەڵە)!

پاش فراوانبوونی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی (کۆمەڵە) و زۆر بوونی ئەندامەکانی و هاتنی ئیبراهیم جەلال و فەیسەڵ تاڵەبانی - سیروان - )، یەکەمین کۆمیتەی کەرکووکمان دامەزراند! کە لە سەرەتادا بریتی بوو لە (عەلی بچکۆل، ئیحسان نەجم، عبدالرزاق و ئیبراهیم جەلال) بە لێپرسراوێتی (فەرەیدون عبد القادر) و پاش زیاتر گەشە کردنی

ڕێکخستنەکان و هاتنی کاک (شەهاب)یش بە نهێنی بۆ کەرکووک، بەرە بەرە (ئەحمەد کرێکار و ئازاد هەورامی و فەیسەڵ تاڵەبانی)، بە هاوکاری و هیمەتی زۆری کاک (حەمیدە سوور)ی گومرگ، کە بە ڕاستی نموونەی تێکۆشەری بەزات و چالاک بوو، هەر لە ماڵی ئەویشدا و بە هێزی بازووی ئەو لە ماڵەکەی خۆیدا ژێر زەمینێکی نهێنی و شاراوەی ڕێک و پێکمان بۆ کاری چاپەمەنی و بۆ خۆحەشاردانی کاک (شەهاب) دروست کرد! ئیتر بەم جۆرە ڕێکخستنەکانمان شان بە شانی گەشەکردنی ڕێکخستنەکانی شارەکانی تر، لە کەرکووکیشدا گەشەی کرد و شانەکانی پەرەیان سەند!

لەو کار و سەرکردایەتییەدا، ناشێ بۆ یەک سات ڕۆڵی گەورەی شەهید (شەهاب) لەبیر بکەین، کە چۆن لە ساڵی ١٩٧٣ وە بڕیاری دا بە ئێجگاری خۆی و هەموو کاتەکانی خۆی بۆ (کۆمەڵە) تەرخان بکات! ئیتر ناوی لە (شەهاب)ەوە بوو بە خاڵە (عوسمان) و بە نهێنی دەستیدایە چالاکییەکی زۆر و بەردەوام و لە کەرکووکەوە سەرپەرشتی هەموو شارەکان و سەرجەم ڕیکخستنەکانی (کۆمەڵە)ی دەکرد! ئەو کاتە لە ماڵی بەندە و ناو بە ناو لە ماڵی کاک (حەمیدە سوور)ی گومرگ و لە ماڵی (ئیبراهیم جەلال و فەیسەڵ تاڵەبانی و ئیحسان نەجم - ئەبو شەهاب -)، بە نهێنی دەژیا و کاری ڕیکخراوەیی و سیاسی دەکرد! دەورەی بو پەروەردە کردنی کادرەکان دەکردەوە و لە لایەکی تریشەوە هاوکاریی دەرکردن و بڵاوکردنەوەی بابەتەکانی (ناوەندی کومەڵە)ی دەکرد! لەو ماوانەدا و لە ساڵی ١٩٧٣ وە بە کردەوە بەهۆی بوونی کاک (شەهاب) و بەهۆی ئەوەی هەر لە کەرکووکیش ئێمە گۆڤاری (ئالای سور) مان دەردەکرد، کە ئەوکاتە وەک ئۆرگانی (ناوەندی کۆمەڵە) وابوو! ئیتر کەرکووک وەک و ناوەندێکی گرنگی

(کۆمەڵـە)ی لێهـات و هـەر لەوێـش ژمارەکانـی بەدەسـت دەنوسـرانەوە !
بەبیـرم دێت (نەجمەدینـی فەقـێ عەبـدوڵا)، یەکـێ بـوو لـەو هاوڕێیانـەی
کـە بەدەسـت و خەتـی خـۆی دەینوسـیەوە!

ئەگەرچـی هـەر لـە سـەرەتاوە (مـام جـەلال) بـە (سـکرتێری کۆمەڵـە)،
لەلایـەن هەمـوو (ناوەنـدی کۆمەڵـە)وە پەسـەند کرابـوو، بـەڵام زۆربـەی
کات (مام جەلال) لە کاری راستەوخۆی (کۆمەڵـە)، دوور بوو. سەردەمێک
لە گەلاڵە و لـە هاتووچـۆدا بـوو، چونکـە لـە پـاش بڕیـاری (بارزانـی) بـە
قبوڵکردنـەوەی رێکخسـتن و کادر و ئەندامەکانی باڵی (مەکتەبی سیاسـی
- جەلالـی ) لـە نـاو لـق و لیژنەکانـی ناوچەکانـدا، سـەرکردایەتیی ئـەو
باڵـە لـە نزیـک سـەرکردایەتی (بارزانـی) لـە ناوچـەی گەلاڵـە و ناوپـردان
مابوونـەوە، بـێ ئـەوەی کارێکـی دیاریکراویشـیان هەبێـت!

لـەو ماوەیـەدا چەنـد جارێـک لـە کەرکـووک و جارێکـی تریـش لـە ئوتێـل
هەورامانـی هەولێر چەنـد کۆبونەوەیەکمـان کـرد، لە باسـی رێکخسـتنەکان
و گەشـەکردنیان مـام جـەلال)، ئـاگاداری کردیـن، کـە دەچێتـە دەرەوەی
وڵات بـۆ لوبنـان و قاهیرە. لـەو کۆبونەوەیـەدا رێگـە و شـوێنی پەیوەنـدی
و گۆڕینـەوەی بیـروڕا و هاتووچـۆی نامـەی هەردوولامانـی رێکخسـت و
سـەفەری کـردا!

پـاش سەفەرەکەشـی بـۆ دەرەوەی وڵات، لـە بێـروت و جـار جاریـش
لـە شـام دەمایـەوە. لـەو ماوەیـەدا زۆر تێکـەڵ بـە رێکخـراوی (جەبهـەی
شـەعبی) بـوو. ئـەو رێکخـراوە (بـەرەی میللی بـۆ رزگاری فەلەسـتین)، لـە
دوای جەنگی حوزەیران و لـە کانونـی یەکەمـی ١٩٦٧ دا، لەسـەر دەسـتی
ئەمینـداری گشـتی (جـۆرج حبـش)، دامـەزرا و رێبـازی سۆسیالیسـتی و
مارکسـی گرتبـووە بـەر! ئیتـر وردە وردە (مـام جـەلال) پەیوەندییەکانـی
لەگەڵ (جورج حبش و ودیـع حـداد) و باقـی سـەرکردەکانی بزووتنـەوەی

رزگاری فەلەستیندا پەرەی سەند و لە چالاکییەکانیاندا هاوکاریان بوو. ئەو رێکخراوە چونکە بە فراندنی فرۆکە و (لیلی خالید)ەوە ناوی دەرکرد بوو، لەناو لاواندا بەتایبەتی لەناو کچاندا خۆشەویستییەکی پەیدا کردبوو!

جارێکیان (مام جەلال) داوای کرد، کە کاک (شەهاب) رەوانە بکەین بۆ لای، کاک (شەهاب)یش پێی باش بوو سەردانی بکات و ماوەیەک لە نزیکەوە هەندێک مەسەلەی فیکری لەگەڵ تاووتوێ بکات و لەگەڵی بمێنێتەوە و لە پاشدا بتوانێت بە نهێنی بگەڕێتەوە و ئیتر خۆی بەتەواوی بۆ کاری (کۆمەڵە)، تەرخان بکات و هیچ کارێکی تر نەکات! کە کاک (شەهاب) سەفەری کرد، لە (ناوەندی کۆمەڵە) بە تەنها (دلێر سدیق) مایەوە هاوکارم بێت، کە هاتنەوەی کاک (شەهاب)یش دواکەوت، بیرمان لە فراوانکردنی (ناوەندی کۆمەڵە) کردەوە! بەڵام بۆ نەگبەتی هێشتا هیچمان نەکردبوو، (دلێر سدیق) بڕیاری کشانەوەی دا، گەرچی گفتی دا کە لەلاوە هێندەی پێی بکرێت هەر یارمەتیم بدات، ئیتر بە تەنها مامەوە و بەوەش دۆخێکی سەخت و کارێکی زۆر و گران رووی تێکردم. بە رەزامەندی (مام جەلال و کاک شەهاب)، هاوڕێیان (جەعفەر عەبدول واحید و ئاوات عەبدول غەفور و حەمەی میرزا سەعید) مان سەرخست بۆ کۆمیتەی (ناوەندی کۆمەڵە) و ئیتر منیش بە یارمەتیی ئەو هاوڕێیانە ئاهێکم پیا هاتەوە! پێکەوە (جەعفەر عەبدول واحید، ئاوات عەبدوڵ غەفور و حەمەی میرزا سەعید) و من کە سەرپەرشتیکەر بووم، ناوەندی تازەی (کومەڵە) بووین و چالاکانە پێکەوە کارمان دەکرد!

(جەعفەر عەبدول واحید) تێکۆشەرێکی گەورە و بەکار بوو، لە خێزانێکی تێکۆشەر بوو، برا گەورەکەشی (خالید دلێر)، پیاوێکی پێشمەرگە و

تێکۆشـەر و شـاعیر بوو، خـاڵ و هاوڕێی (نەرمین عوسـمان)ی تێکۆشـەر بـووا (نەرمیـن) هاوڕێیەکـی نزیکـم بـوو، لەگـەڵ (دارۆی شـێخ نـوری)، دڵیـان بـە یەکـەوە بـوو، زۆرجـار لـە بەغـداوە دەهـات بـۆ کەرکـووک و پێکـەوە دەڕۆیشـتین بـۆ هەولێـر بـۆ سـەردانی (جەعفـەر عەبدول واحید) و بـۆ کۆبوونـەوەکان، ئیتـر بەوجـۆرە تیکەڵییەکـی زۆرمـان لەگـەڵ کـەس و کاری یەکتـردا هەبوو. (جەعفـەر و نەرمیـن) و مـن بـۆ دایکـی (نەرمیـن) زۆر خوشەویسـت بوویـن و نـاوی هـەر یەکێکمـان، هـەر سـێکمانی بیـر دەخسـتەوە، ئێسـتاش یەکێکـە لـە هاوڕێکانـم!

(جەعفـەر) هاوڕێیەکـی گیانـی بـە گیانیـم بـوو لـە بەغـدا، لـە چـوار سـاڵی خوێندنی زانکۆ، هەردووکمـان لـە زانکـۆی ( المسـتنصریه ) پێکـەوە بوویـن، ئـەو لـە کۆلێجـی زمانـی ئینگلیـزی بـوو لەگـەڵ (غانـدی)، جوانـە مەرگـدا، کـە بـرای کاک (فازیـل کەریـم - مامۆسـتا جەعفـەر- ) بـووا (جەعفـەر عەبدول واحیـد) لاوێکـی جوانخاسـی بـەکار و زیـرەک، پیاوێکـی حـازر جوابـی دەم بـە نوکتـەی شـیرین خەنـدە بـووا لەبـەر خوێندنـی زانکـۆ و هـاوکات سـاڵانی زووتـر، کـە پێشـمەرگایەتی کـرد بـوو، خەڵکێکـی زۆری دەناسـی و پەیوەندییەکـی خـۆش و فراوانـی کۆمەڵایەتـی هەبـووا ئـەم کەڵـە پیـاوە توانایەکـی باشـی لـە نووسـین و شـیعری بـە زمانـی عەرەبـی هەبـوو، لـە سـاڵانی زانکـۆدا دڵـی چوبـوو بـە کچێکـی ئێجـگار جوانـی عەرەبـدا نـاوی (عالیـە) بـوو، کچەکـەش (جەعفـەر)ی خۆشدەویسـت. (جەعفـەر) لـە مـاوەی خۆشەویسـتییەکەیدا چەندیـن پارچـە شـیعری نایابـی بـۆ دانـا و بـۆی دەنـارد، بەداخـەوە شـیعرەکانم لەبـەر نەکـردوە و بیـرم نەمـاون، بـەڵام ئێسـتاش پیشـەکیی وەڵامـە شـیعرێکیم هـەر بیـر مـاوە کـە دەڵێـت..

( الـى التـى تحـاول ان تقدم عصـاره فكرهـا موزونـة، مقفـى البنـا، و هـى لا تـدرى بـأن المـرأة هـى أجمـل و احلـى قصيده يتغنـى بهـا الرجـال منذ الخليقة

و الی أبد الابدین)
لەو ماوانەدا کە من ماڵم لە کەرکووک بوو لەگەڵ (جەعفەر) پێکەوە لە (ناوەندی کۆمەڵە)، کارمان دەکرد. بیرمە رۆژێکی عەسر خەریکی خوێندنەوە بووم دەرگای ماڵی کردەوە و هاتە ژوورەوە - ئاخر لەو جۆرە سەردانەی زۆر بوو - وتی پێش ئەوەی دابنیشم با پێت بڵێم، خەریکم ژن دەهێنم و زۆریم تەواو کردووە، منیش بە باوەڕی خۆم وامزانی، کە (عالیە) ی خۆشەویستی دەهێنێت، وتم یاخوا پیرۆز بێت و بە خۆشی، بە راستی کارێکی باشت کرد (عالیە) زۆر کچی چاکە. دەنگی هەڵبری و وتی : دەسا (عالیە) نییە کچێکی زۆر باشی هەولێریە، ناوی (قانیعە)یە، دەستڕەنگینە و خەیاتێکی زۆر باشە، گەر من لێم قەوما یا لە سێدارە درام، ئەو دەتوانێت خۆی و ماڵ و منداڵ بەخێو بکات! - ئایندەش دەری خست (قانیعە) خان لەو ستایشانەی (جەعفەر)ی زیاتری هێنا - بە راستی (قانیعە)، ژنێکی چاک و رەوشت بەرز و قورس و گران بوو! بەڵام وەڵامەکەی (جەعفەر) تاساندمی، چاوەڕوانی ئەنجامی وا نەبووم، درێژەی بە قسەکانیدا و بەدەم حەسرەت و روویەکی شپرزەوە، کە هەر خۆم دەزانم چۆن زەردەخەنە هەمیشەییەکانی تورابوون، بۆ لای بیرەوەرییە شیرینەکانی پەلکێشی کردم و وتی : چۆن کچێکی وا خۆشەویست و جوان دەخەمە ئەم ژیان و ئاییندە نادیارەوە، دەزانم رۆژێک هەر لە سێدارە دەدرێم و ئەوسا دەبێت هەموو مەینەتییەکانی ژیانی بۆ بەجێ بهێڵم، نا من شتی وا ناکەم، ئەمەیان کچێکی کوردە وەک من ئەرکی خۆیەتی لەو رێبازەدا هەرچی بەسەر بێت، بۆیە خۆم دەزانم چی دەکەم و کێیش دەهێنم! هەندێکی تر لەو باسە دواین و دواتر هاتینە سەر باسی کاروباری خۆمان!
جارێک لە بەغدا (ئاوات عەبدول غەفور)م بینی هاتبوو بۆ لای کاک

(شـەهاب)، ناسـیم کوڕێکـی زیـرەک و بـاوەڕ بەخۆیـە و بـە گەنجێکـی وریـاو پـڕ مەعلومـات هاتـە بەرچـاوم! ئەویـش لـە خێزانێکـی تێکۆشـەر بوو، لە مەلازادەکانی دێلێژەی سلێمانی بوون و خزمی نزیکی پرۆفیسۆر (عیززەدیـن مسـتەفا رەسـوڵ)ە، کـە هاورێـی (مـام جـەلال) و تیکۆشـەر و کۆمۆنیستێکی دێرینە و سـالانیک لەگـەڵ (مـام جـەلال) و (زەبیحـی) ١٩٥٦ - ١٩٥٧ لـە سـوریا لـە تاراوگـە ژیـاون و لەوێـش بووبوونـە دۆسـتی خانمـی کـورد پـەرەر (رەوشـەن بەدرخـان) و ئێسـتاش مامۆسـتای زانکۆ و نووسـەرێکی گەورەیـە و خاوەنـی خزمەتیکـی دیـارە لەبـواری ئەدەبـی کوردیـدا و ژمارەیەکـی زۆر کتێبـی نووسـیوە، هەروەهـا بـرای (فاروقـی مـەلا مسـتەفا)یە، کـە ئەویـش یەکێـک بـووە لـە کەسایەتییە چـالاک و تێکۆشـەرەکانی (قیادەی مەرکـەزی) لـە سلێمانی و هاورێمـان بـوو! سـەر بە کوتلەی نەجم، واتە (ئیبراهیم عـەلاوی) بوو، لەگەڵ کوتلەی (موسلیح جەلالـی)، لـە ناکۆکیـدا بـوون و ئێسـتا یەکێکـە لـە سـەرمایەدارە زیـرەک و نیشـتمانپەروەرەکانی سـلێمانی. چونکـە زۆربـەی زۆری سـەرمایەکەی لـە سـلێمانیدا کردۆتـە پـرۆژە، بۆیـە هەمیشـە خەڵکـی بـە چاکـە باسـی دەکـەن! هەروەهـا (ئـاوات) لەگـەڵ (فازیلـی مـەلا مەحمود)یشـدا، خاڵـۆزاو پورزا بوون و برای (هیوا غەفور) ی تێکوشـەرە، کە لە بۆردومانەکەی سـاڵی ١٩٧٤، لـە قـەلادزە شـەهید بـوو! هەرچـی (حەمـەی میـرزا سـەعید) ە، مـن نەمدەناسـی و هیـچ جـۆرە ناسـیاوییەکیم لـە گەڵـی نەبـوو، بۆیـە هیـچ جـۆرە زانیارییەکـم لەسـەری نەبـوو! تەنهـا کاک (شـەهاب) بـۆی بـاس کردبـووم، کـە تێکۆشـەرێکی کۆنـی سـەندیکای کرێکارانـە و کۆنـە کۆمۆنیسـتە، ئیتـر ئەویشـمان لەسـەر پێشـنیاری کاک (شـەهاب) هێنایـە پێشـەوە بـۆ (ناوەنـدی کۆمەڵـە)!

بە راستی (جەعفەر و ئاوات) بە باشی و چالاکانە، (ئاوات) لە سلێمانی

و (جەعفەر) لە هەولێر و کۆیە، کاریان دەکرد و لەماوەیەکی کەمدا بوونە هۆی گەشەپێدانی ڕێکخستنەکان! (حەمەی میرزا سەعید)، لەوان بە تەمەنتر بوو، خەریکی بادینان بوو بۆ ماوەیەکیش خەتی خانەقین و مەندەلی و ماوەیەکیش سەرپەرشتیی هەرێمی بەغدای دەکرد. خوا هەڵناگریّ لەو ماوەیەدا، کە ئێمە کارمان لەگەڵدا دەکرد، هەم پیاوێکی باش بوو هەم ڕۆڵی هەبوو لە گەرمکردنی برایەتی لەناو هاوڕێیاندا! ئەوکاتە کۆبوونەوەکانی (ناوەندی کۆمەڵە)، زۆربەی لە کەرکووک و لە ماڵی خۆمان دەکران، ناو بە ناویش لە سلێمانی، یا لە هەولێر لە ماڵی (شەهید جەعفەر) یا لە ماڵی (کاکە حەمە) کۆبوونەوە کانمان دەکرد! دوای هەموو کۆبوونەوەکانیش کاغەز و شتە زیادەکانمان دەسووتاند و لەپاڵ خۆپاراستنمان لە دەزگا سیخوڕییەکان، بایەخێکی زۆریشمان بە مەسەلەی پەروەردە کردن و ئەڵقەی ڕۆشنبیریی هاوڕێیان دەدا!

لەو ماوەیەدا کە پێکەوە بووین، چەند نامەیەکی (مام جەلال)مان بۆ هات، بیرمە لە یەکێ لە نامەکاندا باسی پێویستیی کارێکی نیشتمانی فراوانی لە دەوری (کۆمەڵە)، کرد بوو، بە جوانی هۆی پێویستییەکانی ڕێکخراوێکی لەو بابەتەی بۆ باس کرد بووین، دیارە ئەو مەسەلەیەی لا مەبەست بوو، بۆیە لە نامەیەکی تریشدا جارێکی دی باسی ئەو مەسەلەیەی کردبوویەوە! باقی نامەکانی دەنگ و باسی ڕێکخراو و حیزب و جووڵانەوە شۆڕشگێرەکانی ناوچەکە و فەلەستینییەکان بوو! جگە لەوانەش دوو سێ بابەتی لەمەڕ هەڵسەنگاندنی ڕژێمی عێراق و ئاسۆی ڕووداوەکان باس کرد بوو، یەکێکی تریشیان لەسەر گرنگی نەوت و مەسەلەی خۆماڵیکردنی نەوت و ڕەنگدانەوە و شوێنەوارەکانی بوو لە سیاسەتی حکومەتی عێراقدا و نووسراوێکی تریشی بۆ ناردین، کە بە هەڵسەنگاندنی ڕێککەوتنی ٢٥ساڵەی ستراتیژی نێوان عێراق و

یەکیتیی سوڤیەت دەستی پێکرد بوو، کاریگەری ئایندەی ئەو پەیمانەی باس کرد بوو! ئیتر لەو ماوەیەدا پەیوەندیمان باش و توند و تۆڵ بوو لەگەڵ (مام جەلال و کاک شەهاب )دا و بەوردی ئاگاداری یەکتر بووین و ناو بە ناویش ئێمە لە هەلومەرجی ناوخۆ و رەوتی پەرەسەندنی رووداوەکان و گەشەکردنی رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)، ئاگادارمان دەکردنەوە!

## گەڕانەوەی کاک (شەهاب)!

هەر ساڵی ١٩٧٣، پاش زیاتر لە شەش مانگ، کاک (شەهاب) بە شێوەیەکی نیمچە نهێنی و بێ ئاگادار کردنەوەی ژن و ماڵ و کەس و کار و هاوڕێکانی، لە ڕێگەی سنوورەوە بە موسڵدا گەڕابوەوە هەولێر. تەنها من و (جەعفەر عەبدول واحید)، دەمانزانی کە لەو ڕۆژانەدا دەگەڕێتەوە و ئیتر کە هاتەوە خۆی دەرناخات و بە نهێنی لە کوردستان دەمێنێتەوە و خۆی بۆ کارەکانی (کۆمەڵە)، تەرخان دەکات!
پاش نیوەڕۆیەکی درەنگی پێنج شەممەیەکی گەرمی هاوین بوو، لەپڕ (جەعفەر) خۆی کرد بە ماڵدا، شادی و زەوقێکی خۆشی لەگەڵ خۆی هێنایە ماڵەکەوە. ئاخر ئەو هەمیشە یەک دوو نوکتەی خۆشی پێ بوو زوو زوو دەیگێڕایەوە، دیار بوو فریای نانخواردن نەکەوتبوو، بۆیە داوای خواردنی کرد. تا سفرەی خواردن ئامادە کرا هاتە لامەوە و بە دەنگێکی نزم وتی: کاک (شەهاب) هاتۆتەوە و داوای کردووە سبەی بە ئامادەبوونی هەموو هاوڕێیانی (ناوەندی کۆمەڵە)، کۆبونەوەیەک

بکەین لە هەولێر و لە ماڵی خۆمان! منیش پاش پشوودانی ئەو، جوابم نارد بۆ (ئاوات عەبدول غەفور)، تاوەکو لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بێت. نایشارمەوە زۆر پەرۆشی دیدار و بینینی کاک (شەهاب) و لایەنە نادیارەکانی دەنگوباسەکان بووم، بۆیە تا رۆژی دوایی دەتووت بەسەر ئاگرەوەم. رۆژی هەینی (ئاوات) زوو گەیشتە لام، پاش نانخواردنی بەیانی بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆم هەردووکمان بەرە و هەولێر کەوتینەڕێ، نزیکی نیوەرۆ لە ماڵی (جەعفەر) بە دیداری کاک (شەهاب) و دەنگ و باسی (مام جەلال) و جووڵانەوەی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ناوچەکە گەیشتین! (ناوەندی کۆمەڵە)، هەموو هاوڕێیان (کاک شەهاب، حەمەی میرزا سەعید، جەعفەر و ئاوات و من ) ئامادە بووین. جێگەی داخ بوو (دلێر سدیق)، لە گەڵمان نەمابوو، بۆیە کاک (شەهاب) هەر زوو پرسیاری کرد:

- ئەوە چۆن بوو (دلێر) کشایەوە!

- لە راستیدا (دلێر) هیچی نەوت لەوە زیاتر کە وتی: بارە گرانەکانی ئەم ئیشە بە من هەڵناسووڕێت! هەرچەندە من زۆری لەگەڵ خەریک بووم، کە هەلومەرجەکە ناسکە و بۆچی زووتر تا کاک (شەهاب) لێرە بوو قسەت نەکرد، بەڵام قسە و هەوڵەکانی من هیچ سوودیان نەبوو! تائێستاش (دلێر) بێ دەنگە، هەرچەندە من بۆ خۆم هاوڕێیەتی و خۆشەویستیم تا ئەمڕۆش لەگەڵدا پاراستوە و ئەویش هەمیشە خۆی بە لایەنگیرێکی هوشیاری خەبات دەزانێت! بەڵام ئەو جۆرە کارانە ناوازە نین و لە هەوراز و نشێوەکانی خەباتدا مرۆڤ دەبێت چاوەڕوانی کار و پێشهاتی وا بکات و ئاساییە، کە هەموو کەس نەتوانێ تاسەر بڕ بکات. ئەوی گرنگە زۆر باش نهێنی ریکخستنەکانی (کۆمەڵە) ی وەک چاوی پاراست!

(حەمـەی میـرزا سـەعید) وتـی: بەڕاسـتی کوڕێکـی زیـرەک و بـاش بـوو، نـە دەبـوو لـەم کاتـەدا واز بهێنێت! لـە پاشـدا ڕووی کـردە کاک (شـەهاب) و وتـی.. ئـەرێ قسـە قسـە دەهێنێ، ئـەوە (حەمـە جـەزا)ی ئەندازیـار چۆنـە!
- زۆر باشـە و کوڕێکـی چاکـە، ماوەیەکـی زۆر لـە ماڵـی ئـەو بوویـن و خزمەتێکـی زۆری کردیـن، ئێسـتاش (مـام جـەلال) لـە بێـروت لـە ماڵەکـەی ئـەوە، هەرچەنـدە لـەم ڕۆژانـەدا بـۆ سـەفەر چـووە بـۆ قەتـەر!
نیـوەڕۆ ( قانیعـە) خانـی ژنـی (جەعفـەر) خواردنێکـی شـێوە یاپـراخ یـا گیپـەی بـۆ کـرد بوویـن، دیـار بـوو لـەوێ بـاوی بـوو، نـاوی ( میمبـەر) بـوو، شـتێکی تـازە بـوو، ئـاوات زۆری لێخـوارد! (قانیعـە)، ژنێکـی نایـاب و دڵسـۆز و بـێ قسـە بـوو، ناوەکـەی خەسـار نەکـرد بـوو، بـە ڕاسـتی قانیـع و خۆراگـر بـوو! لـە درێژەی کۆبونەوەکـەدا کاک (شـەهاب) جگـە لـە باسـی جمووجوڵـی ڕێکخـراو و تیکۆشـەرە چەپەکانی عـەرەب و فەلەسـتین و دەنگوباسـی (بـەرەی میللـی ڕزگاری فەلەسـتین) و بەرنامـەی دەسـت هەڵگرتنیـان لـە فڕۆکـە فڕانـدن، باسـی بەرنامـەی کارکردنـی خـۆی کـرد، کـە ڕەنگـە لەمـەودوا زۆرتـر بـە نهێنـی و لـە کەرکـووک جێگیربێـت، چونکـە کەرکـووک لـە ناوەڕاسـتی سـلێمانی و هەولێـر دایـە! بـۆ ئەمـەش منـی ڕاسـپارد جێگـەی بـۆ ئامـادە بکـەم. لـە وەڵامـدا پێـم وت : تەگبیـری ناوێـت، ماڵـی خۆمـان و ماڵـی کاک (ئیبراهیـم جـەلال) و هاوڕێیانـی تریـش هـەن، پـەک ناکەوێـت!
لەپڕ (ئـاوات) هەڵیدایـە و وتـی : کاک (شـەهاب) ئیتـر نابێـت کاک (ئیسـماعیلی کەشـکۆڵ) ببینێـت! مەبەسـتی (ئیرەجـی کەشـکۆڵی)، سـازمانی ئینقلابـی بـوو، کـە کاک (شـەهاب) لـە سـاڵانی ڕابـوردودا نێوانـی لـە گەڵیـدا گـەرم بـوو. دیاربـوو ( ئـاوات)، لـە قسـەکەی دوو مەبەسـتی هەبـوو، یەکەمیـان مەبەسـتی لایەنـی ئەمنـی بـوو، تـا زۆر کـەس هەسـت بـە بوونـی نەکـەن

و نەزانن، کە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان! دووەمیش دەیویست بڵێت..
( ئیرەجی کەشکۆلی - ئیسماعیل -) کە تێکۆشەرێکی کۆمۆنیست و سەرکردەیەکی (سازمانی ئینقلابی حیزبی تودەی ئێران) بوو، کوردستانی بەجیا لە ئێران یا لە عێراق نەدەبینی و لە ئاڵا هەڵگرەکانی یەکێتی ڕێکخراوەیی چینی کرێکار بوو! باش یا خراپ هەموو هەڵەکانی چین و (ماوتسی تۆنگ)ی پینە دەکرد و لە بانگدەرەکانی (تێزی سێ جیهان )بوو! چینییەکان لەو ساڵانەدا لەگەڵ زۆرێ لە وڵاتانی وەک عێراق و تەنانەت لەگەڵ ئێرانیش پەیوەندیان هەبوو، بەو هۆیەشەوە تیۆری (تێزی سێ جیهان)ی چینییەکان، پاساوی بۆ هەنگاوەکانی (چین) دەهێنایەوە و وڵاتانی وەک عێراق و سوریای بە بەشێک لە خەباتی جیهانی سێ و خەباتی گەلان دژی ئیمپریالیزم دەزانی و ئەمەش مانای وایە ئەو وڵاتانە و ڕژێمەکانیان پێشکەوتوخوازن و لە دژی ئیمپریالیزم لە خەباتدان و دەبێت تیکۆشەرە مارکسیەکان، سیاسەتی (یەکگرتن و ململانێ - الوحده والصراع ) یان لەگەڵدا پیادە بکەن و ناکۆکیی لەگەڵ ئەو ڕژێمانەدا نەگەیەننە ئاستی ناکۆکیی سەرەکی! بەلای ئێمەشەوە ئەمە هەڵەیەکی زۆر زەقی سیاسی و فیکری بوو! بۆیە ئەگەر بڕوامان بەو بۆچوونە هەبوایە و لە بواری پراکتیکدا پەیڕەومان بکردایە، ئەوا دەبوو چاو لە قەلاچۆکردنی نەتەوەکەمان بنوقێنین و ناکۆکییمان لەگەڵ ڕژێمی عێراق نەگاتە ئاستی ناکۆکیی سەرەکی و خەبات بۆ ڕووخاندنی یا لادانی نەکەین، دیارە ئەمەش لەگەڵ خەبات و بیروبۆچوونی ئێمەدا بە هیچ جۆرێ نەدەهاتەوە!

لەو کۆبونەوەیەدا باسی ڕژێمی عێراق و (پارتی دیموکراتی کوردستان) و پەیوەندیی هەردووکیان و وەزعی خەڵک و ئایندەی ڕووداوەکانی نێوانیان کرا! باسی وردەکارییەکانی ڕێکخستن و گەشەکردن و باری

ژیان و گوزەران و ئابووری کرا و وەزعی خراپ و شپرزەی (حیزبی شیوعی)ش بەدەر نەبوو لە باسەکان! هێڵە گشتییەکانی نەخشەی کارکردن بۆ ئایندە و چۆنیەتیی پەیوەندی کردن لەگەڵ (مام جەلال) باسکرا. ئیتر عەسرێکی درەنگ کاک (شەهاب) و من گەڕاینەوە بۆ کەرکووک و لەبەر ئەوەی، کە (ئاوات) کاری هەبوو مایەوە و نەگەڕایەوە! لە کەرکووک تەنها ترسمان لە منداڵەکانی من هەبوو، کە ناوی کاک (شەهاب) بهێنن، دایکیان لە کۆنەوە ناسیاوی و هاوڕێیەتی لەگەڵی هەبوو، بۆیە ئیتر لەبەر منالەکان وتمان ئەوە ( خاڵە عوسمان) ە، من خاڵێکم هەبوو ناوی (عوسمان) بوو، نە دەهاتە سەردانمان بۆ کەرکووک، زۆر تاقەتی سەفەر و سەردانی نەبوو، ئیتر لای هەموو هاوڕێ و منداڵەکانمان کاک (شەهاب) بوو بە (خاڵە عوسمان) و بەهۆی هەندێ هاوڕێی خۆشمانەوە، ناسنامەیەکی - ناسنامەی باری شارستانی - مان، بەو ناوەوە بۆ دروست کرد. (پاکیزە)ی خێزانیشم پڕ بە دڵ خزمەتی دەکرد و بە دڵ و بە گیان نهێنییەکانی دەپاراست و سەلامەتی کاک (شەهاب)ی زۆر بەلاوە مەبەست بوو!

کاک (شەهاب) زۆر جار لە کۆبونەوەکانی کۆمیتەی هەرێمی کەرکووکدا بەشداری دەکرد، بوو بە دۆستی نزیکی هاوڕێیان ( ئیحسان نەجم - ئەبو شەهاب- عەلی بچکۆل، ئیبراهیم جەلال ) هەروەها ( ئازاد هەورامی و حەمیدە سوور و ئەحمەد کرێکار، قادری مەلا عومەر، فەیسەڵ تاڵەبانی - سیروان -) لەناو هەموو ئەو هاوڕێیانەشدا تەنها هەر (ئیبراهیم جەلال)ی لە کۆنەوە دەناسی.

(فەیسەڵ تاڵەبانی - سیروان - )ماڵیان لە گەڕەکی ئازادی کەرکووک بوو دراوسێمان بوو، کوڕێکی ئازا و رەوشت بەرز و چالاک بوو. ئەو هاوڕێیەم زۆر خۆش دەویست، بۆیە هەر کاتێ بچووکترین کاتم

هەبوایە، دەچووینە لای یەکتر و بەرنامەی کتێبێکم لەگەڵ تاووتوێ دەکرد، هەرچیم بزانیایە لەسەر هەر بابەتێک بوایە، هەوڵم دەدا بە باشی بۆی باس بکەم و تێی بگەیەنم، خوا هەڵناگرێ خۆشی خولیای فێربوون بوو، هەمیشە هەوڵی دەدا شتی نوێ فێر ببێت! ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پێشمەرگە، جاری دوەمیش لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێدا بووەوە بە پێشمەرگە و ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد، بەداخەوە لە بۆسەیەکی دوژمناندا شەهید بوو!

لەبەر لایەنی ئەمنی و پاراستنی کاک (شەهاب)، لە زاری خەڵکی و لە چاوی دەزگا ئەمنییەکان، ماوە ماوە دەمان نارده ماڵی (ئیبراهیم جەلال، ئیحسان نەجم یا بۆ ماڵی حەمیدە سوور)، کە نێوانیان زۆر خۆش بوو. هەر لە ماڵی ئەوانیش بە هیمەت و دەست و بازوی هاوڕێ (حەمید)، ژێرزەمین و ژورێکی خاوێن و رێکوپێکمان بۆ کاتی تەنگانەی کاک (شەهاب)، دروست کرد، کە زۆربەی کات بۆ کاروباری چاپەمەنی سوودی لێ وەردەگیرا! لەوماوەیەشدا، کە لە ساڵی ١٩٧٤ شەڕ هەڵگیرسایەوە و من چوومە ریزی شۆڕشەوە، کاک (شەهاب) چووە ماڵی کاک (ئیبراهیم جەلال)!

بیرمە جارێکیان دەورەیەکی کادیرانمان لە کەرکووک کردەوە، زۆربەی کات کاک (شەهاب) دەرسی پێ دەوتن، (ئازاد هەورامی) و (عەلی، کە لەمدوایەدا بە (شوانەی تەنسیق) ناسراو بوو، هەر دووکیان شەهید بوون، دوو کادیری ئەو دەورەیە بوون! (ئەحمەد کرێکار) یش یەکێکی تریان بوو. لەو دەورەیەدا مێژووی کورد و کوردستان و ئابووری و جەنگی گەل (جەنگی رزگاریی نیشتمانی و ناکۆکییەکان)، بابەتەکانی بوون.

لە کەرکووکەوە کاک (شەهاب)، سەردانی رێکخستنەکانی بەغدا،

سلێمانی و هەولێری دەکردا ماوەیەکیشی لە سلێمانی بردە سەر. کە گەڕایەوە بڕیاریدا لە هەولێر بە نهێنی منداڵەکانی لە ماڵی (شەهید جەعفەر) ببینێ. (نازەنین)خانی خێزانی و منداڵەکانی خۆی (سۆران و سۆزان)، یەک دوو رۆژ لای مانەوە. جارێکی تریش بیرم دێت (ئاسۆی شێخ نوری)، هێنانی بۆ ماڵی ئێمە لە کەرکووک، جاروباری تریش هەروا بە نهێنی دەیبینین! شتێکی تایبەتی بوو کاک (شەهاب) نە فرمانی گرتنی هەبوو، نە ناچار بوو خۆی لە ماڵ و منداڵ بکات و واز لە کار و فرمان و بژێوی ژیانی بهێنێ و بەو جۆرە و بەو حەسرەتە زۆر ناخۆشەوە ژن و منداڵەکانی بتوانن باوکی خۆیان ببینن! بۆیە لای (سیروان تاڵەبانی) بووبوو بە پرسیار و رۆژێک لەو بارەیەوە پرسیاری لە کاک (شەهاب) کرد، لە وەڵامدا کاک (شەهاب) وتی:
تێکۆشەری ئەم رێبازە دەبێت یەکەمین شەڕ لەگەڵ خۆی بیکات و خەبات بکات لەگەڵ دەروون و دژی خواست و حەزە شەخسییەکانی خۆی، دەبێت راهێنانی بەردەوامی پێبکەیت تا بتوانێت خۆنەویست و خەڵک ویست و گیانباز بێت، بۆ خەڵکی و مەسەلەکانی سەربەستی و ئازادییەکانیان و ژیانیان تێبکۆشێ! جگە لەوانەش خۆ تەرخانکردن بۆ مەسەلەیەک، بۆ رێکخراوێک مانای خۆی هەیە، بۆیە پێویستە ببێتە دەروێشی ئەو رێکخراوە. دەبێت من بتوانم فریای هەموو کارەکان و هەموو ئەو ئەرکانەی خراونەتە ئەستۆم بکەوم، لەوەش زیاتر دەمەوێ گەر بتوانم رۆڵێ لە پەروەردە کردنی هاوڕێکانمدا بگێڕم، قسەکانی کاک (شەهاب) لەم چەند رستەیە پاراوتر و فراوانتر و بە مانا تر بوون، بەڵام من تەنها شتە گشتییەکانیم لەبیر ماوە ! (شەهید جەعفەر) لەسەر ئەو بیرو کردارەی کاک (شەهاب)، هەمیشە دەیگوت: کاک (شەهاب) پیاوێکی ئێجگار گەورەیە، بۆ من مامۆستا و نموونەی

تێکۆشـەرێکی هەڵکەوتـووە! لـە کەسـایەتییە خاکـی و کۆمەڵایەتییەکەیـدا خـووی هاوڕێکانـی (سـازمانی ئینقلابـی) گرتـووە!
جارێکیـان کاک (شـەهاب)، حـەزی کـرد سـەردانی ناوچـەی حەسـار بکات بۆ لای (کوێخـا جـەلال). ئاخـر بـۆ کاک (شـەهاب) زۆر خۆشـبوو (کوێخـا)، کۆنە کۆمۆنیسـتە و کاتـی خـۆی لـە جووڵانـەوەی جووتیاراندا دەوری هەبـووە و ئاشـنای (مەحمـود عـەدۆ)ی لای هەولێـرە و هەردووکیـان پێکـەوە هەمـان ڕۆلیـان لـەو ناوچانـە دیـوە، تـۆزێ بدوێنـێ! بۆیـە دۆسـتایەتییەکی خـۆش لـە نێوانیانـدا پەیـدا بـوو. چونکـە کاک (شـەهاب)، زۆری پـێ خۆشـبوو، کـە لـە کەرکـووک کەسـی وەک ( ناسـیحە سـوور)ی ناوشـوان و لـەو جـۆرە هاوڕێیانەمـان کۆکردۆتـەوە! ئـەوی ڕاسـتی بێـت ئـەم هاوڕێیـە (ئەبـو شـەهاب) ڕێکـی خسـتبوو بـۆ (کۆمەڵـە). بـەو جـۆرە کاک (شـەهاب)، وەک تەنهـا سـەرکردەیەک، کـە هەمـوو کاتەکانـی بـۆ (کۆمەڵـە) تەرخـان کـرد بـوو، چالاکانـە بـۆ هەمـوو ڕێکخسـتنەکان کاری دەکـرد و شـوێنی سەرەکیشـی هـەر لـە کەرکـووک بـوو، تـا سـاڵی ١٩٧٤ شـەڕ هەڵگیرسـایەوە و ڕێگـەی شـاخ و پێشـمەرگایەتیی گرتـە بـەر!
(گەلاوێـژ جەبـاری)، ئەندامێکـی چـالاک و خانمێکـی ژیـر و بـەکار بـوو، ژمارەیـەک هاوتەمەنـی خـۆی کـۆ کردبـووەوە و ڕێکـی خسـتبوون. ماوەیەکـی زۆر خـۆم ڕاسـتەوخۆ سەرپەرشـتیم دەکـردن و لەبـەر ئـەوەش کـە ئافـرەت بـوون، هەمـوو کۆبوونـەوەکان یـا لـە ماڵـی ئـەوان یـا لـە ماڵـی خۆمـان بەڕێـوە دەچـوون! بەمـەش لەگـەڵ دایـک و باوکـی و کـەس و کاری تێکـەڵ بووبـووم و وەک خزممـان لـێ هاتبـوو! هاوڕێیەکـی تریشـمان هەبـوو بـە نـاوی (شـێرزاد جەبـاری)، کـە بەداخـەوە لـەم دواییـەدا شـەهید بـوو، ئەویـش هـەر لاوێکـی هەڵکەوتـوو بـوو. لـەو هاتوچۆیـەی مـن بـۆ ماڵـی (گەلاوێژ) و هـی ئـەو بـۆ ماڵـی ئێمـە، ڕێکـەوت یـەک دووجـار

(شێرزاد) م دەبینی قسەی لەگەڵ دەکرد و بە تەنها لەگەڵی دەوەستا، لە هەلومەرجی ئەو کاتەی کەرکووک و گەرەکی شۆڕیجە و ئازادیدا، بە کارێکی ئاسایی نەهاتە بەرچاوم! رۆژێک (شێرزاد)م بانگ کرد و پێم وت.. کە شتێکی لەو جۆرەم تێبینی کردووە و پێم ناخۆشە، دەستی کرد بە قاقای پێکەنین و وتی: بۆ تۆ نازانیت (گەلاوێژ) ئامۆزامە و لەوەش زیاتر، دەزانی زۆر نابات دەبینە هاوسەری یەکتری! ئەو هەواڵەم زۆر لا خۆش بوو بە تەواوی ترسم رەویەوە! ئیتر لە ساڵانی دواتردا بوونە نموونەی دوو تێکۆشەر لە هاوسەرە بە ئەمەکەکانی (کۆمەڵە) و (شێرزاد) گیانی خۆی بە (کۆمەڵە) و رزگاری و ئازادی گەلەکەمان بەخشی!

وردە وردە و تادەهات زیاتر لە تەواوبوونی چوار ساڵی ماوەی جێبەجێکردنی رێکەوتنی ئادار و یاسای ئۆتۆنۆمی نزیک دەبووینەوە و (بەعس) هیچی دیار نەبوو، بەمەش رووی راستەقینەی رژێم دەرکەوت و حەقیقەتی بڕوای (بەعس) بە مافی چارەی خۆنووسینی کورد بەتەواوی کەوتە روو، کە سروشتی چینایەتیی ئەم حزبە و ئایدیا شۆفێنییەکەی هی ئەوە نیە مافی گەلانی بندەست بسەلمێنێت! ئیتر بە بیانووی جۆراوجۆر، رۆژ بە رۆژ گرفت لەسەر تەفسیری بڕگە گرنگەکانی ئەو یاسایە پەیدا دەبوو بەعسییەکان و شۆفێنییە عەرەبەکان، بۆ لە قاڵبدانی کورد و دەسکەوت و مافی ئۆتۆنومی، کە بە زۆریان دەزانی بۆ کورد و چاویان بەرایی نەدەدا دانی پیابنێن، کەوتنە پیلانگێران! پاش کفتوگۆ و هاتوچۆیەکی زۆر، پەشیمان بوونەوەی رژێمی (بەعس)، لە بەڵێنەکانی رێککەوتنی ئاداری ١٩٧٠، هیچ بواری بە چارەسەری عادیلانەی کێشەی کورد نەدا و بەمەش گێچەڵ کردن بە کوردستان بە قسە و بە کردەوە دەستی پێکرد و ئاگری شەڕێکی تر

لە کوردستان هەڵگیرسا! خەلکی کوردستانیش لە دژی سیاسەتەکانی بەعس و بۆ پشتگیری شۆڕش بە هەزاران کەس روویان کردە شاخ و بەرەوڕوی سیاسەتی شۆفێنییانەی (بەعس) بونەوە!

(کۆمەڵە)، لە ئاستی ئەو هەلومەرجەدا نەیتوانی بێ دەنگ بێت و تەنها هەر تەماشا بکات! بۆیە بڕیاریدا لەتەک رۆڵەکانی گەلەکەی بۆ وەدەستهێنانی ماف و داخوازییەکان سەنگەر بگرێ! بۆ ئەمەش بە بڕیاری (ناوەندی کۆمەڵە)، زۆربەی سەرکردە و کادرەکانی کەرکووک، وەک باقی شارەکان روویان کردە چیاکانی کوردستان و بوونە پێشمەرگەی جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی و لە شاخەوە سەرکردایەتی رێکخستنەکانیان لە سەرجەم شار و شارۆچکەکانی کوردستان، لە سلێمانی و هەولێر و دهۆک و خانەقین و گەرمیان دەکرد!

بەڵام دوای شکستی گەورەی جووڵانەوەی چەکدارانەی کوردستان لە ئاداری ١٩٧٥ و تەقەلاکانی سەرلەنوێی رێکخستنەوەی ریزەکانی (کۆمەڵە)، لە هەموو شارەکاندا و پاش ئەوەی سەرکردەکانی (کۆمەڵە)، کەوتنە زیندانی بەعسەوە، شەهیدان (ئازاد هەورامی و عبدالرزاق و ئەبو شەهاب و حەمیدە سوور) بە هاندان و یارمەتیی کۆمیتەی هەرێمەکان - سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە - توانییان جارێکی تر رێکخستنەکانی کەرکووک لە پەشۆکاوی دەرباز بکەن و سەرلەنوێ رێکی بخەنەوە! بەمەش رێکخستنەکانی کەرکووک تا سالی ١٩٨١ بە باشی بەردەوام و پارێزراو بوو! دواتریش کە ئێمە کەوتینە زیندان و ژێر زەبری ئەشکەنجەدانەوە و منیش لێپرسراوی راستەوخۆی کەرکووک بووم، ئەوا سەرباری شالاوی گرتن و دەست وەشاندنی رژێم و بە درێژایی هەموو سالانی زیندانیی ئێمە، رێکخستنەکانی کەرکووک و هاورێکانمان

هیچ جۆره زیانێکیان بەرنەکەوت و لە زەبری دوژمن بە دوور بوون!
ئەم بەرخوردان و تۆکمەیەش تا ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨١ مایەوه و لە هەموو شارەکانی تری کوردستان سەلامەتتر و لە زەبری دوژمن بە دوورتر بوو! ئیتر بەوجۆره رێکخستنەکان درێژەیان بە خەبات و تێکۆشان دا، تا دەورێکی تری (کۆمیتەی ئاگر)ی کەرکووک، کە لە ساڵی ١٩٧٩ - ١٩٨٠ لەلایەن سەرکردایەتی (کۆمەڵە)وه و بە سەرپەرشتی راستەوخۆی کاک (نەوشیروان مستەفا) و هەریەکە لە شەهید (فاتیح و مامۆستا کاکە رەش)، یەک لە دوای یەک بۆ ماوەیەک سەرپەرشتی چالاکییەکانی (کۆمەڵە)یان لە کەرکووک دەکرد! مامۆستا(کاکە رەش) لەتەک (کۆمیتەی ئاگر)دا وەک تاکتیکێکی رێکخستن کۆمیتەیەکی نهێنیی تری بەناوی شەهید (ئەنوەر زوراب) دروست کرد! ئیتر لەو دەمەشدا رێکخستنەکانی کەرکووک زیاتر روویان کرده گەشانەوه و پەرەسەندن، هەرچەنده چەندین تێکۆشەری ئەو شاره لەوانە شەهیدان (دارا و مەلا محێدین) و دەستەیەک تێکۆشەری تر لە سێداره دران، ئەوانیش لەو کادرانە بوون کە لەو دەمەدا پەروەرده کران و پێگەیشتن و بوون بە ئەندامی (کۆمیتەی ئاگر)!
ساڵی ١٩٨١ لە خرِی نێوزەنگی بناری مامەنده، ئەندامی (ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەران) بووم ، شەهید (عبد الرزاق)، لەسەر وەزعی (کۆمیتەی ئاگر)، هەواڵی دامێ، کە لە رۆژی ١٧ ئۆکتۆبەری ١٩٨١ دا، زەبرێکی گەوره بەر رێکخستنەکانی کەرکووک کەوتووه و لەو کارەساتەدا (مەلا محێدین و دارا و نەبەز) و دەستەیەک لە تێکۆشەرانی تری کەرکووک بەناوەکانی (حەسەن، عەبدولقادر، جەبار، رەشاد، فەهمی، ئەسعەد، فاروق)، دەستگیر کران و دواتر لە سێداره دران و گیانی خۆیان بەخشیوه بە رزگاری و دادی کۆمەڵایەتی و (کۆمەڵە)!

ئیتر پاش ئەو زەبرە کوشندەیە ( ناوەندی کۆمەڵـە) بـە سەرپەرشـتی کاک (نەوشـیروان) و هـاوکاری شـەهید (عبدالـرزاق) و ڕێکخسـتنی شـارەکان، هەوڵێکی زۆریـان دا بۆ سـارێژ کردنـی برینەکانی کەرکووک! بۆ ئەمـەش (مامۆسـتا قـادری مـەلا عومـەر)، چاکـی مەردانـەی لێکـرد بـە لاداو بـە هـاوکاری شـەهید (شـێرزاد جەبـاری) سـەرلەنوی ڕێکخسـتنەکانی کەرکووکیـان خسـتەوە سـەر شـاڕێی گەشـەکردن، تـا لـە ڕۆژی ١٩٨٦/٩/١٠ لەگـەڵ چەنـد تێکۆشـــەرێکی تـر کـە یەکێتیـــان (ڕەئـووف عبـد الـرزاق) بوو، دەسـگیر کران و لـە ١٩٨٧/٦/١٧، لەسێدارە دران و گیانی خۆیـان بـە کـورد و کوردسـتان و ئامانجـە پیرۆزەکانـی بەخشـی!

لە سـەرەتاکانەوە تێکۆشـەرەکانی کەرکووک، شـەهیدان ( ئازاد هەورامی و ئەنـوەر حەسـەن و شـوان و ئەحمـەد عەسـکەری و نەجمەدینـی فەقـێ عەبـدوڵا)، توانیبوویـان زۆربـەی ڕێکخسـتنەکانی (یەکێتیـی قوتابیانـی کوردسـتان)، لـە کەرکووک بـەلای (کۆمەڵـە)دا، ڕابکێشـن و ڕۆڵێکی ئێجگار گرنـگ و کاریگەریـان لـە گەشـەکردنی (کۆمەڵـە)دا نوانـد!

شـایەنی باسـە (ئـازاد هەورامـی و عبـد الـرزاق سـێ گرتکانـی و فەیسـەڵ تاڵەبانـی - شـەهید سـیروان - و ئەنـوەر حەسـەن)، سـەلماندییان، کـە سـەرکردەی زیـرەک و تێکۆشـەری بـەکار و ئـازا و قارەمانـی (کۆمەڵـە) و گەلەکەمانـن! هـاوکات (کۆمەڵـە) هـەر لـە شـاری کەرکـووک چەندیـن تێکۆشـەری تـری پێگەیانـد، کـە کـوڕی ڕۆژی تەنگانـە و پیـاوی ئـازا و بەجەرگـی نەبەردییـەکان بـوون و کادر و فەرمانـدە و پێشـمەرگەی قارەمانـی شۆڕشـی گەلەکەمـان بـوون. لەوانـە (حەمیـدە سـوری گومـرگ و شـەهیدان بێسـتون و نەجمەدیـن و مـەلا ئەحمـەد و مـارف) و دەیـان تێکۆشـەری تـر، کـە لـە سـەنگەری بەرگـری و پێشـەوەی پێشـمەرگایەتیدا، بـە شـێوەیەکی وا قارەمانانـە شـەهید بـوون، کـە هەتـا دنیـا بمێنـێ لـە

لاپەڕەی سەروەراندا ناویان بە نەمری دەمێنێتەوە! هەندێکی تریش لە هاوڕێیانی (کۆمەڵە) وەک ( قادری مەلا عومەر و شێرزاد جەباری و مەلا محێدین و دارا) و هاوڕێکانیان لە خەباتی ژێر زەمینی و لە سەختترین هەلومەرجی دژواردا، سەرکردایەتیی چالاکیەکانی ڕێکخستنیان دەکرد و زۆر ئازایانە لە هۆڵە تاریک و نسرمەکانی سێدارەدا، بە سەر دوژمناندا شێر ئاسا دەیاننرکاند و بە دەم هاواری (کەم بژی و کەڵ بژی)، ڕووەو پەتی سێدارە، گیانی پیرۆزیان بە گەل و نیشتمان و بە کاروانی ڕوو لە ئاسۆی ڕزگاری و یەکسانیی کۆمەڵایەتی بەخشی و بەمەش سەروەرییەکی گەورەیان بۆ خۆیان و بۆ ڕێبازەکەیان تومار کرد!

ڕێکخستنەکانی کەرکووک لاوی زۆر بەهیمەت و زیرەک و ئازا و قارەمانی گرتبووە خۆی، زۆربەیان ڕۆڵەی نەبەز و زەحمەتکێشی گەلەکەمان بوون و لە سەردەمە جیاجیاکانی تەمەنی کۆمیتەی ئاگردا تیین و تەوژمێکی گەورەیان بە فراوانبون و گەشکردنی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) بەخشی! لەوانە شێرە ژنی وەک (گەلاوێژ جەباری) و لاوی چاپوکی وەک (مامۆستا هۆشمەند هەورامی، ئەحمەد عەسکەری و ماموستا ئەمین و شێرکۆ نەجمەدین و عەبدوڵا و ناسیح ) یان تیابوو، کە نموونەی خەڵکی ئازا و چاونەترس و تێکۆشەر بوون!

هەر یەک لەو سەرکردە و فەرماندە و کادر و پێشمەرگە و تێکوشەرانە لە ڕۆژگاری خۆیدا، نموونەی مرۆڤی ئازا و جوامێر و خۆڕاگر بوون و ڕۆڵی گەورە و کاریگەریان لە بالاکردنی تەلاری ڕێکخراوەیی (کۆمەڵە)دا هەبوو! ئەمانە و چەندین تێکۆشەری دی پێکەوە لەگەڵ باقی تێکوشەرەکانی تری (کۆمەڵە)، لە شارەکانی تری کوردستان، توانیان جومگەیەکی بەهێز و هۆیەکی گرنگ و کاریگەر بن، لە ڕەوتی

رووداوەکانی کوردستان و لە گۆڕینی نەخشەی سیاسیی جووڵانەوەی ڕزگاری و دیموکراسیی خەڵکی کوردستاندا! ئیتر لەو ڕۆژگارەدا و لە ساڵی ١٩٧٠ بەدواوە، واتە لە ٤٥ ساڵ لەمەوبەرەوە، هاتنە مەیدانی چەندین کەس لە کوڕ و کچی لاوی کورد بۆ مەیدانی سەختی خەبات، کارێکی هەروا سادە و ئاسان نەبوو، بگرە گەر تینی بیروباوەڕ و بوونی مەسەلەیەکی ڕەوا و پیرۆز نەبوایە، کە لەو هەلومەرجە دژوار و سەختەدا هەموویانی بە عەشقەوە لە دەوری (کۆمەڵە)و بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی مەرگ کۆکاتەوە و فێریان بکات پێویستە مرۆڤ لە پێناوی مەسەلەی ڕەوای گەلەکەیدا، وەک کەڵ بژین ئەگەرچی کەمیش بژین و هەموو تەمەنی لاویی خۆیان و ژیانیان بکەنە قوربانی بە دەستهێنانی ئامانجەکانی گەلەکەیان، کێ دەیتوانی شان بداتە بەر کارێکی وا سەخت و مێژوویی! ئەوە (کۆمەڵە) بوو، توانی هەموو ئەوانە و دەیان هەزار تێکۆشەری تری کوردستان لە سەنگەرە جیا جیاکانی خەباتدا کۆبکاتەوە و گیانبازییان پێبکات! ئەوە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) بوو، توانی پاش نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ ی گەلەکەمان، کاروانی سەرکەوتووی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بخاتە ڕێ و باڵا بە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بکات!

لە ڕێڕەوی شۆڕشگێرانەی چالاکییەکانی هێزەکانی پێشمەرگە لە ناوچە جیا جیاکانی کەرکوکدا، ئەو ڕاستییە خۆی سەلماند کە هەرێم و کەرت و تیپەکانی هێزی پێشمەرگە و کادرە سیاسییەکانیشی چەندە چالاک و بەکار و کاریگەر بوون و چەندە فەرماندەی لێهاتوو پێشمەرگەی ئازا و قارەمان بوون و چۆن ناوچەکانی (دەشتی کەرکووک و شوان و قەڵاسێوکە و خاڵخاڵان و دەمزێ و باسەڕە و سەنگاو و زەنگنە و بناری کفری)، لە دوژمن کرا بە ئاگر! چۆن لە سێبەری ڕزگاریشدا

ڕەنگدانــەوەی گیــان و هیمەتــی ئــەو تێکۆشــەرانە و دڵسـۆزی و ژیـری و هۆشـیاریی هاوڕێکانـی ئەمڕۆیـان کەرکووکیـان لـە هەڵبژاردنەکانـدا کردۆتـە نموونــە!

منیـش لــەم دەڤــەرەی کەرکــووک و لــەو (کۆمیتــەی ئاگــر)ەدا، شــەرەفی هاوڕێیەتـی ئـەو هەمـوو تێکۆشـەرە قارەمانـە و پێشـمەرگەکانیانم پێبـڕا و هـەر لەوێدا بۆ یەکـەم جـار ئەرکی دانانـی بـەردی بناغـەی ڕێکخسـتنەکانی (کۆمەڵـە)م لـە کەرکوکـدا بەرکـەوت و هــەر لەوێش زۆربــەی ســاتەکانی خەباتـی شـۆڕشـگێڕانەم لەگـەڵ (شــەهید شــەهاب) و دەسـتە هــەرە هەڵکەوتووەکانـی (کۆمەڵـە) و یەکێتـی و گەلەکەمـان پێبـڕا! ئێسـتاش هەقـی خۆیەتی ئەو ڕاستییە بڵێم، کە ئەگـەر ئـەو تێکۆشـەرە گەورانـە نەبوونایـە و گـەر ورەی شـۆڕشـگێڕانەی خەڵکـی کەرکووکمـان لەگـەڵ نەبوایـە، نـە مـن و نـە هیـچ سـەرکردەیەکی تـر نەیدەتوانـی ببێتـە شـەریکی ئـەو سـەرکەوتنانەی کوردسـتان و ببێتـە هاوبەشـی ئـەو هەمـوو بیرەوەرییـە پڕ لـە شـانازییانەی/ کـە ئێسـتا باسـیان دەکەیـن!

## (کۆمەڵە) و خەباتی شاخ!

وەک هەر لە سەرەتاوە (کۆمەڵە) پێشبینیی کرد، حیزبی (بەعس) و ڕژێمەکەی، لە بەڵێنەکانی ڕێککەوتنی ١١ ئاداری ١٩٧٠ پەشیمان بوونەوە و هەڵگەڕانەوە و بە عەقڵییەتی شۆڤێنییانە و بەعسییانە، ئۆتۆنۆمییان لێکدایەوە و کەوتنە خۆ ئامادە کردن و خۆ خڕکردنەوە تا جارێکی تر پەلاماری کورد و شۆڕشەکەی بدەن و کێشەی ڕەوای گەلی کورد بەو شێوەیە لێکبدەنەوە، کە خۆیان دەیانەوێ!

- ڕێککەوتنی ڕژێمی عێراق لەگەڵ سەرکردایەتی کورد لە ئاداری ١٩٧٠ دا، بەری هەلومەرجێکی تایبەتیی ناوخۆی عێراق و ناوچەکە و جیهان بوو، بۆ خۆ دەربازکردنی ڕژێمی (بەعس) بوو لە مەترسییەکانی ناو ڕیزەکانی خۆی و ڕێگرتن بوو لە کەڵەکە بوونی ئەو مەترسییانەی، کە لەو کاتەدا لە دەرەوە و لە ناوەوە ڕووبەڕووی ڕژێمی عێراق بووبوویەوە. لە سەرووی هەموشیانەوە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد و بەهۆی ئەویشەوە مەترسیی ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکا بوو!

ئەگینا ئەو ڕێککەوتنە دەرئەنجامی بڕوای ئەو ڕژێمە نەبوو بە مافی گەلان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا و بەری باوەڕ بوونی ئەو ڕژێمە نەبوو بەو ڕاستیەی، کە عێراق دەبێت وڵاتی شەریکایەتی و پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب و پێکهاتەکانی تر بێت، هەرگیز!

- ڕژێمی عێراق بەحوکمی پێگەی چینایەتی و مەیلی شۆفێنییانەی بۆ چارەسەری کێشەکان، لە ڕاستی و ڕەوایی مافی نەتەوایەتیی کورد نەدەگەیشت، کە سەلماندنی ئۆتۆنۆمی و دامەزراندنی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی بوو بۆ گەلی کورد و لانی کەمی مافی چارەی خۆنووسین کارێکی ڕەوا و دیموکراسییانەیە و دەبێت کورد لە عێراقدا پێی بگات!

- تێگەیشتنی (بەعس)، بۆ حوکمی ئۆتۆنۆمی، سەلماندنی ئەو مافە نەبوو، کە بوار بە نەتەوەی کورد بدات لە چوارچێوەی عێراقدا خۆی بە خۆی بەڕێوە بەرێت و بە سەربەستی ئەنجومەنێکی یاسادانان (پەرلەمان) ی هەبێت و تایبەتمەندییە نەتەوەیی و کلتووری و ڕۆشنبیرییەکانی خۆی و ناوچەکەی خۆی پیادە بکات و شوناسی نەتەوەی خۆی دەربخات! بەمەش یاسای تایبەتی بە گوێرەی هەلومەرجی تایبەتیی کوردستان دابنێ و چاودێری کار و بەرنامەکانی دەزگای جێبەجێ کردن بکات! بەڵکو بەغدا دەیویست بە ئارەزووی خۆی و بە مەیلی خۆی چوارچێوەیەک بۆ ئەو ئۆتۆنۆمییە دابنێت، دووربێت لە خواست و ویستی نەتەوایەتییانەی گەلی کورد و دەیویست بە ئارەزووی خۆی ڕەنگی ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمییە بڕێژێت و بە گوێرەی پاراستنی مەرکەزیەتی حوکمی خۆی، کورد و دەزگا ئۆتۆنۆمییەکەی لە قاڵب بدات!

- ڕژێم دەیویست دەزگای جێبەجێکردن لە قاڵبێکی وادا دابڕێژێت، کە پاشکۆی دەسەڵاتە مەرکەزیەکەی خۆی بێت و حوکمی عێراق

بۆ تاکڕەوی و دیکتاتوری کەم نەکاتەوە و هاوکات بەهۆی دەزگا ئەمنییەکانی حیزب و رژێمەکەیەوە ئەمین عامەکان دیاری بکات، تا ئەوانیش لەو جۆرە کەسانە بن، کە گوێڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی رژێم بن!

-رژێمی عێراق دەیویست، سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی، سنووری کوردستانی باشوور نەبێت! بەڵکو ئەو سنوورە بە ویست و ئارەزووی خۆی دیاری بکات و بە هیچ جۆرێک (کەرکووک و خانەقین و مەندەلی و کفری و دوز و دوبز و پردێ و مەخمور و شەنگال و رەبیعە)ی تێدا نەبێت!

- لە هەموو خێر و بێری عێراق و لە سامانی نەوت و غازی کوردستان و عێراق، هیچی بۆ دیاری نەکات و لەو خەرجییانەی، کە ساڵانە لە خۆ پڕ چەککردن و مەسرووفاتی حیزبەکەی و دەزگاکانی ئاسایش و کۆشک و خەرجی جەنگەکانی دەمێنیتەوە، بە ئارەزووی خۆی و وەک خێر و سەدەقە هەرچییەک زیاد بوو، شتێکی لێ بنێرن بۆ خەزێنەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی! لەکاتێکدا کورد دەیویست رێژەیەکی دیاریکراو لە داهاتی بۆ دابین بکرێ، تا بتوانێت بەو بودجەیە وڵاتە وێرانەکەی خۆی پێ ئاوەدان بکاتەوە و تۆڵەی پرۆسەی بە ئەنقەست پاشخستنی وڵات و گەلەکەی پێبکاتەوە!

- دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی عێراق دەیویست نەک هەر لە عێراق، بەڵکو لە هەولێر و لە کوردستانیش بەسەر دەزگا ئۆتۆنۆمییەکانەوە حاکم و باڵادەست بێت و بە سەریانەوە چاو سوورکاتەوە، بەمەش لە باتی دابین کردنی ئازادی و ئاسایش و پاراستنی سەر و ماڵی هاووڵاتییان و رەخساندنی بواری خۆش و لەبار بۆ ئەوەی ئازادییەکان و مافەکانی مرۆڤی کورد بەر قەرار بن، کەچی بە دەزگا و دامەزراوەی ئەمنی

و فەرز کردنی کارمەند و کاربەدەستی بەعسی و عەرەب، دەیویست دەست لە بینی تاکی ئەم گەلە گیر بکات!

- رژێم بە زمانێکی زاڵ و سوڵتانیی و دڵرەق، بە نەفەسی دیکتاتۆر و زاڵم، بە هەڕەشە و گورەشەی بێ مانا، لە ئاداری ١٩٧٤دا، پڕوژەیەکی شوفێنییانەی خستە بەردەست گەلەکەمان و راستەوخۆ ئاماژەی بەوەدا، کە ئەمە دوا روانینی بەعسییەکانە بۆ چارەسەری کێشەی گەلەکەمان، جا ئەگەر قبوولی دەکەن، ئەوا باشە! ئەگەر نا ، ئەوە فڕۆکە و سوپا و تۆپ و تانک ئامادە کراون بۆ پەلاماردانی کورد و کوردستان!

- (پریماکۆف)، کە نێردراوی روسیا بوو لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا، هەوڵێکی زۆری دا، کە تێگەیشتنێکی تر لە نێوان رژێمی عێراق و (بارزانی)دا، بهێنێتە کایەوە، بەلام لووت بەرزیی رژێم و هەڵسەنگاندنی بۆ تواناکانی (بارزانی)، بواری بە ئەنجامێکی باش نەدا! ئیتر لەسەر بانگهێشتی سۆڤیەت (صدام) لە ١٢ ئاداری ١٩٧٤دا و لە مۆسکۆ، بێ ئەوەی گوێ لە ئامۆژگارییەکانی مۆسکۆ بگرێت، بە نەفەسی هەڵگیرسانەوەی شەڕ گەرایەوە بەغدا!

رژێمی عێراق لە ئاداری ١٩٧٤دا، بەو بەرنامە و پڕۆژەیەوە هاتە سەر کاتی جێبەجێکردنی رێکەوتنی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ و یاسای ئۆتۆنومی! ئیتر پڕۆژە و بڕیاری بەعس لەسەر زاری(احمد حسن بکر)ەوە بەوجۆرە بو کورد و جیهان راگەیەنرا. بەمەش لە بەردەم ئەو پیلان و نەخشەیەی کە بەعسییەکان دایانڕشت، خەڵکی کوردسان راپەڕین و روویان کردە چیا سەر بڵندەکانی کوردستان! (کۆمەڵە)ش لە ئەنجامی هەست بە بەرپرسیارێتی کردن و بۆ مێژوو بەیاننامەیەکی بۆ پشتیوانی لە راپەڕین و بەرگری خەڵکی کوردستان راگەیاند! ئێستاش چەندین

لەو خاڵانەی، کە لەو بەیاننامەدا لە بیرم مابێت، دەخەمە بەر دیدەی خوێنەران..
* رژێمی (بەعس)ی عێراق لە رێککەوتنی ١١ ئاداری ١٩٧٠ و لە یاسای ئۆتۆنۆمی پەشیمان بۆتەوە و ئۆتۆنۆمییەکی دەوێت بە ویست و ئارەزووی خۆی، چونکە رژێم دەیەوێت بە ئارەزوو ویستی خۆی سنوورو دەسەڵاتەکانی دیاری بکات، هەر خۆشی بە تەنها رەنگ و روخساریی ئەو ئۆتۆنۆمییە دابڕێژێ و دام و دەزگایەکی کارتۆنی بۆ داتاشێ، لەبری ئەوەی بۆ خەڵکی کوردستان بێ، بۆ رژێم و بۆ بەعسییان کاربکات. بەڵام لە جیاتی ئەوەی بارەگاکەیان لە بەغدا بێت، لە هەولێر دەبێت و بە فرمانی بەعسییان نەک بە ویستی گەلەکەمان کار دەکات!
* رژێمی عێراق چارەسەر و رێگەی ئاشتی و گفتوگۆی بەلاوە ناوە و بە زمانی زبر و شەڕ هەڕەشە لە گەلەکەمان دەکات!
* سەرەڕای ئەوەی، کە سەرکردایەتیی جووڵانەوەی چەکداریی کوردستان، سروشتی چینایەتی لەگەڵ جووڵانەوە رزگاریخوازەکەی کوردستان و ناوەرۆکە دیموکراسیەکەیدا جووت و تەبا نییە، بەڵام ئەمە هیچ لەو راستییە ناگۆڕێت، کە ئەو جووڵانەوەیە، جووڵانەوەیەکی رزگاریخوازانەی دیموکراسییە و جووڵانەوەیەکی ڕەواو عادیلە، بۆیە دەبێت (کۆمەڵە)، لەگەڵ سەرکردایەتیی جووڵانەوەکە سیاسەتی (یەکگرتن و ململانێ - الوحدە والصراع -) پەیڕەو بکات!
* (کۆمەڵە)، بە هوشیارییەکی تەواو و بە دڵ و بە گیان بەشداری لە بەرگری خەڵکی کوردستان دەکات و لە رووی هێرش و پەلاماری رژێمی بەغدا، پێشمەرگە ئاسا دەوەستێ و هاوکات ئەو ئەرکەش بە ئەرکێکی نیشتیمانی و ئەرکی چینایەتیش دەزانێت!

* بـەلام نابـێ و ناشـێ بـە دەم سـۆزی نیشـتمانی و ناسیۆنالیسـتییەوە ئەنـدام و کادر و سـەرکردەکانی (کۆمەڵـە)، ئەرکەکانـی خۆیـان فەرامـوش بکـەن! بۆیـە دەبێـت باشـتر و تۆکمـە تـر ریزەکانیـان لـە شـار و لـە شـاخ رێـک بخـەن و ئەگەرەکانـی هـەر هەلومەرجێکـی سـەخت لـە بەرچـاو بگرن و لـە ئێسـتاوە ئیحتیاتـی بۆ بکەن. بۆ ئەمـەش لـە ریزی پێشـمەرگە قارەمانەکانـدا رێکخسـتنی نـوێ دروسـت بکـەن و لـە هەمـان کاتـدا بـە هەمـوو توانـاوە هەوڵـی ئـەوە بـدەن شـۆڕش بەهێزتـر بێـت و بەرگـری خەڵـک لـە ڕووی دوژمنـدا قایمتـر و بەتواناتـر بکـەن.

بەیاننامەکـە لەگـەڵ پشـتیوانی تـەواوی بـۆ خواسـتەکانی گەلەکەمـان و جووڵانـەوە رزگاریخوازەکـەی ئـەو ئەرکەشـی خسـتە ئەسـتۆی تێکۆشـەرەکانی، کە دەبێت خەبات ئاراسـتەی ئـەو لایەنە گرنگـەش بکرێت کـە سـەرکردایەتیی جووڵانەوەکـە دەکات، تـا سـەرکردایەتییەکی جـووت و گونجاوبێـت لەگـەڵ سروشـت و ناوەرۆکـی جووڵانەوەکـە!

گـەر بیرەوەریـم هـاوکارم بێـت، ئەوانـە خاڵـە سـەرەکییەکانی ئـەو بەیاننامەیـە بـوون، کـە مـن بـۆ خۆشـم نووسـیبووم! ئیتـر ئـەو بەیانـە بـوو بەهـۆی ئـەوەی، کـە زۆربـەی سـەرکردە و کادرەکانـی (کۆمەڵـە)، ڕوو لـە شـاخ بکـەن! لەوانـەی یەکەمیـن جـار گەیشـتنە نـاو هێـزی پێشـمەرگە لـە کەرکـووک ( عەلـی بچکـۆل، عبدالـرزاق سـێگرتکانی، ئـازاد هەورامـی، عەلـی حسـێن، شـەهید شـوان، حەمیـدە سـوور، سـیروان تاڵەبانـی، بێسـتون (شـەهید)، ئەحمـەد عەسـکەری، نەجمەدیـن ( شـەهید )، ناسـیحە سـوور و فەرەیـدون عەبدولقـادر) بـوون. ئێمـە بـە پـلان رۆیشـتین هەندێکمـان بـۆ نـاو قوتابییـان و لاوان و هەندێکیشـمان بـۆ نـاو هێـزی پێشـمەرگە. لـە سلێمانیش (سـالار عەزیـز، عومـەری سـەید عەلـی، شـە هید ئـارام و دارۆی شـێخ نـوری، کەمـال عەلـی، سـەلام عەبدولڕەحمـان، جەمالـی عەلـی باپیر،

ئەنوەری مەجید سوڵتان، مامۆستا ئەنوەر و عەلی شیعە و شێخ عەلی) و دەیان کادری پێشکەوتوی تر. لە خانەقین (مەلا بەختیار و شکور و نەسرەدین) و هەندێکی تر لە هاوڕێیانمان، لە کۆیەش (مامۆستا هۆشمەند و حەمید کەریم) و چەند هاوڕێیەکی تر. لە دواییشدا ( کاک شەهاب خۆی و ئیحسان نەجم - ئەبو شەهاب - ) هاتنە دەرەوە !

لە کەرکووک ئێمە هەندێ هاوڕێی هونەرمەندمان هەبوو، کە تێکۆشەری چالاک و زیرەک بوون و کاریگەریشیان لەسەر لاوانی کەرکووک هەبوو. یەکێک لەوانە خوالێخۆشبوو (جیهاد دڵپاک) برای شەهید (ئەنوەر زۆراب) و یەکێکی تریشیان هونەرمەند (عەلی کەریم) برای شەهید (جەلال کەریم) بوو. ئەو دوو لاوە عاشقی هونەری شانۆ بوون و لەو بوارەدا زۆر چالاک بوون! ساڵی ١٩٧٤ (عەلی کەریم)، دەقێکی جوانی شانۆگەرییەکی بۆ هێنام بە ناوی (تەقینەوە)، تەماشای بکەم، منیش پاش خوێندنەوەی هەندێ دەسکاریم کرد و پارچەیەک لە سرودی (کۆمەڵە)م بۆ دیمەنێکی زیاد کرد و جووتم کرد لەگەڵ جیهانبینی و بۆچوون و بەرنامەی (کۆمەڵە)دا، ئەویش پەسەندی کرد و سیناریۆی بۆ دانا! ئیتر کەوتنە پرۆڤە کردن، تا لە میهرەجانێکی گەورەی شانۆگەری، کە ئەو رۆژانە لە بەغدا سازدەکرا، نمایش بکرێت و بکەوێتە کۆڕی پێشبڕکێوە، منیش بۆ هاندان و پشتیوانییان لە گەڵیان چووم بۆ بەغدا، دواتر ئەوە بووە هۆی ئەوەی، کە من چەند رۆژێک درەنگتر بچمە شاخ!

لە دواییدا لە بەغدا و لە هەلومەرجێکی زۆر ناسکدا، لە رۆژە هەرە گرژ و مۆنەکانی ئەو رۆژگارەدا لە ناو ژمارەیەکی زۆری شانۆگەریدا، شانۆگەری (تەقینەوە)کەی ئێمەش نمایش کرا، خۆشبەختانە لە ناو هەموویاندا هەم (عەلی کەریم)ی دەرهێنەر و ئەکتەر یەکەم خەڵاتی

باشترین نواندنی وەرگرت و هەم شانۆگەرییەکەش لە پلەی یەکەمیندا هەموو خەڵاتەکانی دەرهێنان و بەرهەمهێنان و نواندن و سیناریۆی وەرگرت، کە ئەمەش دەنگدانەوەیەکی گەورەی لێ کەوتەوە! پاش ئەوە بە پەلە گەڕامەوە بۆ کەرکووک بۆ ماڵ ئاوایی لە کاک (شەهاب و شەهید جەعفەر)، ئیتر کەوتمە تەگبیر بۆ چۆنێتی ڕێکخستنی کارەکانی (کۆمەڵە) و هاوڕێیانی کۆمیتەی کەرکووک. کە لەوە بوومەوە ماڵ و منداڵم ئامادە کرد و لە ڕێگەی چەمچەماڵەوە و بەهۆی (شەهید عبد الرزاق) ەوە لە ڕۆژی ٢٦- ٣ ١٩٧٤دا، خۆمان گەیاندە سەنگاو بۆ لای (نورەدین عەبدولڕەحمان و نەجمەدین گلی) کە ئەو دەمە هەردووکیان ئەندامی لقی کەرکووکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، بەڵام (نەجمەدین)یان، لە لایەنگرانی ئێمە بوو، لەوێ بە گەرمی پێشوازییان لێکردین و بە (صالح بێداوی)یان ئاشنا کردین، کە فەرماندەی هێزی کەرکووک بوو. چەند ڕۆژێک میوانی ئەوان بووین. (صالح پێداوی و صدیق ئەفەندی) زۆریان لێکردم، کە لە هێزی کەرکووک بم، بەڵام چونکە جارێ کاری دۆزینەوەی هاوڕێکانمان و ڕێکخستنەوەیانمان لە هەموو شت لە پێشتر بوو، نەمتوانی لایان بمێنمەوە و بە سوپاس و پێزانینەوە داوای لێبوردنم کرد!

لە سەنگاو پاش دۆزینەوەی (حەمیدە سوور)، لەگەڵ (عبدالرزاق و حسێن و عەبدول مەجید) و چەند هاوڕێیەکی تر خانوویەکمان لە ناو سەنگاودا پەیدا کرد و بۆ خۆمان کردمانە شوێنی حەوانەوەمان! ئیتر لەوێوە دەستمان کرد بە دۆزینەوەی هاوڕێکانمان، شەهید (ئازاد هەورامی و نجم) و هەندێ لە هاوڕێیانی خوێندکاران، لەوانە (حەمە عەزیز) کە لێپرسراوی لقی کەرکووکی قوتابیانی کوردستان بوو، لەگەڵ (عەبە و عەلی کاکە حەمە، برازای حەسیب صالحی)

ئەندازیـاری ناسـراو بـوون، لـە گـەڵ (سـتار شـۆڕیجەیی) و ژمارەیەکـی تـر وەک پەلێکـی پێشـمەرگەمان لێهـات. ئەنجـا کەوتینـە سـۆراخی (عەلـی بچکـۆل) و هاوڕێیانـی تـر لـە ئاغجەلـەر. لەگـەل (ئـازاد هەورامـی) و هاوڕێیانـی تـردا یەکمـان گرتـەوە، پـاش سـوراخکردن و هـەواڵ پرسـینی ئەوانـی تـر و زانیـاری لـە بارەیانـەوە، لەگـەڵ (عەلـی بچکـۆل)، لەسـەر نەخشـەی دابەشـبوون بەسـەر ناوچـە جیاجیـا کانـدا و شـێوەی پەیوەندیـی نێوانمـان، ڕێککەوتیـن! پـاش چەنـد ڕۆژێـک مانـەوە گەڕاینـەوە شـوێنی خۆمـان. لـەوێ تەنهـا دوو کـەس تفەنگیـان پـێ بـوو، ئەویـش یەکێکیـان سـەمینۆفێکی روسـی و ئـەوی تریـش بڕنەوێکـی کورتـی ئەڵمانـی بـوو، دەنـا ئێمـە کەسـمان جگـە لـە دەمانچـە هیچمـان پـێ نەبـوو!

نۆبـەی بۆردومـان و فرۆکـە هـات، بەیانییـان زوو یـان عەسـر دەهاتنـە سـەرمان، سـەنگاویان وێـران کـرد، بـارەگای لـق و هەمـو شـوێنەکانیان بۆردومـان کـرد. وای لـێ هـات بـەر لـە هاتنـی ڕووناکـی و پێـش ئـەوەی کـە خـۆر هەڵبێـت، دەبـوو خەڵـک هەمـوو سـەنگاو چـۆل بکـەن و خۆیـان بگەیەننـە ئـەو هەڵـەت و زوورگ و چەمانـەی ئـەو نـاوە و بڵاوەی لێبکـەن! ئیتـر ئێمـە بارەگاکەمـان بـردە لای (کونـە کەمتیـار) لـەوێ ئەشـکەوتێکی لێبـوو، لـە دیـوی ئێمـەوە جۆگەیەکـی چەویـی لێبـوو نزیـک شـوێنەکەی ئێمـە بـوو، کـە زۆربـەی جۆگـە بچکۆلەکانـی شـوێن خـۆی خسـتبوو، هەموویانی لە باوەش گرتبوو، بەمـەش ڕووبارێکی بچکۆلـەی لـێ دروست بووبـوو. لـە دیـوی ئـەو دیـوی ئەشکەوتەکەشـەوە گوندێـک هەبـوو بـە نـاوی (میـراوا)، زۆر جـار خەڵکی میـراوا لـە هاتوچـۆی خۆیانـدا مەشـکە دۆیـان بـۆ دەهێنایـن. لـەو شـوێنە بـە زۆری خەریکـی نامـە نووسـین و ناردنـی و پەیوەنـدی و خـۆ پـەروەردە کـردن بووین! جارجاریش سـەردانی دۆســـتانمان لـە هێز و لقی کەرکووک دەکرد، کە بارەگـاکەیان بردبوە

لای دێی هەنـاران. شـــەوانیش (ماشــە ) مـان دەنایـەوە لـە شـوێنێکی قەڵبـەزەی ئاوەکەدا ماسیمان دەگرت، ئیتر بەیانییان کە دەچووین بزانین چیمـان بەنسـیب بـووە، دەمانبینـی چەنـد ماسـیەکی بـۆ گل داوینەتـەوە، ئێمـەش دەمانهێنایـەوە و بـە رۆژ دەمـان برژانـدن.

(نورەدیـن عەبدولڕەحمـان) کاتـی خـۆی ئەندامـی کۆمیتـەی ناوەنـدی پارتی ( باڵی مەکتەبی سیاسی ) بوو، پیاوێکی تێکۆشـەر و لـە خێزانێکی ناسـراو بـوو، لـە کەرکووک رێز و خۆشەویستی تایبەتیی خـۆی هەبوو، هاوڕێی خۆشـمان و خۆشەویسـتم بـوو، زوو زوو بانگی دەکـردم و لای برادەرەکانـی خـۆی داوەتـی دەکـردم، لای مەبەسـت بـوو فەرمانـدە و لێپرسـراوەکانی ئـەو دەڤـەرە بمناسـن، منیـش ئاشـنایەتییان لـە گـەڵ پەیدا بکـەم! لەبـەر ئـەوە زۆرجـار بـۆ سـەردانی ناوچـە و بەتالیۆنەکانـی کەرکـووک لەگـەڵ خـۆی دەیبـردم. ئـەو رۆژانـە لـق و ئیدارەی ناوچەکـە نووسـراویان بـۆ سـەرکردایەتی دەکـرد بـۆ ئەوانـەی، کـە هاتوونەتـە ریـزی شۆڕشـەوە ، تـا جێگەیـان بـۆ دیـاری بکـەن و تفەنگیـان بدەنـێ. ئیتـر دەسـتە دەسـتە دەڕۆیشـتن چەکیـان وەردەگـرت و شـوێنیان بـۆ دیـاری دەکـردن و دەگەڕانـەوە. کـە نۆبـەی منیش هـات، ماوەیـەک لەگـەڵ (ئەنـوەر هەمـزە)ی هاوڕێـم بـووم و یارمەتیـم دەدا - ئـەو بەڕێوەبـەری شـارەوانییەکان بـوو- پـاش ئـەوە منیـش لەگـەل (عبدالـرزاق) و چەنـد هاوڕێیەکـی تـردا، چـووم بـۆ سـەرکردایەتی. ئـەو کاتـە هێرشـەکانی رژێـم بـۆ سـەر کوردسـتان دەسـتی پێکرد بـوو، خەریـک بـوو شـەڕ بەتـەواوی گـەرم دەبـوو! لـە رێگـەی هەشـەزینی و باسـەڕەوە پەڕیینـەوە بـۆ گونـدی ( بیبیجـەک)، لـەوێ هێندەمـان نەزانـی توشـی هێرشـی تانـک و تۆپـی هێزە داگیرکەرەکانـی عێـراق بوویـن، دەسـتەیەک پێشـمەرگە و (عبـد الـرزاق) و مـن و چـوار کەسـی تـر، یەکێکیـان پێشـمەرگەیەکی خەڵکـی بـاوە

فەتێی لای ئاغجەلەر بوو، لەگەڵ کوڕێکی تر کە سەرپەلێکی ئازا بوو بە ناوی ( عیزەدین تەوەکەلی) پێکەوە بووین، شەڕێکی سەخت بەرۆکی گرتین، بە سەختی شەو درەنگ توانیمان لە بیبیجەک لا بدەین و پشوویەک بدەین، پاش پشوودانێکی باش لەوێوە کەوتینە رێ تا رۆژی دوایی چوینە گەورە دێ. لەوێ ( شێخ قادر)ی سۆتکەمان دی، فڕۆکەیەکی میک خرابووە خوارەوە، ئیمەش چووین بۆ سەیرکردنی، پاشان شەوێک لە ئاغجەلەر ماینەوە و شەڕ لە نزیکی گوندەکانی ئەو شارە زۆر گەرم بوو! لەوێ کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ هاوڕێیان (عەلی بچکۆل، ئازاد هەورامی و ماموستا ئەمین - شێرکۆ - ) دا کرد و دێ بە دێ پەڕینەوە بۆ کلکە سماق، ئیتر لەوێ پشوویەکمان دا و لە ماڵی خزمانی (مامە رەزا) ی حەقە ماینەوە، رۆژی دوایی کەوتینە رێ گوند بە گوند، تا گەشتینە گوندی (گەناو) و لەوێشەوە بۆ قەڵادزێی بۆردومان کرا و ملی رێمان گرت!

تا ئەو کاتە (عەلی بچکۆل)، بۆ ئەوە لەو ناوە بوو، کە سەروکاری رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)، لە ناوچەکەدا بکات و لەگەڵ هاوڕێیانی کەرکووکدا لە پەیوەندیدا بێت و ئاگاداری چالاکییەکانی هاوڕێ سەرەکییەکانی ناو قوتابییان و لاوان و ناو پێشمەرگەش بێت !

ڕوومان کردە پڵنگان و بەرەو وەرتێ و لەوێشەوە بۆ ناوچەکانی سەرکردایەتی و بۆ بارەگای (بارزانی). لە بەشی پێشوازی کاک (حەمەی عەزیز)، لێپرسراوی ئەو کاتەی بارەگای (بارزانی) بوو، (تەهای حاجی عەبدولا)ی لەگەڵدا بوو! زۆر گەرم پێشوازییان لە خۆم و هاوڕێکانم کرد و میواندارییەکی چاکیشیان کردین. (حەمەی عەزیز)، تێکۆشەرێکی ناسیۆنالیست بوو، لە سەرکردە ناسراوەکانی (پارتی گەلی کورد) و پاشان (کاژیک) بوو، پیاوێکی کورد پەروەر و روو خۆش و رەگێکی

سلێمانچێتیش ختووەکەی دەدا، تەمەنێکی زۆری خۆی بۆ کوردایەتی و خزمەتی گەل و نیشتیمان سەرف کرد و ئێستەش خەڵکی سلێمانی بە ڕێزەوە لێی دەڕوانن. کاک (تەها)ش، کوڕێکی چاک و لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەر بوو، برایەکی تریشی هەبوو ناوی (عیمادی عەبە خەیات) بوو، هاوڕێی ئێمە بوو، بە درێژایی ڕۆژانی سەختی شاخ پەیوەندی لەگەڵ نەبچڕاندووین و دەستی پێمانەوە بوو. ئەو دەمە کاکە (حەمە) دەسەڵاتی زۆر بوو، کۆمەڵێک چەکی کلاشینکۆفی جوانی پێداین!

لە سەرکردایەتی چومە لای هاوڕێکانم لە رایات (بەکر حسێن و بەختیار نەجمەدین و بەختیار زوهدی و سەروەر و رۆژی نوری شاوەیس)، کە ئەوانە هەموو لای کاک (نوری شاوەیس) بوون! ئەو کاتە کاک (نوری) جگە لە کاری سەرکردایەتیی پارتی، ئەمینی گشتی شارەوانییەکانیش بوو. لەگەڵ دکتۆر (رۆژ)، چوومە سەردانی کاک (نوری شاوەیس)، کە ئەو وەک (رۆژ و رەنج) سەیری من و (بەختیار زوهدی) دەکرد. دوای ئەوە چوومە سەردانی حاجی هۆمەران بۆ لای (بەختیار زوهدی و نەورۆز حەمە سەعید و کەمال عەبدولا)، دواتر بە سەرپەرشتیی خوالێخۆش بوو کاک (ئیدریس بارزانی) دەورەیەکی دژە ئاسمانی بۆ کردنەوە، ئیتر لەگەڵ کۆمەڵێک لاوی خوێندەواری تردا هەموویان چوونە دەورەکە. کە چووینە سەرکردایەتی وەک گوتم، چووینە لای کاک (نوری شاوەیس)، خوا هەڵناگرێ رێزێکی تایبەتیی لێگرتم و بە بەڕێوەبەری شارەوانییەکان داینام - بۆ وەفاداری باشە سوپاسگوزاری بم و بیرم بێت، کە هەر ئەویش لەکاتی خۆیدا لە سلێمانی هەوڵی بۆ دام بە کارمەند لە شارەوانی دابمەزرێنم - لەوێ لەگەڵ کاک (نوری شاوەیس)، چاوم بە (ئیدریس بارزانی) کەوت، هەواڵی قۆڵی سلێمانی و برایانی لقی لێ پرسیم و قەڵەمێکیشی بە دیاری پێدام!

ئـەو ماوەیـە رژێـم بـە تـەواوی هـار بووبـوو، ڕۆژانـە پەلامـاری هەمـوو شـوێنەکانی دەدا، بۆردومـان ژیانـی بـە هەمـوو خەڵـک تـاڵ کـرد بـوو، هـەر کـە ڕۆژ دەبـوەوە و خـۆر هەڵدەهـات، فرۆکـە جەنگییەکانـی رژێـم، ئاسـمانی (چۆمـان و ناوپـردان و گەلاڵـە و حاجـی هۆمەران)یـان دەگـرت و قیـن و زووخـاوی رژێمیـان بـە سـەر شـارۆچکە و گوندەکانـدا دەبـاران! ئیتـر ڕۆژێکیـان هێندەمـان نەزانـی وتیـان فرۆکەیەکـی (میـک) کەوتۆتـە خـوارەوە!
لەو سـەردانانەدا بـووم لای ئـەو دۆسـتانەم، هەواڵێکی ناخۆشـم پێگەیشت لـە بـارەی بۆردومانـی قەڵادزەوە، کـە سـەرەڕای ئـەو کارەسـاتە ناخۆشـەی قـەڵادزە و شـەهید بوونـی خەڵـک و وێـران بوونـی شـارەکە و تیاچوونـی خەڵکەکـەی، لـە زانکـۆی سـلێمانیش کـە ئەوکاتـە گوازرابـۆوە بـۆ ئـەوێ، چـوار هاوڕێـی چالاکمـان شـەهید بـوون، کـە یەکێکیـان (هیـوا عەبـدول غەفـور) بـرای (ئـاوات عەبـدول غەفـور) ی (ناوەنـدی کۆمەڵـە) بـوو، مـن بـۆ خـۆم (هیـوا)م لـە نزیکـەوە دەناسـی، بۆیـە زۆر بـۆی بـەداخ بـووم. یەکێکـی تریشـیان کـوڕیماڵـی (سـام سـام)ی سـلێمانی بـوو، هاتمـەوە بەیانێکـی ئاگرینـم لەسـەر نووسـین و ناردم بـۆ هەمـو لایـەک!
کاتێک کە لـە بەهـاری سـاڵی ١٩٧٤ دا، شـەڕ لـە نێوان خەڵکی کوردسـتان و رژێمـدا هەڵگیرسـایەوە، شـۆڕش زانکـۆی سلێمانی گواسـتەوە بـۆ قـەڵادزێ بـۆ ئـەوەی ئـەو سـاڵەی خوێندنـی قوتابییـان نەفەوتـێ! ئیتـر ژمارەیەکـی زۆری خوێنـدکار و مامۆسـتاکانی زانکـۆ روویـان کـردە شـاخ و بەشـداری شۆڕشـیان کـرد. رژێمـی عێـراق کـە تاوانکـردن و کوشـتنی بـە کۆمـەڵ پیشـەی لـە مێژینـەی بـوو. هـەر بـەو شـێوەیە کەوتـە پەلاماردانـی هـەردوو شـارۆچکەی (قـەڵادزێ و هەڵەبجـە)، بەمـەش لـە ڕۆژی چوارشـەممەی ١٩٧٤/٤/٢٤ بـە فرۆکـە مەرگچێنەکانی (سـۆخۆ) ی رووسـی، شـەلم کوێـرم

ناپارێزم، کەوتە بۆردومان کردنی شاری قەڵادزە و زانکۆ ساواکەی سلێمانی و لە ماوەی کەمتر لە نیو کاتژمێردا شاری نوقمی تاوان و خەڵتانی خوێن کرد و ١٦٣ مرۆڤی سڤیل و بێتاوانی لە خەڵکی شار و لە مامۆستا و قوتابییانی زانکۆ بوونە قوربانی سیاسەتە شۆڤێنی و رەگەز پەرستەکەی بەعس! بە هەمان شێوە و دوو رۆژ دوای کارەساتە جەرگ بڕەکەی قەڵادزێ و لە سەعات چوار و نیوی رۆژی هەینی ١٩٧٤/٤/٢٦ یشدا، هەڵیان کوتایە سەر شاری هەڵەبجە و لە ماوەیەکی کەمدا جەستەی هەلا هەلا بووی ٥٢ کەسی مەدەنیان لە خەڵکی شار و لەو میوانانەی، کە لە شارو شارۆچکەکانی کوردستانەوە بۆ پەیوەندی کردن بە شۆڕشەوە روویان کردبووە ئەو شارە، تێکەڵ بە داروپەردووی شار کرد و بوونە سووتەمەنی سیاسەتە رەش و گڵاوەکانی بەعسییە عەرەبەکان!

لەو ماوەیەدا لە تۆڵەی شەهیدانی قەڵادزە و هەڵەبجە، هێرشی هێزی پێشمەرگە بۆ گرتنی بنکە و بارەگاکانی لیوای دووی پیادەی سوپای عێراق، کە شاخی سپیلک و بەرزاییەکانی رەواندزیان کردبووە مۆڵگە، دەستی پێکرد. هەرچەندە زیانێکی زۆریان گەیاندە سوپای عێراق، بەڵام شۆڕش لە گرتنی لیواکەدا سەرکەوتوو نەبوو!

- رۆژی ١٩٧٤/٤/٢٦ رژێمی عێراق بە شێوەیەکی درندانە بە فڕۆکە پەلاماری گەلاڵەی دا، زیاتر لە ٢٤ کەس شەهید بون و برینداریکی زۆری لێکەوتەوە!

- لە ٢٤ ی ئەو مانگەدا، پەلاماری قەلادزە و زانکۆی قەلادزەی دا و نزیکەی ١٦٣ شەهیدی لێکەوتەوە.

- لە ٢٦ ی هەمان مانگدا، بۆردومانی شاری هەڵەبجە و شاری چوارتای کرد.

- لە ٥ ئاياری ١٩٧٤دا، بۆردومانی زاخۆی کرد و بە هێزی پیادە و تۆپ و تانک پەلاماری شاری زاخۆی دا و داگیری کرد.
بەو ئازار و غەمە زۆرەوە سەردانی شەهید (ئارام و دارۆ و مارف) و هاوڕێیانی ئەو ناوچانەم هەموو کرد، بەڵام لە بەختی من ئەو ماوەیە دەچوومە هەر شوێنێک، لە ئاسمانەوە بۆمبا باران بوو، لە زۆربەی شوێنەکانیش رژێم بۆمبی هێشوویی و ناپاڵمی فڕێ دەدایە خوارەوە.
رۆژێکیان چووم بۆ سەردانی ماڵی شەهید (عەلی عەسکەری)، (سەبیحە) خانی خێزانی دانیشتبوو لەگەڵ ژنێکی تردا ناوساجی بۆ ئەکردین تا بە کەرە و ماستەوە بیخوین، وتی برنجێکیشتان بۆ دەکەم، لە ناکاو فڕۆکەی دوژمن پەیدا بوو، بۆردومان حەشرێکی پێ کردین، خواردنی بیر بردینەوە، سێ بۆمبی ناپالمی بەردایەوە و بە سەدان رۆکێتی بچکۆلەش دەورو پشتی بێژاین! بیرمە ئەو رۆژە لە گەلالە پێنج کەس پێوە بوون، سیانیان لەجێدا مرد بوون! ئەگەر کونە تەیارەی باشیان نەبوایە ئێمەش توشی زیان دەبووین!
من بۆ خۆم دەمێک بوو تێکەڵی کاک (عەلی عەسکەری) بووم، دەمزانی کاک (عەلی) چەند پیاوێکی ئازا و خۆڕاگرە، بەڵام ئەو رۆژە ئازایەتی وام لە (سەبیحە) خان دی، لە کەم فەرماندەم دیوە! ئەو لەباتی ئێمە یەک بە یەک لە ژێر زەبر و سامی بۆردوماندا بە سەرماندا دەگەڕا و لە سەلامەتیمانی دەپرسیەوە و باکی بە دەنگی سامناکی فڕۆکە و بۆردومان هەر نەبوو! کە فڕۆکە کانیش ئاوا بوون (سەبیحە) خان، وەک ئەوەی کە هیچ رووی نەدابێ کەوتەوە ناوساجی کردن بۆمان! شەهید (عەلی عەسکەری)، کوڕی (شێخ عەبدوڵا)ی عەسکەر، پیاوێکی ئازای کورد پەروەر بوو، هەر لە سەرەتاوە لاوێکی هەڵکەوتووی ریزی تێکۆشانی کوردایەتی بوو لە شاری کەرکووک. پیاوێکی دڵسۆز بۆ

هاوڕێکانی و پاک لە ریزی تێکۆشاندا. لە جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی کوردستاندا رۆڵی خۆی هەبوو، سەرەتای شۆڕشی ئەیلول لە نزیک (بارزانی) فەرمانڕەی هێزەکە بوو، فەرماندەی هێزی رزگاری و هێزی خەبات بووە، پیاوێکی خۆش مەشرەف و زمان شیرین و میهرەبان بوو، لە کاتی تێکچونی وەزعی هێز و رێکخستنەکانی باڵی (مەکتەبی سیاسی) و لە سەردەمی رێککەوتنی ئاداری ١٩٧٠ پێشمەرگە و تێکۆشەرێکی نموونەیی بووە. لە شۆڕشی نوێی کوردستاندا رۆڵی کاریگەری نواندووە، ئەگەرچی ململانێ ناوخۆییەکانی زۆر پێناخۆش بوو، بەڵام بەداخەوە بووە قوربانییەکی گەورەی ئەو ململانێ دزێوە! من هەمیشە هاوڕێیەتی و خزمایەتیم لە گەڵی گەرم و برایانە بوو، زۆرم خۆش دەویست، شەوێکیان لە ساڵی ١٩٦٩ لەگەڵ شەهید (ئارام و فازیلی مەلا مەحمود)، چوبوینە سەردانی (مام جەلال)، لە بەکرەجۆ، ئەو شەوە لەسەر زۆر بابەتی جیاجیا قسەی خۆشمان کرد، (دکتور جەلال - کورشی لاشایی -) یش لەوێ بوو، دانیشتنەکەمان درێژەی کێشا، ئەو دەمە من لاوێکی چالاک بووم، پرسیاری زۆرم لە (مام جەلال) کرد، شەو دوای سەعات ١٢ ی شەو شەهید (عەلی عەسکەری) ماندوو بوو، رۆیشت بەتانییەکی دا بەکۆڵیدا و بەدەم قاقای پێکەنینەوە هەڵساو وتی.. بەخوا وابزانم پرسیاری ئەم شەش مانگە لە (مام جەلال) دەکەن و نایبڕنەوە و خەوەکەش لە من تێک دەدەن، جا تا خەوەکەم تیا نەچووە با من راکەم، وامزانی دەڕوات کەچی گەڕایەوە و وتی .. بەخوا نوکتەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە لەم پرسیارانە خۆشتر بێت : وتی.. رۆژگارە ناخۆشەکانی ناچاریی پاش هێرشی (بارزانی) بۆ سەر بارەگاکانمان و ئاوارەییمان لە ئێران، رۆژێک کاکم - مەبەستی خوا لێخۆش بوو عومەر دەبابە - بوو، تەلەفۆنی بۆ کردم، پێی وتم

.. (عەلی) بەبیرت دێت لەو شـــارە لـە دوکانێکی گـەورەی جوانی جل و بـەرگ بوویـن، تـۆش حـەزت لـە چاکەتێکـی رەشـی خـاڵ خـاڵ کـرد، پارەت نەبوو بیکڕیت، ئەوکاتـە مـن زانیم زۆر حـەزت لێ کردووە، لـەو کاتـەوە لـە دڵمـدا مـاوە و بیـری لـێ دەکەمـەوە تـا لـە دەرفەتێکـدا بـۆت بکڕم، ئـەوە هاتـووم لـە هەمـان شـوێن لێرەم، نەمهێشـت قسـەکانی تـەواو بکات، وتـم.. کاکـە گیـان، پێویسـت بـەو عەزیەتـە نـاکات، زۆر سوپاسـت دەکـەم، ئـەوە تەنهـا حەزێکـی ئەوکاتـە بـوو، ئەویـش وتـی.. پەلـە مەکـە (عەلی) دڵی خـۆت خـۆش مەکە، خـۆ ناڵێم هاتـووم بـۆت بکڕم، تەنهـا بـە رێکـەوت ئێسـتا هاتـووم لـە قاوەخانەکـەی تەنیشـتی دانیشـتووم قاوەیـەک دەخۆمـەوە، منیش تێر پێکەنیم! ئێسـتاش بیرم کەوتـەوە هاتـم بـۆ ئێوەشـی بگێڕمـەوە!

پـاش مـاوەی چەنـد رۆژێکـی تـر، کـە کارەکانمـان تـەواو کـرد لەگـەڵ هاوڕێکانمـا لـە ناوپردان و گەلاڵـە وە گەڕاینـەوە بـۆ ناوچەکانی خۆمـان لـە لای کەرکـووک، لـە رێگـە کـە گەیشـتینە نـاو گەلاڵییـەکان و گونـدی گەلاڵـی لای گـەورەدێ، زانیمـان هێـزی کەرکـووک شـکاوە و ناوچەکـەی چـۆڵ کـردووە و کـەس لـە بـەری قـەراخ و سـەنگاو نەمـاوە. شـەهید (سـیروان) بـە یـاوەری (فازیـل تاڵەبانـی)، بـە هێزیکـی کەمـەوە و بـە شـێوەیەکی نیمچـە نهێنـی هەنـدێ شـوێنی بـەری قـەراخ و کەرکووکیـان ئـاوەدان کردۆتـەوە، ئیتـر رێگەمـان گـۆڕی روو لـە شـــارباژێر ئەنجـا ناڵپاریـز و لەوێشـەوە چوینـە پێنجوێـن بـۆ لای (حەمـەی میـرزا سـەعید)/ کـە ئەندامـی (ناوەنـدی کۆمەڵـە) بـوو، ماڵەکەشـی ناوەندێکـی (کۆمەڵـە) و هێـزە چەپـەکان بـوو. کاکـە (حەمـە)، پیاوێکـی دەسـت و دڵ جـوان بـوو، خواردنـی بـاش و بـە تامـی دروسـت دەکـرد و هەمیشـە کەرەسـەی خواردنیشـی هەبـوو، خۆشـی کەمـێ نەوسـن بـوو، ئیتـر ماڵەکـەی هەمیشـە جمـەی دەهـات لـە نووسـەر

و شاعیر و سیاسی و پێشمەرگەی ناڕازی! کە گەیشتینەماڵەکەی کاکە (حەمە)، لەوێ (حسێن عارف)ی چیرۆکنووس و سیاسی و تێکۆشەری لێ بوو، ئەویش یەکێک بوو لە تێکۆشەرە ناسراوەکانی (قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراق)! بەختم هەبوو، چونکە پڕ بەدڵ حەزم دەکرد ئەو نووسەرە بەناوبانگە ببینم و لە نزیکەوە قسەی لەگەڵ بکەم و بیناسم و بە تاسە و شەوقەوە لە بیروڕا و چیرۆکەکانیم دەپرسییەوە، ئیتر چەند رۆژێ پێکەوە بووین و کاتێکی بە سوودمان بردە سەر، بەمەش زانیاریی باشم لە کاک (حسێن) لەسەر ئەدەب و چیرۆک وەرگرت و هەندێ زانیاریشمان لەسەر وەزعی شارەکانی عێراق و پاشماوەی چالاکییەکانی (قیادەی مەرکەزی)، پەیداکرد! یەکەم شەو هەندێ قسەمان لەسەر چیرۆکی (چای شیرین) کرد، کە یەکێک بوو لە چیرۆکە نایابەکانی خۆی! چونکە لەگەڵ (عەلی توانا) ی هونەرمەندا بیرەوەری خۆشم لەسەری هەبوو، ئیتر ئەو چیرۆکە رۆژانێکی بیر خستمەوە، رۆژانی بیرەوەریی (کۆمەڵەی بووژانەوەی سامانی کوردی)، کە لەگەڵ (عەلی توانا، دڵشاد مەریوانی، ئەکرەم قەراخی، عەبدول رەزاق پشدەری، عومەر صالح، دارۆی شێخ نوری و فایەق نەقشبەندی)، ئەو دەمە (عەلی توانا و من و هەندێ جاریش دڵشاد مەریوانی)، نووسەرە سەرەکییەکانی بووین، کە لە گۆڤاری (پرشنگ) دا، دەماننوسی! ئەو کۆمەڵەیە رێکخستنێکی ئەدەبی سیاسی بوو، رۆژانی دوو کەرتبوونی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، بەو رێکخراوە دەنگی ناڕازی بوونی خۆمان دەربڕی و داوای پاراستنی یەکێتیی ریزەکانی (پارتی) و شۆڕشمان دەکرد!
رۆژی ئاینده لەگەڵ کاکە (حەمە)، هەندێ باسی کاروباری (کۆمەڵە) مان کرد، پاشان لەگەڵ (ئەنوەر شاکەلی)ی شاعیر، قسە و باسێکی

زۆرمـان لەسـەر ئەدەبی شۆڕشـگێڕانە كـرد و شـیعرێكی تـازەی جوانـی خـۆی بـۆ خۆێندمـەوە، دانیشـتنەكەمان زۆر خـۆش بـوو، چونكـە (ئەنـوەر شـاكەلی - فەرهـاد -) بـە یەكێـك لـە شـانازییەكانی لاوانـی كەركووكمـان لە قەڵـەم دەدا، ئاخر ئـەو هـەر شـاعیر و ڕووناكبیر نەبوو ، لاوێكی ئازا و چـاو نەتـرس بـوو، ئەوكاتـە لەگـەڵ (لەتیـف هەڵمـەت و محەمـەد موكـری) بووبوونـە دەنگی نەبەزینی كەركووك، لـە ڕۆژگارەكانـی حوكمـی (شـكری حدیثـی) و هەڕەشـەكانی بـۆ سـەر كـوردا!

دوایـی سـەردانێكی كاك (قـادر جەبـاری)م كـرد، ئـەو دەمـە جێگـری لێپرسـراوی لقـی ٤ ی سـلێمانی (پارتـی) بـوو، منداڵەكانیشـی هێنـا بـوو، خێزانەكـەی (كەلسـوم) خـان، خوشـكی (هـاوڕێ سـەفوەت، دایكـی عەزیـز)، ژنێكـی بـاش و هاوكارمـان بـوو. كاك ( قـادر جەبـاری) هەرچەنـدە لێپرسـراوی پاراسـتنی پارتـی بـوو، بـەڵام لـە گەڵمـان زۆر میهرەبـان بـوو! (سـەفوەت) یەكێـك بـوو لـە هـاوڕێ باشـەكانمان لـە كەركـووك، تەنانـەت مـۆر و تایـپ و شـتومەكی (كۆمەڵـە) لـە ماڵـی ئـەوان، واتـە لـە ماڵی (قـادر جەباری) شـارابوەوە! (سـەفوەت)، وەزعـی هێـزی كەركـووك و ناوچەكـەی بـۆ گێڕامـەوە، گوایـا سـەركردایەتیی سەرزەنشـتی (صالـح پێـداوی)ان كـردووە. (قـادر جەبـاری) بـۆی بـاس كـردم، كـە خوالێخـۆش بـوو (ڕەسـول مامەنـد) كـراوە بـە لێپرسـراوی لقـی كەركـووك، زۆرم پـێ خۆش بوو، چونكە هـەم برایەتیمـان خـۆش بوو، هـەم تێكۆشـەریكی پاكـی كـورد پـەروەری ڕەوشـت بـەرز و ڕەفیـق دۆسـت بـوو! ئەوكاتـە (شـەفیق ئاغـا) لە پێنجوێن بوو، كە لـە ئیدارەی شۆڕشـدا بە پارێزگاری سـلێمانی دانـرا بـوو، خەڵكێكـی زۆری كەركووكیـش لـە خوێنـدكار و پێشـمەرگە و هاووڵاتـی و كەسـانی تـازە وەرگیـراو ڕژابوونـە ئـەوێ، ئیتـر پێنجوێـن زۆر قەرەباڵـغ و ناخـۆش بووبـوو! چەنـد ڕۆژێـك چومـە سـەردانی كاك

(عومەری سەید عەلی)، ئەوانیش زۆر بوون و جێگەو ڕێگەیەکی وایان نەبوو، بەڵام ئەو چەند ڕۆژە توانیمان زانیاریی زۆر بگۆڕینەوە و تاڕادەیەک لە بارو دۆخەکەیش بگەین! (کەمال عەلی) هاوڕێیەکی باشمان بوو، خەرجی ڕۆژانەمان لە دەستی ئەودا بوو، خوا هەڵناگرێ هێندەی تەماتاو دابووینێ ناوکە ڕیژی کرد بووین! ڕوژێک هەندێک باڵی مریشکی کردبووە خوارنەکەوە، کاک (عومەر) وتی: ئۆخەی (کەمال) گیان، دوو هەفتەیە گرتووتە بە تەماتەوە، بەڵکو ئەمە خوایە دوو سێ ڕۆژیش بیگری بە مریشکەوە !

بیرم دێ جاریکی تر سەردانێکی کاک (ڕەسول مامەند)م کرد، کە لە پشتی پێنجوێنەوە لە شوێنێک کە هەندێ کەپریان کردبوو، چوومە سەردانی! سەردانەکەم نزیکی نیوەڕۆ بوو، پاش قسە و باسێکی زۆر خولقی کردم بۆ نانی نیوەڕۆ، ئەگەرچی ماستەکەی نەبێ خواردنەکانیان لەوەی (کەمال عەلی) باشتر نەبوو، بەڵام تەنها ئەوە نەبێت، کە ئەم جارە کاک (ڕەسول) لە جاران چەپتر ڕووداوەکانی لێک دەدایەوە و پیشکەوتنخوازتر دەیڕوانیە سەرجەم هەلومەرجەکە! ئیتر منیش ئەو ماوەیە چەند جارێک سەردانم کرد، ڕاستییەکەی تەماعی ئەوە گرتبوومی بۆ (کۆمەڵە)ی ڕاکێشم! جارێکیان بە خوالێخوش بوو (جەوهەر نامیق)ی ناساندم، گوایا تازە هاتووە بۆ لقی کەرکووک و خۆشی گەرمیانییە! (جەوهەر نامیقی خوالیخوش بوو، تێکۆشەریکی گەورەی کوردایەتی بوو، خاوەنی ڕا و هەڵوێستی خۆی بوو، خەباتێکی دوورودرێژی کرد و لە زەمەنێکدا سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستانیشی گرتە دەست و لە م دواییدا بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد)!

## بەرەکانی شەڕ!

سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٤ بوو، کە هێرشی رژێم بەرە و (عەربەت، زەڕایەن، دەربەندیخان)، دەستی پێکرد. هەر لەو مانگەشدا بوو، کە پەلاماری قەرەداخیان دا، لەولاشەوە هێزێکی تر لە جەلەولاوە بەرە و پشتی کەلار و قۆرەتوو بۆ هێرش کردن کەوتبوونە رێ! هاوزەمان لە ١٩٧٤/٦/١٧دا، لیوای ٤ ی رژێم بە پیادە و بە هێزێکی زرێپوش و هەندێ هێزی ترەوە، پەلاماری شاخی ئەزمریان دا، کە فەرماندەکەیان زۆڵە کوردێک بوو بە ناوی (عەبدولرەحمان)! ئیتر تادەهات هێرشی رژێم بەرفراوانتر دەبوو، تا لە ١٩٧٤ /٧/٥دا لە کۆیە و هەیبەت سوڵتان و بێستانەوە بەرەو دامێنی چیای سەفین و پاشتر بە فەرماندەیی پلەدارێکی سەربازی بە ناوی (کریم حمدان) سوپای رژێم هێرشیان کرد بۆ دابینکردنی شاخی سەفین، ئیتر بەم جۆرە لە یەکەمین هەفتەی تەمموزدا بەرەو رانیە و سەنگەسەر و لەوێشەوە بۆ کێوە رەش هێرشیان کرد، بەڵام لە هەموو ئەو شەڕانەدا هێزی

پێشمەرگە زەرەرەر و زیانێکی زۆری بە دوژمن گەیاند!
خوالێخۆش بوو (شێخ حەمە مینی عەبابەیلیێ)، جێگری پارێزگای کەرکووک بوو، پیاوێکی باش بوو، بۆ پارێزگاریش کابرایەکی دهۆکیی دانرا بوو، بەڵام لەوە دەچوو دڵی بە کارەکەی خۆش نەبێت، بۆیە هەر نەهات، ئیتر (شێخ حەمەمین)، بە کردەوە وەک پارێزگار کاری دەکرد! داوای کرد وەک یاریدەدەر یارمەتی بدەم و هاوکاریی بکەم، بۆ ئەوەش بارەگاکەی بردە ( بیارە). لە راستیدا ئەو دامودەزگایەی ئۆتۆنۆمی بە تایبەت ئەوانەی پارێزگای کەرکووک، هەر بۆ رواڵەت بوو، ئەگینا کارێکی راستەقینەی ئەوتۆیان نەبوو، زۆرتر کارێکی سیاسی بوو، تا نیشانی بدەن ئەوە سەرکردایەتی (بارزانی)، خۆی ئۆتۆنۆمی لە کوردستاندا جێبەجێ دەکات و کەرکووکیشی فەرامۆش نەکردوە و ئەوەی حکومەت رەت دەکاتەوە!
(شێخ)ماڵی لە تەوێڵە بوو، زۆر تاقەتی دەوامی نەبوو، منیش هەموو کەرەسەی چاپ و شوێنەکەم بەکار دەهێنا بۆ (کۆمەڵە) و هاوڕێیانی (کۆمەڵە)! لەبەر ئەوە زۆرم پێخۆش بوو، کە بوارێکی لەو شێوەیە بۆ ئێمە هەڵکەوتووە و رەخساوە! ئەوکاتە هەندێ هاوڕێمان هەبوو وەک (شێخ ئەنوەر و شێخ عەلی)، لەوێ بوون، ئەوان خەریکی ریکخستن و کاری خۆیان بوون و کارەکانیان هی سنووری سلێمانی بوو. (سەفوەت و سامی و عبدالرزاق و عەبەی کاکە حەمە) و زۆری تریش کەوتبوونە ئەو سنوورەوە و زوو زوو شەهید (ئازاد هەورامی) ش دەهات بۆ لامان. هێڵێکی قوتابیان و لاوان لەو سنوورە بوون، شەهید (ئازاد ) سەرپەرشتیی دەکردن، ژمارەیەکی زۆریان هاوڕێی (کۆمەڵە) بوون.
(عەلی بچکۆل) و ژمارەیەکی باش لە تێکۆشەر و خوێندەوارەکانی (کۆمەڵە)، وەک کاک (حەمید) لە سنووری کەرکووک و لە عەسکەر

لـە حەسـاری کوێخـا جـەلال مابوونـەوە، کاری دەکـرد و پەیوەندییەکـی باش و ڕێکوپێکیـان بـە شـارەوە هەبـوو. لـەو ماوەیـەدا لەگـەڵ شـەهید (عبدالـرزاق)دا، سـەردانێکمان کـردن لـە حەسـار و هەنـدێ کاروبـاری ڕێکخسـتنی کەرکووکمـان لەگەڵیـان مشـتوماڵ کـردەوە! (عەلـی بچکـۆل) تێکۆشـەرێکی هەلکەوتـوو بـوو، لـە بنەماڵەیەکـی زەحمەتکێش بـوو، لـە شۆڕشـی ئەیلولـدا و هـەر لـە سـەرەتای هەرزەکارییـەوە بووبـوو بـە پێشمەرگە و ڕۆڵێکی گرنگی لەنـاو (کۆمەڵـە)دا، بـە تایبەتـی لـە سـنووری ڕێکخسـتنەکانی کەرکووکـدا گێـڕا!

کاک( شـەهاب) یش، بوونی لـە نـاو شـارەکاندا سـوودی نەمـا بـوو، چونکە لەبـەر چاودێری و نیـوە ئاشـکرا بوونـی، وەک جارانـی بـۆ نەدەکرا! بۆیـە شـەهید (جەعفـەر) و برایانـی سـەرکردایەتیی ناوخـۆی شـارەکانیش هاتنـە دەرەوەی ئەویـان زۆر پـێ بـاش بـوو. ئیتر مەترسـیی گرتنی پەیدا بوبـوو. بـۆ ئـەوەش بڕیـاردرا، کـە کاک (شـەهاب) بێتـە دەرەوە بـۆ نـاو هێـزی پێشـمەرگە. بەهاتنـی کاک (شـەهاب)، پـاش دەربـاز بوونـی لـە مەترسـیی ناحـەزەکان، ئیتـر ناوەندێکـی بـەکاری (کۆمەڵـە) پەیـدا بـوو، بەمـەش پەیوەندییەکانمـان ڕێـک و پێـک و بـەردەوام بـوو. کاک (شـەهاب) لـە نـاو پـردان جێگیـر بـوو، کاریشـی لای (خەسـرەو تۆفیـق)، بـرای (دارا تۆفیـق)، لە وەزارەتـی دارایی شـۆڕش بۆ دیاریکرا، نزیکیش بـوو لە کاک (ئـارام) و لـە (دارۆ) و لـە ژمارەیەکـی زۆر لـە لاوە خوێنـدەوارە باشـەکانمان!

پـاش یـەک دوو هەفتـە لەگـەڵ شـەهید (عەبدولـرەزاق) چووینـە سـەرەوە بـۆ ناوپـردان و سـەردانی کاک (شـەهاب)مان کـرد، دوای گفتـو گۆیەکـی هەمەلایەنـە، لـە نزیکـەوە لـە بیـرو ڕاو بۆچوونەکانـی گەیشـتین! ئـەو ڕۆژانـە بەرەکانـی شـەڕ تـا دەهـات زیاتـر تینـی دەسـەند و پێشـمەرگەش زیاتـر بەرگـری دەکـرد، لـەوە نەدەچـوو بەبـێ یارمەتییەکـی جیـدی تـری

ئێران، هێزی پێشمەرگە تاسەر بتوانێت شەڕی جەبهە و بەرگری بکات، بۆیە هەموو چاوەڕوانی هەنگاوێکی بەکار تری ئێران بووین!
کاک (شەهاب) بە کارێکی رەسمی وەزارەتی دارایی شۆڕش لە مانگی ئابی ١٩٧٤ دا، هات بۆ مەریوان و پاشان بۆ پێنجوێن. بەڵام بەر لە هاتنی ئاگادار کرابووین، چونکە شێخ (دارۆ)، لەباتی کاک (شەهاب)، نامەیەکی درێژی بۆ نووسیبووم و باسی هاتنی کاک (شەهاب) و زۆر مەسەلەی تری تیا کردبوو! بۆی نوسیبووم کە گوایا کاک (وەسمان - شەهاب) ی دیوە نیازی هەیە لە نیوەی دووەمی مانگی ئابدا سەردانێکی پێنجوین بکات، بەڵکو بتوانێ بنێرێت بە شوێن دایکیدا چاوی پێی بکەوێت، ئەو قسانەشی تەنها بۆ شوێنە ونی نوسیبوو، تەنها مەبەستی ئەوە بوو ئاگادارمان بکات، کە کاک (شەهاب) دێتە پێنجوێن!
لە سەرەتاکانی مانگی ئابدا من و (ئاوات و کاکە حەمە)، لە پێنجوێن ئامادە بووین، کاک (شەهاب) هات لە ماڵی کاکە (حەمە) و جارێکیش لە ماڵی شەهید (جەماڵە رەش)، لە سەید صادق کۆبونەوەمان کرد، بە تێر و تەسەلی باس لە سەرکردایەتی رێکخستنی شارەکان و نامەی (مام جەلال)، بۆ شەهید (جەعفەر) و نامەی سەرکردایەتیی شارەکان و رێکخستنی هاوڕێیانی شاخ لە سنووری گەرمیان و سلێمانی و کەرکووک کرا، ئەویش باسی لە رێکخستنەکانی هەولێر کرد! هەڵسەنگاندنی رەوتی بەرگری هێزی پێشمەرگە و نەبەردەکانی قۆڵی سەرەوە و شوێنەکانی تر کران، توانای (پارتی) و باری نێودەوڵەتییمان خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە، لەپاشدا شتێکمان داڕشت بۆ هاوڕێیان، کە لە شێوەی ئامۆژگاری و رێنماییدا بوو زیاتر وەک نیوە بەیانێکی ورە بەخش بوو! ئێمەش نامەیەکی دورو درێژمان بۆ (مام جەلال) نوسیەوە.
هەلومەرجی ناو شۆڕش و (پارتی) و رەوتی رووداو و نەبەردیەکانی

هێزی پێشمەرگەمان بۆ نووسی و لە کاروباری (کۆمەڵە) ش، ئاگادارمان کردەوە! دوای نزیکەی ١٠ رۆژ مانەوە لە سنووری پێنجوێن، بە هەمان ئەو رێگەیەی، کە هاتبوو، کاک (شەهاب) گەڕایەوە بۆ ناوپردان.

لە پەلاماردانەکانی رژێمدا لە ١٩٧٤/٨/٨ دا، بۆ دەشتی هەولێر و شەڕە سەختەکانی دەشتی هەولێر و دەوری (فارس باوە) لەو شەڕانەدا، کە رۆڵی دیاری تیا هەبوو رژێمی تەنگەتاو کرد بوو، ببووە باسێکی گەرمی ناو شۆڕش! ئیتر پاش ئەوە رژێمی عێراق لە چەند قۆڵێکەوە نەخشەی هێرشەکانی فراوانتر و گەرمتر کرد، بەمەش رووی لە گرتنی شوێنە ستراتیجی و گرنگەکان کرد، تا لە دواییدا بتوانێ هێرش بۆ سەر سەرکردایەتی شۆڕش بکات!

لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا، لیوای ١٢ زرێپۆش بە دەریاچەی دوکاندا بەرە و قەڵادزە دەستیان کرد بە هێرش و یەک لیوای پیادەی تریش و هەندێ یەکەی تۆپخانە و تانکیش لە چەند قۆڵێکی ترەوە شەڕی گەرمیان بۆ سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە دەست پێ کرد. لەو شەڕانەدا دوو فڕۆکەی جۆری (هۆکەر هەنتەر)، کەوتنە خوارەوە، ئەوە یەکەمین جار بووە تۆپخانەی ئێرانی بەو چڕو پڕییە تۆپبارانی سوپای عێراق بکات. بارەگای فیرقەی چواری بە چاکی کوتا و زیانێکی گەورەی پێ گەیاندن، لە گەرمەی ئەو شەڕانەدا لە ١٩٧٤/٩/٣دا، لە شەڕی تووە سووراندا، فەرماندەی قارەمان (عیزەدینی قەرە محەمەد) شەهید بوو!

لە ١٩٧٤/٩/٣دا، لە هێرشێکی دلێرانەی هێزی پێشمەرگە، بۆ سەر هێزەکانی لیوای سێی (حامید دلێمی)، کە بە لیواکەی و کەتیبەیەکی تانکەوە دەیویست گەرووی هۆمەرئاغا بگرێت، کەچی هێندە لە هێزەکانی کوژرا، کە بەهیچ جۆرێ توانای هێرش کردنی پێ نەما!

ئیتر دوای ئەو شەڕانە، شەڕی گەرم لە هەموو شوێنەکانی هەندرێن و زۆزک و سەرتیز و حەسەن بەگ و کۆرەک، تینی سەند. تا لە دوا هەفتەی تشرینی یەکەمدا دوژمن توانی زۆزک و سەرتیز بگرێت، بێ ئەوەی بتوانێت زەفەر بە هەندرێن بەرێت! لەو ماوەیەدا هەموو هێزەکانی (خەبات، کەرکووک، کاوە، ئەزمەڕ، سەفین، باڵەک و زاخۆ، لە شەڕ و بەرگریەکی سەختدا بوون!

لە کۆتایی ئابدا هێرشێکی فراوانی پێشمەرگە بۆ سەر لیوای ١٢ و هێزەکانی دوژمن، هەموو ناوچەکەی گرتەوە و زیانێکی گەورەیان بە دوژمن گەیاند. لە ٢٧ و ٩/٢٨ /١٩٧٤دا، دوژمن سەرەتا هێرشێکی فراوانی کردە سەر ناوچە شاخاوییەکانی بێتواتە و ئامانجی هێرشەکەشی، هێرش بوو بۆ سەر شاخی هەندرێن، ئەو شەڕانە نزیکەی ١٧ ڕۆژیان خایاند!

پاش هێرشەکانی سوپای عێراق بوسەر کێوە ڕەش و دۆڵی پڵنگان، (ئیسماعیل تایە النعیمی)، لە سێهەمین هەفتەی ئەیلولدا، هێرشێکی فراوانی کردە سەر پشتی دیانا بۆ هەندرێن و زۆزک، بەڵام تێکشانێکی خراپ تێکشکا! لەو ڕۆژانەشدا فڕۆکەیەکی جۆری (میک)، لە بناری کۆڕەک لە بەرزیەوە خرایە خوارەوە و ڕۆژی دواییش لە ١٩٧٤/٩/٢٤دا، لە هەمان ناوچە، فڕۆکەیەکی (سۆخۆ)ی تر خرایە خوارەوە، بەڵام لە ئەنجامدا سوپای دوژمن توانی دۆڵی ڕەواندز داگیر بکات! ئیتر تا دەهات شەڕەکانی هەندرێن و زۆزک و گەرووی هۆمەرئاغا، سەختترو قورستر دەبوون!

شەهید (جەعفەر)، کە زۆر ئازا و چالاکانە لە ناو شارەکاندا کاری دەکرد، بەردەوام لە وەزعی خۆیان و بیرو بۆچوونەکانی (مام جەلال)، ئاگاداری دەکردین! منیش لە نامەیەکدا کە مانگی تشرین بۆم نووسی،

نووسـیبووم، کـە دراوسـێکانمان دوو کەتیبـە تۆپخانـە و دژە ئاسـمانییان هێنـاوە، ڕەنگـە تـەرازوی هێـزەکان بگۆڕێـت! ئـەو کاتـە سـەرکردایەتی ڕێکخسـتنی شـارەکان بـە شـەهید (جەعفـەر)، وەک لێپرسـراو و (ئەنـوەر زۆراب و ئاسـۆی شـێخ نـوری)، سـپێردرا بـوو، هەمووشـیان پیـاوی بـە هیمـەت و بـە توانـا بـوون و دەیانزانـی چـۆن پەیوەندیمـان لەگـەڵ ڕێـک دەخـەن و زانیارییـە گرنگەکانمـان بـۆ دەنێـرن. هـەر کاتێکیـش هـەواڵ و نامـەی (مـام جـەلال) یشـیان بـۆ بهاتایە، بـە درێژی ئاگاداریـان دەکردین! شـەهید (ئەنـوەر زۆراب)، سـەردانی (مـام جـەلال)ی کردبـوو لـە شـام و بێـروت و شـەهید (جەعفـەر) یـش لـە بەرنامەیـدا بـوو سـەردانی بـکات، ئاگاداررمـان کـردن، کـە دەبێـت لـەو سـەردانانەدا وردەکاری بکـەن و ئاگاداربـن، تـا دەزگاکانی ڕژێم شـوێن پێیـان هەڵنەگرێ، ئەوانیش دڵنیایـان کردیـن، کـە بەوپـەڕی هوشـیارییەوە ئـاگاداری خۆیـان دەبـن!

بـەرە بـەرە تـا دەهـات شـەڕەکان سـەخت تـر دەبوون، پەلامـاری هێزەکانی ڕژێـم بـەرە و خەتـی گەلاڵـە سـەختتر دەبـوو، ڕژێمـی بەغـدا فڕۆکـەی جەنگـی و تۆپخانـەی زۆرتـر و هێـزی زیاتـری ئاراسـتەی سـەر تیـز و حەسـەن بـەگ دەکـرد! دەنگوباسـیان بـۆ هێنایـن، کـە برینـدار و شـەهید بوون ڕوو لـە زیـاد بوونـە، بەرگریـش قایمتـرو بـە توانـا تـر خـۆی نیشـان دەدا، برینـدار بـوون و پێکانـی فەرمانـدەکان ڕوویـان لـە زیـاد بـوون کـرد بوو، کە ئـەوەش مانـای تایبەتـی خـۆی هەبـوو، ئـەوەی دەگەیاند کە بـەرز کردنـەوەی ورەی هێـزی پێشـمەرگە، پێویسـتی بـە بەشـداری زۆرتـری فەرمانـدەکان هەیـە!

سـەرەتای مانگـی تشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩٧٤ شـەڕێکی تـری سـەختی بەرگـری، شـاخی سـەرتیژی وەک ناوچەیەکـی حـەرام لێکـرد، کـە هیـچ لایـەک نەتوانـن تیـا جێگیـر بـن! دوای ئـەوە لـە قوڵـی قەلادزەشـەوە هێـرش

بۆ گرتنی هەڵشۆ و هێرۆ تاوی سەند و تادەهات گەرمتر دەبوو! هەر لەدوا هەفتەی ئەو مانگەدا لیوای ٨ ی میکانیکی و چەند فەوجێکی تر هێرشێکی گەرمیان کرد بۆ سەر شەهیدان و گەلاڵە و چۆمان.

لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمدا سەردانی کاک (شەهاب و شاسوار جەلال - ئارام - و دارۆ) و زۆربەی هاورێیانم کرد. سەردانی (کاک عەلی عەسکەری)م کرد، سەرقالی بەرەی شەڕ بوو. (کاک عەلی و کاک شەهاب)، لە وەزعی جەبهەکان و هێرشەکانی هێزەکانی عێراق، لە قۆڵەکانی سلێمانی و هەولێر، ئاگاداریان کردین و لە هەواڵی شەڕەکانی حەسەن بەگ و سەرتیز خۆشحاڵ نەبوون، چونکە شەهید و برینداریکی زۆر هەبوو، سەرکردایەتیی (پارتی)ش، هەندێ پەشۆکانی پێوە دیار بوو! نامەی (مام جەلال)یش بۆ ئێمە، کە بەهۆی سەردانی شەهید (ئەنوەر زۆراب) هوە هاتبوو، بۆنی ئەوەی لێ دەهات، کە گەرم کردنی تەوژمی هێرشەکانی رژێم شتێکی لە پشتەوەیە، بە تایبەتی لە کۆتایی یەکەمین مانگی ساڵی ١٩٧٥ دا، چرپەی هەندێ دەنگوباسی راڕەوە تەنگەبەرەکانی سەردان و کۆبونەوەی سەرانی دەوڵەتان و کەناڵەکانی دیپلۆماتەکان، وا تەفسیری گەرم بوونی هێرشەکانی رژێمیان دەکرد، بەپێی ئەوەی بەر گوێی شەهیدان (جەعفەر و ئەنوەر زۆراب) کەوتبوو، گوایا رژێم سەرەڕای ئەو هەموو زیانە زۆرەی گیانی و داراییەی لەو شەڕانەدا لێی کەوتووە، دەیەوێت (شا)ی ئێران لە (بارزانی)، نا ئومێد بکات و بەمەش زەمینەی کارێکی سیاسی بهێنێتە ئاراوە! لەکاتێکدا تا ئەو کاتە زیانی گیانیی هێزەکانی عێراق لە کوژرانی ٩٠٠٠ سەرباز تێپەڕی کرد بوو، خەرجی شەڕەکەش بە سەدان ملێون دۆلار دەخەملێنرا!

## ڕێککەوتنی جەزائیر!

لە نامەیەکی شەهید (جەعفەر)دا، بۆ من، باسی سەردانی (بۆمدین)، سەرۆکی جەزایری کرد بوو بۆ بەغدا! (جەعفەر) بەهۆی تێکەڵی و ئاسیاوی کەسوکاری هەردووکمان و ئاسانیی هاتوچۆی بۆ سلێمانی و بۆ لای ئێمە، زۆربەی نامەکانی بۆ من دەنارد! لەو نامەیەدا و لە باسی مەترسی ناوبژیی نێوان ئێران و عێراق، لە ناواخنی نامەکەیدا دڵە راوکێی خزاندبووە ناو دارشتنی رستەکانیەوە، گوایە دەبێت ئەوە یەکێک بووبێ لە مەرامی سەردانەکەی (بۆمیدین)!

تا دەهات بەرەکانی شەڕ گەرمتر دەبوون، بۆردومان قایمتر و زیانی زۆرتری لێدەکەوتەوە! ئێمەش ژمارەی شەهید و بریندارى ناسیاومان زۆرتر دەبوون، لەولاشەوە نامەیەکی ڕێکخستنی شارەکان، کە پشتی بە هەندێ زانیاریی دۆستێکی (ئەنوەر زۆراب) و ( عەبدول ستار تایەر شەریف) بەستبوو، زیانەکانی سوپای عێراق ئەوەندە قەبە و گەورە بوو، کە شاردنەوەی لە توانادا نەبوو، گوایە کار گەیشتۆتە ئەوەی، کە

هەموو هەست بە مەترسییەکانی ئێران و هاوکارییەکانی بۆ (بارزانی)، نەشارنەوە! ئیتر لەگەڵ گەرم بوونی بەرەکانی شەڕدا و لەگەڵ زۆر بوونی زیانە گیانی و داراییەکانی دوژمندا، جموجۆڵێکی ئەوتۆ دەستی پێکرد، کە لە ئەنجامدا بە زیانی کورد و جووڵانەوەکەی تەواو بوو!

لە و رۆژانەی سەردانەکاندا، ئاژانسەکان لە زمانی رۆژنامەی ( لۆمۆند) ی فەرەنسییەوە، باسی ئەوەیان دەکرد، کە سەرۆکی جەزایر لە هەوڵی تەقەلایەکدایە بۆ ناوبژی کردن لە نێوان ئێران و عێراقدا ! لە یەکەمین هەفتەی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤ دا، (صدام)، کە پێشتر بەغدای بەجێ نەدەهێشت، سەردانی (شا حسێن) ی کرد لە عەممانی ئوردن، لەوێ باسی رێککەوتنی لەگەڵ ئێرانی بۆ (شا حسێن) کرد بوو. هەر لەو مانگەدا سەردانی قاهیرەیشی کرد و لەگەڵ (انور سادات) ی سەرکۆماری میسردا، هەمان بابەتی تاووتوێ کرد بوو!

لە ٢٥ ی ئەو مانگەدا گەڕامەوە بەرە و پێنجوێن و پاشان چووم بۆ بیارە! خەم و ترسەکانی خۆم لەگەڵ هاورێکانم تاووتوێ کرد، سەرەتا کەس باوەڕی نە دەکرد هیچ هێزێک بتوانێ (صدام و شای ئێران) رێک بخات، بەڵام هێندەی نەبرد دەرکەوت، کە لە سیاسەتدا موستەحیلات نییە! ئیتر ئەوەندەی نەبرد، وابزانم لە مانگی شوباتی ١٩٧٥ دا، بوو (مام جەلال)، نامەیەکی لە رێگەی شەهید (جەعفەر) ەوە نارد بوو دەڵێت: تەقەلایەکی بەهێز لە ئارادایە بو رێکخستنی (صدام و شای ئێران)، بێ گومان ئەو رێککەوتنەش لەسەر حسابی کورد تەواو دەبێت، بۆیە دەبێت وریا بن و خۆتان ئامادە بکەن! دوا بەدوای ئەوە نامەیەکی تری (مام جەلال) هات، کە دەڵێت: وا باشە خۆتان ئامادە بکەن و هەر لە ئێستاوە هەوڵ بدەن بەرگری بکرێت و خۆتانی بۆ ساز بدەن، بیرمە جوابێکی تری بۆ ناردین، کە گوایە لە روسەکان (پریماکوڤ)ی دیوە،

پێی گوتووه جواب بۆ (بارزانی)، بنێره یەک مانگ بەرگری بکەن و خۆ رابگرن، ئێمە یارمەتیتان دەدەین و ئێران چەندە یارمەتی داون، ئێمە زیاتر یارمەتیتان دەدەین! هەروەها (مام جەلال)، باسی ئەوەیشی کرد بوو، کە نامەیەکیشی بەو مانایە رەوانەی لای (بارزانی)، کردووه! دوایی دەرکەوت ئەو نامەیە بە (هێرۆ) خاندا بۆ باوکی و لەوێشەوە بۆ (بارزانی) رۆیشتوه!

ئیتر لە بەردەمی ئەو رووداوانەدا، ئێمەش تەلبەنی ترسمان بەزاند و لەگەڵ کاک (شەهاب و ئاوات)دا، زوو زوو نامەمان دەگۆڕیەوە و سۆراخی دەنگوباس و رەوتی رووداوەکانمان دەکرد. تا وای لێهات هەواڵەکان لە نهێنی دەرچوون و بەکەس نە دەشاردرانەوە. دواتریش زانیمان، کە لە رۆژی ١٩٧٥/٣/٦ دا، لە کۆبونەوەی دەوڵەتانی بەرهەمهێنی نەوت (ئۆپێک)، سێ قۆڵی (شای ئێران و بۆمدین و صدام) واژۆی ئەو رێکەوتنەیان کردووه! مایەوە ئەوە سۆراخی بەرنامە و بڕیاری (بارزانی) و سەرکردایەتی (پارتی) بکەین! ئەو هاوڕێیانەی، کە لەوکاتەدا زیاتر لەیەک نزیک بووین (ئاوات، حەمەی میرزا سەعید، عبد الرزاق، ئازاد هەورامی و ناڕاستەوخۆش رای مەلا بەختیار) و هاوڕێکانیمان پێ گەیشت، کە بڕیار بدەین بەرگری بکەین و خۆ بۆ بەرگری کردن ئامادە بکەین. ئیتر دەست کرا بە چالاکی و پەیوەندی کردن بەو ئاراستەیە! بۆ ئەوەش بە پەلە نامەمان بۆ شەهید (جەعفەر) و سەرکردایەتیی شارەکان نووسی و دوای ئەوە چوم بۆلای کاک (شەهاب و کاک ئارام و دارۆ)، تا لە نزیک سەرکردایەتیی شۆڕشەوە بزانین بەرنامەی نهێنییان چی دەبێت و ئێمەش دەتوانین چی بکەین!

لە عەسری رۆژی ٦ مارتی ١٩٧٥ دا، لەگەڵ (عبد الرزاق)، گەیشتینە ناوپردان بۆ لای کاک (شەهاب) و برایانی تر. هەر ئەو رۆژە تەمومژی

دەنگوباسـە خەماوییەکانی ڕێککەوتنی ئێران و عێراق لەسەر جەستەی جووڵانـەوەی چەکداری کـورد، بـە ماچکردنـی ( شـای ئێـران) لەلایـەن (صدام حسێن) ەوە، بووە پانۆرامایەکی دیار و بینراوی دزێو و بەمـەش مانگـی هەنگوینـی نێـوان (شـا و صـدام)، دەسـتی پێکـرد و مەینەتییەکـی گـەورەش ڕووبـەڕووی گەلەکەمـان بوویـەوە!

تەلەفزیۆنەکانـی ئێـران ئـەو دیمەنانـەی ڕێککەوتنـی عێـراق و ئێرانـی نیشـان دابـوو، هەواڵەکانیش وەک بروسـکە دەگەیشـتنە یـەک بـە یەکی ئـەو خەڵکەی، کە لـە دەمێ سـاڵەوە بە ڕێبـەری (پارتـی و بارزانـی) گیانبازییان دەکـرد و بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجـی سـەربەسـتی و ڕزگاری، هەزارانیـان خۆیـان کـرد بـووە قوربانـی و هـەزاران دایکـی سـک سـووتاویش بـە دەم ڕشـتنی فرمێسـکەوە، ئاوی چاویـان داهات و هەزارەها کوڕ و کچی سـاواش هەتیـو و بێکـەس کەوتـن! بـە سـەدان کەسـیش دەسـت و لاقیـان پـەڕی و هیوایـان بـەوە نەمـا، کـە بـە سـەرکەوتنی (پارتـی و بارزانـی)، تۆڵەیـان بـۆ دەکرێتـەوە! هەزارەهـا لاوی خوێندکاری کوردیـش، خوێندنیـان لـە دەسـتدا و هیوایەکیـان نەمـا، کـە دەزگایەکـی خوێندنـی کوردسـتان تەگبیـر لـە حـاڵ و ئایندەیـان بـکات و کێشـەکانیان بـۆ چارەسـەر بـکات! ئـازاری شکسـت، خـۆ ڕاگرتریـن و بەهێزترین تێکۆشـەری کـردە گریـان و تەنانـەت خـودی (بارزانـی)ش لـەو فرمێسـکە بێ بـەری نەبوو! جنێوی زبـر و پڕ لـە داخیش وەک بارانـی پەڵـە دەبارین. کاک (شـەهاب) و هەمووم‌ـان لەگـەڵ سـەرجەم کوسـت کەوتووەکانـی گەلەکەمانـدا، تێـر تێـر گریایـن! لـە و دەڤـەرە کـە ئیمـەی لـێ بوویـن، تەنهـا مەسـئوولەکان و گـەورە لێپرسـراوەکان ڕەنگیـان پەڕیبـوو، کەسـیان وەک جـاران دەرنەدەکەوتـن!

چـاوم بـە (ئـازادی مسـتەفا خۆشـناو) کـەوت، کـە لـە هەندەرانـەوە هاتبـوو - (ئـازاد) هاوڕێیەکـی نزیکـم بـوو لـە زۆر قۆناخـی جیاجیـای ژیانمـدا و

لە تێکۆشاندا پێکەوە بووین - ئەویش هەندێ دەنگوباسی گرنگی بۆ باسکردم و تازە (مام جەلال)ی دیبوو، باش بیرم نەماوە هاتنەکەی بۆچی بوو!

هەندێ دۆست و ئاشنامان هەبوو.، کە لەخوار سەرکردایەتییەوە بوون بە ترسەوە لە پرسیار و سۆراخی راستییەکاندا بوون، کە ئاخۆ سەرکردایەتی تەسلیم دەبێت، یا شەڕ دەکات! سەرەتای قسەکانیان ئەوە بوو، کە تەنها دوو رێگە لە بەردەمی هێزی رزگاریی کوردستان و لە بەردەمی پێشمەرگە و خەڵکدا هەیە، ئەویش ئەوەیە یا روو بکەنە ئێران و ئاوارە بوون، یاخود تەسلیم بوونەوە بە دەسەڵاتی بەعسیان لە عێراق! کەس راستیی هەڵوێستەکانی بۆ باس نەکرد بوون و خۆشیان چاوەڕوانی دەستێک بوون لە ئاسمانەوە بێت و نەجاتیان بدات. ئیتر بۆ هەر کوێیەک دەچوویت، ئەو خەڵکە دەتووت خۆڵ و دۆی کراوە بە سەردا، ناهەقیشیان نەبوو.. ئاخر شۆڕشێکی گەورە و گران چۆن بەو ئاسانییە هەرەسی هێنا!

لەگەڵ کاک (شەهاب) قسەمان کرد، کە وا باشە هەموو بجوڵێین و بزانین دوا هەڵوێست چییە؟ کاک (شەهاب)، بەدەم هەناسەیەکی ساردەوە نەفەسێکی قووڵی لە دوا قومی جگەرەکەی دەستی دا، تارماییەکی زەرد لەبەر چاومان وەک پەنجەی جگەرە کێشانی کاک (شەهاب)، هەموو دیمەنەکانی زەرد هەڵگێڕا بوو! وتی، (بارزانی) زوو بانگ کرا بۆ تاران، هەموو شتێکی پێ وتراوە و رێککەوتن مانای خۆی هەیە، (صدام) بۆ ئەوە لەگەڵ (شا) رێک نەکەوتووە، تا خەمی کوردی بێت و کێشەکانی چارەسەر بکات، هەرگیز! خۆ ئەگەر کوردی لا مەبەست بوایە لە جیاتی (شا)، لەگەڵ کورد رێک دەکەوت! (صدام)، ویستی کورد تەمێ بکات و شۆڕشی کورد لە ناو ببات! دیارە ئێرانیش دەسکەوتی زۆری

دەست کەوتوە و خەوی دێرینی هاتوتە دی، ئەمەش مانایوایە ئەو دەسکەوتانەی لە (مەلا مستەفا) و لە هەموو کورد پێ گرنگترە! بۆیە یارمەتی (بارزانی)دا، تا مل بە (صدام) کەچ بکات و ئەم دەسکەوتانەی لێوەربگرێ، تەواو!

بەسەر سوڕمانەوە وتم چی تەواو!

لەوەلامدا وتی.. (بارزانی) و بازییەکە تەواو! بە تەما مەبن (شا) هێندە ساویلکە بێت یاری بەم دەسکەوتانە بکات، بە هیچ شێوەیەک جارێکی تر بوار نادات کەس یەک تەقە لە عێراق بکات، هەر لە دوێنێ عەسرەوە ئێران دەستی کردووە بە کێشانەوەی  تۆپە تەیارە شکێنەکانی! ئەوە شکستە و گەورەترین شکستیشە! کاک (شەهاب)، بەو ئێوارەیە چووە دەرەوە و جگە لە (دارۆ) کەسی تری لەگەڵ خۆی نەبرد، بەو نیازەش چوو، بەڵکو لە حاجی هۆمەران یەکێک لە کوڕەکانی (بارزانی)  ببینێت! شەو درەنگ هاتەوە شتی تازەی پێ نەبوو، هەر ئەوانە بوو، کە پێشتر دەمانزانی، بەلام وتی دیارە تەواو بووە و زۆریان لە نەغەدەن! ئیتر ئێمەش قسە و باسی خۆمان لەسەر راسپاردەکانی (مام جەلال)، دەست پێکرد، با خۆمان بۆ بەرگری ئامادە بکەین! کاک (شەهاب)، درێژەی دایە و وتی: دەبێت پەیوەندی جدی تر بکەین، (عەلی عەسکەری) ببینین، ئەو پیاوە دەمێکە دەڵێت بەرگری بکەین، کەسانێکی زۆری تریش دەناسم، کە هەروا قسە دەکەن!

- کاری وا، تەگبیری هەمە لایەنەی دەوێ، کاک ئارام وتی.

- چی بکەین، چۆن دەست پێ بکەین، بە کێ دەست پێ بکەین و کەی!
منیش درێژەم بە قسەکانم دا و وتم : ئایا هیچ پشتیوانییەک لە ئاسۆدا دەبینن!

کاک (شەهاب) وتی.. داوامان کردووە هەموو چەک کۆ بکەنەوە،

کەلوپەلی تایپ و چاپکردنیش کۆبکەنەوە، خۆمان پشتیوانی خۆمانین!
(دارۆ) : دەست پێکراوە .
(ئارام ): ئەگەر هیچ نەبێ، ئەمانە گلۆپێکی سەوز نیشانی فەرماندەکانی پێشمەرگە بدەن. دەتوانین کاری باش بکەین!
کاک (شەهاب)، یەک لە دوای یەک جگەرەی دەکێشا، ئۆقرەی نەبوو لە هیچ جێگەیەک ستاری نەدەگرت، دادەنیشت و هەڵدەسایەوە، دەهات و دەڕۆیشت! لەپڕ وتی : لیقەومانێکی گەورەیە، لەکەیەوە ئێمە هاوار دەکەین، بابە (شا)ی ئێران جێگەی متمانە نییە! ئاخر شۆڕش چۆن وا دەکرێ ٢٠٠- ٣٠٠ هەزار مرۆڤی کوردیان خزاندۆتە ناو شۆڕش، ئاخر ئەوە شۆڕشە یان ئیستیعراز! لەبەرخۆیەوە دەیگوت.. ئێ وایە، ئەم نمایشە گەورەیە بە ئێمە و پشت بە گەلەکەمان ناکرێ . خەرجی و مەسروفاتی نمایشی وا، هەر بە (شا) ی ئێران دەکرێت و بەو دابین دەکرێت!
ئارام و من : ئەنجا ئێستەش گوێ لە کەس دەگرن!
نەخێر بە (دارا تۆفیق و حەبیبم) دەوت.. گەلێکی هەژاری وەک ئێمە، وا گەمارۆ دراو دەبێت رێوشوێنی جەنگی گەل و شەڕی پارتیزانی بگرێتە بەر، کەچی گاڵتەیان پێ دەکردین و دەیانگوت: تۆ(ماوی) ت، دەمگوت : برا تۆ لەم شاخانە چۆن حکومەت و حوکمڕانی دادەمەزرێنی، کە هێشتا وڵاتەکەت ئازاد نەکردوە، هیچ سوودی نەبوو!
هەستم کرد هەمووماں بە مێشک و دەروون تەواو ماندوو بووین، (دارۆ) ریکۆردێکی هەبوو خستیە سەر گۆرانییەکی فارسی، کە فەرهاد ناوێ دەیگوت بەناوی (جومعە)! خۆش بوو لەگەڵ دۆخەکەشدا دەگونجا، گۆرانییەکە دەیگوت (لە رۆژی هەینیدا خوێن چکە دەکا)، ئەو شەوە نەمانتوانی بنووین و خەومان لێ نەکەوت، کاک (ئارام)، (لیدا) ی

خێزانی لەگەڵدا بوو، کە ئەویش وەک ئێمە پەرێشان بوو! ڕۆژی ئایندە هەموو خەریکی دۆزینەوەی دۆست و ئاشنا باشەکانی خۆمان بووین و لە سۆراخی دوا هەواڵەکاندا بووین، تا زانیاریی ڕاست کۆبکەینەوە! هەرچیمان دەبینی خوێن لە دڵ و چاوی دەتکا، سەیر ئەوە بوو هەرچی خەڵکی هوشیارمان دەدی و دەماندواند، دەیگوت:

هەمیشە ترسی ڕۆژێکی وام هەبووە، کە ئێران و ئەمریکا بمانفرۆشن، بەڵام بەم جۆرە ... نا، نەخێر!

## هەرەس و بەرگری!

ئێوارە کە گەراینەوە و یەکمانگرتەوە، کاک (شەهاب) وتی: ئەمڕۆ مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد)، لە تارانەوە هاتۆتەوە، دەیەوێ (مەلا مستەفا)، ببینێت، بەڵام تا ئێستا لە (ئیدریس و مەسعود)، بەولاوە کەسی تری نەدیوە! دۆستەکانیشی پێیان وتوە: تازە (بارزانی)، گفتی داوە بە (شا)، کە هیچ نەکەن! کاک (شەهاب)، پاش هەوڵەکانی بۆ پەیدا کردنی هەواڵ و زانیاریی راستەقینەی (بارزانی) وتی: هەرچی پیاوی دڵسۆز هەیە، پێیان دەڵێت: با بەرگری بکەین، بەڵام لە زمانی (ئیدریس بارزانی)یەوە پێیان وتم، کە (بارزانی) ش بەرگری پێ باشترە، خۆشم هەوڵم داوە سبەی چاوم بە (ئیدریس) بکەوێت! ئەو شەوە زۆرمان تەگبیر کرد، کە چۆن دەست پێبکەین و چی بکەین! مایەوە سەر ئەوەی بزانین، ئاخۆ هیچ چاوپۆشی و هیچ هاوکارییەکمان دەست دەکەوێت، یان.. نا! زۆری لە ئەگەرەکانمان تاووتوێ کرد، ئایا ئامادە کاری بۆ دروست کردنی دەستەی بچووکی پارتیزانی بکەین، یا بەرگری کردن لە ناوچەیەک

بکەین. واتە ئەگەر بەرگری لە ناوچەیەک بکەین، ئەوە بەشدارییەکی فراوانی دەوێ، ئەوەش بەبێ (بارزانی) و پشتگیری ئەو، لەم کاتەدا مەحاڵە کەسێکی تر هەبێت، کە ئەو دەسەڵات و توانایەی هەبێت، بەڵام کاری پارتیزانی، هەم خەرجی کەمترە و هەم کارێکی باشە و دەکرێت لەم کاتەدا کاری بۆ بکەین!

ئارام : بەرگری لە ناوچەیەک ! ئەوە مانای دامەزراندنی بەرەی شەڕە، ئەوە لەم کاتەدا بە ئێمە ناکرێت، ئێمە دەبێت هەنگاو بە هەنگاو کار بکەین، لەپێشدا دەستەی چەکداری بچووک و بنکە و بارەگای گەڕۆک ئامادە بکەین و کار بۆ بە دەستهێنانی پشتگیریی جەماوەری گەل بکەین، بەڵام بەرگری لە ناوچەیەک بۆ !

دارۆ : ئەوە تەنها ئەگەرە و لەبەر ئەو قسەیەی، کە گوایا لیبییەکان و روسەکان وتوویانە.. تەنها یەک مانگ بەرگە بگرن و بەرگری بکەن، ئێمە هەموو شتێکتان بۆ دەکەین!

منیش وتم : راستە لیبییەکان و روسەکانیش شتێکی لەو شێوەیەیان باس کردووە، بەڵام بیرتان نەچێت، ئەو قسەیە بۆ سەرکردایەتی (پارتی و بارزانی)یە، نەک بۆ ئێمە! بۆیە گەر ئێمە بمانەوێ بەبێ ئەوان درێژە بە شۆڕش بدەین، ئەوە تەگبیری تری دەوێت! بۆیە بەڕای من، ئێستا کاتی ئەوەیە بە پڕوپاگەندە و باس کردنی قایمکردنی بەرەی بەرگری کردن و بیرۆکەی درێژە پێدانی شۆڕش و بەرگری بڵاوبکەینەوە و بڵاوەی لێنەکەین! ئێمە دەبێت بیرمان لای بەرنامەی پارتیزانی بێت، بۆ ئەمەش دەبێت سەرەتا لە شتی نهێنی و بچووکەوە دەست پێبکەین!

رۆژی دوایی بە چاوی خۆمان بینیمان، کە چۆن هەندێ دام و دەزگای شۆڕش و راگەیاندن، بەرەو ئێران دەڕۆیشتن! رۆژی ١٩٧٠/٣/٩ هێرشێکی گەورەی هێزەکانی دوژمن، کە زیاتر لە چوار لیوا سەربازی عێراقی

بەشدارییان تێدا کرد، بۆ پەلاماردانی گەلاڵە و چۆمان و سەرکردایەتی و هەندێ شوێنی تر دەستی پێکرد، لە دوا تیری کەوانی دوژمن دەچوو! هەرچەندە دوژمن سەربازێکی زۆری لێ کوژرا و پێشمەرگەش قارەمانانە بەرگرییان کرد و لە هێزەکانی رژێم زیاتر لە ١٧ تانک سوتێنرا و ٢٠٠ سەربازیشی لێ کوژرا و هێزی پیشمەرگەش شەهیدێکی زۆری دا، بەڵام ئەو شەڕە چەند رۆژێکی خایاند و دواجار دوژمن توانی زۆربەی ئەو ناوچانە بگرێ و بۆ ئەمەش لە رۆژی ١٩٧٥/٣/١٢دا، بەغدا کۆتایی شەڕی کوردستانی راگەیاند!

ئەو رۆژانە لە ئەنجامی چاوپێکەوتن و تەقەلاکانی کاک (شەهاب) و لە بینینی ئێمە لەگەڵ ( عەلی عەسکەری) و چاوپێکەوتنی مامۆستا (ئیبراهیم ئەحمەد)، لەگەڵ (بارزانی) و لە قسەکانی دکتور (مەحمود عوسمان) تێگەیشتین، کە ئەوەی (شا)ی ئێران بە (بارزانی) وتووە.. سەرکردایەتیی شۆرش هەموو ئەوە جێبەجێ دەکەن! کە پێیانوتراوە و تەنانەت ئەمریکییەکانیش ئاگاداری (بارزانی)یان کردووە، کە چیتر ئێران قبووڵ ناکات سنووری لەگەڵ عێراق نائەمنی تێدا بێت! لەبەر ئەوە نەک هەر بەرنامەیەکی کەم یا زۆریان نییە بۆ بەرگری، بەڵکو رێگەش بە هیچ کەس و دەستە و تاقمێک نادەن بەرگری بکات!

(بارزانی) خۆیشی نا ئومێد بووبوو، دەیزانی (شا) و ئەمریکا و ئیسرائیل پشتیان کردۆتە کورد و چەند بارودۆخێکی نالەبار و سەخت هاتۆتە گۆڕێ و دەیزانی گەر بە تەنها بەرگری بکات و (شا) ی ئێران دوژمنایەتی بکات، کارەکان روو لە هەوراز دەکەن! دوای ئەوە (بارزانی)، بۆ خۆی لە هەموو سەرکردەکانی (پارتی) و لە هەندێ فەرمانەدەش رازی نەبوو، دەیزانی هەندێکیان کوڕی ئەو رۆژە سەختە نین! ئیتر ئێمە هیوامان بە وەزعی (بارزانی) و بە بەرگری (بارزانی) نەما! مایەوە ئەوەی، کە بە توانای

کەمی خۆمانەوە بەرنامەیەک دابڕێژین بۆ بەرگری! بۆ ئەمەش لەگەڵ کاک (ئارام) و (لیدا) ی خێزانی ڕێک کەوتین، کە هەموو بگەڕێینەوە بۆ ناوچەی پێنجوێن و لەوێوە هەوڵ بدەین بەرنامەی بەرگری پیادە بکەین! گەڕاینەوە پێنجوێن و لەگەڵ (ئاوات عەبدول غەفور و حەمەی میرزا سەعید و عومەری سەید عەلی) و تێکۆشەرەکانی خانەقین لەوانە (مەلا بەختیار) قسەکرا، کە خۆمان بۆ بەرگری ئامادە بکەین و چەک کۆکەینەوە و زۆریش دەنگۆی لەسەر دروست نەکەین و سەرنجی دوژمنانی ئەو کارە ڕانەکێشن و کارێکی وەها نەکەین، کە بیانو وروژێنین! کاک (شەهاب) قسەی لەگەڵ (فەتاح ئاغا)، فەرماندەی هێزی خەباتدا کرد بوو، کە بەشداری یان هاوکاریمان بکات، لە سەرەتادا ئەویش و (نوری حەمە عەلی)، بەڵێنیان دا بەشداری بکەن، بەڵام دواتر بە شێنەیی پەشیمان بوونەوە!

بە پەلە کۆبوونەوەیەکی فراوانی کادیرەکانی (کومەڵە) مان، لە (کێلێ) ی لای پێنجوێن بە ئامادە بوونی ٢٧ کادری (کۆمەڵە)، ڕێکخست! لەو کۆبوونەوەیەدا کاک (شەهاب) و من، هەموو هەلومەرج و دەنگوباسەکانی ئەو بڕیارەی سەرکردایەتیی پارتیمان بۆ باس کردن، باسی بەرنامەی پێویست و چۆنێتیی بەرگریشمان کرد! ئامادە بووان (عومەری سەید عەلی و ئاوات و مەلا بەختیار و عبدالرزاق و کاکە حەمە)، قسەیان لەسەر دەستکردن بە بەرگری کردن کرد، کەس نەبوو پشتیوانی لە بەرگری نەکات و هەموو ئامادەی بەرگری بوون! بەڵام کە هاتینە سەر هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی سیاسی و سەربازی ناوخۆ و عێراق و ناوچەکە و نێودەوڵەتی و پێویستییەکانی بەرگری کردن، ڕایەکی وا پەیدا بوو، کە ئەم کارە دەبێت وردتر قسەی لەسەر بکرێت، ئەویش بەوەی ئاخۆ هەر ئێستا و دەم و دەست بکەوینە بەرگری، یاخود بە

بەرنامەیەکی وردتر، چەند مانگێک دوا بخرێ بۆ کاتێکی گونجاوتر تا هەلومەرجەکە لەبارتر دەبێت!

باسیش لەوە کرا، ئێستا شکست و دارمانێکی گەورە و بە گوڕ دەستی پێ کردووە، بەهۆی هەڵوێستی سەرکردایەتیی شۆڕش و (پارتی) و جۆری رەفتاریانەوە، بەهۆی لاوازیی سەرکردەکانی (پارتی) و هەستی پێشمەرگە و خەڵک بەرامبەر بەو سەرکردایەتییە، خەڵکی هەستیان دەکرد ئەوانە زۆر لە خوار چاوەڕوانی گەلەکەمانەوەن و پێناچێ ورە و پشوویەکی درێژیان هەبێت! لەو لاشەوە بوغرا بوون و لەخۆبایی بوونی سەرانی عێراق، بە تێکشکاندنی لەشکرێکی گەورە و دامەزراوەی زەبەلاحی (بارزانی)، دۆخەکەی هێندەی تر سەخت کرد بوو! بۆیە ئیتر ئێمەش لە ژێر باری گرانی ئەو هاوکێشە نا بەرانبەرانەدا ترسمان لەوە پەیدا کرد، کە خەڵک لە سەرەتاوە بە کاردانەی سۆز بێتە پێشەوە، بەڵام دوایی لە رەوتی جێبەجێکردنی بەرنامەی بەرگریدا توانای درێژە پێدانی نەبێ!

رەنگە رێکخستنی دەستەی چەکدار لەم کاتەدا و خۆ قایم کردن و درێژەدان بە بەرگریی ریسک و مەترسی لەو جۆرە، لە هەموو کاتێکی تر، ئەستەمتر بێت! چونکە دوور نییە زۆر لەو دەستانە و لەو هێزەی، کە رێک دەخرێن بۆ بەرگری، بەرگەی رووداوە چاوەڕوان کراوەکان نەگرن و لەبەردەم هەلومەرجی سەختی داهاتوودا خۆیان بۆ نەگیرێت و لە ماوەیەکی کەمدا بەشێکی زۆریان هەڵبوەرێن و بەمەش زیانێکی گەورە بە جووڵانەوەکە بگات و شۆڕشەکەش بە ساوایی بفەوتێت! دووریش نییە لێیان تەسلیم بێتەوە و نهێنییەکانی دەستە پارتیزانەکان و جێگە و ریگەی تەقەمەنی و شوێنی چاپەمەنی و پێویستییەکانی تر لای دوژمن ئاشکرا بێت، کە ئەمانەش هەموو دوارۆژێکی باشیان لێ چاوەڕوان ناکرێت!

ئەو رۆژانە بارو دۆخەکە هێندە ناسک و هەستیار بوو، کە وەک رنووی بەفر لە دۆڵێکدا دەهاتە بەرچاو. کە چۆن تەوژمی توندی ئەو رنووە هێندە مەترسیدارە، هەرچی بێتە پێشی رای دەماڵێ، ئاوەها بوو! جا لە کاتی وەهادا خۆ خستنە بەر ئەو هەرەسە، زۆر جێگەی مەترسییە! جارێ دەبێت بە شێوەیەکی کاتی لەو رنووە و لەو هەرەسە خۆت لا بدەیت، پاشان بگەڕێیتەوە شوێنەکەی خۆت و بەوپەڕی هوشیارییەوە کارەکانی خۆت ئەنجام بدەیت! زۆربەی زۆری ئامادەبووان لەسەر ئەوە پێکهاتن، کە نەفەسی بەرگری بپارێزین، بەڵام بەرگری بەکردار دوا بخرێ! بڕیاری کات و بەرنامەکەشی بۆ (ناوەندی کۆمەڵە)، بەجێ بهێڵرێت! ئەو بڕیارەش بە هەمووان راگەیەندرا و سەرکردایەتیی شارەکانیشی لێ ئاگادار کرا، تا ئەوانیش بینێرن بۆ دەرەوە، بۆ (مام جەلال)! ئیتر دوای ئەوە لە کۆبونەوەی (ناوەندی کۆمەڵە)، بەم جۆرە بڕیار درا..

* هەرچۆن ئێستا مەیدانی خەباتی ئێمە لە کوردستانی باشوورە، ئەوا بەرنامەی ئایندەشمان هەر دەبێت لەوێ پیادە بکرێ!

* نابێت کەس بچێت بۆ ئێران، مەگەر بە ئیشی (کۆمەڵە) و بە بڕیار رەوانە بکرێت، بەڵکو دەبێت بچنەوە شارەکانی کوردستانی عێراق!

* بۆ پاراستنی رێکخستن و لەبەر سەلامەتی ( کۆمەڵە) و هاوڕێیانمان، (ناوەندی کۆمەڵە) و هاوڕێکانی (ناوەندی)، جگە لە هاوڕێ (جەعفەر عەبدول واحید)، هەموو خۆیان دوور بگرن لە رێکخستن تا شێوەی رێکخستن و پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی نوێتر و گونجاوتر رێک دەخەینەوە!

* رێکخستنی ناو شار، ئەرکی سۆراخ کردنی هاوڕێ ناسراوەکان بگرێتە ئەستۆ، ناونیشان و جێگە و شوێنیان بۆ دابین بکرێت، تا دڵنیا دەبین لە هەنگاوە ئەمنییەکانی رژێم!

## ڕێکخستنەوە و شۆڕش!

گەڕاینـەوە بـۆ شـارەکان، بـەڵام چـۆن گەڕانەوەیـەک، هەمـوو دڵ گوشـراو و چـاو پـڕ لـە فرمێسـک. تەمـی خـەم سـەر رووی هەموومانـی گرتبـوو! ئاخـر ئێمـە سـەرباری خەمـی ئـەو شکسـتە گەورەیـە، خەونێکیشـمان هەبـوو، خەونـی هەرچـی زووتـری هەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش و دەسـت کردنـەوە بـە بەرگری لەنـاو شـارەکاندا، ئیتـر کـە دڵنیا بوویـن لـە ڕەفتارەکانـی ڕژێـم و هەنـگاوە ئەمنییەکانـی، ئەنجـا یەکترمـان گرتـەوە و بڕیـاری کۆبوونەوەمـان دا! هاتنـەوەی خەڵکـی هێنـدە بـە لێشـاوێکی زۆر و قەرەباڵـغ بـوو، کـە بـۆ وەرگرتنەوەیـان، دەزگا ئەمنییەکانـی ڕژێـم بەجـۆرێ مەشـغول بووبـوون، کـەس نەیدەپەرژایـە سـەر کـەس، بەمـەش ڕژێـم وا زوو بـواری چاودێـری کردنمانـی نەبـوو! بۆیـە لـە کۆبوونـەوەی خۆماندا باسـمان لـەوە کردەوە، کە ئێمـە لـە دوورەوە هاوکاریی کۆمیتـەی سـەرکردایەتیی شـارەکان دەکەیـن، ئـەوان هـەر هاوکارییەکیـان پێویسـت بـوو لـە ڕێگـەی (جەعفـەر عەبـدول واحیـد)ەوە هاوکارییـان دەکەیـن و

زۆرتر دەوری راوێژکاری دەبینین بۆیان، بۆیە هەر ئەوکاتە بڕیاریشمان دا بە تەواوی رێکخستنی هاوڕێکانی شاخ لە هی شار جیا بکەینەوە و تێکەڵ بە یەکتریان نەکەین. لەبەر کاروباری کەرکووکیش وا بە باش زانرا ،جارێ من وەک هاوکاری کۆمیتەکە بمێنمەوە!

پاش ماوەیەک هەموو ئەو کەسانەی، کە پێشتر کارمەند بووین، نووسراویان بۆ کردین تا هەر یەکە سەردانی شوێنی ئەو کارەی بکات، کە بڕیاری بۆ لێدراوە بۆ چوونەوە سەر کار! کاک (شەهاب) و خوالێخۆش بوو (رەسول مامەند)، هەر دووکیان کاریان لە بەغدا هەبوو، منیش هەر وەک ئەوان پێش چوونە دەرەوەم لە وەزارەتی شارەوانییەکان بووم لە بەغدا! کاری کاک (رەسوڵ مامەند)، گەڕانەوە بوو بۆ زانکۆی (المستنصریە)! لەگەڵ کاک (شەهاب) لەگەڵی چووین، (ئەبو عیماد) ناوێک ئەوکاتە لە تۆمار کردنی گشتی زانکۆ بوو، لەگەڵ (دکتۆر حەسەن عەتار) هەردووکیان دۆستی کاک (شەهاب) بوون، باش بوو بە دوو رۆژ کاری گەڕانەوەی ئەو بۆ خوێندن لە بەشی یاسای ئەو زانکۆیە جێبەجێکرا! کاک (شەهاب)یش لە ئیدارەی توتن بوو، بۆ ئەویش هەمان شێوەی من هەموو نووسراوی پێویستمان بۆ کرا! ئێمە نیازی خۆمان لە کاک (رەسوڵ) خۆش کردبوو، رایکێشین بەلای (کۆمەڵە)دا، ئەویش دەیویست بمانگلێنێ لە تەقەلایەکی (صالح یوسفی و کوردۆ گەلالی و کاک عەلی عەسکەری)یەوە، وتی با سەردانێکی کاک (عەلی) بکەین، کاک (شەهاب)، کاری هەبوو، شەهید (عبدالرزاق) و من چووین لە ئوتیل (شبرد)، سەردانی کاک (عەلی) مان کرد، چاوەڕوانی جوابێکی دەکرد کە موافەقەتیان بدەنێ تا بتوانن جێگەی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بگرن و بەغدا رازی بێت، کە بەفەرمی مۆڵەتی کار کردنی حیزبێکیان بدرێتێ و بە ئاشکرا کار بکەن!

هەندێ شت هەبوون ئەو کاتە زۆرم لا گرنگ نەبوون، نەچوومە قوڵایی دەنگوباسەکانەوە، چوار قۆڵی لەوێ نانی ئێوارەمان خوارد و قسە و باسێکی زۆرمان لەو بارەیەوە کرد، کە ئاخۆ حکومەتی بەغدا هیچ نەرمییەک دەنوێنێ، یا کێشەی زیاتر بۆ کورد دەخوڵقێنێت !

کاک (رەسوڵ) مان بە جێهێشت و بۆ رۆژی دوایی ئێمە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی. بە رێنمایی سەرانی رژێمی عێراق، هەموو کارمەندە حکومییەکان، کە لە شاخەوە هاتبوونەوە گەڕانەوە سەر کارەکانی خۆیان! پاشان بە زوویی زۆرێ لەوانەیان گواستەوە و هەر یەکەیان دوورخستەوە بۆ یەکێ لە شارەکانی خوارووی عێراق، هەندێکی تریش کە وەک شەهید (عەلی عەسکەری)، پێشتر کارمەندی دەوڵەت نەبوون، کارێکی گونجاویان بۆ دانان! بۆ نموونە شەهید (عەلی عەسکەری)، بە سەرۆکی شارەوانی دوورخرایەوە بۆ قەزای (رەفاعیە)، لە خوارووی عێراق! منیش بە وردبین لە بەشی یاسا و موڵکایەتی لە شارەوانییەکانی شاری (رومادی) دانرام! بۆ ئەوەش حکومەت هیچ گومانێکمان لێ نەکات، سوک و ئاسان چووم لەو شارە دەوامم کرد. دوو مانگی نەبرد لە ماڵی شەهید (ئەنوەر زۆراب)، کۆبونەوەیەکمان کرد و باسی دامەزراندنی یەکیەتیەکی فراوان، کە (مام جەلال) زۆر جار بە نامە بۆی باسی کردبووین و هاوکات مەسەلەی (هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش)، بوونە باسی سەرەکی کۆبونەوەکەمان! لەسەر پێشنیاری شەهید (شەهاب)، بڕیاردرا، بەرنامەیەک دابنێین و بە کردەوە کاری بۆ بکەین، بیرۆکەی بەرنامەکەش بریتی بوو لە :

لە سەرەتادا لە چەند ناوچەیەکی گونجاو، چەند دەستەیەک دروست بکەین، ئەو دەستانە شەڕی چەکدار نەکەن، بەڵکو جارێ کاری راگەیاندن بکەن و خۆ نیشانی خەڵکی ناو دێهاتەکان بدەن و قسەیان

بۆ بکەن، کە شۆڕش نافەوتێ و خەباتی شۆڕشگێرانەی خەڵکی کوردستان بەردەوامە! ئەو دەستانە ناویان (دەستەکانی پروپاگاندەی چەکدار) دەبێت و لە ئاستێکی بەرز و نهێنیدا کار دەکەن و لە جێگە و ڕێگە و ڕێگاکانی هاتوچۆ و پەیوەندی کردن خاکییانە ڕەفتار دەکەن! سەرەتا لە ناوچەکانی (چەمی ڕێزان و خاڵخاڵان، بەری قەرەداغ و قۆپییەکان، گەرمیان و بەری کۆیە، قەسرێ و گەڵاڵە، پێنجوێن و شاربازێر، شارەزور و شەمێران، ناوچەی قەلادزی، مەرگە و ئاسۆس)، وەک دەستەی نهێنی و پارتیزان دەردەکەون !

بۆ ئەو شوێنانە بیر کرایەوە، کە (عەلی بچکۆل و ئازاد هەورامی و بێستون)، بۆ دەستەکانی چەمی ڕێزان و قەلاسێوکە، (غەریب سەعید و حەمیدە سوور) و خزمەکانی بۆ ناوچەکانی خاڵخاڵان و (سیروان تاڵەبانی)، بۆ بەری قەراغ و (مەلا ئەحمەد)، بۆ گەرمیان و چەند کەسێکی خانەقینیش بۆ ناوچەی خانەقی و (تایەری عەلی والی بەگ) یش بۆ ناوچەی شەمێران، بنێردرێن!

شەهیدان (عەبدول ڕەزاق و حەمید کەریم شانە) ش، بۆ بەری کۆیە و لای هەولێر و بەری گەلاڵە و قەسرێیش بە شەهید (جەعفەر) و هەندێ هاوڕێیانی تری ناوچەکە بسپێررێت، کە بەداخەوە ئێستا ناوەکانیانم باش لەبیر نەماوە! هێندە دەزانم خوالێخۆش بوو (قادر خەبات)، یەکێکیان بوو! ئیتر دەست کرا بە پەیوەندی کردن بە هەندێ لە فەرماندە کۆنەکانی شۆڕشی ئەیلولەوە، لەوانە (تایەری عەلی والی بەگ و شەوکەتی حاجی موشیر و نوری حەمە عەلی و ئەنوەری مەجید سوڵتان) و ژمارەیەکی تر، کە زۆربەیان ئاشنای کاک (شەهاب و عەبدالرەزاق و شەهید جەمالە ڕەش) بوون.

بەشی دووەمی کۆبونەوەکە تەرخان کرا بۆ باسی ئەو تەقەلایەی،

کە (مام جەلال)، لە هەندەران بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نیشتیمانی فراوان دەیدا! ئاخر دەمێک بوو (مام جەلال) بە نامە بۆمانی دەنووسی، کە هێنانە دی ڕێکخراوێکی نیشتیمانیی فراوان، کە بتوانێ زۆرترین جەماوەری خەڵکی کوردستان بگرێتە خۆی، پێویستییەکی گرنگی ئەم قۆناخەیە! بیرم دێت یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٧٣دا بوو، کە بە نامەیەک ئەم بابەتەی بۆ باس کردبووین، ئێمە ئەوکاتە پێمان خۆش نەبوو، چونکە پێمان وابوو، کە ئەمەی بۆ ژیانەوەی ئەو پارتە حەل کراوەیە، کە شکستی خوارد و بوو بە لایەنێکی میراتگری پڕ لە وەیشوومەی شەڕی ناوخۆ! ئێمەش بیرمان لە هێنانەدی پارتی پێشڕەوی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان دەکردەوە، بۆیە ئەو بیرۆکەیەمان بە هەند وەرنەگرت!جارێکی تریش لە سەردەمی تەقەلاکانی (بۆمدین) کە خەریکی ناوبژی نێوان (شا و صدام) بوو، نامەیەکی بۆ ناردین کە باشتر ئەوەی بۆ روونکردبووینەوە : کە (کۆمەڵە)، ڕێکخراوێکی چەپی (مارکسی - لینینی) یەو ڕێکخراوێکی چینایەتیە، هەموو کەس نابێت بە (مارکسی) و هاوکات نابێت (کۆمەڵە) ش، هەموو کەس وەربگرێ، ناوچەکەش لە بەردەمی گۆڕانکاریی گەورەدایە و لە ناوچەکەشدا، ڕێکخراوی (مارکسی)، دوژمنی زۆرە، ئەوە تورکیا، ئەندامی ناتۆیە، ئێران، ڕژێمێکی کۆنەپەرستە و لەدونیادا بە دوژمنی چەپ و مارکسییەکان ناسراوە، عێراق، ئەو دوژمنە سەرسەختە دڕندەیە، کە هەموومان باشی دەناسین، بۆیە شاردنەوەی (کۆمەڵە)، لەجغزێکی نیشتیمانی گشتیدا کارێکی وەک (مام جەلال) نوسیبووی تابڵێی پێویستە! ئەنجا زەروورەتی کۆکردنەوەی خەڵکی فراوانی کوردستانیش، پێویستییەکی ترە، کە ئەمەش هەر بە ڕێکخراوێکی نیشتیمانیی گەورە و فراوان دەکرێ، کە (کۆمەڵە) ناوک و داینەمۆکەی بێت! ئەم جارە وەڵامی

نامەی ئێمە، نەک هەر وەڵامێکی پەسەند کراو بوو، بگرە هاندانی (مام جەلال)یش بوو، کە بەڵێ ئەو کارە کارێکی باشە و پێویستە هەموو پێکەوە کاری جیدی لەسەر بکەین! ئیتر لە مانگی مارتدا و بە ڕێگەی هاوڕێیەکی عەرەبی شەهید (ئەنوەر زۆراب)دا، نامەیەکی بۆ ناردین کە دەڵێت:

ئەوە پرۆژەیەکە، کە ئێستا ئەو کاری بۆ دەکات و هەوڵی زۆریشی بۆ داوە، بۆیە پێویستە ئێوەش لای خۆتانەوە بە هەمان جۆر کاری بۆ بکەن و ئەگەر بکرێت سەردانی یەکێکتان کارێکی گرنگ و پێویستە!

لەو کۆبونەوەیەدا هەموو لایەنەکانی و هەنگاوەکانی (مام جەلال)، تاووتوێکرا و پەسەند کرا و بڕیار درا، کە یەکێک بچێتە سەردانی، بۆ ئەوەش من دیاریکرام و داوا کرا، تازووە خۆم ئامادە بکەم و سەفەر بکەم بۆ لای (مام جەلال)! ئیتر راسپاردەیان کرد، کە بەیانێک بەو مانایە بنووسیین و هەنگاوەکانی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی گەلەکەمانی تیا بەیان بکەین! بەیانەکەمان ئامادە کرد و خاڵە گرنگەکانی بریتی بوو لە..

* تەقەلای تەواو بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نوێ بە ناوی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)!

* هەڵگیرساندنەوەی خەباتی (چەکداری - سیاسی)، لە شێوەی مەفرەزەی پارتیزانی، بە ڕاگەیاندنی چەکدار!

ئیتر (مام جەلال)، لای خۆیەوە دەستی بە چالاکی و جموجوڵ کرد بوو، بۆ هەنگاونان بۆ دامەزراندنی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، بەو جۆرەی، کە ببێتە جغزێک بۆ (کۆمەڵە) و ئەمیش ببێتە داینەمۆ بۆ ئەو ڕێکخراوە نیشتمانییە فروانە! ئێمەش لای خۆمانەوە پێ بەپێ هەنگاو بنێین بۆ دروست کردنی دەستەی پێشمەرگەی ( دیعایە )ی

چەکدار! منیش لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٩٧٥ دا، ڕەشنووسی بەیانێکم بەو خاڵانە داڕشت و بەیانەکەش درایە کۆمیتەکانی شارەکان! نایشارمەوە ئەوکاتە سەفەر کردن بۆ ئێمە و بۆ هیچ یەکێکمان ئاسان نەبوو، بەڵام گیان بەوە بوو، کە ڕژێم بۆ چنینەوەی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی، کە بەسەر جووڵانەوەکە و سەرکردایەتیی (پارتی)دا، دەستی کەوتبوو، وە سەرقاڵی دامەزراندنەوە و ڕێکخستنی ئەو هەموو خەڵکە گەڕاوەیە بوو، هاوکات هێندەی مەشغوڵی ڕێککەوتنەکەی بوو لەگەڵ ئێران و ڕەنگ ڕشتنەوەی سەر لەنوێی نەخشەی سنوورەکان و شەتوڵ عەرەب بوو، هێندە نەیدەپەرژا، یا بۆیان نە دەکرا چاودێری هەڵس و کەوتی ئێمە مانان بکات! منیش بۆ حەلال کردنی سەفەرەکە و بۆ دوورخستنەوەی چاوی دەزگا ئەمنییەکان، گەر لەو کاتەدا لەسەرم بووبێت - چونکە چەند جارێک بۆ چارەسەری ئازاری گەدە نامەی تەندروستیم بۆ سەردانی نەخۆشخانە کردبوو - ئەوا لای هاوڕێکانی فەرمانگە، هێندەی تر ئەو نەخۆشییەم زەق کردەوە !

## دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)!

بەهۆی خزمێکمانەوە کابرایەکم پەیدا کرد زۆر یارمەتیدام پاسپۆرت وەربگرم، پاش هاو ئاهەنگی کردن لەگەڵ (مام جەلال)، بە رێگەی زەمینی و بە پاصی گەورەی گەشتیاری، کە لە هەموو شت ئەمینتر و هەرزانتر بوو، سەفەرم کرد بۆ سوریا بۆ لای (مام جەلال)! پێم وا بوو، بە دوو رۆژ کارم لای (مام جەلال) تەواو دەبێت و ئیتر بۆ سەفەری شوێنەونی دەچم بۆ (سۆفیا) بۆ چارەسەری نەخۆشی! لە سەر سەفەر بووم، هەواڵی گرتنی هەندێ هاورێی سلێمانیم زانی، گوایا وتیان کاک (ئاسۆی شێخ نوری) گیراوە، بەلام مەسەلەکەیان سادە کرد بوو، بۆیە بە منیان وت لەوە دەچێت لە کێشەی خزمێکیانەوە گلابێت و مەترسی نییە!

کە گەیشتمە شام، لەوێ وەک پێموترا بوو، تەلەفۆنم لەگەڵ (عبدول الالە نصراوی ) کرد، ئەو زاتە هاورێیەکی زۆر نزیکی (مام جەلال) بوو، ئەمینی گشتی (جولانەوەی سۆسیالیستی عەرەب) و دۆستی خۆشم

بوو! من کاتی خۆی بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٩٧٠ ئەم پیاوەم ناسی، ئەویش بەهۆی گرتنیەوە بوو لەلایەن رژێمەوە، ئیتر لەسەر داوای (مام جەلال)، سەردانی کەسوکار و خێزانیم کرد و لە گەڵیان تێکەڵ و ئاشنا بووم! ئەو دەمە و لەو تەنگانەیاندا، کە لە گەڵیان بووم کاری باشم بۆ کردن! - ماوەیەک لەمەوبەر لەگەڵ کاک (فریاد رەواندزی) سەردانی ماڵیمان کرد لە بیروت - (نصراوی) زوو هات بۆ لام و هەواڵی سەفەرێکی کتووپڕ و چاوەڕوان نەکراوی (مام جەلال)ی پێدام، ئیتر لە دوو توێی قسەکانیدا بۆم دەرکەوت، لەگەڵ فەلەستینییەکان سەفەری کردووە ! وتی (مام جەلال) پێی وتووم، کە جارێ بچێت بۆ شوێنێکی تر کات بەسەر بەرێ و چاوەڕوان بکات، کە هەرکات هاتەوە ئەوسا منیش بە تەلەفۆن ئاگادارت دەکەمەوە،! بەڵام تۆش لە هەر شوێنێ گیرسایتەوە ئاگادارم بکە و زانیاریم بدەرێ، تا بتوانم لە هاتنەوەی (مام) ئاگادارت بکەم!

بە راستی زۆر نارەحەت بووم، وتم خوا دەزانێ من بە چ مەترسی و زەحمەتییەک ئەم سەفەرەم رێکخستوە و هەلومەرجی ئێمە چەند ناسک و هەستیارە و چ سەرچڵییەکم کردووە تا هاتومەتە ئێرە، کەچی لێرەش (مام جەلال)، رۆیشتوە و سەفەری کردووە، چۆن دەبێت! بیرم بێت هەندێ بۆڵە بۆڵی تریشم کرد: وتم ئاخر کە ئەو دەیزانی سەفەری گرنگتری لە پێشە و سەفەرەکەی زۆر گرنگترە لە کاری کورد و ئەم هەموو ئەرکەی رێکخستنێکی نیشتیمانیی نوێ و ئامادەیی ئێمە بۆ بەگژاچوونەوەی رژێم، بۆچی منی هێنا بۆ ئێرە! خوا هەڵناگرێت (نصراوی) کەوتە دڵدانەوەم، هەوڵیدا هێندێ هێمنم بکاتەوە و قایلم بکات، کە سەفەرەکەی کتوپر بووە و بە دەستی خۆی نەبووە! وتی ئیتر هەندێ جار کار وایە، کە هاتە پێشەوە وادە و سەعات نازانێت!

ئیتر کە لەوە حاڵی بووم، تازە (مام جەلال)، سەفەری کردووە و وا زووش ناگەڕێتەوە، لەگەڵ (نصراوی) وا ڕێکەوتین بچم لە تورکیا خۆم بزر بکەم تا هەواڵی (مام جەلال)، پەیدا دەبێت! ئاخر من لەو دوورەوە بۆ کارێکی گرنگ هاتووم و ناشێ بە دەستی خاڵی بگەڕێمەوە! ئەویش بڕێک پارەی بە دۆلار پێدام، وتی: ئەوە (مام جەلال) بۆی داناویت لە تورکیا پێویستت پێدەبێت!

ئیتر هەر بە ڕێگەی زەمینی و بە چاوساغی (نصراوی)، چووم بۆ حەڵەب، لەوێشەوە بۆ سنووری تورکیا و بە سواری پاس شارە و شار ڕێگەیەکی درێژم بڕی و چومە ئەستەنبوڵ، تەنها سێ شەو لەوێ مامەوە، لە دووەمین ڕۆژیدا بە ڕێکەوت چاوم بە کابرایەکی بەعسی ناسراو کەوت، کە ناوی (تاریق قرەغولی) بوو، لەکاتی خۆیدا لە وەزارەتی شارەوانییەکان پێکەوە بووین و دۆستایەتیشمان زۆر خۆش بوو! هەرچەندە ئەو ژن و ماڵی لەگەڵ بوو، بەڵام خوا هەڵناگرێ هەر بە زۆر بۆ نانی نیوەڕۆ داوەتی کردم و لێی پرسیم خێرە بە تەنها لێرەیت! لە وەرامدا تێمگەیاند، کە بۆ عیلاجی نەخۆشی هاتووم و دەچم بۆ (سۆفیا)! ئیتر لە ترسی بینینی زۆرتری خەڵکی ناسیاو زۆر نەمامەوە و چووم لە دورگەیەک کاتم بەسەربرد بێ ئەوەی هیچ هەواڵێکی (مام جەلال)م هەبێت! ڕۆژێک زۆر ماندو بووم، تەلەفۆنم لەگەڵ (نصراوی) کرد تا هەواڵێک بزانم، پێی وتم، کە بگەڕێمەوە لای ئەو سەفەرێکم لەبەرە! منیش پاش تێپەڕبوونی ٢٥ ڕۆژ گەڕامەوە سوریا بۆ لای (نصراوی)، لەوێ پێی وتم : سبەی لەگەڵم وەرە دەچین بۆ لای (عبد الحلیم خدام)، ئەو کاتە ئەو وەزیری دەرەوەی سوریا بوو، تا پاسپۆرتت بۆ ئامادە بکەم، تومەز (مام جەلال) پێیوتووە! ڕوژی دوایی زوو هات بە شوێنما و نانی بەیانیمان پێکەوە خوارد و کەمێ لە

سەعات ۹ درەنگتر گەیشتینە لای (خدام)، ئەویش پێشوازییەکی گەرمی لێکردین و بەدەم گفتوگۆ و قاوە خواردنەوە لەبارەی بزر بوونە لە ناکاوەکانی (مام جەلال) هەندێ قسەی خۆشی کردو لەپاشدا وتی.. ئیتر نۆبەی کارە، زەنگی لێدا و داوای لە سکرتێر کرد، کەسێکی بۆ بانگ بکات و داوای دوو رەسمی لە من کرد و منیش رۆژی پێشتر دابووم بە (نصراوی)، ئەویش رەسمەکانی لەسەر مێزەکەی دانا و بە ناوی (سمیر) ناوێک، پاسپۆرتی دیپلۆماسیان بۆ راسپاردم و نامەیەکیشیان بۆ نووسیم بۆ سەفارەتی ئەڵمانیای رۆژهەلات، تا فیزەم بدەنێ. گوایە من بە سەفەرێکی فەرمی دەچمە ئەڵمانیا، کارت و دوو ژمارە تەلەفۆن و ناونیشانیشیان دامێ و وتیان خۆمان تەلەفۆن بۆ سەفیر دەکەین، کار ئاسانیت بۆ بکەن!

(نصراوی) بلیتی بۆ بڕیم بۆ بەرلین، کە سێ رۆژ چاوەڕوانی دەویست. لەو ماوەیەدا بە رێکەوت (عەبدولرەزاق فەیلی)م بینی، کە هاوڕێیەکی زور خۆشەویستم بوو، یەکێک بوو لە لاوە زیرەک و باشەکانی سەرەتای دامەزراندنی (کۆمەڵە) و بە درێژایی ژیانی لەگەڵ (کۆمەڵە) و یەکێتیدا بووە و گەلێک پۆستی جیاجیا و گرنگیشی وەرگرتووە و تا پلەی وەزیریش رۆیشتووە! هەرچەندە من بۆ خۆم لە رۆژانی شکستەوە نەمدیبوو، هاوڕێیەکی باوەڕ پێکراوی (مام جەلال) وخۆیشم بوو، لە راستیدا ئەو گومانی کرد بوو، کە من بۆچی هاتووم، بەلام نە من قسەم کرد و نە ئەویش پرسیاری کردا لە ریستۆرانتێکی نزیک ئوتێلەکەم داوەتی کردم و پاشان منیش سەردانێکی ماڵەکەیم کرد، کە لەژێر زەمینێکدا بوو!

ئیتر لە وادەی خۆیدا سەفەرم کرد بۆ بەرلینی روژهەلات. ئەوەی زۆر سەیر بوو لە فڕۆکەخانەی بەرلین چاوم بە (مونزیر نەقشبەندی)

کەوت، کە لەگەڵ (عادل موراد) و چەند کەسێکی تردا بوو، ئەوان منیان نەدی، زۆرم لەلا مەبەست بوو، کە (مونزیر) من نەبینێ. چونکە دەمێک بوو، هەر لەو کاتەوە کە لە لقی پێنجی بەغدای (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوو، قسەی ئەوەی لەسەر بوو، کە سەر بە موخابەراتی رژێمە! منیش هێندە بە پەشۆکاوی تەقەلای خۆ شارنەوەم لە پشتی پایەکانەوە دا، پۆلیسی ئەڵمانی گومانیان لێکرد بووم و بانگیان کردم بۆ ژوورێک، لەوێ بە وردی هەموو جەستە و شتەکانیان پشکنیم، ئەنجا مەرەخەسیان کردم! ئیتر لە فرۆکە خانەوە بە تەکسی بەرەو سەفارەتی سوریا بۆ لای سەفیر کەوتمەرێ، ئەویش پێشوازیی لێکردم! سەفیر پیاوێکی میهرەبان و خۆش قسە بوو، بە ئۆتۆمبیلی تایبەتی رەوانەیان کردم بۆ بەرلینی رۆژئاوا! لەوێ کاک (عومەر شێخ موس)، بردمی بۆ لای خۆیان بۆماڵێک (مام جەلال)ی لێ بوو، پشوویەکی باشمدا و پاشان لەگەڵ (مام جەلال) دوو قۆڵی چوینە دەرەوە بۆ پارکێکی گشتی و جوانی بەرلین. نامەیەکی هاورێیانم پێبوو، بە ناوی کاک (شەهاب) ەوە نوسرا بوو، لەگەڵ دانەیەک لە بەیانەکەی (کۆمەڵە)، کە دەربارەی هەلگیرسانەوەی شۆڕش بوو، تا ئەوکاتە بە باشی لە جلەکانمدا قایمم کرد بوون. (مام جەلال) هەردووکیانی خوێندەوە و وتی ئادەی ئیتر خۆت قسەم بۆ بکە. منیش هەرچی هەبوو، هەر کارو هەنگاوێ، کە بۆ دروست کردنی مەفرەزەکانی ناوچەکانی ناوخۆ نرابوو، بە وردی و بە درێژی هەموویم بۆ باس کرد! (مام جەلال) لە خۆشیدا گەشایەوە، ئێجگار خۆشحاڵ بوو، کەوتە ستایشی هەندێ لەوانەی، کە ناوم هێنا بوون! وتی: (غەریب سەعید)، کورێکی چاک و ئازایە و زۆر باشە، (عەلی بچکۆل) هەر زۆر باشە، کاک (تایەر)، کورێکی چاکە خۆشم خەبەری دەزانم، کاک (شەهاب)، قسەی لەگەڵ کردووە! هەندێکیان

ناناسـم، بـەلام کاریکـی زۆر باشـتان کـردووە، هەلومەرجێکـی بـاش دێتـە پێشـەوە، لـە سـوریا وەزعمـان باشـە و بـرا عەرەبەکانیش بـاش کەوتونەتـە خـۆ، دروسـت کردنـی دەسـتەکان لـە سـەرەتادا بەوجـۆرە زۆر باشـە، تـا دۆخەکـە باشـتر پێدەگات!

پرسیاری کرد: باشە من دەتوانم چیتان بۆ بکەم !

وەرامـم دایـەوە : وتـم (مـام جـەلال) ،مـن هاتـووم بـۆلای تـۆ، تۆ لێپرسـراوی ئێمەیـت، تـۆ ئامۆژگاریمـان بکـە، لـە نـاوەوە (کۆمەڵـە)، کاری باشـی پێدەکـرێ، تـۆش چـەک و پـارە پەیـدا بکـە!

لەسـەر باسـەکە رۆیشـت : گوتـی بـۆ ئیشـەکانی (یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان)، لێـرە کاری باشـم کـردووە. لەگـەڵ کەسـانی چـاک قسـەم کـردووە، تێکۆشـەری بـاش کۆبوونەتـەوە، ژمارەیەکـی زۆر کەسـایەتیی دڵسـۆزمان کۆکردۆتـەوە! کاک (کەمـال فوئاد)یش دەبینـی، جوابـم بـۆ کاک (نەوشـیروان)یش نـاردووە، لـە ئەوروپـا ئامادەبـێ باشـە و خەڵکێکـی زۆرمـان بـۆ خـڕ دەکرێتـەوە، لـەم قسـانەدا بوویـن لەپـڕ هەوالـی کاک (عەلـی عەسـکەری) پرسـی، وتـم زۆرباشـە لـە (رەفاعیـە) یـە و ئـاگاداری هەواڵـی هـەم. زۆرمـان قسـە لەسـەر زۆربـەی زۆری نـاوەکان کـرد، خێـرا تێبینـی خـۆم لەسـەر (مونزیـر نەقشـبەندی) دا، کـە هەرگیـز نابێـت لـەو کارەدا بێـت!

لێـی پرسـیم بـۆ سـەرکردایەتیی ئـەم کارە کـێ باشـە، قسـەتان لەسـەر هیـچ ناوێک کـردووە ! بۆم باس کـرد، کـە ئەوانـەی لـەوێ ناویـان هاتـووە، (ناوەنـدی کۆمەڵـە) و ( عەلـی عەسـکەری و عومـەر دەبابـە)  قسـەکەی پـێ بڕیـم و وتـی.. نامـەم بـۆ کاک (عەلـی و کاک عومـەر و کاک خالیـد)، نووسـیوە، ئەگـەر لـەوێ رەوانـە نەکـرا بـوو، وادەکـەم بـۆت بهێنـن، بـە (شێخ سالار)دا، بۆیـان رەوانـە بکـە! کەواتـە : (نەوشـیروان،  دکتـور خالید،

رەسـول مامەنـد، شـازاد سـائب، کاک شـەهاب) و لـە (ناوەنـدی کۆمەڵـە) ش خـۆت کێت لا پەسـەندە، لەسـەر نـاوی (رەسـول مامەنـد)، وەسـتا و رازی نەبـوو، وتـی جـارێ زووە! وەرامـم دایـەوە، کـە دەمێکـە دۆسـتمانە و پیاوێکـی تێکۆشـەرە و لـە ناوچەکـەی خۆیشـیدا کاریگـەری خـۆی لەسەر(شـیلانە) یـی هەیـە و ئێمـە پێمـان باشـە، ئـەو برایانـەی ئێرەش خـۆت باشـتر دەیانناسـی! ئەویـش هەنـدێ نـاوی بـرد، لەوانـەی دەرەوەی وڵات، کـە مـن رازی نەبـووم، وتـم ئەوانـە یەکێکیـان گومانـی لەسـەرە پیـاوی موخابـەرات بێـت، ئەوانـەی تریـش بـۆ ئـەم قۆناخـە سـەختە، سـەرەتا سـودیان نابێت. لـە ئەنجامـی گفتوگـۆدا لەسـەر ئـەوە پێکهاتیـن، کـە جـارێ ئەوانـەی ئەوروپـا سـەرکردایەتیی دەرەوەی کوردسـتان بـن و ئەوانـەی ناویشـەوە سـەرکردایەتیی نـاو وڵات بـن و خۆشـی جێگـەی دیـارە، کـە لێپرسـراوی (یەکێتـی) دەبێـت! ئیتـر لەسـەر ئـەوە پێکهاتیـن رێکخسـتنێکی نیشـتمانی فراوان بـە نـاوی (یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان)/ لـە دەوری (کۆمەڵـە)، بێـت و ببێتـە جغـزی (کۆمەڵـە) و هـاوکات (کۆمەڵـە) ش داینەمـۆی ئـەو (یەکێتی)یـە بێـت و رێبـازی ئـەو (یەکێتی)یـە و هێڵـە گشتیەکانیشـی بریتـی بێـت لـە :

* بەرگـری کـردن لـە بوونـی نەتەوایەتیـی کـورد و لـە واقیعـی نەتەوەیـی کوردسـتان. چونکـە رژێم کە دەبینێت سـەرکەوتنی بەسـەر سـەرکردایەتیی (بارزانـی و پارتـی)دا هێنـاوە، دەسـتی کـردووە بـە تەقـەلا بـۆ شـکاندنی تەواوەتـی جووڵانـەوەی رزگاریخوازانـەی کوردسـتان و دەیـەوێ بەسـەر ویسـتی کـوردا زاڵ بێـت و کـورد بـە ئـارەزووی خـۆی لـە قاڵـب بـدات! بۆیـە ئەرکـی پەلـەی ئێسـتا هێنانـە دی بەرگریـی دژی ئـەو سیاسـەت و شـاڵاوەی رژێمـی دیکتاتـۆری شـوڤێنیی بەغدایـە، ئەمـەش مانـای وایـە دەبێـت کـورد، گەشـە بـە بەرگریـی سیاسـی و جەمـاوەری و ژیانـەوەی

خەباتی چەکدارانەی خۆی بدات!
* خەبات بکات بۆ گۆڕینی رژێمی دیکتاتۆریی شۆفێنیی عێراق، بە رژێمێکی دیموکراسی!
* هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕ و دیموکرات و نیشتمان پەروەرەکانی عێراقدا، بۆ هێنانەدی ئەو ئەرکانە و گەشەدان بە (گردبوونەوەی نیشتمانیی عێراقی - التجمع الوطني العراقي)
* هاوکاری و هاوپەیمانیی هێزە نیشتمانی و دیموکراسیەکانی عەرەب، بۆ گۆڕینی رژێمی عێراق!

(مام جەلال) هەواڵەکانی هێندە پێخۆش بوو، شادی لە روی پڕا بوو رەنگ و رووی لە خۆشیدا بریسکەی دەهات و کەوتە قسەی خۆش! وتی: (شەهاب و ئاوات)، بنێرن بۆ لای من، ئاخر ئەو کاتە (مام جەلال)، لە بیروبۆچونی کاک (شەهاب) رازی نەبوو، چونکە مەسەلەکانی (تێزی سێ جیهان) و بەهەند وەرگرتنی بۆچوونەکانی کاک (ئیسماعیل) و برادەرانی (سازمانی ئینقلابی ئێران)، بەتەواوی کاریان کردبووە سەری. بۆیە ئەو لەگەڵ (مام جەلال) و ئێمەدا هەندێ جیاوازی هەبوو، ئێمە مەسەلە نەتەوایەتییەکانمان لەوان زیاتر لەلا گرنگتر بوو! (مام جەلال)، داوای کرد هەردووکیان بنێرین بۆ لای خۆی، بۆ ئەوەی ماوەیەک نزیکی یەکتربن و پێی باش بوو هەندێ دەورەی سەربازیش ببینن، تا شتی پێویستی سەربازی فێرببن و ئەوانیش خەڵکی تر فێر بکەن!

ئەو باخچەیەی کە (مام جەلال) بە دەم هاتوچۆی پەلە و وەرزش ئاسا، منی تیا ناوکە ریژ کرد بوو، پڕ بوو لە پیرەژن و سەگ، وتم ئەرێ (مام جەلال)، من لەو وێرانەیەوە و لەو زیندانە گەورەی عێراقەوە هاتوومەتە ئێرە، ئایا لەم باخچەیە خۆشتر نییە لەم شارەدا!

(مـام جـەلال) پەلـی گرتـم و هـەر بـە پیادە بردمـی بـۆ شـوێنێکی خـۆش و لەسـەر کورسـی و مێـز دانیشـتین. لـەوێ لـە درێـژەی باسـەکاندا لێـی پرسـیم، کـە ئاخـۆ ئـاگاداری گرتنەکانـم. لـە وەرامـدا پێـم وت: ئەگـەر ئەوەی کاک (ئاسۆی شـێخ نـوری) دەڵێـی، ئـەوا تـا مـن لـەوێ بـووم وتیـان پەیوەنـدی بـە کێشـەیەکی خێزانییـەوە هەیـە. ئـەو وتـی: نەخێـر هەنـدێ کەسـی تریـش گیـراون، لـەوەش خراپتـر ئەوەیـە کەسـێکی جەماعەتـی (نصـراوی) گیـراوە، کـە برادەرانـی ئێمـە دەناسـێت، بـەڵام خۆیـان ترسـیان لێـی نیـە! مـن بـەو هەواڵانـە زۆر نیگـەران بـووم، بـەڵام دەرم نەبـڕی. پـاش قسـە و باسـێکی زۆری تـر، کـە لـە باسـی سـتایش و تێبینییەکانیـدا زۆر کەسـی گرتـەوە! ئیتـر هەسـتاین و گەڕاینـەوە لای (عومـەر شـێخ مـوس)، کاک دکتـۆر (کەمـال) یـش لـەوێ بـوو! دکتـۆر (کەمـال فوئـاد)، پیاوێکـی ئێجگار قسـە خـۆش و پـر نوکتـە بـوو، نوکتـە گێڕەوەیەکـی بـە تـام و چێـژ بـوو، خـۆی بـە نزیکەکانـی (بەشـیر مشـیر)ی ڕەحمەتـی دەزانـی و هەمـوو سـەرگوزەشـتەکانی ئـەوی لەبەربـوون و جاروبـار بـۆی دەگێڕاینـەوە. لـە کۆنـەوە چـەپ و کۆمۆنیسـت بـووە و یەکێکـە لـە کەسـە ماندووەکانـی خەباتـی (کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کـورد) لـە ئەورووپـا، مـن بـۆ خـۆم پێشـتر دەمناسـی و ئاشـنایەتیی خێزانیمـان پێکـەوە هەبـوو. سـاڵی ١٩٧٠ چەنـد جارێـک لـە بەغـدا لەگەڵـی دانیشـتووم و قسـەم لەگـەڵ کـردووە، بیـروڕای خـۆم بـۆ بـاس کـرد بـوو لـەو ڕووەوە لـە یەکتـر دوور نەبووین! جارێـک لـە کتێبخانـەی بیـری نـوێ، هێنـدە چـەپ هاتـە بەرچـاوم، بۆچوونەکانـی نزیـک بـوون لـە (کۆمەڵـە) وە، خەریـک بـوو بـۆ هـاوکاری (کۆمەڵـە) قسـەی لەگـەڵ بکـەم. لـە سـاڵانی ١٩٨٠ بـە دواوە لـە ئەورووپـا بـە لاقرتێوە بـە چەپـە توندڕەو و ترۆتسکییەکانی دەوت (ئـەولادی عەسـر)! لەگـەڵ ئـەوان زۆرتـر قسـەی خۆشـمان کـرد، ئەوانیـش خۆیـان لـە باسـی نێـوان (مـام جـەلال) و

من نەدا!
لە گەڕانەوەمدا (مام جەلال)، ئامۆژگاری کردم، کە هوشیار و وریابین لە پریشکی گرتنی ئەو پیاوەی (جولانەوەی سۆسیالیستی عەرەبی)، کە لە برادەرەکانی ( نصراوی) بوو! پاشان زانیم کە ئەو پیاوە، یەکێک نییە کە گیراوە بەڵکو دوو کەسن بە ناوەکانی (زاری و سالم)! کە ئەندامی چالاکی سەرکردایەتیان بوون! (سالم)یان پێشتر و لە دەورانی (قصر النهایة)دا گیرا بوو، قارەمان و خۆراگر دەرچو بوو، بەلام ئەمجارە زۆر بەرگەی نەگرت و ناوی هاوڕێکانی خۆی و ناوی (کۆمەڵە)ش، کە لە جانتاکەیدا گیرا بوو، درکاند بوو! ئیتر نەیتوانیبوو تا کۆتایی لە ژێر ئەو بارە گرانە دەربچێ، لەوێوە نهێنی درکاند و بووە هۆی ناو هێنانی سەرکردەیەکی تریان، بە ناوی (ولید زنون)، ئەویش خەڵکی موصل بوو، هاوڕێی شەهید (ئەنوەر زۆراب) بوو، لە ئەنجامی ئازاردانی زۆردا، ئەویش ناوی شەهیدان (ئەنوەر زۆراب و جەعفەر)ی درکاند و بەوەش گەورەترین گورزی کوشندە و زیان، لە هەرە هەستیارترین رۆژ و ناسکی گەلەکەماندا بەر (کۆمەڵە) کەوت !
لە رێگەی گەڕانەوەمدا چەند رۆژێک خۆم لە بێروت دواخست، بە هیوای ئەوەی کە بەهۆی (نصراوی)یەوە بتوانم ئاگاداری رووداو و پێشهاتەکان بم! ئەویش تا ئەو کاتە لە ترس و دڵەڕاوکێ زیاتر، هیچ زانیارییەکی رۆشنی بەدەست نەگەیشتبوو! لە گەڕانەوەدا لە (شام) ەوە پاصەکەمان بە رێگەی رومادیدا تێپەڕی دەکرد بۆ بەغدا، من لە رومادی دابەزیم و دوو هاوڕێی عەرەبی باشم لەوێ هەبوو، یەکێکیان لە رێکخستنی ناسرییە عەرەبەکان بوو، بەناوی (عبدالفتاح)، ئەوی تریشیان ناوی (یاسین) بوو، پێیان وتم ئاگاداربە ئەمنی رژێم سۆراخیان کردوویت و هاتونەتە فەرمانگەش بە شوێنتدا. ئیتر وەزعەکە

تێگەیشتم، کە دەبێت کەسێکی وا لە (کۆمەڵە) گیرا بێت، من بناسێ، ئەگینا بۆ ئەمن بە شوێن مندا دەگەڕێ! هەرچۆنێ بوو بەهۆی ئەو دوو هاوڕێیەمەوە گەیشتمەوە بەغدا، لەوێ تەکسییەکم گرت و چووم بۆ ماڵی شەهید (ئەنوەر زۆراب)! لە زەنگم دا، دراوسێیەکیان حاڵی کردم، کە (ئەنوەر زۆراب) گیراوە و خێزانەکەی رۆیشتوە بۆ ماڵی باوکی، ئامۆژگاریشی کردم، کە جارێ سەریان نەدەمەوە! منیش کە دوور کەوتمەوە، یەکسەر تاکسییەکم گرت بۆ نەقلیاتی مەیدانی (نەهضە) ی بەغدا، تاکسی هەبوو بۆ سلێمانی لە ترسی ماتەڵبوون پارەی هەر دوو نەفەری پێشەوەمدا و سوار بووم بۆ سلێمانی! لە سلێمانی بە پەلە کاک (شەهاب)م دی و قسە و باسی سەفەرەکەم بە درێژی بۆ گێڕایەوە، هەواڵەکان و رای (مام جەلال) و هەموو ئەو کارانەش کە تا ئەوکاتە لە ئەوروپا کرابوون بە دوور و درێژی بۆ باس کرد! رای تایبەتی (مام جەلال)م لەسەر هەموو مەسەلەکان بۆ گێڕایەوەو داوای (مام جەلال) م بۆ سەردانی خۆی و (ئاوات) پێڕاگەیاند! پێم گوت.. (مام جەلال) لەو گرتنانەی هاوڕێکانمان نیگەرانە، سەیرە.. لە بەغدا پێیان وتم، کە کاک ( ئەنوەر زۆراب) یش گیراوە، ئەوە چۆن بووە و چی لەبارەوە دەزانن!

## شالاوی گرتن و خۆشاردنەوە!

ئاگام لێ بوو، کاک (شەهاب) شل شل و بە تاسووقەوە گوێی بۆ گرتبووم و پاشان وتی: بەخێربێیتەوە، دیارە سەفەرێکی باش و بە سوود بووە. بەڵام بەداخەوە لێرە هەواڵەکان ناخۆشن! کاک (ئاسۆ و عەلی موراد) و دەستەیەک گیراون، دەڵێن خزمیکی کاک (ئاسۆ) خەبەری لێداون، جارێ هیچ هەواڵێک لای ئەوانەوە نە چاک و نە خراپ، نییە! بەڵام ئەوەی زۆر ناخۆشە ئەوەیە، کە کاکە حەمە (حەمەی میرزا سەعید و ئەنوەر زۆراب) و چەند هاوڕێیەکی ترمان لە بەغدا گیراون، ئەوەش ئاماژەیەکی زۆر خراپە، ڕەنگە سبەینێ هاوڕێیانی ترمان بگەنە ئێرە و کۆبوونەوەیەکی (ناوەندی کۆمەڵە) بکەین!

منیش بەسەر سوڕمان و داخێکی زۆرەوە، وتم : باشە ئەو گرتنانە چۆن بوون و پەیوەندیان پێکەوە چیە، وا هەموویان بە یەکجار گیراون!

لەسەرخۆ و بەهێمنی وەڵامی دامەوە : وتی مەسەلەی (ئاسۆ) لە هی هاوڕێکانی تر جیاوازە، گرتنی (ئەنوەر) و ئەوان پەیوەندی بە گرتنی

برادەرەکەی (جولانەوی سۆسیالیستی)یەوە هەیە، (ولید زنون) گیراوە، پێ دەچێ برادەرەکانی (نصراوی) رووخابن و ئیتر ناو درکاندن لەوانەوە تەشەنەی کردبێت! چونکە لەپێشدا (سالم ) گیراوە، هەرچەندە پیاوێکی ئازا بووە، ئەویش بەهۆی کەسێکی تریانەوە کە لەناو بەغدا گیراوە، ناوی ئەوی داوە، دیارە ئەویش رووخاوە، ئیتر بەهۆی ئەوەوە ئەمن داویان بۆ (سالم) ناوەتەوە و گرتوویانە! ئیتر کە (سالم) گیراوە، راستەوخۆ دوای ئەو (ولید)یش گیراوە. لەوە دەچێ (ولید) (ئەنوەر)ی بەگرت دابێت !

هەر باش بوو کارەساتێکی گەورە نە قەوما، ئاخر ئەو رۆژەی (ئەنوەر) گیراوە بۆ رۆژی دواتر، بڕیار بووە لە ماڵی (ئەنوەر)، کۆبونەوە بکرێت، ئازایەتی (سەبیحە) خان بووە، هەواڵی گرتنی (ئەنوەر)ی گەیاندۆتە کاک (عەلی بچکۆل)، کە ئیتر کەس روو نەکاتە ماڵەکەیان، با تووش نەبن! - سەبیحە، یەکێکە لە ژنە ئازاکان، کە هاوسەری شەهید (ئەنوەر) بوو، بە دڵ ئاگای لە پاراستنی (کۆمەڵە) بوو، چەندین ساڵ بە بێوەژنی بەدیار منالەکانیەوە دانیشت و رووسورانە گەورەی کردن و بە دڵسۆزی مایەوە بۆ (کۆمەڵە) و (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) - ! (جیهاد دڵپاک) کە برای شەهید (ئەنوەر) بوو، بە پەلە هەواڵی گرتنی (ئەنوەر)ی گەیاندۆتە (عەلی بچکۆل)! ئێستا ئیتر هێشتا زووە بزانین چی روو دەدات، بەڵام دەبێت بە پەلە هەنگاو بنێین و حسابی هەموو ئەگەرەکان بکەین!

رۆژی دواییتر کوبوونەوەیەک کرا، (عەلی بچکۆل) بە جیا هات، (عەلی ئامەخان) ئازایانە چوو بە شوێن (جەعفەر)دا و لە هەولێرەوە هێنای بۆ سلێمانی!

کە هاتنە لامان هەر یەکەیان بەجیا زانیارییەکانی لای خۆیانی

گێڕایەوە، بەلام ئەو هەواڵەی تازە بوو ناو هێنانی (جەعفەر) بوو، گوایا سیخوڕەکانی ئەمن سۆراخی (جەعفەر)یشیان کردبوو، چوبوونە سەر قوتابخانەکەشی، بەلام خۆشبەختانە لەوێ نەبووبوو، ئیتر بە ناسنامەیەکی دروستکراو لەگەڵ (عەلی مستەفا)دا، هاتەوە بۆ سلێمانی!
ئەو ناو هێنانەی ئەو زەنگێکی ترسناک بوو، مانایەکی خراپی هەبوو، نیشانەی ئەوە بوو، کە دەبێت کاکە (حەمە)، یاخود (ئەنوەر)، ناوی (جەعفەر) و هاوڕێیانی تری (ناوەندی کۆمەڵە) یان دابێت! کەچی تەنها دوو رۆژی نەبرد دادوەرێکی خەڵکی سلێمانی کورد پەروەر، کە لە خزمەکانی کاک (شازاد سائیب) و ناوی (حاکم فەرەیدون) بوو، بە پەلە کاک (شەهاب) ی ئاگادار کردبوەوە لە بڕیاری گرتنی هەموومان: (شەهاب شێخ نوری، فەرەیدون عەبدول قادر، جەعفەر عەبدول واحید، عومەری سەید عەلی، عەلی بچکۆل)!
ئەمانە هەموو لە سلێمانی بووین، بۆیە کۆبونەوەیەکی بە پەلەمان رێکخست و بڕیارمان دا جارێ لە سلێمانی بە نهێنی بمێنینەوە و خۆمان حەشار بدەین و دەستوبرد شێوەیەکی نوێ بۆ رێکخستن و سەرکردایەتی کردنی (کۆمەڵە) دابنێین! بەمەش هەموو کارەکانی (کۆمەڵە) بە گوێرەی ئەو هەلو مەرجە سەختە و ئەو بارودۆخە نوێیە رێک بخەینەوە، ئەوسا تەگبیرێکی تر لەحاڵ و وەزعی خۆمان بکەین!
ئیتر هەموویانم برد لە ماڵی (خاڵە بەکر) م حەشارگەم بۆ دابینکردن!
- (خاڵە بەکر) یان وەک ئەوەی لەناو خەڵکی بە (وەستا بەکری دارتاش) ناسرابوو، ئەندامێکی کۆنی (کۆمەڵە) بوو، حەیف ئەم هاوڕێ ئازا و بە جەرگە، لە سەرکردایەتیی رێکخستنەکانی ناو شاردا و لە کارێکی پێشمەرگانەدا، سالی ١٩٨٨ ئاشکرا دەبێت و دەسگیر دەکرێ، هەرچەندە لە دەزگا سیخوڕییە جیاوازەکانی رژێمدا زۆر ئەشکەنجە

دەدرێ، بەڵام دواتر لە سێدارە دەدرێ - ! لەوێ ژوورێکی گەورەیان وەک حەشارگە بۆ تەرخان کردین تا کۆبوونەوەکانی لێ بکەین و لەو شوێنەوە سەرپەرشتی هەموو ئیش و کارەکانی (کۆمەڵە) بکەین!

ئیتر لەو شوێنەوە، کە شەو دادەهات دەست دەکرا بە چالاکی و پەیوەندی کردن. زۆر تریش کاک (عومەری سەید عەلی) و من لەو چوونە دەرەوە و چالاکییانەدا هەڵدەسووڕاین، ئەو بۆ رێکخستنەوەی وەزعی سلێمانی و منیش بۆ بینینی هاوڕێیانی کەرکووک و ئەو هاوڕێیانەی برادەران بۆیان دیاری دەکردم! لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانی حەشارگەکەدا ،کاک (شەهاب) مەسەلەیەکی گرنگی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە، ئەویش سەر لەنوێ رێکخستنەوەی (کۆمەڵە) بوو، دوور لەو سەرکردایەتییەی کە تائێستا کارەکانی بردووە بەڕێوە! بێگومان ئەوەش بە دیاری کردنی سەرکردایەتییەکی نوێ و رێگە و شوێنی نۆی و شاردنەوەی زانیاری و رێکخستن لە سەرکردایەتییەکەی ئێمە دەبێت! کاک ( شەهاب) رای وابوو، کە رێکخستن بە دوور بگرین لە خۆمان و بۆ ئەوەی رێکخستنیش سەلامەت بێت، دەبێت کارێکی وا بکەین، کە مەترسی گرتنی ئێمە زەبری کاریگەر بە رێکخستن نەگەیەنێت، بە کوردی و بە کورتی دەبێت ئەو سەرکردایەتییە لە کوردستان نەمێنێ و دوور بکەوێتەوە! کاک (شەهاب) بە راوێژی هاوڕێیانی تر، منی راسپارد تا هەڵسم بەو کارەی رێکخستن و جێبەجێکردنی ئەرکەکانی و هەنگاوی دووەمیش دوور کەوتنەوەی هەموو ئەندامانی ئەو سەرکردایەتییە بێت لە شار! منیش ناردم بە شوێن شەهید (ئازاد هەورامی)دا و پاش تاووتوێکردنی ئەو ناوانەی بۆ من پێشنیار کرابوون، لەگەڵ کاک (ئازاد) دا، کۆمیتەیەکمان پێکهینا لە (شەهید ئازاد هەورامی، ئەرسەلان بایز، عوسمانی نانەوا، عبالرزاق سێگردکانی) و لە تەنیشتەوە نەک راستەوخۆ (ئیحسان

نەجم - ئەبو شەهاب) و تێکۆشەرێکی بەغدا، بە ناوی (سەلام برزو) دیاریکرا بوو، بەڵام دواخرا بۆ دوو سێ هەفتە، تا تەموومژی گرتن و پریشکەکانی لە بەغدا روون دەبێتەوە، ئیتر بانگ کردن یا نەکردنی (سەلام)، بۆ شەهید (ئازاد هەورامی) مایەوە، تا لەبەردەم رۆشنایی رووداوەکاندا بڕیاری لێبدات!

بۆ مەسەلەی پەیوەندیکردن و ئاراستە کردنی ئەو کۆمیتەیە، بەو جۆرە لەگەڵ شەهید (ئازاد هەورامی)دا رێککەوتم، کە خۆبەخۆ سەرپەرشتی کارەکانیان بکەن و وا هەست بکەن، کە خۆیان ئێستا دەست پێشخەرن لە دروستکردنی رێکخراوێکی نوێدا، تا منیش چارەنوسم روون دەبێتەوە بە تاکی کاک (ئازاد) ببینم، یاخود بە نامە پەیوەندی پێوە بکەم. ئەوانیش بە زوویی هەوڵ بدەن بۆ چۆنێتیی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ (مام جەلال)! ئیتر بەو شێوەیە سەرە داوەکانی هەموو رێکخستنەکان خرانە بەر دەستی کاک (ئازاد) خۆی! لەو بڕیارەش ئاگادارم کردەوە، کە بە هیچ شێوەیەک نابێت پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی پێشوو بکەن و لەگەڵ ئەو کەسانەش، کە راستەوخۆ بەسترابوونەوە بە هاورێ گیراوەکانەوە! بۆیە جارێ بە شێوەیەکی کاتی لە هەموو خەتەکاندا ئەو جۆرە کەسانە بپەرێنن و بێ چاوپێکەوتن و ناڕاستەوخۆ بە نامە ئاگاداریان بکەن، کە پشوویەک بدەن تا وەزعەکە روون دەبێتەوە و ئاگری مەترسی دادەمرکێتەوە!

کاک (شەهاب)، پێشنیاریکرد: کە بچینە دەرەوەی وڵات و برۆینە دەرەوە بۆ سوریا، (مام جەلال)یش لە سەردانەکەی مندا بۆ لای داوای کرد بوو هەندێکمان بچینە لای ئەو! کەواتە شتێکی باشە جارێ دوور بکەوینەوە و ماوەیەک مەشقی پێوست وەربگرین و پاشان و دوای چەند مانگێک

لـه بادینانـەوە بـە نهێنـی بگەڕێینـەوە بـۆ تەواوکردنـی ئەرکـی دەسـتە چەکدارەکان! هـاوڕێ (عەلـی بچکـۆل)، ئـەو بڕیـارەی ڕەتکردەوە و ئـەوەی پێشـنیار کـرد، کـە ڕێگـەی شـاخەکانی خۆمـان بگرینـە بـەر و بچینـە شـاخ و سـەروکاری دەسـتە چەکدارەکانمـان بکەیـن و لـە باتـی چوونـە سـوریا، ئەرکەکانـی دەسـتە چەکـدارەکان تـەواو بکەیـن، زۆر باشـترە!
کاک (شـەهاب) سـوور بـوو لەسـەر پێشـنیارەکەی خـۆی و وتـی: بـەو پەلـە پروزێیـە و لـەم گێژەن و بگـر بگـرەدا، لـە توانـادا نییـە پێویسـتییەکان دابیـن بکرێـن و کارەکان بـە وردی و بـە باشـی جێبەجـێ بکرێـن، بۆیـە ئەویـش لەبـار دەچێـت و ناگاتـە مەبەسـت! ئاخـر هەمـوو نهێنییەکانـی ڕێکخسـتن لای ئێمەیـە، چوونـە شـاخ و مانـەوە لـە شـار، واتـە مانـەوە بـەو هەمـوو نهێنیانـەو بـەو هەمـوو ئەمانەتـەی ڕێکخسـتنەوە لـە بەردەمـی ئەگـەری دەسـگیر کردنمانـدا، کارێکـی هـەروا ئاسـان نییـە! هاوڕێیـان.. ئـەم (کۆمەڵـە) یـە، ئەمانەتێکـی گـەورەیـە لـە ئەسـتۆمانـدا، دەبێـت بیپارێزیـن، بـا زیانـەکان لـەم سـنوورەدا بووەسـتێت و نەبێتـە هـۆی دارمانـی (کۆمەڵـە)!
(عەلـی بچکـۆل) : ئەمـە حەشـارگەیەکی نـا ئەمینـە، بـا بچیـن لـە شـاخ حەشـارگەیەک دروسـت بکەیـن و کـاری گرنگتـر بکەیـن!
کاک (شـەهاب): لـە شـاخیش لـەم هەلومەرجـە سـەختەدا مانـای گەیشـتنە شـوێنێکی قایـم و ئەمیـن نییـە، بەڵکـو چوونـە شـاخ و پەیوەنـدی کردنەکانتـان بـۆ ڕێکخسـتنی مەفرەزەکان و دابینکردنـی پێداویسـتییەکان و پەیوەندیـی تـری ریکخراوەیـی، جۆرێکـە لـە جـاڕدان بـە دەنگـی نـزم! ئاخـر بڵاوبونـەوەی هەواڵـی ئـەو کـارە و گەیشـتنی بـە گوێـی دەزگا ئەمنییـەکان، دەبێتـە هـۆی ترسـاندن و هـار کردنـی ڕژێـم و هەنگاوی تـری ڕژێـم کـە جـارێ حسـابمان بـۆ نەکـردووە! بۆیـە ئەویـش هـەوڵ دەدات بـە هـەر شـێوەیەک بێـت هەندێکمـان لـێ دەسـگیر بـکات، ئـەو کاتـە هەمـوو ئاینـدە

و (کۆمەڵە) دەکەونە مەترسییەوە ! بۆیە رۆیشتن و دوور کەوتنەوە و لە پاشدا زانینی خەڵک و رژێم، کە ئێمە گەیشتووینەتە سوریا، ئەوا ئەنجامێکی وا دەخاتەوە، کە دەزگاکانی رژێم نائومێد بکات لە سۆراخ کردن و گەڕان بە شوێنماندا! ئیتر بەو جۆرە سۆراخ کردن و پەیداکردنی نهێنییەکانی (کۆمەڵە) بۆ دەزگاکانی رژێم، کارێکی زەحمەت دەبێت!

شەهید (جەعفەر)یش هەندێ بیروڕای باس کرد، بەڵام لە بەردەم لۆجیکی بیرۆکەکەی کاک (شەهاب)دا، خۆیان نەگرت!

بە دوو قۆلی و بە تەنها بە کاک (شەهاب)م وت : تۆ خۆت من دەناسیت، ئەم ماوەیەش بۆت دەرکەوت، کە من جێگەی حەوانەوەم زۆرە، بەنهێنی تەگبیرێک بکە، برادەرانیش دەزانن من بمێنمەوە و بە شێوەیەکی دیاریکراو ئاگاداری ئەو کۆمیتە تازەیە بم، پێموایە خراپ نییە! سەرەتا وتی باشە با بزانین کارەکان چۆن دەڕۆن، بەڵام لە دواییدا رای گۆڕی و وتی: واز لەو هاوڕێیانە بهێنن با خۆبەخۆ کارەکانی خۆیان بەڕێوە بەرن، بەمەش سەلامەت تر دەبن و رەنگە لە ئێمەش باشتر کارەکانی خۆیان بکەن!

رۆژێکیان کاک (عومەری سەید عەلی) پێی وتم : هاوڕێیەکمان لە خانەقینەوە هاتووە، وابزانم فرمانی گرتنی هەیە، باش وایە ببینی و عیلاجێکی جێگە و رێگەی بۆ بکەیت. منیش لەو سات و کاتەدا، کە بۆم دیاری کرابوو ئەو هاوڕێیەم بینی ناوی (حیکمەت محەمەد کەریم) بوو، ئێستا ناوی کاک (مەلا بەختیار)ە، کە چاوم پێی کەوت کوڕێکی وریا و بەورە هاتە بەر چاوم، پرسیارم لێکرد کە بۆ لە خانەقین خۆی نەشاردۆتەوە و هاتۆتە سلێمانی، لە وەرامدا وتی : ئەم گرتن و دەنگوباسە ناخۆشانە هەن، حەزم کرد بێم کەسێکی بەرپرس

ببینم و لێی حاڵی ببم، کە ئەم دۆخە بەرەو کوێ دەڕوات! قسە و باسەکانم لە گەڵیدا زۆر بابەتی گرتەوە، چونکە هەستم کرد نیگەرانە لەسەر ئایندەی (کۆمەڵە) و خۆش پرسیارە! منیش لەسەر هەلومەرجی خانەقین پرسیارم لێکرد، دیم کوڕێکی حازر جواب بوو، دیمەنێکی جوان و باشی خستە بەر چاوم، بەڵام چونکە ماڵی خوشکی لە هەولێر بوو، هاتبوو سەردانێکی ئێمەش و ئەوانیش بکات! ئیتر داوای لێکردم لە سلێمانی حەشارگەیەکی بۆ پەیدا بکەم و ڕێی نیشاندەین چی بکات، پێم وت هەفتەیەک لە ماڵی خوشک و هاوڕێکانت خۆت مات بکە، دوای ئەوە کەسێک دێت و پەیوەندیت پێوە دەکات و بۆ ئەوەش ناونیشانێک بۆ خۆناساندن و بڕوا پێکردن بە تۆ دەڵێت!

منیش بە (خاڵە بەکر)م وت، کە تەگبیرێک بۆ ئەو لاوە (مەلا بەختیار) بکات! ئەویش لە پاشان لە ماڵی خۆی گلی دایەوە و بە ناوی (بەختیار) ی ئێمەوە ناوی (بەختیار)ی لێنا. لەبەر ئەوەی کە ئەو هەرزەکاریش بوو، تاکوو خەڵکی گەرەک زۆر پرسیاری لەسەر نەکەن، بە خەڵکەکەی وتبوو ئەوە (بەختیار)ی خوشکەزامە و خیزانەکەشی هەر بەوشێوە تێگەیاندبوو. لە ئایندەشدا بوو بەو (مەلا بەختیار) ەی، کە ئێستا پیاوێکی تێکۆشەر و ناودارە!

کاک (شەهاب)، یەکێک لە دۆستە باوەڕ پێکراوەکانی، کە ناوی (هادیە سوور) بوو، نارد بۆ بەسرە بۆ لای هەندێ لە دۆستەکانی خۆی، تا بزانن لەوێ تەگبیریکمان بۆ ناکەن بۆ دەرچوون لە وڵات! زۆری نەبرد کاک (هادی) بە بێ ئەنجام هاتەوە، ئیتر نائومید بووین لەوەی لە ڕێگەی بەسرەوە بەرە و کەنداو ڕێگەیەک بۆ دەرباز بوون پەیدا بکەین! – (هادیە سوور)، کە (هادی محەمەد ڕەشید)ی سابوونکەرانە، ئەفسەری پۆلیس و پێشمەرگە و کادریی شۆڕشگیرانیش بوو لە شۆڕشدا – !

کاک (شـەهاب)، لەسـەر سـەفەر سـوور بـوو، بـەو مەبەسـتەی بگەینـە تـاران و لـە ڕێگـەی سـەفیری سـوریاوە هـەوڵ بدەیـن بگەینـە لای (مـام جـەلال). بەرهەڵستی و ڕای جیاوازیش لـە ڕوویدا نەوەستا و هەمـوو لـە ڕایەکانـی پێشـوومان کشـاینەوە، بـۆ ڕا و تەگبیرەکـەی ئـەو! ئیتـر (خاڵـە بەکـر و عومـەری سـەید عەلـی)، لـە قوڵـی خۆیانـەوە کەوتنـە جموجـوڵ و ڕێکخسـتنی سـەفەرەکەمان! بەرنامـەی سـەفەر و قاچاخچـی و ڕێگـە و شـوێن دانـرا، ئێـوارەی ١٩٧٥/٩/١٤ (شـەهاب شـێخ نـوری، جەعفـەر عەبـدول واحیـد، عەلـی محەمـەد قـادر - عەلـی بچکـۆل - عومـەر سـەید عەلـی و فەرەیـدون عەبدولقـادر) کەوتینـە ڕێ!

شـەهید (وەسـتا بەکـر) ی دارتـاش ئـەو ماوەیـە زۆر پیاوانـە و لێـزان و نەترس هەمـوو کارەکانـی بـۆ ئاسـان کردین، لـە ئێوارەی سەفەرەکەشماندا، لەگـەڵ چەنـد کەسـێکی تـر یاوەرییـان کردیـن تـا هەنـدێ لـە قـەراخ شـار دەرچوویـن، کـە یەکێکیـان وەسـتا (عەبـدول)ی بـرای شـەهید وەسـتا (فایـەق)ی خزمـم بـوو، کـە باوکـی شـەهیدان (سـەردار و هوشـیارو سـالار ) ە، پیاوێکـی قارەمـان بـوو، کاتـی خـۆی لەگـەڵ کاک (مـەلا بەختیـار)و هاوڕێیانـی تـردا لـە لێدانـی پارێـزگاری سلێمانی بەشـدار بـووە!

سـەفەرەکەمان بـەرەو شـارباژێڕ و ڕوو لـە سـنووری ئێران بـوو، وەسـتا (عەبـدول) دوور و نزیـک بـە تراکتۆرێکـەوە دوامـان کەوتبـوو، ئیتـر لـە هەورازەکانـدا هاتـە لامـان و لەگەڵـی سـوار بوویـن، هەمـوو پێنـج کـەس بوویـن لەگـەڵ کابـرای قاچاخچـی سـوار بوویـن تـا گونـدی (سـیرین) ی سیوەیلی شـارباژێڕ، لـەوێ لە ماڵـی (شـێخ عەلـی سیرین) کە دوایـی بـوو بە ئامـر فەوجـی جـاش، ماینـەوە! لە نـاو باخـە قۆخـەکان لـە سـیرین خۆمـان حەشـار دابـوو، کـە سـەربازەکانی ڕەبیەکـەش دەهاتنـە نـاو دێکـەوە!

تەگبیـری ئێمـە لەگـەڵ کابرای قاچاخچیدا، کە (عەزیـز)ی نـاو بـوو، وانەبوو

که له سیرین مەحتەل بین! بەلام لەوێ کەوتنە منە منج و لەناو خۆیاندا دوو سێ کەس بوون و هەر بەیەکدا دەهاتن و دەچوون و نیگەرانییان پێوە دیار بوو! قاچاخچییەکان دەستەیەک بوون، یەکێکیان لە دیوی عێراق بەرپرسیاری لە ئەستۆ بوو، ئەوانی تریش لە دیوی ئێران بەرپرسیار بوون! (عەزە) ناوەکە هەر زوو خۆی بزر کرد، ئەوانی تریش کە ناسیاوی (شێخ عەلی سیرین) بوون، کەوتنە سۆراخی و ئەو چەند رۆژە لەوە زیاتر، کە وتیان.. چەند رۆژێکە فڕۆکەی هەلی کوپتەری عێراقی و ئێرانی لە ناوچەکەدا دەڵێی جاو دەنێنەوە و هەر فڕکەیان دێ! رێگەکەی (بلەکێ) ش، شەوانە کەمینی کەوتۆتە سەر و ئەمین نییە و دەبێت چاوەڕوان بین، ئێتر هیچی تریان پێ نەوتین! ئێمە پرسیارمان کرد کە ئاخۆ لەوەوپێش وابووە، وتیان نەخێر دنیا کش و مات بووە، بەلام دەڵێن.. قایمقامی چوارتایە هاتوچۆ بۆ ئەو دیو دەکات! لە راستیدا قسەکەیان نەچوو بە عەقڵماندا، بەلام تازە رێگەیەکی تر پەیدا نابێت! دواجار شەوی ۱۸ لەسەر ۱۹/ ئەیلولی ساڵی ۱۹۷۵ بەسەر شاخدا سەریان خستین، هەورازێکی کەمەر شکێن و سەخت بوو، گەیشتینە لوتکەی هەورازەکە پشوویەکیان پێداین و کەوتینەوە رێ، لەو راستە رێیەی شۆڕ دەبووەوە بۆ ناو دێی (چەمپاراو)، لەوە زیاتر ئێتر قاچاخچی نە دەنگی ما، نە رەنگی! تا لەپڕ جەندرمەی ئێرانی دەنگی : (ئیست) یان لێ کردین و هەر پێنجمان (شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدول واحید، عەلی بچکۆل، عومەر سەید عەلی و فەرەیدون عەبدولقادر)، دەسگیر کراین و براینە بارەگای پۆلیسی سنوور لە چەمپاراو! ئێتر بەو نیوە شەوە دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لە گەڵماندا. زۆربەی پۆلیسەکانیش کورد و لێپرسراوەکانیشیان تورک بوون! ئەو شەوە هەوڵێکی زۆرمان لەگەڵ کوردێکیان دا، بە پارە

ئازادمان بکەن و دەستمان لێ بەرەڵا بکەن، ئەویش لە ترسی کابرایەکی باشچاوەشی پۆلیسی تورک، نەیوێرا هیچمان بۆ بکات!

پێشتر کە هێشتا لە ناو گوندەکەدا بووین، بۆ ئەگەرێکی لەم جۆرە بیرمان کردبووەوە و قسەکانمان کردبوو بە یەک. ئەوانیش پرسیاری زۆریان لێکردین و ئێمەش دەمانگوت : ئێمە کاتی خۆی پێشمەرگە بوین، لە سەر بەڵێنەکانی پاش ڕێکەوتنی جەزایر ڕۆیشتینەوە، بەڵام ماوەیەکە حکومەت دەستی کردووە بە خەڵک گرتن، هەوڵیان دا ئێمەش بگرن، ئێمەش رامان کرد و هاتین بۆ ئێرە! ڕۆژی دوایی لە (چەمپاراو) بۆ بانە و لە بانە بۆ سەقزیان بردین، بەشی ساواکی سەقز لێکۆڵینەوەی وردیان لەگەڵ کردین و لە دوایین مەنزڵدا لە زیندانی سەقز گیرساینەوە! ئەوان گومانیان لە هەموو کەسێک بوو، کە لە دیوی عێراقەوە بچێتە ناو ئێران، لەو کاتەدا بۆ ئەوە دەچوون گرووپەکانی ئۆپۆزیسیۆنی خۆیان کاری تەقینەوە و ئیشی تیرۆر بکەن و ئەو دۆخە نۆییە بقۆزنەوە و بەمەش نێوانیان لەگەڵ عێراق بشێوێنن و عێراقیان لێ دردۆنگ بکەن! بۆیە ئاراستەی لێکۆڵینەوەکەیان بەو لایەنەدا دەچوو، کە بزانن ئاخۆ کارێکی لەو جۆرەمان بە دەستەوەیە یان.. نا! پاشان ڕەوانەیان کردین بۆ زیندانی سەقز و بە پەروەندەیەکی پۆلیس بە تاوانی بەزاندنی سنوور مەسەلەکەیان جووڵاند بۆ ئەوەی ڕەوانەی دادگا بکرێین!

زیندانی سەقز ناسرا بوو بە زیندانی پۆلیسی سەقز، قاوشێکی گەورە و دوو ژووری بچووکی تێدا بوو، بە حساب بۆ ژووری جیاکردنەوەی تاکە کەسی و بۆ زیندانی تاوانی قورس و سزای گەورە بوو، کە بە شیش جیا کرابوەوە، سیخناخ بوو لە خەڵکی گیراو! هەندێ لەوانە دادگایی کرا بوون و حوکم درابوون، هەندێکیشیان بۆ ماوەیەکی کورت

لەوێ مابوونەوە، ئیتر زۆربەی گیراوەکان لەسەر تاوانی ئاسایی و نا سیاسی بوون، ژمارەیەکیش سیاسی بوون و لەسەر گومان یا لەسەر (حیزبی دیموکرات) و لایەنی سیاسی تر گیرا بوون. بەو کەسانەیان دەوت زیندانی (شا)! گیراوەکانی (کۆمەڵە)ش، لە یەک دوو کەس تێپەری نەدەکرد!

زیندانەکە بەڕێوەبەرێکی هەبوو، ئەفسەرێک بوو کە پلەکەی عقید بوو! بەڵام کەسی هەمە کارە و ئەوەی پەیوەندی راستەوخۆی بە رێکخستنی زیندانییەکان و ئاسایشی ناو زیندانەوە هەبوو، پۆلیسێکی کورد بوو، (سەر گروبانیان) پێدەوت، کە مفەوەز یا جێگری ئەفسەری لای خۆمانی دەگرتەوە، ناوی ئاغای (رەزاقی) بوو، پیاوێکی بە ئیدارەو ژیر بوو! بە رواڵەت پیاوی دەوڵەت بوو، بەڵام لە ناخیدا پیاو چاکی تیا دەبینرا. لە ساڵانی دواییشدا دەرکەوت کوڕێکی (کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران) بوو، خۆیشی لەناو خەڵکیدا بە چاکە باس دەکرا. ئەوانی تریش مفەوەز و باشچاوەش و عەریف و پلەداری لە ئەفسەر بچووکتر بوون!

بیرم دێت یەکێکیان لەسەر سنگی نوسرا بوو (مەحمودی ئازاد)، لە ئاخاوتنێکیدا وتی.. بەو ئازادە تێمەکەون، چونکە من ئازاد نیم! لەو زیندانەدا لە ١٩٧٥/٩/٢٠ تا رۆژی ١٩٧٥/١٢/٢٩ماینەوە، جارێک نەبێت، کە بردینیان بۆ ئیدارەی ساواکی شاری سنە لەوێ لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردین و فایلیان بۆ دروست کردین، ئیتر بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر لەوێ بووین!

یەکەم رۆژ، کە پێڵاوی غەریبیمان لەو زیندانەدا داکەند، پاش ئەوەی چەند زیندانییەکی دەست رۆیشتوو گوێیان لە ئاغای (رەزاقی) بوو، کە پرسیاری لێکردین و ئێمەش وەرامان دایەوە، کە پێشمەرگەی شۆڕش بوین و پاش کارەساتەکە گەڕاوینەتەوە بۆ وڵاتی خۆمان، بەڵام سەر

لەنوێ رژێمی (صدام) ویستی بمانگرێ و ئێمەش هەڵهاتووین، ئیتر هەم (رەزاقی) خۆی و هەم ئەو کۆمەڵە زیندانییەش بە چاوی رێزەوە تەماشایان دەکردین! ئەو زاتانە ناسراو بوون، پاشان زانیمان ناویان (عەباسی قوچالی، ئەمیر سۆسەنی و رەحیم ) بوون. (عەباسی قوچالی)، بەرێزەوە پێشوازی لێ کردین و لە یەکێک لەو دوو ژوورەی زینداندا بوو، کە باسم کرد، کەسێکی لەگەڵ بوو بە ناوی (سفرە داشی، هاو سفرە)، بەڵام لە راستیدا خزمەتی (عەباسی) دەکرد! لە ناو زینداندا کەسێکی تر هەبوو بە ناوی (محەمەد)، کە لەبەر ئەوەی دەنگی خۆش بوو لاسایی هونەرمەندی گەورە (محەمەدی ماملێ)ی دەکردەوە، پێیاندەوت (ماملێ)! بەڵام ئای چ جیاوازییەکی گەورە لەنێوان کەسایەتی (ماملێ)ی هونەرمەند و ئەم مامڵێیەی زینداندا هەبوو! رۆژێکیان (قوچالی) لە (حەمە)ی پرسی، نیوەڕۆ چیمان هەیە، گوێم لێ بوو وتی (یارل ماسی)، منیش وامدەزانی دەڵێت ماسیمان هەیە، بە دڵخۆشییەوە بە شەهید (جەعفەرم) وت خواردنەکەمان بەسەر ئەو برسیەتییە زۆرەماندا زۆر خۆشە، ئەویش وتی باشە تۆزێک پیاز و تەماتەشی بۆ بجنە!

کە خواردن هات و لە قاپەکاندا رۆکرا، بینیم پەتاتەیە، بەڵام نەک وەک ئەوەی لای خۆشمان، بەڵکو بە توێکڵەوە لێیانناوە، ئیتر هاتمەوە سەر سفر! چونکە من هەر بۆ خۆم بە تەبیعەت حەزی لێناکەم و ناچارییش نەبێت نایخۆم، دەوەرە ئێستا بە توێکڵیشەوە لێنرابێت ! شەهید (جەعفەر)یش بە لاقرتییەوە دەیوت.. بخۆ ماسی زیندان زۆر خۆشە!

دوای نان خواردن چای روونی ئێرانیشمان بە سەردا کرد، ئەنجا (عەباسی قوچالی)ش جارێکی تر بە شێوەی خۆی کەوتە لێکۆڵینەوە و پرسیار کردن! کاک (شەهاب) لە هەموومان گەورەتر بوو، بەشێوەی

جوانی خۆی جوابی دایەوە، ئیتر (عەباس) تێگەیشت، کە ئێمە کۆمەڵێک تێکۆشەری گەلەکەمانین و بە خۆڕایی و لەخۆوە هەڵنەهاتووین! لەو رۆژەوە زۆر بە رێزەوە ئاگای لێمان بوو، لە قسەکانیشیدا وریای کردینەوە، کە گوایا زیندانەکە دزی تێدایە ئاگاداری سەعات و گیرفانی خۆمان بین، لە کاتێکدا خۆیشی لەسەر دزی و ماڵ بڕین گیرا بوو! ئێمە کەس نەبوو بێتە سەردانمان، بەڵام (عەباس)، رۆژی چاو پێکەوتن خەڵکێکی زۆر دەهاتن بۆ لای، ئەویش شتەکانی خۆی و هی چەند برادەرێکیشی کۆ دەکردەوە و دەیخستە بەردەستی کاک (شەهاب) و دەیگوت.. خاڵە (شەهاب)، تۆ خۆت بەسەر خەڵکە شایستەکەدا دابەشی بکە!

(قوچالی)، زۆر قسەی بۆ دەکردین و سەرگوزەشتەی خۆی بۆ دەگێراینەوە، ئیتر زانیمان کە ماوەیەکیش لە زیندانی ( قزڵ قەلا ) ی تاران لەگەڵ تێکوشەری ناسراوی (حیزبی دیموکراتی ئێران، غەنی بلوریان و کاک جەلیلی گادانی) زیندان بووە و شتی باشیان لێ فێربووە و خۆی وتەنی، ئەوانە لە زیندانا قوتابخانە بوون بۆ زۆربەی زیندانییەکان! خاڵە (شەهاب)یش زۆر ئامۆژگاری باشی (قوچالی) دەکرد. ئەو پیاوە ئالوودەی تلیاک و خواردنی حەبی بێهوشی بووبوو، کاریگەری باشی لەسەر دانا و ماوەیەکی باش وازی لەو خووە خراپە پێهێنا! خاڵە (شەهاب)، لای زۆربەی زیندانییەکانی سەقز، خۆشەویست بوو رێزێکی زوریان لێدەگرت. بەهۆی هەندێ لەوانەوە، کە ئازاد دەبوون هەوڵی دەدا دەنگمان بگات بە لێپرسراوە ناودارەکانی (پارتی)، بێ ئەوەی کەسیان بە دەنگمانەوە بێن! کەچی من هەر بەهۆی ئەوانەوە هەندێ خزمی سابڵاخیمان هەبوو، هەواڵم بۆ ناردن خێرا بە دەنگمانەوە هاتن و چەند جارێک سەردانیان کردین!

لە دەرەوەی زیندان و لە ڕێرەوی نەخشەی سەر لەنوێ ڕێکخستنەوەی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) دا، کاک (ئاوات عەبدول غەفور)، تێکەڵ ئیشەکانی کاک (ئەرسەلان و عوسمانی نانەوا) بووبوو. وەک ئێمە نەخشەمان بۆ کێشا بوو، بە ئاسانی و بە بێ کیشە کارەکان دەچوونە پێش! بەڵام کاک (ئاوات) (ئەرسەلان) ڕازی دەکات، کە ئەوانیش شوێن ئێمە بکەون و هەمان ئەو ڕێگە بگرنە بەر، کە ئێمە گرتمان! ئیتر لە سلێمانییەوە بە ڕێگەی هەمان دۆستانی ئەوکاتە، دەکەونە ڕێ و یەکسەر دێنە (چەمپاراو)، ئیتر ئەوانیش دەسگیر دەکرێن و پاش لێکۆڵینەوە و تێپەڕاندنی قۆناخەکانی بانە، دەیاننێرنە زیندانی سەقز! پاش چەند هەفتەیەک بووین بە حەوت کەس (ئەرسەلان بایز، ئاوات عەبدول غەفور، شەهابی شێخ نوری، عەلی بچکۆل، جەعفەر عەبدول واحید و عومەری سەید عەلی و فەرەیدون عەبدولقادر)، ئیتر پێکەوە هەر حەوتمان هاوڕێ و سفرەداشی یەکتر بووین!

جارێکیان لە گۆڕینی بەڕێوەبەری زیندان بە کەسێکی تر، ئەفسەرێکی تر هاتە شوێنی، ئەویش وەک کەسێکی نوێ، کە تازە هاتووە ویستی توانای خۆی دەربخات! دیارە بە باشی زانیبوو هەر لە سەرەتاوە زەبرو زەنگی خۆی بنوێنی، تا باش کۆنترۆڵی زیندان و زیندانییەکان بکات! بۆ ئەوەش لەناو هەموو زیندانییەکاندا (عەباسی قوچالی)، هەڵبژارد و شەڕێکی بێ ئامانی پێفرۆشت، ئەویش بە گەردن ئەستووری خۆی وەرامی بەڕێوەبەرەی دایەوە! گەرچی ڕۆژێکی تۆفان و بەفر بارینی ساردی سەقزی مانگی یانزەی ئەو ساڵە بوو، بەڵام بەڕێوەبەر فەرمانی دا (عەباس)، بە کەلەبچەوە بە داری ئاڵاکەوە ببەستنەوە. ئەویش بێدەنگ و لارەمل نەبوو، بەڵکو لە ئەفسەری بەڕێوەبەر هاتە دەنگ و تووڕە بوو! لەبەرچاومە بە دەنگی بەرز ئەیشیڕاند و جوێنی

بە (جووقەی عەلا حەزرەت)، واتە بە تاج و نیشانی (شاهەنشا)ی ئێران دەدا! کارێکی لەوجۆرەش لەو ڕۆژگارە و لەو شوێنەدا هەروا ئاسان نەبوو، ئاخر کەم بوون ئەوانەی وا ئازا و بوێربن و جنێویان بگاتە ئاستی (شاهەنشا)! بیرم دێ لە ترسی ئەوەی نەک دوایی بڵێن، گوایا ئەوانیش گوێیان لەو جنێوانە بووە، هەموویان چونە دەرەوە و خۆیان بوارد لە گوێگرتن، چونکە دەیانوت گوێ گرتنیش لە شتی وا سزای خۆی هەیە!

ئەنجا بەو سەرمایە لە چاڵێکی کۆنکرێتیدا، کە داری ئاڵاکەی لێ چەقی بوو (عەباس)یان بە سنگی روتی و بە کەلەپچە بەستەوە! ئەویش نەیکردە نامەردی بە تەکانێک پیرە کەلەبچەی پساند و هاتە دەرەوە! ئەو ڕۆژە هەموو زیندانییەکان خۆشحاڵ و ئەفسەریش مات و شکست خواردە گەڕایەوە ژووری خۆی.دوایی ئاغای (رەزاقی)، بەحیکمەت و ئارامیی خۆی ئەو بارە گرژەی خاو کردەوە.

ئێمە بۆ خۆمان لە ناو زینداندا کاتی خۆمان بە باشی ڕێک خستبوو، شەهید (جەعفەر) زمانی ئینگلیزی فێری کاک (عەلی) دەکرد و ڕۆژانە دەرسی پێ دەوت، منیش گەرچی کەمێ ئینگلیزی ساڵانی خوێندن و زانکۆ فێر بووبووم، دەرفەتێکی چاک بوو گەشەی پێبدەم و سوود لە شەهید (جەعفەر) وەربگرم! کاتێکی زۆریشمان بە خوێندنەوە دەبردە سەر و هەندێکیش زمانی فارسی فێر بووین، بەڵام بە پلەی سەرەکی خۆمان بە وەرزشەوە مەشغوڵ دەکرد! زیندانەکە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، جێگەی وەرزش بوو، ئێمە بەیانییان زوو ڕاکردنمان تیا دەکرد و زوو زووش خڕ دەبوینەوە و قسەمان لەسەر دەرفەتی ڕاکردن دەکردەوە، چەند ڕۆژێکیش پێش ئەوەی تەسلیممان بکەنەوە بە عێراق، کۆبووینەوە و بڕیارمان دا ئەگەر لە ڕێگە کەمێ دەرفەت

پەیدا بێت رابکەین و خۆمان بە دەستەوە نەدەین!
لەو ماوەیەدا چەندین نامەمان ناردە دەرەوە، هەوڵێکی زۆرمان دا دەنگمان بگات بە یەکێک لە لێپرسراوە کوردەکانی (پارتی)، بە راسپاردەی راستەوخۆی منیش، کە خزمە سابڵاخییەکانم هاتنە لامان بۆ هەمان مەبەست راسپاردەم کردن، هەرچەندە ئەوانیش زۆر بە سەختی توانیبوویان دەنگی خۆیان بگەیەنن بە وانەی تاران و نەغەدە، بەڵام بە داخەوە کەس نەهات بە دەنگمانەوە! زۆربەی تەقەلاکانیشمان رووی لە خوالێخۆشبوو (ئیدریس بارزانی و دکتۆر مەحمود عوسمان) بوو، بەڵکو کارێکی وا بکەن هەوڵێکمان بۆ بدەن، تەسلیم بە رژێمی (صدام)مان نەکەنەوە، بەڵام بێهودە بوو! دوای ئەوە چەندین داوا و نامەشمان نووسی بۆ لایەنە فەرمییەکانی ئێران، کە تەسلیم بە رژێمی (صدام)مان نەکەنەوە و بە گوێرەی یاسا نێو دەوڵەتییەکان و وەک کەسێکی سیاسی، کە لە دەست گرتن و کوشتنی رژێمێکی زۆردار رامان کردووە رەفتارمان لەگەڵ بکەن، کەچی هیچی سوودی نەبوو!
لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٧٥ دا، هەر حەوتمانیان بە تاوانی بەزاندنی نا یاسایی سنووری ئێران دەست بە کەلەبچە، رەوانەی دادگایەکی سەقز کرد. لەوێ حاکمەکە پیاوێکی باشی سابڵاخی بوو، بە داخەوە ئێستا ناوەکەیم لەبیر نەماوە، کە گوێی لێگرتین و زانی کێشەکەمان چیە و چ مەترسییەکی گەورە لە عێراق چاوەڕوانمان دەکات، تێگەیشت و هاوسۆزیی نیشاندا! بۆیە پۆلیسە پاسەوانەکانمانی کردە دەرەوە و بە تەنها لە گەڵمان مایەوە و کەوتە قسە کردن لەگەڵمان ! ناردی هەندێ کاڵەکی شیرینیان بۆ هێناین و بە قاش کراوی و لەسەر سینیەک بۆیان داناین تا بیخۆین! دوایی پێی وتین: من هیچم لەدەست نایە، بە داخەوە هەلومەرجی ناو ئێرانیش

تـا ئێسـتا لـە قازانجتـان نەبـووە، ئێوە بـۆ خۆتـان دەتوانـن باشـتر وەزعـی خۆتـان و هەلومەرجـی عێـراق و گۆڕانکارییـەکان هەڵسـەنگێنن، چونکـە بـە پێـی یاسـا هێنـدە دەسـەڵاتم هەیـە، کـە لـە ١١ ڕۆژەوە تـا یـەک سـاڵ گلتـان بدەمـەوە، ئیتـر بـواری پێدایـن کـە لـە نێوخۆمانـدا تەگبیـر بکەیـن و دواجـار بـەو بڵێیـن مـاوەی زیندانیمـان چەنـد بێـت بـۆ ئێمـە قازانجـە! ئێمـەش بـەدەم کاڵـەک خواردنـەوە هەمـوو ئەگـەرە بـاش و خراپـەکان و ئـەو گۆڕانکاری و پێشـهاتانەی بە بیرمانـدا هـات، تاووتوێمـان کـرد! حاکم ڕای وابـوو زۆرتریـن مـاوە بمێنینـەوە تـا بتوانیـن لـەو ماوەیـەدا هەوڵێـک بدەیـن دەروازەیـەک بکرێتـەوە بـۆ کێشـەکەمان، بەڵکـو وا بکـرێ تەسـلیم بـە عێراق نەکرێینـەوە! ئێمـەش ئـەو لایەنـەو گۆڕانکارییەکانـی کـە ئاگامـان لێیـان بـوو، ئـەو دوو لایەنەمـان لێـک دەدایـەوە. ئـەو ڕۆژەی لـە دادگادا بوویـن جووڵانـەوەی چەکداری و هەڵگیرسـانەوەی شـۆڕشـی نـوێ هێشـتا دەسـتی پـێ نەکرد بوو، بـەڵام دەمانزانی لـە چەند مانگی ئایندەدا دەست پێدەکات. ئیتـر وتمـان جـا ئەگـەر هـەر تەسـلیم بکرێینـەوە، بـا لانـی کـەم لەکاتـی جووڵانـەوەی چەکـداری و ململانێـی توندوتیـژی سیاسـیدا نەبێـت، بـۆ ئـەوەی سـەرانی ڕژێمـی عێـراق تونـد ڕەفتارمـان لەگـەڵ نەکـەن و بـە ڕقـی قینـاوی و زەبـرو زەنگتـر تەماشـای کەیسـەکەمان نەکـەن و نەیبەسـتنەوە بـە بەکارهێنانـی چـەک و شـۆڕش و پێشـمەرگایەتییەوە، بەڵکـو وەک لـە هەلومەرجـی ئاسـاییدا و بـە جۆرێکـی تـر ڕەفتـار لەگـەڵ حاڵەتەکەمانـدا بکـەن! بۆیـە ئەوەمـان پـێ بـاش بـوو مانەوەمـان نـە زۆر بێت و نەکەم، تەنهـا یـەک دوو مانگ دەرفەتـی ترمـان بـۆ تەقـەلای زۆرتـر و پەیوەنـدی و هەوڵـی زیاتـر هەبێـت، ئیتـر بەسـە! لەبـەر ئـەوە ئەوەنـدەی زیندانیکردیـن، کـە لـە نزیـک کۆتاییەکانـی سـاڵی ١٩٧٥دا، زیندانییەکەمـان تـەواو بێت!

ئەو حاکمە پیاوێکی باش بوو، لە چەندین نووسین و چاو پێکەوتنی تردا، باسی ئەو چاکەیم کردووە و پێیشم وایە لە ناخەوە هەست و دڵی زۆر زیاتر لە گەڵمان بوو، بەڵام لە ترسی (ساواک) و لە ترسی چەوسانەوەی نەتەوایەتی، هەر ئەوەندەی بۆ کرا کە کردی! تا ئێستاش لای من تامی ئەو کاڵەکەی کە لە ژوری حاکم و لەکاتی دادگایی کردنەکەدا بۆ ئێمەیان هێنا، خۆشترین تامی کاڵەک بووە، کە لە ژیانمدا خواردبێتم! ئاخر هەر خۆم دەزانم بۆن و بەرامەی ئەو کاڵەکە و هەستی نەتەوایەتی و پڕ ویژدانی حاکم، کە لە چاوەکانیا و لە قسەکانیدا دەدرەوشانەوە، چۆن ئاوێتە بووبوون! ئەو رۆژە و ئەو دیمەنە یەکێکە لە بیرەوەرییە هەرە شیرینەکانی رۆژانی تاڵیم، کە هەتا ماوم لە بیرم ناچنەوە!

ئیتر دوای ئەوە چەندین هەوڵ و تەقەلای ترماندا، بەڵام هەر وەک ئەوانەی پێشوو، هیچ ئەنجامێکیان نەبوو! بۆیە وەک بیرم مابێت لە رۆژی ١٩٧٥/١٢/٣٠ دا بە سواری ئۆتۆمبیل و بە پاسەوانییەکی زۆرەوە بردینیان بۆ شارۆچکەی مەریوانی نزیک سنووری سلێمانی، ئەو شەوە لە گرتوو خانەیەکی سەربازیدا گلیان داینەوە، زیندان هێندە چۆل و سارد بوو هیچ پێخەف و جێگەیەکیشی لێ نەبوو، کە لە زیندان بچێت! لەوێ ئەفسەرێکی باش هەندێ پەتووی سەربازی بۆ ناردین، منیش لە پاداشتا هەندێ تابلۆی جوانم بە قەڵەم کێشابوو، بە خەڵات بۆم بەجێ هێشت! زیندانە بە رینەکە و ساردییەکەی ناچاری کردین جگە لە کاک ( شەهاب)، کە قاچی لەجێ چووبوو، ئێمە هەر بە پێوە هاتوو چۆ بکەین. ئیتر بەدەم هاتوچۆوە نەخشەیەکمان دانا، کە لەودیو لە نێوان مەخفەری پۆلیسی بناوەسوتە و پێنجوێندا چۆن رابکەین، وشەی نهێنی دەسپێکردنمان دانا، کە هەرچۆنی بێت رابکەین! کەچی رۆژی

دوایی بە نمایشێکی ناشیرین و دزێو تەسلیم بە عێراقیان کردینەوە و پێش ئەوەی لە ئۆتۆمبیل دامان بەزێنن، ئۆتۆمبێلێکی پڕ لە سەرباز ئەم دیوو ئەو دیویان قایم لێگرتین و بەرزاییەکانیان گرت، لە بەرامبەریش و لەوبەرەوە وەک بەرەی شەڕ ڕێک بخەن، پۆلیسی عێراق بە هەمان دیمەن دامەزران. پاش ئاڵوگۆڕی نووسراو لەنێوان هەردوولا، لە ئۆتۆمبیل دایان بەزاندین و ریزیان کردین و لەم دەستەوە رادەستی ئەو دەستیان کردین!

## ئێران رادەستی رژێمی (صەدام)ی کردینەوە!

ئەگەرچی بەفر بەتەواوی زەوی سپی کرد بوو، دنیاش سارد و سەرما و سۆڵەیەک بوو، نەبێتەوە. کەچی هەر ئەو ئێوارەیە لەو خاڵە سنوورییەی پۆلیسەوە بەرەو پێنجوین بەڕێیان کردین!چەند پۆلیسێک لە پێشەوە و هەندێک لە پشتمانەوە و لەملاو لاشەوە پۆلیس بە پێ دەڕۆیشتن، سەرما گوێی دەتەزاند، بڕوا ناکەم حاڵی پۆلیسەکان زۆر لە حاڵی ئێمە باشتر بووبێت! بەڵام ئەوەی باش بوو، بەپێ دەڕۆیشتین و هەموو لە جووڵەدا بووین! لەگەڵ هەنگاوەکانماندا کە خرمەی بەفرەکە دەهات، من لە جاران وریاتر بووم و بە هیوای بیستنی وشەیەک بووم، کە لە کاک (شەهاب) یا لە هاوڕێیەکی ترەوە بێت، کە هەموو راسپێردرا بووین وشەی نهێنی دەستپێکردنی پرۆسەی راکردن دەبێت! وابزانم (عەلی بچکۆل)، قسەیەکیشی کرد، بەڵام دیار بوو پەشیمانبوونەوەیەک لەبەر خاتری کاک (شەهاب) روویدا بوو، چونکە قاچی لەجێ چووبوو ئازاری هەبوو توانای خێرا راکردنی نەبوو، بۆیە ئەگەر رامان بکردایە

ئەو بەجێ دەما! خۆشەویستی ئەویش بواری بە کەسمان نەدەدا بە تەنها بەجێی بهێڵین، ئیتر راکردن لەو ئێوارە روو لە شەوەدا، کە بەلای منەوە کارێکی زۆر سەخت و ئەستەم نەبوو، لە دەستدرا! بەوەش رووبەڕووی ئەگەری ئەشکەنجە و لە سێدارەدان بووینەوە و ملی ڕێگامان رووەو ئەو چارەنووسە گرت!

شەوی کۆتایی ساڵ گەیانراینە گرتوخانەی پێنجوێن، کە شوێنێکی زۆر پیس و بێ پێخەف بوو! ئەو شەوە ناخۆشە پڕ لە خەیاڵ و بیرکردنەوەی تاڵ، چاوم بڕیبووە ئەوەی دەستێکی بە هێز بێت و دەرمان بهێنێت لەم دۆخە ناخۆش و ترسناکە دەربازمان بێت! کەچی هێندەی نەبرد سەری ماندوو و جەستەی شەتەک خەو بردیەوە، ئیتر لە شیرین خەودا، بە راکردن و هەڵهاتن و ئازاد بوونەوە خەومان دەبینی! رۆژی دوایی بەهۆی پۆلیسێکەوە هەواڵم نارد بۆ ماڵی هەندێ خزمم لە پێنجوێن، بۆ ماڵی (حاجی سەعیدە سوورە و ماڵی حاجی فەتحوڵای پێنجوێنی)، ئەوانیش هاتنە سەردانمان و پێخەف و پێویستی تەواویان بۆ هێنایان و بەهۆی ئەوانەوە سلێمانی دەنگی دایەوە، کە خاڵە (شەهاب) و هاوڕێکانی تەسلیم کراونەتەوە و لە گرتووخانەی پێنجوێن زیندانین. هەر ئەو رۆژە خێزان و کەس و کاری هەندێکمان هاتنە سەردانمان، لەو چاوپێکەوتنەدا (پاکیزە) خانی خێزانم هەواڵی دامێ، کە (عەلی) برای ئەوو (سالار)ی برای خۆشم و ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێکانمان گیراون و ئەمان لە ئەمنی سلێمانین و ئەوانیش لە ئەمنی بەغدان!

لەوە دەچوو یەک دوو رۆژی سەرەتا هەر بەو جۆرە تەماشای ئێمەیان کردبێت، کە هەندێ خەڵکی سنوور بەزێن بووین و تەسلیم کراوینەتەوە، کەچی لە پڕێکدا رەفتاریان لەگەڵمان گۆڕا و ئیتر ڕێگەی چاوپێکەوتنیان لێ تەنگ کردینەوە، لەوە دەچوو تازە لە ئەمنی

سلێمانییەوە ئاگادار کرابنەوە! ئیتر ئێمە بە پێی توندگرتن یا شل کردنی رەفتاریان لەگەڵمان، دەمانزانی لە سێبەری ئەو رژێمە درندەیەدا چ چارەنووسێ چاوەڕوانمان دەکات! تەنها ئەو ماوەیە خێری ئەوەی هەبوو هەم ئێمە لە دواییین هەواڵەکان ئاگادار بووین، هەم خزم و هاوڕێکانمان بە حاڵ و وەزعی ئێمەیان زانی و هەندێکیش هاو ئاهەنگی نێوانمان رێکخست! ئیترلەوێ زانیمان ئەو هاوڕێیانەی لە گرتووخانەی ئەمنی گشتی گیراون و لە ژێر گیرو گازی لیکۆڵینەوەدان بریتین لە (ئەنوەر زۆراب، حەمەی میرزا سەعید، دارۆی شێخ نوری، جەبار فرمان، سەلام محەمەد برزو، عەلی حەمە موراد، عوسمانی نانەوا، کەمال عەلی مەحمود، ئاسۆی شێخ نوری، حسەین رەزا رەزا، ئەنوەر حەسەن، سەعدون فەیلی، عەبدوڵا عەلی رەشید، فاروق ئەحمەد و محەمەد سابیر کەریم) و چەند کەسێکی تر، کە پاش ماوەیەکی کەم ئازادکراون و شەهید (ئیبراهیم عەزۆ و ئبراهیم عەبد عەلی و ئەنوەر شاکەلی)ش دەربازبوون و چوون بۆ سوریا!

ئێمە کە زانیمان ئەو ژمارە زۆرە گیراون و نهێنیش درکاوە و رژێم بە بوونی (کۆمەڵە)ی زانیوە، ئیتر لە گفتوگۆی نێوان خۆماندا لە پێنجوێن وەک رای جارانمان هەرحەوتمان رێککەوتین لەسەر ئەوەی، کە لە لێکۆڵینەوەدا بەرگری لە بیروباوەڕی خۆمان بکەین و خۆمان بە راست بزانین و بەرگری لە مافە رەواکانی گەلەکەمان بکەین! بەڵام هەوڵ بدەین وەک تەیارێکی بیروباوەڕ (کۆمەڵە) بخەینە روو، نەک وەک رێکخراوێکی سیاسی و هێندەی بکرێ کۆبوونەوەی دەوری و بوونی ئابوونە و بەیان و بڵاوکردنەوە نکۆڵی لێبکەین، هاوکات پەیوەندییەکانی نێوانیشمان وەک دۆست و هاوڕێیەک، کە بەو تەیارە فیکریە باوەڕیان هەیە ببەستینەوە و یەکتر بینین و بیرورا گۆڕینەوەش هەر بخەینە ئەو

چوارچێوەیەوە!
ڕۆژی چوارەم هێزێکی ئەمنی سلێمانی، کە لە چەند ئۆتۆمبیل و پیکابێ پێک هاتبوو، گەیشتە گرتووخانەی پێنجوێن، وەک دەستەیەک لەشکری داگیرکەر ترس و تۆقاندنیان لەگەڵ خۆیان بۆ شارۆچکەی پێنجوێن و بۆ گرتووخانەکەش هێنا، تەنانەت ئەو ترسە پۆلیسەکانی ئەوێشی گرتبووەوە! بانگیان کردین و ناوەکانیان خوێندینەوە و لە پەنا دیوارێکدا ریزیان کردین!
سەرگەورەکەیان رووی کردە کاک (شەهاب) و بە عەرەبی پێی وت.
تۆ (شەهاب) یت!
کاک (شەهاب)یش، بە دەنگێکی دلێر و بە عەرەبییەکی رەوان وەرامی دایەوە : بەلێ من (شەهابی شێخ نوری)م!
ئیتر بە دەستی کەلەپچە کراوەوە سواری ئۆتۆمبیلەکانیان کردین، هەر وەک رفاندن بەرەو شاری سلێمانی کەوتنەڕێ! بە درێژایی پێچاو پێچی رێگای شاخاوی من هەر بیرم لەوە دەکردەوە، کە تۆ بڵێی دەستەیەک چەکدار لە هاورێیانی (کۆمەڵە) بێنە سەر رێگە و لە پێچێکدا لە دەست ئەو جەلادانە دەربازمان بکەن، بەلام ئەوە هەر خەیاڵی زەرد و سوور بوو و بە بادا چوو، تا گەیاندیانییە گرتووخانەی ئەمنی سلێمانی!

## گرتووخانەی ئەمنی سلێمانی!

ئەمنی سلێمانی، کە لەم دواییە و لە رۆژگاریی زەبرو زەنگی بەعسییاندا، بەرامبەر بارەگای فیرقەی سلێمانی بوو، کاتی خۆی شوێنی قوتابخانەیەکی کچان بوو، کە لە بنەڕەتدا شوێنێکی مێژوویی خەڵکی شار بوو، پێیان دەوت ( وەیس )! لە سلێمانی دەستەواژەی (وەیس و چوونە سەر وەیس) جێگەیەکی تایبەتی لە دڵی لاوان و عاشقانی سلێمانیدا هەبوو، لە ناو گۆرانییە میللی و فۆلکلۆرییەکاندا بووبوو بە وێردی سەر زمانی خەڵکی، چونکە کوڕ و کاڵی شار رۆژانی هەینی بۆ گەشت و سەیران روویان تێدەکرد و کاتێکی خۆشیان لەو دەشتە پان و بەرینە پڕ لە گوڵ و سسەوزاییەدا تیا بەسەر دەبرد! کەچی هێزە داگیرگەرەکانی عێراق (وەیس) و ئەو قوتابخانەیەیان کردە دەزگایەکی داپڵۆسینی بەدناو و لە تەنیشت و لە پشتەوەی بە ئارەزووی خۆیان فراوانیان کرد و ماڵی خەڵک و گشتییان دایە دەمی، تا جێگەی ژمارەیەکی زۆرتر لە ئازادیخوازەکانی گەلەکەمانی تیاببێتەوە! ئەو شوێنە بەر لە دروست کردنی قەلا رەش و

قیزەونەکـەی (ئەمنـە سـوورەکە)، رۆڵەکانـی گەلەکەمـان چەندیـن داسـتانی خۆڕاگری و بوێرانەیـان تیا تۆمار کردووە و جەلادەکانی رژێمیش چەندین کاری نامەردانەیـان لـە ئازاردان و سـووکایەتی کردن بەرامبـەر ئـەو رۆڵـە بـە جەرگانـە ئەنجامـداوە!

لەو بەریشـەوە و لـە کۆلانـی دەسـتە چەپیدا، بـارەگای (ئینزیبـات خانـە)ی کۆن هەبوو، کـە ئەویش لـە کاتی خۆیدا شـوێنێکی ترسـناکی تر بـوو بۆ ئازاردان و کوشـتن و دەم کوتکردنـی دەنگـی رەوای تێکۆشـەرە کـوردەکان! سـاڵێک لـە شەسـتەکاندا و هـەر لـەو شـوێنەدا مەلایەکـی ئاینـی کـورد پەروەریـان گـرت، تـا بۆیـان کـرا ئازاریـان دا هـەر لەبـەر ئـەوەی نـاوی (مـەلا مسـتەفا) بـوو! بانگیـان کردبوو پێیـان وتبـوو: ئازادت دەکەیـن ئەگـەر جوێن بـە (مـەلا مسـتەفای بـارزان )بدەیـت، ئەویـش پێـی نەنگـی بـوو، لـە ترسـانا جنێـو بـە سـەرکردەی جووڵانـەوەی رزگاریخـوازی گەلەکـەی خـۆی بـدا، بۆیـە وەک شـێر لـە روویاندا نەڕاندی و وتـی.. مـن هەرگیـز کاری وا ناکەم! جەلادەکانیش لـە سـەر ئـەو شـانازی کردنـەی بـە رەمـزە گەورەکانـی کوردسـتانەوە، بۆ هەتـا هەتایـە بێدەنگیـان کـرد! ئیتـر ئـەو رۆحـی نەمـری چـووە ریـزی شـەهیدانی کـوردو کوردسـتانەوە و جەلادەکانیـش رۆژێـک هـات لـە ترسـی رۆڵەکانـی گـەل شـوێن نەمـا خۆیانـی تێدا بشـارنەوە!

لـە ئەمنـی سـلێمانی پـاش ئـەوەی  فڕێیاندایـنە شـوێنێکی سـاردی ئـەو گرتووخانەیـەوە، بـە دەسـت و چـاوی بـە سـتراوەوە گوێمـان لـە دەنگـی (عەلـی ئامـە خـان) بـوو، (عەلـی) بـرای (پاکیـزە)ی خێزانـم بـوو، ئەوکاتـە ئەویـش (کۆمەڵـە) بـوو، تابلێـی کوڕێکـی ئـازا و بـە جـەرگ بـوو، حەیـف لـە سـاڵانی دواییـدا و .لـە نەبەردێکـی پێشـمەرگانەدا شـەهید بـوو! بـە گۆرانییـەوە و بـە دەنگێکـی خـۆش پێـی وتیـن، خەمتـان نەبێـت ئێمـە هیچمـان نەوتـوە و یەکتـر نەناسـین، بەمـەش ئاهێکمـان هاتـەوە بەبـەردا! کاتێکیـش کـە چـووم بـۆ دەسـت

بە ئاو گەیاندن، (سالار)ی برامم دی کە لەوێ گیرا بوو، پێی وتم کە تەنها لەسەر تۆ گیراوم و هیچ نییە!

ئێوارە دوای نانی شێوان بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی ناردی بە شوێن کاک (شەهاب و جەعفەر) و مندا. بە دەست و چاو بە ستراوی لای دەرگاکەوە بە پێوە وەستاندیانین! مدیری ئەمن کەوتە پرسیار کردن لە کاک (شەهاب) و هەوڵی دەدا نەرمی بنوێنێ، وتی : هەرچی هەیە خۆتان بە ئارامی و بێ کێشە بۆمان باس بکەن و ئێمەش وەک میوان رەفتارتان لەگەڵ دەکەین، ئەویش لە وەرامدا بە زمانێکی رەوانی عەرەبی و بە دەنگێکی باوەڕ بەخۆوە وتی :

عەرەب بەم جۆرە و بە چاوی بەستراو  و بە پێوە، پێشوازی لە میوان ناکات!

قسەکەی کاک (شەهاب) غیرەتی کابرای جووڵاند، گوێم لێبوو  قسەی لەگەڵ کەسانێک کرد، کە پێدەچوو لە ژوورەکەدا لە گەڵیدا بن! وتی: دەڵێن چی (ریفاق )! ئێمە کە تا ئەوکاتە چاومان لە هیچ نەبوو، هێندەمانزانی چاویان کردینەوە و لەسەر کورسی دایان ناین و وتی فەرموو ئێستا قسە بکە!

کاک (شەهاب) وتی: شکستی جووڵانەوەی کورد و هاتنەوەی دەیان هەزار چەکدار بۆ ژیانی ئاسایی، فرسەتێکی گەورە بوو بۆ ئێوە کە ئەم کێشەیەی کورد چارەسەر بکەن و رێگەی ئاوەدانی و پێشخستنی عێراق بگرنە بەر، بەڵام بە گوێ نەگرتن لە هیچ دەنگێکی راستگۆ ئێوە دەستتانکرد بە نەفی کردنی ئەو خەڵکە و دروست کردنی دۆخێکی نالەباری وەها، کە مرۆڤی کورد خۆی رێک بخاتەوە و تەیاری فیکری یا سیاسی ناڕازی بێتە کایەوە و سەدانی وەک و ئێمەش رابکەین! ئەو قسانە پاش ماوەیەک لە کپ بوون و بێدەنگی سەراپا ژوورەکە، سەرو زمانێکی نەرمتر و خۆشتری هێنایە ئاراوە!

(جەعفەر) و منیش ئەوەی زانیمان بۆ فراوان کردن و بە هێز کردنی ئەو باسە وتمان. بەڕێوەبەر ناردی چای بۆ بانگ کردین و رووی مۆنیان وەرگێڕا و بە روویەکی باشترەوە روویان تێ کردین!
ئیتر لەو لایەوە کابرایەک هەڵیدایە و وتی: (رەفیق) باش وایە ئەمانە بەنووسین رای خۆیان بنووسن! پێدەچوو بەڕێوەبەر بەو رایە قایل بێت، بۆیە بە ئەفسەرێکی ووت : کاغەز و قەڵەمیان بدەنێ و روی کردە ئێمەیش و وتی.. لەسەر هەر شتێک ناڕازین، رای خۆتانم بۆ بنووسن! پێم وایە دوای ئێمەش ناردبوویان بە شوێن باقی هاورێکانی تردا و ئەوانیش ئازایانە و بە جوانی قسەی خۆیان کرد بوو!
( دوایی لە زاری خوالێخوش بوو (شازاد سائیب) هوە بڵاوبووەوە و ئێمەش زانیمان، کە دانیشتوانی ئەو شەوەی ژووری بەڕێوەبەری ئەمن، بریتی بوون لە بەڕێوەبەر، کە ناوی ( ئەبو ریم ) بوو، (صالح عانی)، ئەندامێکی گەورەی لقی سلێمانی حیزبی (بەعس) و ئەندامێکی تریشیان (ئەحمەد) ناوێک بووە و یەکێکی تریش (حاکم ئەورەحمانی) حاکمی لێکۆڵینەوەی ئاسایش بووە و قسەکانیشمانیان وەک هەڵوێست و قسەی بوێرانە دابوو لە قەڵەم، وەک دوایی لە لایەن حاکمەکەوە باسکرابوو) !
کە ئێمەیان بردەوە شوێنی خۆمان، هەر یەکەمان لەسەرخۆ و بە رێک و پێکی رای خۆمان لە سەر مەسەلەی رەوای کورد و رێگە چارەی ئەوکاتە نووسی و رای خۆشمان لەسەر پێویستی رێز گرتن لە ئازادییەکانی مرۆڤ و مافە دیموکراتییەکان بۆ نووسین! هەوڵمان دا، کە بە نووسینەوە کاتێکی زۆر بکوژین تا رۆژێک زیاتر دۆخی ئەشکەنجەدان دوور بخەینەوە. ئەو رۆژە ئەوانیش وازیان لێ هێناین و ئێوارە نووسینەکانمان نارد بۆ بەڕێوەبەر، کەچی ئاگاداریان کردین، کە ئەمنی گشتی لە کەرکووک داوای کردووین و دەبێت رەوانەمان بکەن!

## ژیان و ئەشکەنجەدان لە (ئاسایشی گشتی – الأمن ألعامە) ی بەغدا!

رۆژی دوایی ٨- ١- ١٩٧٦ نزیک سەعات ٨ ی سەر لەبەیانی سواری پشتی دوو ئۆتۆمبیلیان کردین و بە یاوەری دوو ئۆتۆمبیلی تری ئەمن بردینیان بۆ کەرکووک. لەوێ پاش رێکخستنی نامە و نامە کاری بەڕێکەوتین بۆ بە غدا! لە رێگە لەگەڵ ئەفسەرە ئەمنەکاندا، هەم شەهید (جەعفەر) لە ئۆتۆمبیلی خۆیاندا، هەم کاک (شەهاب) و من هەوڵماندا کێسەکەمان ئاسان نیشان بدەین و دۆستانە لە گەڵیان قسە و باس دامەزرێنین و درێژەی پێ بدەین تا زۆر سڵ نەکەنەوە. شەهید (جەعفەر) بە قسە خۆشەکانی خۆی هێندە کاری کردبووە سەر سەردەستەی ئەمنەکان، کە ناوی (نەقیب کەریم) بوو، دۆستایەتی لەنێوانماندا دروست بوو! عەسرێکی درەنگ لە چێشتخانەکانی (دوز) لامان دا نانی نیوەڕۆ بخۆین، وتی بە ئارەزوی خۆتان پشوو بدەن و نان بخۆن، دەمەوێ زوو نەتانگەیەنمە بەغدا! لە سوارکردنەوەشماندا

کەلەبچەکانی لە دەست داماڵین و وتی: هێواش دەڕۆین و دەمەوێ نیوە شەو کاتێ بگەینە شوێنی خۆی ئەفسەری ئێشکچی خەو بردبێتیەوە، ئەمڕۆ پێنج شەممەیە و سبەینێش هەینییە، ئیتر کەس نایەت بەلاتاندا و بۆخۆتان ئیسراحەت دەکەن! بەحەقەت لە ڕێگا بە تەواوی بە هێواشی دەڕۆیشتن و نوکتەو قسەی خۆشیش ڕێگای دووری بۆ نزیک کردینەوە!

سەرەتا لەناو خانووە زۆرەکانی ئەمنی عامە لە تەلارێکی تازە، بەڵام ترسناک لایان دا! خۆی چوە ژورەوە، دیار بوو وەک خۆی پێشبینیی کرد بوو ئەفسەری ئێشکچی خەو بردبوویەوە، بۆیە خۆی خەبەری کردەوە! ئەویش نامەکەی ئیمزا کرد و بە چاوی خەواڵوو بە بۆڵەبۆڵ بە عەرەبی پێی وتبوو (سەرەکی)، ئیتر ئەویش ئێمەی لەوێ تەسلیمی چەند پۆلیسێکی ئەمن کرد! ماڵی (نەقیب کەریم) ئاوا، ئەو شەوە هیچ قایم کاریەکییان لەگەڵ نەکردین و لە بەردەمی هۆڵێکی گەورەی دەرگا شوشەدا ڕایانگرتین، هەر لەوێدا پاش پشکنینی جەستە و جلەکانمان ریزیان کردین تا بمانکەنە ژورەوە، ئاگام لێ بوو لە بەردەمی دەرگا شووشەکەدا هەندێ لە هاوڕێکانمان لە نزیکەوە و هەندێکی تریش لە دوورە بە حەپەساوی و بە وردی تەماشایان دەکردین و واقیان وڕما بوو! لەوانە شەهیدان (جەبار فرمان، ئەنوەر زۆراب، ئەنوەر حەسەن و دارۆی شێخ نوری)! ئاخۆ دەبێ لەوکاتەدا چ هەستێکی ناخۆش و نائومێدی شاڵاوی بۆ بردبن، یاخود چەند ناڕەحەت بوون بەوەی، کە ئێمە لە ئێرانەوە و لەو دوورەوە کەوتووینەتەوە بەر دەستی دوژمن! یان هەر یەکەیان چەند ترساوە لەوەی، کە هاتنی ئێمە چەندە کاریگەریی لەسەر ئەوان دەبێت و چۆن سەرلەنوێ دەیانخاتەوە ژێر گیر و گازی لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان! بەمەش دەبێ چ خەیاڵێکی تفت و تاڵ بە بیریاندا هاتبێت!

بەلام ئەوە ریگەی هەوراز و نشێوی خەباتە، ئێمە کە ئەوکاتە بەرپرس و سەرکردەی ئەوانە بووین، دەبێت سەرلەنوێ ورەیان بەرز و بەهێز بکەینەوە و ئەگەر هەڵەیەکیشیان کردبێت، ئەرکی سەرشانی ئێمە ئەوەیە، کە بۆیان راست بکەینەوە!
چووینە ناو هۆڵەکەوە، دانیشتین بۆ ئەوەی شوێنێ بۆ نووستنی خۆمان لەسەر ئەرزە رەقەکە بکەینەوە! جا بەوپێیەی لە هەموو گرتووخانەکان نەریتێ هەیە، کە خەڵکی تازە دەهێنن بۆ هەر گرتووخانەیەک، ئەوا ئەو گیراوانەی پێشوتر کە لەوێن، بە بەرچاوی سیخوڕەکانەوە بەخێرهاتنیان دەکەن، بێ ئەوەی تووشی کێشەش بن! لەبەر ئەوە برادەران بەرەبەرە هاتنە لامان و کەوتینە قسە و باس، ئێمەش دوای ئەوەی پێمان وتن دەبێت لە ئیفادەکانتانا هەوڵ بدەن، کە باسی ئابوونە و کۆبوونەوەی دەوریی نەکەن و داواشمان کرد، هەر کەسیش لە قسە و ئیفادەکانیدا گەر باسی هەرکامێک لە ئێمەیان کردبێت و باسی پەیوەندییان کردبێ لەگەڵ ئێمە، بابێین لەو فرسەتە سود وەرگرین و هاوئاهەنگییەکی تەواو و گونجاو بکەین، تا بزانین چۆن دەتوانین درز و کەلەبەرە خراپەکان چارەسەر بکەین و لەمەودواش چۆن قسە بکەین! خوا هەڵناگرێ بەگوێیان کردین و بە قسەی ئێمە هەر یەکە و چوو بۆ لای ئەو کەسەی کە لە ئیفادەکەیدا ناوی هێنا بوو! من (عوسمانی نانەوا)، ناوی هێنا بووم، بۆیە وتی: هاوڕێ دڵگران مەبە من لاواز نەبووم، بەلام من دەمزانی کە تۆ شارت جێهێشتوە و لە بەردەستی دوژمندا نەماوی و بەردەستی ئەمن ناکەویت و گەیشتوویتە ئێران، لەبەرئەوە پێم باش بووە ناوی تۆ بهێنم باشترە، کە دوورە دەستیت لەوەی کە بەردەوام ئەشکەنجەم بدەن! چونکە لێپرسراوی پێشوم لە سلێمانی لە ئیفادەکانی برادەرانی تردا لای ئەوان زانرا بوو. تەنها

هێندەم وتـوە کـە تـۆ چ پەیوەندییەکـت بـە منـەوە هەبـووە و هیچـی تـر! خێرا بـە بیرمـا هـات، کـە ئـەو ئیفادەیـە هیـچ نییـە و بـە قازانجـی منـە! لـە ڕاستیشـدا بـەو ئیفادەیە، کە منی لـە ڕێکخسـتنەکانی سـلێمانیدا بـاس کـرد بوو، هـەم منی لـە کەرکووک دوور خسـتبووەوە، بۆیـە گـەر ئـەوان داوای زانیاریـی لەمـن بکـەن، داوای هـی سـلێمانی دەکـەن نـەک هـی کەرکـووک، هـەم ئاستی لێپرسراوێتی منیشی کردبوو بـە ئاسـتێکی بچووکی خـوارەوە نـەک سـەرکردایەتی! ئیتر خێرا وتـم ئافـەرم تۆ پێویسـت نـاکات ئیفادەکـەت لەسەر من بگۆڕیت! - کاک عوسمانی نانەوا ماوە و ئێستاش هاوڕێیەتیمان هـەر بەردەوامـە - ئیتـر لـە شـەهید (ئەنـوەر زۆراب)م پرسـی کێـی تـر نـاوی هێنـاوم، خـوا هەڵناگرێت خـۆی باسـی نەکرد بـووم، بـەڵام (حەمـەی میـرزا سـەعید) نـاوی هێنـا بـووم، وتـم بینێـرە بـۆ لام. کاکـە (حەمـە) هاتـە لام، وتی هـاوڕێ مـن پیاوێکم چوومەتـە عومـرەوە بەرگـەی هەمـوو شـێوە ئەشـکەنجەدانەکانی ئەمانـەم نەگرتـووە، ڕاسـتە قسـەم کـردووە و خەڵـک لەسـەر قسـەکانم گیـراون، بـەڵام مـن باسـەکانم وا سـووک کردۆتـەوە، ئەگـەر خۆشـیان تـۆزێ خۆراگـر و قایـم بـن، زۆر سـەخت نایگـرن لـە سـەریان! بەڵام نـاوی تـۆم وا هێنـاوە کـە تـۆ خەڵکـی سـلێمانیت و مـن بـە ڕێکـەوت تـۆم لـە ماڵـی کاک (شـەهاب) بینیـوە و لـە ماڵـی (جەعفـەر) یـش تـۆم دیـوە و هەرگیـز لـە دوور و نزیکـەوە باسـی کەرکووکـم نەکـردووە! وتـم مـن نکوڵـی لـێ دەکـەم کـە لـە هیـچ شـانە و لیژنەیەکـدا لەگـەڵ تـۆ نەبـووم و بەهـۆی (جەعفـەر عەبـدول واحیـد) ەوە تـۆم ناسـیوە. ئـەم جـارە ئەگـەر ئەشـکەنجەیان کردیتـەوە، تکایـە هەنـدێ خۆڕاگربـە! ئـەوەی لـە هەمـوو شـت لای مـن گرنگتـر بـوو، کـەس لـە کاروبـاری کەرکووکـدا نـاوی منی نەهێنا بوو، چونکە ئـەو زانیارییانـە بـەلای منـەوە لـە شـتی تـر گرنگتر بـوو، تـا ئەوکاتـەش لـە ڕێکخسـتنی کەرکـووک کـەس نەگیـرا بـوو،

(ئەنوەر حەسەن)یش وەک خوێندکاری زانکۆی بەغدا گیرا بوو، نەک لە ڕێکخستنی کەرکووک! بە کورتییەکەی کەرکووک سەلامەت بوو، زۆریش لام مەبەست بوو بە سەلامەتی بی پارێزم! ئێمە خۆشمان کاک (شەهاب و جەعفەر و من و ئاوات)، هەریەکە ڕێکەوتبووین خۆمان چ قسەیەک بکەین، لەبەر ئەوە خەمی ئەم لایەنەم نەبوو! ئەو شەوە چەندە توانیمان هاوئاهەنگییەکی باشی نێوانی قسەکانی خۆمان ڕێکخست و قسەمان کرد بە یەک! ڕۆژی ئایندەش کە هەینی بوو کەس بانگی نەکردین و جارێکی تر بە قسەکاندا چووینەوە و هەر نا ڕێکییەکیشی تێدا بوو چارەسەرمان کردن!

لە هۆڵەکەدا هەندێ گیراوی جیا جیای لێبوو، هەندێک لەوانە سەر بە ڕێکخراوێکی چەپ بوون کە ناویان (جیش التحریر الشعبی) بوو، هەندێکیشی لەو بەعسییانە بوون، کە جیابووبوونەوە و بە چەپی (بەعس)، دەناسران! چەند گیراوێکیش سەر بە (حیزبی شیوعی عێراق) بوون، کە بە فەرمی هاوپەیمانی (بەعس)، بوون و لەیەک بەرەدا پێکەوە بە نیازی ئەوەی عێراق بەرەو سۆشیالیزم ببەن، گیرا بوون! گیراوی تریشی لێ بوو، کە بە تۆمەتی سیاسی جیا جیا گیرا بوون، یەکێکیشی تێدا بوو ناوی (تەها) بوو لە ناسیۆنالیستە عەرەبەکان بوو، ئەشکەنجەیەکی زۆر درابوو لە هاوڕێکانی ئێمەوە چەند وشەیەکی کوردی فێر بووبوو، هاواری دەکرد دەیوت: ئای پشتم.. لەوە دەچوو بوبێت بە هاوکاری هاوڕێکانی ئێمە!

تروسکەی یەک گوڵ ئەستێرەی شەوەزەنگ بۆخۆی جۆرێکە لە ڕووناکی، لەو دۆزەخەی ئەمنی عامە بەدناوەدا، ئەو ڕۆژی هەینییە بۆ ئێمە لەو کاتەدا لە تروسکەی ئەو گوڵ ئەستێرە دەچوو، ڕۆژێکی خۆشی پشوودان بوو! چونکە جارێکی تر چاومان بە هاوڕێکانمان

کەوتـەوە و زانیارییەکـی زۆریشـمان لەسـەر بـارو دۆخەکـە وچۆنێتیـی لێکۆڵینـەوەکان و فایلەکانمـان زانـی و تەنانـەت بـە یارمەتـی هاوڕێکانمـان توانیمـان لـە توالێتەکـەدا خۆمـان بشـۆین و چڵکێکـی زۆرمـان لـە کـۆڵ بێتـەوە! هەرچەنـدە دەمانزانـی چ رۆژگارێکـی رەش و چارەنووسـێکی ترسـناک و نادیاریـش چاوەڕێمـان دەکات!

رۆژی شـەممە سـەعات هەشـت و نیـوی بەیانـی ناویـان خوێندینـەوە و راپێچیـان کردیـن بـۆ ئەشـکەنجەدان لـە بەشـی سیاسـی. هەرکـە گەیشـتینە ئـەوێ، بـە نـەڕە نـەڕی کابرایـەک پێشـوازیمان لێکـرا، کـە جنێـوی بـە بەڕێوەبـەری ئەمنـی سـلێمانی و راپۆرتەکـەی دەدا، کـە گوایـا شـتێکی بـە قازانجـی ئێمـە نووسـیوە و پێـی بـاش بـووە، کـە وەزعـی شـاری سـلێمانی نەورووژێنـن و هـەوڵ بـدەن ئارامـی شـارەکە تێـک نـەدەن! دیـار بـوو پیاوێکـی دەمپیسـی کۆلانـان بـوو. ئیتـر بردیانیـن و هـەر یەکەمانیـان بـە کەلەپچەکانمـان بەسـتەوە بـە پەنجەرەکانـی هۆڵەکـەوە و یـەک یـەک بانگـی کردیـن و بـە هەڕەشـە و تۆقانـدن، داوای زانیـاری و دانپیانانیـان (اعتـراف ) لـێ دەکردیـن! پـاش ئـەوە بـە ئەشـکەنجەدانێکی بـێ وێنـەی بەعسـییانە کەوتنـە ویزەمـان! ئێمـەش هـەر یەکـە بـە دەوری خۆمـان هەسـتاین و هەوڵمـان دا بەوجـۆرەی، کـە پێشـتر لەگـەڵ هاوڕێکانمـان رێککەوتبوویـن، رەوتـی لێکۆڵینـەوە و ئیفـادەکان بـە شـێوەیەکی سـەلامەت و گونجاوتـر رێکخەینـەوە. بـەڵام بـە داخـەوە هـەر لـە رۆژی یەکەمـەوە لـەوە گەیشـتین، کـە زانیارییەکانـی دەسـتی ئەمـن لەبـارەی کاک (شـەهاب، ئەنـوەر زۆراب، جەعفـەر عەبـدول واحیـد)، بـە دەسـتی هاوڕێکانـی ئێمـە نییـە و لـە لایەکـی تـرەوە و لەلایـەن (سـالم و ولیـد زنـون )ەوە بـاس کـراون و ئەوانیـش دوور لـە ئێمـەن و لێکۆڵینەوەیـان تـەواو بـووە و لـە ئەمـن گوێزراونەتـەوە بـۆ شـوێنێکی تـر! کاک (شـەهاب) کـە لـە بێـروت

و سـوریا بـووە، ئەوانـە لـە هاتوچۆکانیـان بـۆلای (عبدالالـه نصـراوی)/ سـکرتیری (جولانـەوەی سۆسیالیسـتی عـەرەب)ی، چاویـان پێـی کەوتـوە و ناویـان زانیـوە و دانیـان پیـادا نـاوە، (ئەنوەر)یـش هاوڕێـی (ولیـد زنـون) بـووە و لـە کارخانـەی کارتـۆن پێکـەوە کاریـان کـردووە لـە بەغـدا، ئیتـر بەهـۆی (ولیـد)ەوە نامـەی نـاردوە بـۆ (مـام جـەلال) و (جەعفەر)یشـی هـەر لەڕێـی هاتوچۆکانـی بـۆ لای (مـام جـەلال) لـە بێـروت و سـوریا دیـوە و ناسـیوە! بـەو جـۆرە تەقەلاکانـی ئێمـە بـۆ گۆڕینـی ئیفـادەکان بەوشـێوەی لـە سـەری رێکەوتبووین جارێکـی تـر زۆربـەی هاوڕێکانـی راکێشـایەوە بـۆ ژێـر ئەشـکەنجە. بـەڵام ئـەم جارەیـان خۆگـر تـر و قایمتـر و بـە ورەیەکـی بـەرزەوە وەڵامـی جەلادەکانیـان دایـەوە!

ئـەو رۆژە تـا ئێـوارە ئـەو جـۆرە ئەشـکەنجەدان و هێنـان و بـردن و راکێشـانە بەشـە خۆشـەکەمان بـوو، تـا خۆیـان بەتـەواوی مانـدوو بـوون، ئیتـر هەموومانیـان گێڕایـەوە! لـە رێـگا کـە لەگـەڵ یەکتـر سـواری ئۆتۆمبیلیـان دەکردیـن و دەیانگێڕاینـەوە بـۆ شـوێنی خۆمـان، بەدزیـەوە دەسـتی یەکترمـان دەگوشـی و بـە دزیـەوە و بەبـێ ئاخاوتـن دەسـت خۆشیمان لەیەکتر دەکرد و ورەمـان بـە یەکتـر دەدا، تـا گەیشـتینە هۆڵـە گەورەکـە و دەرگای شوشـەکەیان لێکردینـەوە! ئیتـر بینیمـان هاوڕێکانمـان هەندێ راوەسـتاو و چـاو پڕ لـە پرسـیار هەندێکیش دانیشـتبوون و چـارە پەشـۆکاو بێدەنـگ، دەیانپرسـی چـی بـوو.. چـۆن بـوو! ئێمـەش کـە دڵنیایمـان دەدانـێ، لـە خۆشـیاندا خەریـک بـوو دەفڕیـن! ئـەو رۆژە بـە تووڕەبـون و سـووکایەتی پێکردنێکـی زۆرەوە جیایـان کردینـەوە لـە هاوڕێکانـی ترمـان و دوو دوو، تەنهـا ئێمـە نەبێـت سـێ کـەس، کاک (شـەهاب و ئەرسـەلان) و مـن، فڕێیـان داینـە ژوورەکانـی ئینفیـرادی! پەنجەکانـی قاچمـان هەمـوو برینـدار بووبـوون، بـە دەرمانـی دان شـتن تۆزێـک تیمارمـان کـردن!

چەند ڕۆژێکی تر لەسەر یەک، ئەوە بەرنامەیان بوو! بردن بۆ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان و دواتر گەڕانەوە بۆ لای هاوڕێیانمان! لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا بە پەنجەرەیەکەوە بە کەلەپچە هەڵواسرابووم، دیارە هاوڕێکانیشم هەر یەکەو لە شوێنێ بەسترابونەوە! لە نزیکەوە گوێم لە هاواری (ئاوات و ئەرسەلان بایز) بوو، کابرای بەڕێوەبەری ئەشکەنجەش بە هەموو توانای خۆی دەیقیژاند بە سەریاندا و جنێوی پێدەدان و داوای زانیاری لێدەکردن لەسەر (سالار عەزیز و ئیحسان نەجم)، کە کامیان لێپرسراوی کەرکوکن، ئەوانیش بە وشەی (نازانم)، وەرامی هەموو قامچی و کوتەک وەشاندنی ئەمنەکانیان دەدایەوە! لەپڕ (ئەرسەلان) بەدەم دەنگی (ئاه )ەوە دەنگی لێبڕاو هەناسەشیم گوێ لێنەما، وامزانی مردووە! بەڕاستی خەمێکی ناخۆش دایگرتم و نەفرەتم لە بەختی ئەم وڵاتانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکرد، کە چ کەسانێکی نەفام و دڕندە و بێ ئاگا لە مافەکانی مرۆڤ و لە ئازادیی دەسەڵاتی سیاسیی وڵاتیان بەدەستەوەیە و چۆن لەبری پەروەردەکردنی لاوانی وڵات بە زانست و زانیاری، بە هونەر و وەرزش و بە کاری جوانی مرۆڤدۆستانە، کەچی بە بکوژ و جەلاد و پسپۆر لە بواری ئەشکەنجە و ئازاردانی مرۆڤدا پەروەردە کراون! ئاخر ئەوە چ بەڕێوەبەرێکی بەشی سیاسییە، کە جگە لە جنێودان و قیژە قیژ و نەڕە نەڕ و قامچی وەشاندن هیچی تر نازانێت! دەزانێ کارەبا لە جەستەی مرۆڤی تێکۆشەر بدات، بەڵام نازانێ گوێ لە پارچە شیعرێ بگرێ! دەزانێ نینۆک دەربهێنێ، بەڵام هیچ شتێک لەسەر هونەری جوان نازانێت! دەزانێ بە زەبری ئەشکەنجەدان و هەڵواسین و بە ڕێگەی دەستدرێژی بۆ سەر ناموسی ژن و خوشکی تێکۆشەری ئەسیری بەردەستی و بە بەرچاوی برا و مێردەوە، زانیاری لەسەر ڕێکخستنەکانی عێراق کۆبکاتەوە، بەڵام

نازانیی زانیاری لە سەر ڕێژەی بێکاریی لاوان و ڕێژەی نەخوێندەواری لە شارەکەی خۆشیدا کۆبکاتەوە! لەو لێکدانەوە ئاڵۆزانەدا بووم، کە لەپڕ دەنگی دلێری کاک (شەهاب) تەوژمی ورە و باوەڕی کرد بە گیانمدا، کە بە جەلادەکەی بەرپرسی وت:

* ئەوانە گەنجن هیچ نازانن، واز لەوانە بهێنە، هەموو زانیارییەکان لای منە!

ئەو ڕستە تۆکمە و پڕ لە ئازایی و جوامێرییە وەک ئاوازی مارشێکی شۆڕشگێڕانەی بەرز بە سەر دەنگی هاوار و ئازار و ناڵە ناڵ و شیرە شیرِدا زاڵ بوو، هوڵەکەی بێدەنگ کرد و جەلادەکەی تاساند! ئیتر بەرپرسی جەلادەکە وتی:

* بیهێنن بۆ لام، دیارە ئەمەیان پیاوی باشە، دەیەوێ قسە بکا!

منیش وەک هاوڕێکانم چاوم بەسترابووەوە و بە تەواوی شتم نەدەبینی، بەڵام لەو بگرەو بەردەیەدا پەڕۆکەی سەر چاوم تۆزێ جووڵا بوو لەپڕ تارمایی کەسێکم بینی، کە لە بەردەمی یەکێکی تردا قایم لەسەر پێی خۆی وەستاوە و چەکمەی یەکێکی تریشم دەدی، کە بەرامبەری وەستاوە!

وتی: ئافەرم ئەی بۆ لە سەرەتاوە قسەکانت نەکرد!

* کاک (شەهاب)یش بەلاقرتییەکەوە و زۆر دلێرانە وەرامی دایەوە و وتی..

ئێستاش هیچت پێ ناڵێم !

کابرا تووڕە بوو هاواری کرد: ئەمڕۆ یا من (ئیبراهیم علاوی)م، یا تۆ (شەهابی شێخ نوری)ت و شریخەی لە کاک (شەهاب) هەڵساند، کاک (شەهاب)یش وەک شاخی پیرەمەگروون بەرز و بێدەنگ لەبەردەمیا هەر بەپێوە وەستا بوو، بێ ئەوەی یەک ئۆف لە گەرووی بێتە دەرەوە!

(ئیبراهیم علاوی)، ئەفسەرێکی ئەمنی خەڵکی فەلوجە بوو، کابرایەکی بەخۆوەی تێکسمڕاوی چارە مۆنی سپیکەلەی مێشک بۆگەن و دڕندەی بەعس بوو! ئەم جەلادە ئەوکاتە بەڕێوەبەری شعبەی سیاسی ئەمنی عامە بوو، کۆمەڵێ بکوژ و دڵ بەرد و بێویژدان و مێشک پووتی وەک خۆیشی بە دەورەوە بوو! داهێنەرێکی بێ ئەندازەی جۆرەکانی ئەشکەنجە بوو، لەو مرۆڤە دڕندانە بوو، کە تێکۆشەری لەگەڵ پشیلەی برسی گەورەدا دەخستە ناو یەک گونیەی سەر داخراو و لە هەردووکیانی دەدا، بۆ ئەوەی لە ناوەوە پشیلەکان لە گیانی بەربن و بە چڕنوک پارچە پارچەی بکەن! یاخود وەک هاوڕێ (حسێن رەزا)، کە چۆن ئەندامی نێرینەیان لە کارەبا دەدا! هەر ئەو دڕندەیەش بوو، کە کاتی خۆی هاوڕێ ئازاکانی (عزیز الحاج)ی خستبووە ناو تێزابەوە! هەرچەندە لەگەڵ هاوڕێیانی ئێمەدا، سەرباری نینۆکی قاچ شکاندن و هەڵواسین بە کەلەپچە و فەلاقە و کێبڵی کارەبا، زۆر شتی تریشی بەکارهێنا، بەڵام خۆشبەختانە زۆربەی زۆری هاوڕێیانمان سەربەرزانە لەو ئەزموونە تاڵ و گرانە دەرچوون! ئەو دڕندەیە پێنج ساڵ پاش ئەشکەنجەدانی ئێمە، بە ئۆتۆمبیل وەرگەڕا و چەندین تەقڵەی لێدا و رۆحی رەشی بە سەرەنوێلکی جەلاد و خائینانی مێژوو سپێررا! دوای ئەوە فەلاقەی ئەو کەڵە پیاوە دەستی پێکرد، ئەوان بە ئازاردان و ئەشکەنجەی هەمەجۆر کاک (شەهاب)یان شەکەت کردو ئەویش قارەمانانە بە نەبەردی و ئازایەتی و دان بەخۆدا گرتن، ئەوانی بە تەواوی ماندوو کرد بوو! ئیتر ئێمەیان بیرچوەوە و ئیسراحەتێکمان بەهۆی ئەشکەنجە و ئازاری کاک (شەهاب)ەوە پێ بڕا، بەڵام تەنها لە ئازاری جەستە دابڕاین، دەنا لە رووی ئەخلاقی و ویژدان و رۆحییەوە، لە حاڵی کاک (شەهاب) پەرێشانتر بووین! ئێوارە وەک رۆژانی تر

بە ئۆتۆمبیلە (فوکس واگۆن)ە کانیان، ئێمەیان بردەوە و ئێمەش وەک ڕۆژانی پێشوو بە هەمان دەست گوشینەوە ئافەرینمان لە یەکتر دەکردو ورەمان دەکردەوە بەگیانی یەکتردا! بەردەرگا شووشەکەش وەک ڕۆژانی پێشوو ترس و نیگەرانی و دڵەڕاوکێی زۆری پێوە دیار بوو، بەڵام کە دەیانبینین سەربەرزین، لە خۆشیاندا شادی دەپژایەوە لە روویان! ئەنجا بە دەست و قاچی بریندارەوە هەر یەکەمانیان فڕێدایە ژوورێکی ئینفرادییەوە!

ڕۆژی دوایی دیار نەبوون، بوو بە نیوەڕۆ نەهاتن، ئێوارە بێ دەنگ و ڕەنگ بوون و شەویش هەر نەهاتن، ئیتر خەومان لێکەوت! دوای نیوە شەوێکی درەنگ، وابزانم دوای سەعات دوو بوو ناوی هەندێکمانیان خوێندەوە، کاک (شەهاب) و منیان لە یەک ئۆتۆمبیلدا سوار کرد و بردینیان، لە ڕاڕەوێکی تەسکدا هەردووکمانیان بەستەوە! ئەمنێکی زل و ناشیرین، کە بە جەستە هەر لەدێو دەچوو بە قەدەر دوو کەس دەبوو، دەهات بە چەکمەکانی پێی دەنا بە پەنجە بریندارەکانی قاچماندا! لەپڕ (ئیبراهیم علاوی)، بانگی کاک (شەهاب)ی کرد، لە سەرەتادا بە نەرمی پێی وت. من پلە بەرزبونەوەکەم لەسەر قسە کردن و دان پێدانانی تۆ وەستاوە، یارمەتیم بدە و ڕاستی قسەکانم بۆ بکە، پەیمان بێت کاری بکەم یەک ساڵ زیندانی نەکرێیت ! کاک (شەهاب)، کە گاڵتەی بە قسەکانی دەهات، هیچ وەرامێکی نەدایەوە، ئەویش هەڵچوو زۆر تووڕە بوو هاواری کرد (چلابتین)! واتە ئامرازی گاز بهێنن، لەوکاتەشدا بە سێ چوار کەس بە لێدان تێی بەربوون، بێ ئەوەی نقە بکات و یەک دەنگی لێبێت! ئیتر (ئیبراهیم علاوی) هێندەی تر تووشی هیستیریا بووبوو، لەباتی بەو ئامرازە پەلاماری قاچی بدات و نینۆکی بشکێنێ و دەریبهێنێ، پەلاماری دەم و دانی کاک (شەهاب)یدا! بەمەش هەموو

دەم و لێوی پڕ بوو لە خوێن. منیش لەژێرەوە و بەحاڵ نەبێت، هیچ نابینم جگە لە بیستنی ئەو هەموو هات و هاوارە و بیدەنگییەی کاک (شەهاب) ، تا شریخەیان لە منیش هەستان و بە لێدان و راکێشان تێم بەربوون و حەشریان پێکردم، تا لە ناکاو و لەسەر بانێک فڕێیان دام، نەمزانی کێی تری لێیە! هەرچۆنێک بوو تا بەرەبەیان ئەو شەوەشمان بەڕێکرد، کە گەڕاندیانینەوە دەرگا شووشەکە وەک پەنجەرەی چاو برکێی ئەوینداری لێهات بوو، چونکە هاوڕێیان هەموو لە چاوەڕوانیدا بوون و پەرۆشی تەنها زەردەخەنەیەکی ئێمە بوون! ئێمەش هەموو خواستمان تەنها دڵنیا کردنی ئەوان بوو، هیچی دی! بۆیە هەمیشە کاک (شەهاب) پێی دەوتین..

* کە دەگەڕێنەوە پارچە پارچەش کرابن دەبێت بە زەردەخەنەوە تەماشای هاوڕێیان بکەن!

ئیتر بەرنامەکان بوونە شەوانە، رۆژی دوایی کە لە خەوی شەکەت بوون هەستاین، یەکێک لە هاوڕێکانمان (فاروق )ی ناو بوو، لە هۆڵەکەوە هاتە نزیک دەرگای شووشە و بە دەنگێکی خۆش گۆرانی دەوت و وشە و رستەکانیشی پرسیار بوون لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان. ئێمەش هەر ژورە و یەکێک بە ئاهەنگی گۆرانی کوردی وەرامی دەدانەوە و تێی دەگەیاندن کە خەمتان نەبێت! ئەمنەکان عەرەب بوون و کوردییان نەدەزانی لایان وابوو تەنها گۆرانی وتنە، ژوورەکانیش لە تەنیشت دەرگا شووشە کەوە بوون و دیوارەکانی لەگەڵ دەرگا شووشە گەورەکەدا گۆشەیەکی ٩٠ پلەیی بوو! ئیتر ئەو شێوەیە گۆرانی وتنە بوو بە هۆیەکی باشی رێکخستنی هاوئاهەنگی لە نێوانماندا، تەنانەت کە برادەرانی (حیزبی شیوعی)شیان هێنا و بەسەر ژوورەکاند دابەشیان کردن، ئەوانیشمان تێگەیاند چۆن لەنێوان خۆیاندا ئەوانیش

بەو شێوەیەی ئێمە دەتوانن هاوئاهەنگی بکەن! شەوی ئایندە پاش نیوە شەو (عەلی بچکۆل و ئاوات) و هەندێکی تریان برد، شەوێکیش (ئەرسەلان و شەهید جەعفەر)، شەوی واش هەبوو هەموومان پێکەوە راپێچ دەکراین، ئیتر بەپێی بەرنامە و میزاجی رەشی خۆیان چۆنیان پێ خۆش بوایە، ئاوا مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین!
شەوێکیان درەنگ لاوێکی عەرەبیان هێنایە لامان، ناوی ( کازم خلف) بوو، گۆڵچی تیمی فوتبۆڵی عێراق بوو، کورێکی ناسراو بوو! ئەوانە چوار کەس بوون و بەسەر ژوورەکانی تری هاورێیانماندا دابەشیان کردن! لە رێکخستنی هێڵی سەربازی (حیزبی شیوعی عێراق) بوون، ئەشکەنجەیەکی زۆریان دابوون، دەیانویست لەگەڵ هاورێکانی تریاندا قسەکانیان بکەن بەیەک، بەڵام نەیاندەزانی! ئێمە بە گۆرانی وتن لەگەڵ شەهید (جەعفەر)، قسەکانمان بە یەکتر گەیاندن و زۆریش ئامۆژگاریمان کرد! چونکە ئێمە ئەوەمان دەزانی، کە ئەگەر لە سەریان بسەلمێت کە کاری رێکخستنیان لەناو سوپا و لەناو هێزەکانی پۆلیسدا کردووە ئەوا حوکمی لە سێدارەدانیان بەسەردا دەدەن! لە دواییشدا زانیمان کە بە لە سێدارەدان حوکم دراون، بەڵام دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری مەکتەبی سیاسی (حیزبی شیوعی)، بۆیان کردوون بە حوکمی هەتا هەتایی !
هێندەی نەبرد بەرنامەکەیان گۆری، واتە بەرنامەی جەنگی دەروونی و ئەشکەنجەدان و لێکۆڵینەوەی نیوە شەوان تەواو بوو، بەرنامەی رۆژانە دەستی پێ کردەوە! رۆژێک هەموومانیان پێکەوە برد، ئەو رۆژە هەندێ لە هاورێکان لەسەر ئامۆژگاری بە کۆمەڵ بۆ باشتر رێکخستنەوەی ئیفادەکانمان، لە بەردەمی (ئیبراهیم علاوی)دا، هەموو قسەمان گۆری. لەو دیدارەدا شەهید (جەعفەر) پێی وت.. تۆ شتی هەڵەو

تێکـەڵ و پێکەڵمـان بـەدەم لێدان و چـاوی بەسـتراوە پـێ ئیمـزا دەکەیت، هیچمـان نەخوێندۆتـەوە، ئێـوە خۆتـان بۆمـان دەخوێننـەوە! ناچاریـن لای داوەری لێکۆڵینـەوە بـە درۆتـان بخەینـەوە... (ئیبراهیـم عـلاوی) شـێت بـوو، کەوتـە گیانـی شـەهید (جەعفـەر و ئـاوات عەبـدول غەفـور) پـر بـە هۆڵەکـە جنێـوی دەدا، دوو سـێ ئەمنـی وەک سـەگی هاریـش بـە کێبـل بەربوونـە کاک (شـەهاب) بەبـێ لێکۆڵینـەوە و هیـچ پرسـیارێک، زۆربەمـان بـەر ئـەو ئەشـکەنجە هەڕەمەکییـە کەوتیـن و لەپاشـدا (عەلـی بجکـۆل و جەعفـەر) و منیـان لەسـەر بانێـک دانـا و بـە چـاوی بەسـتراو و بـە کەلەپچـەوە بـە بۆریەکـەوە هـەر سـێکمانیان نزیـک یەکتـر بەسـتەوە! نازانـم چـۆن بـوو ئەمنـەکان وتیـان.. ئێـوە (دەمـاخ سـزن) و نوکتەیەکیانـن لەسـەر بـێ عەقلـی و بـێ دەماخـی کـورد گێڕایـەوە. شـەهید (جەعفەر)یـش وتـی گوێگـرن بـا مـن نوکتەیەکتـان بـۆ بگێڕمـەوە :

ڕۆژێـک عەرەبێـک درەنـگ دەگاتـە رسـتۆرانتێک، شـاگردێک بانـگ دەکات، دەڵێـت چیتـان هەیـە! ئەویـش دەڵـێ ئێسـتا درەنگـە و تەنهـا مۆخمـان مـاوە، ئەویـش دەپرسـێ مۆخـی چـی، شـاگردەکەش لەوەرامـدا دەڵـێ.. مۆخـی عـەرەب و هـی تـورک و هـی کـورد، ئەویـش دەپرسـێت دەڵـێ نرخەکانیـان چەنـدە! کابـرای شـاگرد پێـی دەڵێـت.. مۆخـی عـەرەب لـە هەموویـان گرانتـرە! کابـرای عـەرەب بـە پۆزێکـەوە دەپرسـێت: دەزانـم مۆخـی عـەرەب بەنرخـە، بـەڵام بـۆ وا گرانـە، شـاگردەکەش دەڵـێ: قوربـان چونکـە عـەرەب بـە دە کەللـە سـەر، ئەنجـا بەشـی یـەک نەفـەر مۆخـی تیـا دەبێـت، ئیتـر کابـرای عـەرەب تـووڕە دەبـێ و دەڕوات! پـاش ئـەو نوکتـە لمـۆز شـکێنە، یەکێـک لـە ئەمنـەکان پێکەنـی و ئـەوی تریـش بـە کێبـڵ بەربـووە گیانـی شـەهید (جەعفـەر)!

لێکۆڵینـەوەی سـەر لەنوێـی ڕۆژانـە بـەردەوام بـوو، ئەشـکەنجەدان و هـار

بوونـی ئەمنەکانیـش تـا دەهـات توندتـر دەبـوو! ئـەو حاڵـە ماوەیەکـی زۆری خایاند، ئێمـە لـە ١٩٧٦/١/١ کەوتینـە دەست عێراق و لـە ١٩٧٦/١/٨ وە کەوتینـە دەسـتی (ئەمنـی عامـە) و لـە١٩٧٦/٧/١١دا، لـە (دادگای محکمـة الثورة) حوکم دراین! راسـتە (ئیبراهیـم عـلاوی) بـە هەمـوو تواناو قین و داخ لـە دڵیی خۆیـەوە بەرامبـەر کورد زۆر ئازاریداین، بـەڵام ئێمـەش زۆر داخمـان کرد بـە دڵیدا ! کارێکمـان کرد، کە یـاری مـار و پەیـژە لەگەڵ ئەمن و لێکۆڵینـەوە و ئەشـکەنجەداندا بکەیـن! هەرچەنـدە زۆربـەی هاوڕێکانمـان ئیفادەشـیان تـەواو بووبـوو، بـەڵام کارێکمـان کـرد کـە زۆربەیانمـان لـەو ئیفادانـە پەشیمان کردەوە و لـە نووکەوە دەسـتیان پێ کردەوە! ئیفادەیـان لـێ وەردەگرتیـن، بـەڵام کـە دەبرایـن بـۆ بەردەمـی دادوەری لێکۆڵینـەوە یـا پەشـیمان دەبووینـەوە، یـا بەرامبـەر هەنـدێ بڕگـەی ئیفادەکانمـان، دەمانـوت ئەوانـە خۆیـان نوسـیوویانە و بـە ئەشـکەنجە و لێدان ئیمزایـان پێکردویـن، ئیتـر جارێکـی تـر دەبراینـەوە بـۆ لێکۆڵینـەوە و ئەشـکەنجەدان! لـەو ماوەیـەدا ئـەوەی بـە چـاوی خـۆم بینیـم و ئـەوەی بۆیـان گێراومەتـەوە ئـەوە بـوو، کـە بـە گشـتی سـەرەڕای رووخانـی (حەمـەی میـرزا سـەعید) و قسـە کردنـی لـە سـەرمان، ماباقـی هاوڕێکانـی تر زۆر خۆراگرو ئازا و مـەرد بـوون و توانییـان جوامێرانـە زۆربـەی هـەرە زۆری نهێنیـی رێکخستنەکان بپارێـزن و بشـارنەوە! بـە راسـتی (کۆمەڵـە)، لـەو رۆژگارە هـەرە هەسـتیار و هـەرە مەترسـیدارەدا پیـاوی ئێجگار قارەمانـی تیا دەرکـەوت! ئـەوەی من لـە کاک (شـەهاب)م بینیـوە - ئاخـر زۆربـەی زۆری کاتەکانـی لێکۆڵینـەوە و ئەشـکەنجەدان پێکـەوە بوویـن - لـە ئازایەتـی و بەرگـە گرتـن و جوامێـری و هەسـتکردن بـە لێپرسـراوێتی و تێگەشـتن لـە ئەرکـی سـەرکردە، لـە کـەم داسـتانی تێکۆشـەرە قارەمانەکانـی جیهانیشـدا بیسـتوومە! کاک (شـەهاب) بـاری سـەر شـانی زۆر قـورس بـوو، ئیعترافـی بەڵگـە نەویسـتی سـەرانی

(جووڵانـەوەی سۆسیالیسـتی عـەرەب)ی و (حەمـەی میـرزا سـەعید) و تەنانـەت شـەهید (ئەنوەر زۆراب)یش، کە دواتـر لای دادوەری لێکۆڵینـەوە ئیفادەکـەی گـۆڕی، لەسـەر بـوو! سـەرەڕای ئەوانـەش، کاک (شـەهاب)، بـاری گرانـی هەمـوو کارەکان و لێپرسـراوێتی خسـتە سـەر شـانی خۆی! شـەهید (جەعفـەر عەبـدول واحیـد)، نموونـەی ئازایەتـی و قارەمانێتـی بـوو، گاڵتـەی بـە مـردن و بـە ئەمنەکانیـش دەکـرد، لەکاتێکـدا ئەویـش بەڵگـەکان لەسـەری وەکـو هـی شـەهید (شـەهاب) بـوو! شـەهید (ئەنـوەر زۆراب) لـە هەلومەرجێکـی زۆر ناسـکدا گیـرا بـوو. چونکـە لـەو ڕۆژانـەدا بڕیـار بـوو کۆبوونـەوەی سـەرکردایەتی، لـە*ماڵـی ئەواندا بکرێ، ئیعترافی سـەرەکی (سـالم و ولید)یشـی لەسـەر بـوو، هـەر ئەوانیـش بـە گرتیـان دابـوو، هـاوکات (حەمـەی میـرزا سـەعید)یش قسـەی لەسـەر کردبـوو، دەمانچـەو دۆکۆمێنتیـش لـە ماڵەکەیـدا گیـر ابـوو! هەرچەنـدە ناچـار بـوو بـۆ پەیـدا کردنـی دەرفەتێـک تـا بتوانێـت هەواڵێـک بەهـۆی ژنەکەیـەوە بنێرێـت بـۆ هاوڕێیـان، کـە ڕۆژی دوایـی نەچنـە ماڵـی بـۆ کۆبوونـەوە و بگیرێـن، کارێکـی وایکـرد بەنـدی خـۆی قایمتـر بـکات و بکەوێتـە دۆخێکـی ئاڵـۆز و سـەختی ئەوتـۆوە، کـە هەنـدێ زانیاریـی بڵێـت، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا توانـی زۆر زانیـاری بشـارێتەوە! ئاخـر ئـەو زۆربـەی ڕێکخسـتنەکانی دەناسـی، بـەڵام بەشـی هـەرە زۆری پاراسـت و نـاوی نەدرکانـدن! شـەهید (حسـێن ڕەزا ڕەزا)، یەکێکـی تـر بـوو لـە قارەمانەکانـی زینـدان، کـە ڕەوای هەقـە هەرگیـز لـە بیـر ڕۆڵەکانـی گەلەکەمـان نەچێتـەوە! شـەهید (جەبـار فرمـان)، نموونـەی تێکۆشـەر بـوو لـە بەرگـە گرتـن و پاراسـتنی نهێنییەکانـی (کۆمەڵـە) لـە نـاو زیندانـدا!

دیـارە پەیوەندیـی ئـەو حـەوت کەسـەی، کـە لـە ئێرانـەوە تەسـلیم بـە عێـراق کرایـنـەوە دوو لایـەن بـوو! لایەنێکـی پاراسـتنی (کۆمەڵە)بـوو، کـە لەسـەر

ئامـۆژگاری و بڕیـاری کاک (شـەهاب) خرابـووە ئەسـتۆمان، لایەنێکـی تریـش پاراسـتنی ڕێکخسـتن و نهێنییەکانـی (کۆمەڵـە) بـوو، کـە بەوپـەڕی قارەمانانـە پارێزگاریـی لێکـرا! قارەمانـی وەک (عومـەری سـەید عەلـی و ئـاوات عەبـدول غەفـور)، کـەم بـوون، بەتایبەتـی ئـەو دوانـە ئـاگاداری ئێجـگار زۆری دۆخـە سیاسـییەکە و نهێنیەکانـی (کۆمەڵـە) بـوون! (عەلـی بچکـۆل و ئەرسـەلان بایـز)، کـە هـەر یەکەیـان بـە ئەنـدازەی ئەوکاتـەی خۆیـان توانییـان پارێـزگاری لـە نهێنیەکانـی ڕێکخسـتن و لـە هاوڕێیـان بکـەن! بەنـدەش کـە هەمـوو گـەورە و بچووکـی نهێنیەکانـی (کۆمەڵـە) و ڕێکخسـتنەکانیم لابـوو، بـە تایبەتـی ڕێکخسـتنەکانی کەرکـووک، کەچـی تـا ئەوکاتـەش یـەک کەسـی ڕێکخـراوی کەرکـووک نەگیرا ! بەکورتـی دەتوانـم بڵێم..زۆربـەی زۆری گیـراوەکان کەسـانی قارەمـان و خۆگـر بـوون و بـە ئـازاری جەسـتەی خۆیـان، بەشـی هـەرە زۆری ڕێکخسـتنەکانیان پاراسـت.

## گرتوخانەی فەزیلیە!

پاش پەسەند کردنی کۆتایی ئیفادەکان لەبەردەمی دادوەری لێکۆڵینەوە بەچەند رۆژێک، ئەوانەی لێکۆڵینەوە بێخەتایی نیشاندان، ئازاد کران، کە وابزانم شەش کەس بوون! لەوانە (محەمەد سابیر، کە بە حەمەی عەتێ ناسرا بوو، عەلی ئامەخان و شاخەوان عەباس)م بیرماوە! لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٦دا، بە دوو جار هەموومانیان گوێزایەوە بۆ زیندانی فەزیلیە لە (ابوغرێب)، کە لەوێشەوە پاش رێکخستن و ناردنی فایلەکان بۆ دادگا، چەند جارێک ئێمەیان برد بۆ ( محکمە الثورە ) و لە ١٩٧٦/٧/١١ لەوێ حوکم دراین!

ئەو زیندانە لە گەڕەکی (فەزیلیە) یەو دەکەوێتە ناوچەی فەزیلیە لە خوارووی رۆژهەڵاتی بەغدا، کاتی خۆی کارخانەی شیر بووە و هاوکات کۆمەڵەی جووتیارانیشی لێ بووە! ئەم زیندانە لە ساڵانی رابردوودا لەلایەن سەرەک وەزیرانی ئەوسای عێراق (تاهیر یەحیا) دروست کراوە! سەیر ئەوەیە هەم (تاهر یەحیا) و هەم (صدام حسین)،

لـه دوو سـەردەمی جیـاوازدا لـەوێ زیندانـی بـوون! بـەڵام باشـیی ئـەم زیندانـە ئـەوە بـوو، کـە ڕێگـەی چاوپێکەوتنـی هەبـوو! بەمـەش هـەر زوو کـەس و کارمـان هاتـن بـۆ سـەردان و چاوپێکەوتنمـان!

لـە یەکەمیـن ڕێگـە پێدانـی چاوپێکەوتنـدا بـوو، وەک بزانـم پـاش چـوار ڕۆژ لـە گەیشـتنمان بـە زیندانـی فەزلیـە، هاوڕێیانـی کەرکـووک هاتنـە سـەردانم و باسـی کێشـەکانی خۆیـان لەگـەڵ کۆمیتـەی هەرێمـەکان بـۆ کردم! کە لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٦ وە دەستیان بە کار کردن کردوە و چەندیـن جـار (ئیحسـان نەجـم و ئیبراهیـم جـەلال و سـیروان تاڵەبانـی و شـەهید عبـد الـرزاق)، لەگـەڵ هاوڕێیانـی (کۆمیتـەی هەرێمـەکان)، لەسـەر دوو مەسـەلە نیگەرانـی و سـاردی کەوتبـووە نێوانیانـەوە!

لەسـەر ڕاپۆرتـی شـوبات (٨ شـوباتی ١٩٧٦)، کـە لـە ١٩٧٦/١/١٥ ەوە، مشـتومڕی دروست کرد بوو لە نێوانیاندا، لـەو ڕاپۆرتـەدا باسـی هـاوڕێ گیراوەکانـی زینـدان کـرا بـوو، هێرشـێکی بێجـێ و ڕێ و بە پەلەیـان تێدا کردبووە سـەر ئـەو هاوڕێیانە! ئەمـەش کارێکی پەلـە پەلکـەر و زوڵـم بـوو لـە هاوڕێیانی زینـدان! چونکە ئەوانـەی کـە دارێژەری ئـەو ڕاپۆرتـە بـوون، تـا ئەوکاتـە هیـچ زانیارییەکیـان لەسـەر ڕەوتـی ڕووداوەکان و چۆنێتیـی لێکۆڵینـەوەکان و جـۆری ئەشـکەنجەدانەکان نەبـوو، ئیتـر چـۆن دەکـرێ بـەو چەشـنەی کـە لـە ڕاپۆرتەکـەدا هاتـووە باسـی ئـەو هاوڕێیانـە بکـەن! ئاخـر ئێمـە لـە ١٩٧٦/١/١ دا لەپێنجوێـن تەسـلیم کراینـەوە، زیاتـر لەحـەوت هەشـت ڕۆژێکـی پێچـوو تـا گەیاندراینـە ئەمنـی عامـە لـە بەغـداو تەنانـەت ڕۆژی گەشتنیشـمان بـە ئەمنـی عامـە، ڕۆژی هەینـی و پشـوو بـوو، کـە دەکاتـە ١٩٧٦/١/٩ واتـە یەکەمیـن ڕۆژی لێکۆڵینـەوە و ئەشـکەنجەدانمان دەکەوێتـە ڕۆژی ١٩٧٦/١/١٠، ئیتر چۆن لـە ١٩٧٦/١/١٥دا، لـە کۆبونـەوەی ماڵی (دلێری سـەید مەجید)، لـە سلێمانی، واتـە پاش کەمتر لـە هەفتەیـەک

و تەنها دوای (٥) رۆژ لە لێکۆڵینەوەی ئەمنی عامە، کە هێشتا هیچ کەس نەیزانیوە هەر لە کوێین، ئێمە خۆڕاگر بووین، یان نا، ئەو بەیانە دەنووسن! لانی کەم خۆ دەبوو ئەوە بزانن، کە لە دوای ئەوەی ئێمە کەوتینە دەست ئەمنی عێراق، ئیتر نە کەس لە رێکخستنەکانی (کۆمەڵە) ئاشکرا بوو نە کەسیش دەستگیر کرا ! ئاخر نەدەبوو ئەوە بزانن، کە ئێمە لە ئەمنی سلێمانی بە چ ئازایەتییەکەوە رووبەڕوی رژێم و پیاوەکانیان بووینەوە! خۆ حاکم (عبدالرحمان)ی لێکۆڵینەوە لە ئەمن، کە خەڵکی سلێمانی بوو، کاتی خۆی هەمووی بۆ خوالێخۆش بوو کاک (شازاد) ی رەحمەتی گێڕابووەوە و ئەویش بۆ زۆربەی هاوڕێیان و خەڵکی باس کرد بوو، ئیتر چۆن بەو شێوەیە باسی ئێمە دەکەن! خۆ دەبوو لانی کەم هاوڕێ (بەختیار- مەلا بەختیار -) بیزانیایە، کە بەندە خۆم کۆبوونەوەم لەگەڵ کرد بوو، هەر خۆیشم بە خاڵە (بەکری دارتاش)م ناساند و سپاردم، کە جێگە و رێگەی شاردنەوەی دابین بکات و هەر لەو ماڵەشدا بە ناوی (بەختیار)ی ئێمەوە ناونرا (بەختیار) و ئاگام لە تەواوی جێگە و رێگەیشی بوو! بێ ئەوەی لە ژێر ئەو هەمووئازار و ئەشکەنجەدا کەس باسی بکات و هەر بە پارێزراویش مایەوە! ئاخر دەبوو بزانن ئەو رۆژگارە دەزگای ئەمنی بەعسییان، چەندە توند و قایم گیرا بوو، ئەوانەی دەگیران سەرنگوم و بزر دەکران و کەس چاوی پێنەدەکەوتن و بینینیان قەدەغە بوو! ئیتر چۆن ئەو هاوڕێیانەی خاوەن (راپورتی شوبات)، توانییان هەواڵی ئەو سەرکردە گیراوانە بزانن، کە خۆراگر بوون یاخود نەخێر! بۆیە تەنها رێگە ئەوە بوو، کە چاوەڕوانی ئەنجامی ئەشکەنجەدان و لێکۆڵینەوەکان بکەن، کە چەند مانگێکی خایاند، یا تەماشا و چاودێری خوانەخواستە گرتنی هاوڕێیانی تر و راونانی تیکۆشەرانی تریان بکردایە، بزانن ئاخۆ ئێمە لە

زینداندا خۆراگر بووین، یا کەسانی بی ورەو روخاو! ئیتر لەو کاتەدا چۆن توانییان ئەو حوکمە نا بابەتییە بدەن، گوایا ئێمە بەرگەمان نە گرتووە! ئاخر هیچ نەبێت خۆ ئەگەر کەسێکی وەک من، تۆزێ بە ورە و خۆگر نەبووبێت، کە نهێنیی هەموو رێکخستنەکانم لا بوو، هاوکات لێپرسراوی راستەوخۆی هەموو رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)ش بووم لە کەرکووک، چۆن ئەو هاورێیانە بە سەلامەتی دەرباز دەبوون! کە تا ساڵێکیش دوای ئەوکاتە یەک کەس لە رێکحستنەکانی کەرکووک نەگیرا و بە پارێزراوی مانەوە! خۆ هاورێیانی کۆمیتەی کەرکووک، کە هەر خۆم لە سەرەتاوە پێکم هێنابوو، لە کاتی باسکردن و لەکاتی دەرکردنی (راپۆرتی شوبات)یش هەر یەکە لە (عەبدول رەزاق و ئیبراهیم جەلال و سیروان تاڵەبانی) ئازا و ئازادانە و بێ هیچ دوو دڵی و ترسێک، کۆبوونەوەیان لەگەڵ دەکردن و یەک کەسیشیان رووبەرووی هیچ جۆرە هەڕەشە و مەترسییەک نەبوونەوە! ئیترچۆن بەیانی لەوجۆرە لەسەر ئێمە دەردەکەن! هەندێ گلەیی تریشیان هەبوو، بەڵام ئێمە بە سەلیقەی خۆمان، هەموویمان لەلا رەواندنەوە و داوامان لێکردن، کە هاوکاری هاورێکانیان بن!

کاتی خۆی (عومەری سەید عەلی و ئاوات) و من چەند چەک و تەقەمەنیەکمان شاردبووەوە و حکومەت نەیتوانی بوو زەفەری پێ بەرێ! پاشان تەسلیم بە شەهید (جەمالە رەش)م کردن ! ئەوە شەهیدان (شەهاب و جەعفەر) و هاورێیان (عومەری سەید عەلی و عەلی بچکۆل و ئەرسەلان بایز و ئاوات) بوون، کە بە هەڵوێستی ئازا و و قارەمانانەیان و بەرگە گرتنیان بەرانبەر بە رژێم، هەر یەکەیان بە گیانی خۆی و بە خۆگرتن ئەو هەموو هاورێیانەیان پاراست! لەگەڵ ئەوەشدا لە یەکەمین چاوپێکەوتندا، سەرکەوتنی کارەکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان)

مان بە ئەركى گرنگى خۆمان زانى و بە هاوڕێيانى كەركووكم وت.. كە دەبێت بەوپەڕى تواناوە هەموو ساردى و ناكۆكييەک بەلاوە بنێن و بچن وەک پێشمەرگە لەگەڵ كاک (ئارام) و هاوڕێيانى (كوميتەى هەرێمەكان) كار بكەن! شەهيدان (شەهاب، جەعفەر، ئەنوەر)، بە هەمان شێوە و جوانتر و رەوانتريش قسەيان بۆ هەموو ئەو هاوڕێيانە كرد بوو، كە هاتبوونە سەردانيان!

لە زيندانى فەزيليە چاوم كەوت بە سەركردە گيراوەكانى (جولانەوەى سۆسياليستى عەرەب)، ئەوانەى كە بوونە هۆى ئەو زەبرە كوشندەيە بۆ سەر (كۆمەڵە)! لە راستيدا (سالم و وليد زنون) و يەكێكى تريش، كە ناوى (حەسەن) بوو، من ئەوانەم نە ئەناسى و نەم ديبوون! جگە لەوانە ژمارەيەكى زۆريش گيراوى حيزبى (دەعوەى ئيسلامى) و هەندێكى (ئيخوان موسلمين) و هەندێک كادرى ناسراوى (ناسيوناليستە عەرەبەكان)يشى لێ بوو!

رۆژێک لە زيندان لە (سالم و وليد)م پرسى، كە راستييەكانم بۆ بگێڕنەوە، ئايا ئەو كەشف بوون و دواتر ئەو گرتن و دانپيانانە چۆن بووە، بۆ ئەوەش بە جيا هەردووكيانم دواند! لە راستيدا هەردووكيان چيرۆكێكى تا رادەيەک لە يەكچوويان بۆ گێڕامەوە و وتيان :

لە مانگى ئابى ١٩٧٥ دا بەهۆى رووداوێكى شەڕ كردنەوە، كە لە نێوان چەند گەنجێكى گەڕەكدا رودەدات، يەكێک لەو گەنجانە دەست دەوەشێنى و بە چەقۆ يەكێ لە نەيارەكانى بەرامبەرى بريندار دەكات، بەمەش براى هاوڕێيەكى ئێمە، كە ناوى (صارى ) يە پۆليس دەچێتە سەر ماڵەكەى، چونكە شكاتى لێكراوە كە گوايا دەمانچەى پێبووە! دواى ئەوەى ماڵەكەيان دەپشكنن، بە رێكەوت و بۆ بەد بەختى هەموومان كۆمەڵێک بەياننامەو دۆكۆمێنتى جوولانەوەكامان بەر دەستى پۆليسەكان

دەکەوێت، ئیتر لە ئەنجامی ئەوەدا دوو هاوڕێمان لە لایەن ئەمنەوە دەگیرێن و دەبرێنە (ئەمنی عامە)، بۆ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان، ئەو دوو هاوڕێیەش هەردووکیان لێپرسراو بوون لە ڕێکخستنەکەماندا و تێکۆشەری بەکار و کارامە بوون! پاش ماوەیەک ئازاردانی (صاری)، کە خۆی و ژنەکەشی هاوڕێی خۆم بوون و زۆر باوەڕیشم بە ئازایی و قارەمانێتی هەبوو، زۆریش نیگەران بووم بە گرتنیان، ئەوا پاش ئەشکەنجەیەکی زۆر، ئەو ئەمنە دڕندانە بێ ئابڕووانە شەوێک ژنەکەی دەگرن و دەیبەن لە بەر چاوی خۆی روتی دەکەنەوە و هەڕەشەی ئەوەی لێدەکەن، کە ئەگەر ئیعتراف نەکات، ئەوا بە بەرچاوی خۆیەوە دەستی بۆ درێژ دەکەن و سکی پڕ دەکەن، ئەویش کە هەر ساڵێک دەبێت بە عەشق و دڵداری ئەو ژنەی هێناوە، لە ترساندا دڵ و گیان و باوەڕی دێنە لەرزین و ئیتر دەڕووخێ و قسە دەکات، پاش ئەوە کە ناوی من دەهێنێ و بە کەسی سەرەکیم لە ڕێکخستنی ناو عێراقدا دەناسێنێت! ئیتر پیلانێک لەگەڵ ژنەکەی دا دەڕێژن و بەڵێنی دەدەنێ، ئەگەر هاوکارییان بکات، ئەوا ناهێڵن مێردەکەی توشی سزای قورس بێت و ئازادی دەکەن! ئەویش مل کەچیان دەبێت و منیش ئاگام لەو کەین و بەینە نییە!

ڕۆژێکیان ئەو ژنە جوابی بۆ ناردم  تاچاوم پێیبکەوێت، گوایا یەکێکی دۆزیوەتەوە پۆلیسی ئەمنە و خزمیانە، بەڵکو بتوانێت هەواڵیکی (ضاری) بزانێت و دەیەوێ بزانێت ئامۆژگاری من چییە! منیش بە بڕوای جاران و بە هاوڕێیەتیان شوێن و کاتی چاوپێکەوتنم لە گۆڕەپانی (مەیدان) لای پاصەکان بۆ دانا، کە شتێکی ئاساییە و لەوێ خەڵکی سواری پاصی هاتوچۆ دەبن و منیش دەتوانم ئەو ببینم!  عەسر بوو چاوم پێی کەوت، کاتێکم زانی هەر دەمانچە بەدەست و دشداشە لەبەر بوو لە

هەر چوار لاوە پەلاماریان دام و گیرام و هێنایانم بۆ ئەمن و لێکۆلینەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەشکەنجە! بە حەقەت بوارم نەبوو نکوڵی لە هیچ بکەم (صاری)، سەر شۆرانە ڕوبەڕووم قسەی دەکرد. بەو هۆیەوە (ولید زنون) یشیان گرت، جانتایەکیشمان هەبوو هەندێ شتی تێدا بوو، گیرا! لەوانە نامەیەکی (نصراوی) بوو بۆ ئێمە، کە باسی برایانی (کۆمەڵە) دەکات! ئیتر ئەشکەنجەشمان لەسەر ئەوە سەختتر بوو، لە ئەنجامدا پریشکی قسەکان برادەرەکانی ئێوەیشی گرتەوە!

لە چاوپێکەوتندا خەڵکێکی زۆر هاتن بۆ لامان، لە خێزان و خزمان و دۆست.خوا هەڵناگرێت هاوڕێیانی (کۆمەڵە) ش، دریخییان نەکرد! لەوانە (جەماله رەش و کاک روشدی عەزیز و عەبدول رەزاق) و (پاکیزە) خانی خێزانم، کە لەگەڵ هەندێ خزم خواردن و پێویستیان بۆ هێنا بووم،!زوو پێم وت.. پاسپۆرتەکەم لە هەر جێگەیەکە بیسوتێنن، باش بوو دەمێک بوو سوتاندبوویان! زانیم کە لە ئازاد کردنی (سالار)ی برام و (عەلی) برای (پاکیزە)خان، وایانکردبوو، کە هەموو شتە ترسناکەکان بفەوتێنن! فرسەتم هێنا وەزعی ئیفادەکانم بۆ باسکردن و هەواڵی هاوڕێیانم لێ پرسین، برادەرانی کەرکووک تا ئەوکاتەش سەلامەت بوون. هەواڵی (ئەبو شەهاب و ئیبراهیم جەلال و کاک حەمید و ئازاد هەورامی)م پرسی و منداڵەکانم و ماڵی باوکم خۆشبەختانە هەموو باش بوون!

ئێمە هەموومان و هەمیشە تا ئەو ڕۆژەی، کە لەم زیندانە ئازاد دەبین، ژیانمان لە مەترسیدا بوو، لە هەر ڕووداوێکی تردا و لە گرتنی هەر هاوڕێیەکی تردا، گەر ناومان بێت، ئەوا را دەکێشرێینەوە بۆ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان! بۆیە سەلامەتی ڕێکخستن و هاوڕێکانمان، سەلامەتی بوو بۆ ئێمەش!

لەو زیندانەدا زۆر خەڵکی جیا جیامان ناسی، لایەنگرانی دەعوەی ئیسلامی

و لایەنگرانی (محمد باقر صدر) و لایەنگرانی (حکیم) و لە سوننەکانیش ڕێکخراوێکمان ناسی بە ناوی (حیزبی تحریر)، کە ئیخوان موسلمین بوون! (قیادەی مەرکەزی) و (لیژنەی مەرکەزی)ش لەوێ لایەنگریان هەبوو، تەنانەت کەسێکی لێ بوو لایەنگری پاشایەتی بوو! ئیتر لەوێ بۆت دەردەکەوت جگە لە (حیزبی بەعس) و سەرکردەکانی (حیزبی شیوعی)، کەس نییە لە عێراقدا بتوانێت بە ئاسودەیی هەناسەیەکی ئازاد هەڵمژێ!

لەو ماوەیەدا کە ئێمە زیندانی بووین، سەرکردایەتی (بەعس) بەهۆی موخابەراتەوە، جارجار قسەیان لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسییەکانی ناو زیندان دەکرد، ئەگەر بێت و هەر لایەک بیەوێت کار بۆ پشتیوانی حیزبی (بەعس) و بەرەی سیاسی عێراقی (بەعس) بکات و بەڵێننامە بدەن و بە کۆمەڵ ئیمزا بکەن لەژێر چەتری شۆفێنییانەی( بەعس)دا کاربکەن، ئەوا سەرکردایەتیی شۆڕش چاو بە حوکمەکانیاندا دەخشێنێتەوە! ڕۆژێک تەقەلایان دا ختووکەیەکی لەوجۆرەی کاک (شەهاب) بدەن، ئەویش پاش نارازیبوون تەنها بە شەهید (جەعفەر) و منی ووت، ئیتر بەردێکی لەسەر دانا!

پاش کەمتر لە مانگێک ڕۆژێکیان ناویان خوێندمەوە و بردمیان بۆ گرتووخانەیەکی سەر بە دەزگای موخابەرات، لە ژوورێکی بچووکی تەنها و تاریکی گرتووخانەی ناوەندی موخابەراتی گشتی فڕێیان دام! بیرم دێت ئەو ڕۆژە کەس لێی نە پرسیمەوە، منیش خۆم فیکەی خۆم دەناسیەوە و دەمزانی هەر ڕۆژێک لەسەر سەفەرەکەم بانگم دەکەن. لە خەیاڵی ئاڵۆزکاو و لە بێدەنگی و کشوماتی ئەو ژوورە ترسناکەدا بیرم کەوتەوە، خۆ من کەسێک دەناسم لە وەزارەتی شارەوانییەکان بە ناوی (قحتان شاکر) کە برای (سعدون شاکر)ی سەرۆکی دەزگای

موخابەراتــە، دۆســتێکی نزیکمــە و برادەرێتیشــمان زۆر خۆشــە، ئیتــر بــە بیرمــا هــات ســوود لــەو ناســیاوییە وەربگــرم!

ڕۆژی دوایــی هاتــن بــە شــوێنمدا و بــە چــاو بەســتراوی بردمیــان، وابزانــم دووریــان نەخســتمەوە و هــەر لــەو تــەلارەدا بــوو لــە نهۆمەکانی خوارەوەیدا لــە قوژبنــی ژوورێکــدا بــە هەڵتــروکاوی دایاننــام. یەکێــک هــات چــاوی کردمــەوە بردمیــە لای مێزیکــەوە و خــۆی چــووە پشــتی مێزەکــەو لێــی پرســیم ..

* لەگەڵ (تاڵەبانی) دا دۆستایەتیت باشە!

وتــم.. نەخێــر، ئــەو لــە تەمەنــی منــدا نیــە، مــن تەمەنــم ٢٨ ســاڵە و ئــەو تەمەنێکــی زۆرتــری هەیــە!

* بێهەڵچوون و تووڕەبون لێی پرسیم.. ئەو تەمەنی چەندە!

ووتم: نازانم!

چەند جار سەردانت کردووە، بە قسە نەتبینیوە!

تەنهــا ڕۆژێــک لــە سلێمانی چــاوم پێــی کەوتــووە و ئــەو ڕۆژەش هەمــوو کــەس چــاوی پێــی کــەوت، چونکــە لــەو دەمــەدا (حاجی ئیبراهیمــی چەرمــەگا) تــووڕە بوبــوو، چووبــووە ســەر ئۆفیســەکەی و خەڵکێکــی زۆر کۆبوونــەوە، منیش وەک خەڵکی تر، ئەگینــا بــە قســە چــاوم پێــی نەکەوتــووە!

* سالی ١٩٧٥ سەردانت نەکردووە!

نەخێــر، مــن ســالی ١٩٧٥ چــووم بــۆ تورکیــا بــۆ نەخۆشــی و شــاهیدەکەشــم کادرێکــی ناســراوی خۆتانــە و دۆســتمە، نــاوی ( تاریــق قەرەغولی)یــە و لــە تورکیــا پێکــەوە بوویــن! (تاریــق قەرەغولــی) ئــەو کــوڕە بــوو پێشــتر باســم کــرد، کــە چــۆن بــە ڕێکــەوت لــە تورکیــا بینیــم و نیوەڕۆیەکیــش دەعوەتــی کــردم، کادرێکــی پێشــکەوتوی حیزبــی بەعــس بــوو، هاوڕێــی گیانــی بــە گیانــی ( قحطــان شــاکر)ی بــرای (ســعدون شــاکر)ە، کــە ئەندامــی

سەرکردایەتیی حیزبی (بەعس)ە و سەرۆکی دەزگای موخابەراتی عیراقە! کە بەعسییەکان کودەتایان کرد، ئیتر (تاریق) لە وەزارەت نەما و بوو بە ئەندامی لقی بەغدای حیزبی (بەعس)!

بانگی کرد پەلکێشیان کردم و چینێکی باشیان دارکاری کردم و پاشان بە پانکەیەکدا هەڵیانواسیم، کە زانییان بێهۆش بووم، هێنامیانە خوارەوە و هەندێ ئاوی ساردیان کرد بە سەر و کەلەمدا و بردمیانەوە بۆ لای هەمان ئەفسەری لێکۆڵینەوە. ئەویش بە هەمان هێمنی جاری پێشوو لێی پرسیم،

* باسی (تاڵەبانی)م بۆ بکە!

منیش لە وەرامدا پیم وت باسی ئوستاد (سعدون شاکر)، سەرۆکی جەنابت دەکەم، کە ئەوەی بیست لە شوێنی خۆی راچەنی و وتی:

* ئەو لە کوێ دەناسیت!

دەیناسم و چوومەتە ماڵیشیان، کاتی خۆی لە یەک گەرەکیش بووین! (قحتان شاکر)ی برای کادرێکی پێشکەوتووە و پێموایە دەیناسی، دۆستێکی نزیکمە و هەم لە زانکۆ و هەم لە وەزارەتی شارەوانییەکان پێکەوە بووین! ئەو (تاریق قەرەغولی)یەی کە باسیشم کرد هەر هاورێمان بوو ، باشم دەناسن کە من درۆ ناکەم و (تاڵەبانی)ش ناناسم، دەتوانی لەوانیش بپرسیت!

ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، هەندێ بە بەزەییانە تەماشایەکی کردم و وتی: چاکەیەکت لەگەڵ دەکەم، ئەم قسانە دەنووسم بۆ جەنابی سەرۆکی موخابەرات بۆ خۆی!

شەو بردمیانەوە بۆ ژوورە تەنیاکە، گەرچی ئازاریشم زۆر بوو بەڵام زۆری نەبرد، خەو لە باوەشی گەرمی خۆی کردم تا لە دەنگە دەنگی سەر ژمێری بەیانییان خەبەرم بووەوە! بۆ نانی بەیانیش سەموونێکیان

بۆ فڕێدام و دۆلکەیەک چایان دامێ! جارو باریش بە دەنگی کردنەوەی دەرگای ئەو ژوورانەی دەکرانەوە بە رووی زیندانیاندا بۆ ئەشکەنجەدان، قورگیان وشک دەکردم و نان و چاکەم بەلاوە دەنا!
بە دەم چاوەڕوانی نۆبەی پەلکێش کردنی خۆمەوە، کزۆڵەم کرد بوو، بیرم لە چارە رەشی خەڵکی عێراق دەکردەوە، کە ئەم رژێمە چۆن لەلایەکەوە لە تاریکی سەدان زیندانی لەم جۆرەدا، هەزاران هاوولاتیی ئەم ولاتەیان زیندانی کردووە و ئازادییان لێ زەوت کردوون و ئەشکەنجەیان دەدەن و لەژێر شریخەی قامچی و ئازاردا دەیانکوژن و لە سێدارەیان دەدەن و گوللە باران دەکرێن، بێ ئەوەی نە کەس پێیان بزانێ و نە کەسیش بتوانێ لەسەریان بێتە جواب! لە لایەکی تریشەوە چۆن بە هەزاران هاوولاتیی تری عێراقیان سەقەت کردوە و نەخۆشیان خستوون، بەوەی بوونەتە جەلاد و پیاو کوژ و فێری چونێتی ئەشکەنجەدان و بە زۆر نهێنیی دەرهێنانی کردوون! رژێمی (بەعس) لەباتی ئەوەی خەڵکی ولات فێری بەرهەمهێنان و داهێنانی هونەری و زانستی نوێ بکات، کەچی فێری ئەشکەنجەدان و دلڕەقی و رەفتاری دزێو و نامرۆڤانەی کردوون! بەمەش پارەیەکی ئێجگار زۆری لە سەروەت و سامانی ولات بەهەدەر داوە و هەزاران کارمەندیشی لە ئەمن و پۆلیس بە ولاتدا بلاوکردۆتەوە، تا بەنهێنی خەریکی نووسینی راپۆرت بن لەسەر هەر جموجوڵێکی هاوولاتییان، کە مایەی شک و گومان بێت! ئەمانەیشی هەموو بۆ ئەوەیە کە بەردەوام درێژە بە حوکمی رەشی خۆی بدات و دوور لە دەنگی سندووقەکانی هەڵبژارن و دەستاودەست کردنی دیموکراسییانەی حوکمداری، دەسەلات لەسەر خۆی تاپۆ بکات! لەپڕ دەنگیگ رای چڵەکانم و هێنامیەوە ناو تاریکستانی زیندان:

* توالێت.. توالێت !
تەقەم لە قاپیەکەم هێنا و ئەویش هات بە دەنگمەوە و وتی چاوەڕوان بە! پاش کردنەوەی دەرگایەکی دوورتر هات دەرگای ژورەکەی لێکردمەوە، پەنجەی راکێشا بۆ توالێتەکان و رۆیشت و بەجێی هێشتم، چونکە دەنگی زەنگی تەلەفۆنی رارەوەکە وەرامی ئەوی دەویست! ئەو ناوە چۆڵ و هۆڵ بوو، تەنیا لاوێکی شەرواڵ لەپێ، کە کاشی رارەوەکانی پاک دەکردەوە، هاتە لامەوە وتی: گوێم لە ناوەکەت بوو، من کوڕی (حاجی جەزای تەوێڵەیی)م و لەم رۆژانەدا ئازاد دەبم! منیش وتم : تکایە بە خەڵکی بڵێ، کە لێرەم و هەرچییەکت کردووە بەڵکوماڵمان بدۆزیتەوە، باوکت دەمناسێت و پێی بڵێ-( فەرەیدون عەبدولقادر)، لە موخابەرات زیندانییە، نەک بێسەرو شوێنم بکەن! ئیتر رۆیشتم بۆ دەست بە ئاو گەیاندن. زۆر دڵم خۆش بوو، کە توانیم ئەو هەواڵە بنێرمە دەرەوە، چونکە کە لە فەزیلیە منیان هێنا بۆ ئێرە هیچیان باس نەکرد و هاوڕێکانیشم نازانن لە کوێم!
ئەو رۆژە تا نیوەشەو خەو بردمیەوە بانگ نەکرام. رۆژیی دوایی بردمیانە خوارەوە و سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردم و چەند خولەکێک لێخوڕین تا گەیاندمیانە بەر خانوویەکی تر، ئیتر لەوێ پەلکێشیان کردم بۆ ژوورێکی نەختێ گەورە و چاویان کردمەوە و لەسەر کورسییەکی قەنەفەی تەنها دایاننام. پاش نیو سەعاتێک چاوەڕوانی، دیم ئەفەندیەکی کەڵەکەت هاتە ژورەوە و لە پشت مێزێکی جوانەوە دانیشت! بیرەوەریم غەدرم لێنەکات، خودی (سعدون شاکر) خۆی بوو وتی:
* بەختت یار بوو، قسەمان لەگەڵ (تاریق) کرد، راستە لە تورکیا بوویت، (قحتان) پێی ناخۆش بوو گیراویت، بڕۆ بگەڕێرەوە بۆ فەزیلیە،

بەڵام باسی ئێرە بۆ کەس نەکەیت!
ئیتر هیچ کەس پرسیاری تری لێ نەکردم، پاش ژوورە تاریکەکەم بردمیانەوە بۆ فەزیلیە بۆ لای هاوڕێکانم و ئەوجارەش لە دەمی گورگ دەرباز بووم ! منیش ئەوکاتە تەنها لای کاک (شەهاب و جەعفەر) باسم کرد!

## دادگایی کردن و مەخسەرەی دادگا!

واتە وات و چاوەڕوانی دادگا لە گرتووخانەی فەزیلیە، فێری هونەری چنین و کاری زەنگیانە و قوتوو و جانتا دروستکردنی کردبووین! لەگەڵ چەندین ئاراستە و ڕێکخراوی سیاسی عێراق تێکەڵ و ئاشنا بووین، ڕۆژانە لەوانەوە داستانی سەیر و سامناکمان لە بارەی جۆری ئەشکەنجەدان و کوشتن گوێ لێ دەبوو! لە حیزبی (دەعوەی ئیسلام) ی (ئیبراهیم و شێخ ماجید)، ناوێک بوونە ئاشنامان، لەوێ تێگەیشتین بنەماڵەی (ئایەتوڵا موحسین حەکیم)، کە بە دۆستی کورد ناسرا بوون، چ گوشارێکیان لەسەرە و چییان بەسەر هاتوە و چەند کەسیان لێ کوژراوە! ئیتر تێگەیشتین کە چەوسانەوە و مەینەتییەکانی (شیعە) ی عێراق لە هی (کورد) کەمتر نییە! ئیخوانەکانمان ناسی، وابزانم ڕێکخراوێکیان گیرابوو بە ناوی (ڕزگاریی عێراق)! لەوێش لە نهێنیی گرتنەکانی هاوڕێیانی (کۆمەڵە) و دزە کردنی ئاگری ناو برا عەرەبەکان بۆ سووتاندنی ماڵی (کۆمەڵە) تێگەیشتین! لەوێ (ولید زنون و سالم )و

هاوڕێکانی ئەوانمان ناسی، حیزبی (بەعسی چەپ)ی سەر بە سوریا و تێکۆشەرەکانی ناو زیندانیانمان ناسی! (سوپای میللی رزگاریی عێراق) مان دی، کە ڕێکخراوێکی چەپ بوون و باوەڕیان بە خەباتی چەکداری هەبوو، زۆربەشیان خەڵکی پارێزگاکانی خوارووی عێراق بوون!

تا لە مانگی حەوتی ساڵی ١٩٧٦ دا، بۆ یەکەمین جار براینە بەردەمی دادگا. هەموو جارێک دەیانبردینە ژێر زەمینێکی دادگا (محكمة الثورة) و لەوێ لەگەڵ گرووپێکی تری زیندانی ئاشنا بووین و خەفەتمان بۆ ئەوانەیان خوارد، کە بە لە سێدارەدان حوکم درابوون! پاشان گەڕاینەوە زیندانەکەی خۆمان، دوو سێ جار بەوچەشنە هاتووچۆمان پێکرا!

یەکێک لەو جارانە لەوکاتەدا بوو، کە بە ریز لە ئۆتۆمبیلەکە دایان دەگرتین، لەپڕ چاوم بەهاوڕێیان (مەلا بەختیار و ئاواتی شێخ جەناب) کەوت، لەناو قەرەباڵغی ئەو کەسوکارەدا کە دەهاتن بۆ لامان، دەیانویست بزانن لە دادگایی کردن چیمان بەسەر دێت! دوایی بۆیان باسکردم، کە هاتبوون بۆ ئەوەی شوێن و وەزعەکە هەڵسەنگێنن تا ئەگەر بکرێت پلانێک بۆ رفاندن و دەرباز کردنمان دابنێن! کە گەڕاینەوە بۆ زیندان، کاک (شەهاب) راسپاردەی کردن، کە کاری لەو جۆرە نەکەن! ڕۆژی ١٩٧٦/٧/١١ بردینیانەوە بۆ دادگا، ئەمجارە قایمکاری زۆرتریان کردبوو، لەوە دەچوو ئەو ڕۆژە حوکممان بدەن! بانگیان کردین بۆ هۆڵی دادگا و لە قەفەسی تاوانباردا ریزیان کردین، لە بەرامبەریشمانەوە، کە هەر شەش حەوت مەترێ دوور بوو، سێ دادوەر دانیشتبون! ئەوی ناوەڕاستیان سەرۆکی دادگاکە بوو، ناوی (جاراللە علاف) و دوو دادوەرەکەی تریش، یەکێکیان ئەفسەرێکی عەمید بوو بە ناوی (راغیب فخری) و ئەوی تریشیان کەسێک بوو بە ناوی موقەدەم (ئوسامە امین)!

ئەوانە هێندەی لە کەسانی موجریم و تاوانکار دەچوون، نیو هێندە لە دادوەر نە دەچوون! لە دەستی راستیشیانەوە کابرایەکی ورگ زل هەبوو، کە داواکاری گشتی بوو، لە پاڵەوە خێسەی لێ دەکردین و هیچ هەستی نەدەکرد لە دادگایە! ئەم مەخسەرەیە زۆرتر لە شانۆیەک دەچوو، تا دادگا! بێجگە لە ئێمە ئەوانیش هەموو لە ئەکتەری شانۆکە دەچوون! دادوەر دەستی کرد بە خوێندنەوەی خاڵ بە خاڵی تاوانەکانمان، کە گوایە ئێمە ئاسایشی وڵاتمان خستۆتە مەترسییەوە و ئەو کارانەش لە جۆری تاوانن دژی ئەمنی دەوڵەت! ئیتر یەک یەک پرسیاری لێ دەکردین:

* تۆ تاوانباریت یان نا!

هەموومان، یەک یەک : نەخێر بێ تاوانین!

دەستی بۆ چەند فایلێکی ئەستووری سەر مێزەکەی بەردەمی راکێشا، وتی ئەمانە هەموو ئیفادەکانتانن و بە نمایشێکی لێزانانە تەماشای دوو دادوەرەکەی راست و چەپی خۆی کرد، وەک بیەوێت پێیان بڵێت، ئێوە دەڵێن چی! ئەوانیش بە جووتە سەریان بو لەقاند. ئەویش پاش چەند پرسیارێک و بەرگری کاک (شەهاب) و بە دوایدا (جەعفەر)، داواکاری گشتی، کە ئەفسەرێکی تربوو نۆبەی رۆڵی ئەو لە شانۆگەرییەکەدا هات! ئەویش بە زمان و دەنگێکی حەماسییەوە قسەکانی خۆی کردو بە حسابی خۆی تاوانە ترسناکەکانی ئێمەی دژ بە ئاسایشی وڵات و یەکێتیی خاکی عێراق دەربڕی و داوای کرد چوار کەسمان، کە یەکێکیان من بووم لە سێدارە بدرێین و ئەوانی تریش بە سزای قورس حوکم بدرێن! هێندەی نەبرد شانۆگەرییەکە پشوویەکی تێکەوت و دواتر هاتنەوە سەر شانۆ. ئەم جارەیان (جاروالله علاف)، بە دەنگێکی گڕ و پر لە خەشم، بە ناوی گەلی عێراقەوە حوکمێکی درێژی خوێندەوە !

بڕیاری دادگای شۆڕش، ژماره (٣٧٤ ) له ١٩٧٦/٧/١١ دا، بەم شێوەیە:
* ئازادکردنی نزیکەی یانزه کەس!
* حوکمی له سێدارەدانی شەهیدان (ئەنوەر زۆراب ئەحمەد و شەهاب نوری و جەعفەر عەبدول واحید ئەحمەد)!
* شەش ساڵ زیندان بە گوێرەی ماده ٣٠٤ و نیشانه بە برگەی ١ ی مادەی ١٧٥ له یاسای سزادانی عێراقی، بۆ هەر یەک له هاوڕێیان (فەرەیدون قادر فەرەج، ئەرسەلان ئیسماعیل)، زەکی، ئاوات عەبدول غەفور، عومەر عەلی حسەین، عەلی محەمەد قادر، محەمەد سەعید عەباس، سەلام محەمەد حەسەن برزو، ئیبراهیم حسەین عەبدوڵا، دارا نوری ساڵح، عەبدول جەبار فرمان عەلی ئەکبەر، عەبدوڵا عەلی رەشید، سەعدون یەدوڵا شەفیق، خدر عەبدول رەحمان محەمەد، کەمال عەلی مەحمود، عوسمان ئەحمەد نەسروڵا، حسێن رەزا رەزا، فاروق ئەحمەد عەبدوڵا، ئەنوەر حەسەن خدر، ئاسۆ نوری رەزا و عەلی حەمه موراد)!
* دەست بە سەراگرتنی موڵک و ماڵی گوێزراوە و نەگوێزراوەی هەموویان!
* حساب کردنی تاوانی ئەوانە هەموویان بە تاوانی ئاسایی (واتە ئەو تاوانانە بە تاوانی سیاسی حساب ناکرێن)!
پاش بەرزبوونەوەی هەندێ دەنگە دەنگ له هاوڕێکانمانەوە، بە زۆر بردینیانەوە بۆ ژێر زەمینەکەی دادگا، چاوەڕوان بین تا بڕیارەکە و هاوپێچەکانی چاپ و ئیمزا دەکرێت و نووسراو بەو ناوانە بۆ زیندانی ئەبو غرێب ئامادە دەکرێت!
لەوێ شەهید (جەعفەر) له (حەمەی میرزا سەعید) تووڕه بوو، هەندێ قسەی زبریشی پێووت و درێژەی دایە: کە تۆ پیاوی ئەم ڕێگایە

نەبوویت، بە دارکارییەک ناوی ئێمەت هێنا و هەموو ئەو هاوڕێیانەت تووش کرد و ئەو زیانە گەورەیەت لە (کۆمەڵە)دا، بۆ هاتیتە کۆمەڵەوە! شەهید (شەهاب)یش لە (جەعفەر) تووڕە بوو، بانگی کردە لاوە و پێیووت : تۆ چۆن لەم کاتەدا ئاوا دەکەیت، هێشتا زۆری پاراستووە، تۆ ناترسیت ئێستاش دوو هێندەی تر زیان بگەیەنێت! پاشان دۆخەکەمان ئاسایی کردەوە و کاک (شەهاب) بە دەوری خۆیدا داینایین و دەستی کرد بە قسە کردن و ئامۆژگاری، کورتەی قسەکانیم بیر ماوە .. وتی: ئەم ڕێگایە ڕێگەی سەر فرازی زەحمەتکێشانی کوردستانە، ڕێبازی رزگارییە و خۆمان بە ویستی خۆمان هەڵمانبژاردوە! ئەم ڕێگایە بە گوڵ نەچنراوە و ڕاخەری سووری لێ دانەخراوە، ڕێگەی سەخت و گیانبازییە، بۆیە هەموومان دەبێت ژیر و هوشیار و ئازایانە ئازارەکان و ئەنجامەکانی تەحەمول بکەین، ببین بە سەر مەشق بۆ هەزارەها تێکۆشەری تری گەلەکەمان! لاوانی کوردستان فێر بکەین (کەم بژین و کەڵ بژین)! دەبێت دوژمن لە ئێمە بترسێت و ناشبێت ئێمە لە دوژمن بترسێین، ئەو لە ترساندا دەمانگرێ و لە سێدارەمان دەدا، (ئەو کەسەی بە شمشێریش نەمرێت، هەر دەمرێت)! ئازا و زیرەک و خۆنەوست بن، لە زینداندا یەکتری بپارێزن، نهێنی پارێزبن! ئێستا ئیتر لەمەدوا هاوڕێیانی دەرەوە ئازاد تر و ئازاتر دەتوانن چالاک بن و جووڵانەوەی چەکدارانە بکەن! لە زیندانا، چاو کراوە و لە پەیوەندیدا وریا بن! هەموومانی ماچ کرد، (جەعفەر و ئەنوەر)یش وایان کرد و هەموو یەکترمان ماچ کردا!

لەو کاتانەدا بوو، کە چوار کەسی باڵی بەعسی سەر بە سوریا، کە پێیان دەوتن (باڵی چەپ ) هێنایانە لامان بۆ ژێر زەمینەکە، چونکە بە لەسێدارە دان حوکم درابوون، ڕەنگیان پەڕیبوو، زەرد هەڵگەڕابوون و

بە چەشنێ هێزی ئەژنۆیان شکا بوو، کە نەیاندەتوانی بە پێوە خۆیان رابگرن! کاک (شەهاب) و زۆربەی هاوڕێکانمان لێیان چووینە پێشەوە، کاک (شەهاب)، سەرەڕای حوکی قورسی خۆی، بە گفت و هەستێکی دلێرانە و میهرەبانانە قسەی لەگەڵ کردن و وتی:

ئێوە پیاوی تێکۆشەرن و ئەمەش چارەنووسی ئەو کەسانەیە، کە لەم وڵاتانەدا دەژین و بڕیاریان داوە مەسەلە نیشتمانییەکان بخەنە ئەستۆی خۆیان! ئێوە پیاون و دەبێت پیاوانە بژین و واقیعبین بن و ئاسایی بڕواننە ئەم جۆرە رووداوانە! دوای ئەوە، دوور نیە دەروازەیەکی رزگاربوونیش پەیدا بێت! لە گەڵیان دانیشت و چیرۆکێکی بۆ گێڕانەوە پڕ بوو لە هیوا و ئومێد و وتی:

رۆژێک لە شارێکدا فەرمانڕەوایەکی زاڵم کابرایەکی دارتاش بە خنکاندن حوکم دەدا، ئیتر کابرای زیندانی بەخۆی و خاو و خێزانییەوە لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوون، کە چ رۆژێک ملی دەکرێت بە پەتا! لەپڕ رۆژێکی تر بەیانی زوو، کابرای دارتاشیان بانگ کرد. خۆی وخێزانی وایان زانی، کە دەیبەن لە سێدارەی دەدەن، کەچی بردیان بۆ ئەوەی تابووتێ بۆ کابرای فەرمانڕەوا خراپەکەی پێ دروست بکەن، کە ئەو بەرەبەیانە مرد بوو، بەوەش کابرای دارتاش رزگاری بوو! ئەنجا کاک (شەهاب) بە دەنگێکی پڕ لە ئومێدەوە و لە زاری کابرای دارتاشەوە بە تۆنێکی خوش وتی (نەجار..نەجار، خودا یەکە و قاپی هەزار!) ئێوەش ورەتان بەرزبێ، کێ دەڵێت بەر لەجێبەجێکردنی حوکمی ئێوە، ئەم تەخت و تاراجە سەرنگوون نابێت! قسەکانی کاک (شەهاب) و میهرەبانیی هاوڕێیان لەگەڵیان، تا رادەیەک تین و تاوێکی وەبەر هێنانەوە!

## (کۆمەڵە) و دەرەوەی زیندان!

لە ١٩٧٥/٩/١٤ وە تا رۆژی ١٩٧٦/٧/١١ واتە لەو رۆژەوە کە هاوڕێیانی (کۆمەڵە)، بە سەرکردایەتیی (شەهاب شێخ نوری)، روو لە هەندەران دەکەن و تا رۆژی دادگایی کردنمان، رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)، دوور لە ئێمە و لە واقیعێکی تایبەتیدا کاریان دەکرد و رووداو و چالاکییەکانیشیان بەم شێوەیە بەردەوام بوو:

- ئەو هاوڕێ گیراوانە، کە دوای لێکۆڵینەوە بە بڕیاری دادگا ئازاد کران، بیروڕاکانی ئێمەیان لە هاوڕێکانی دەرەوە گەیاند بوو، کە هەموومان پشتیوانی لە تەقەلاکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) دەکەین!
- هەندێ خەتی (کۆمەڵە)، لە بەغدا و لە خانەقین و لە سلێمانی و کەمێکیش لە هەولێر بەر پریشکی گرتن و راونان کەوتبوون، ئەگینا تەواوی رێکخستنەکانی ناو شاری کەرکووک و چەمچەماڵ و ناو شوان و کفری و دەرەوەی کەرکووک، هەموویان وەک خۆیان مابوونەوە و هیچ زیانێکیان بەرنەکەوتبوو! کۆمیتەکەشیان بە سەرپەرشتیی هاوڕێیان

(سیروان تاڵەبانی، ئەحمەد کرێکار و حەمیدە سوور - مام حەمیدی گومرگ- ئیبراهیم جەلال ) درێژەیان بە کارەکانی خۆیان دەدا!

• (عبدالرزاق سێگردکانی)، بۆ پڕ کردنەوەی کەلێنی (شەهید جەعفەر) و (حەمەی میرزا سەعید و ئەرسەلان بایز)، چووبووە هەولێر و ڕێکخسنەکانی هەولێریش زیادی کرد بوو، کە هەر لەوێش ئاشکرا بوو، گیرا! شەهید (ڕێباز)ی فەرماندە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا (قەندیل بەغدای هەژاند)، بەشی یەکەم و دوەم، چاپی ۲۰۰۸، بەم جۆرە باسی ڕێکخستنەکانی هەولێر دەکات:

(پاش گەڕانەوەم لە ئێران، لە تەموزی ۱۹۷۵ دا، لە لایەن شەهید (عەلی سالح)ەوە ئاگادار کرامەوە، کە لە ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) کار بکەم، منیش لەگەڵ کاک (تەلعەت خدر و محەمەد عوسمان) پەیوەندیمان بە (کۆمەڵە)وە کرد! لەبیرمە ئەو کاتە لە هەولێر هەمووومان لە ۳۰ تا ٤۰ ئەندام زیاتر نەبووین! ناوی هەندێکیان بەم جۆرە تۆمار دەکات: ( کانەبی عوسمان، هادی - کرێکار لە کارگەی جگەرە - مام بەهرام، شەهید حەیدەر جوکل، شەهید مەولود هەمزە، شەهید محەمەد عەجەم، شەهید محەمەد زەنگنە، شەهید عبدالرەزاق، (لێپرسراوی هەولێر و ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە)، (شەهید محەمەد جەمیل قەشقە، شەهید سەعدی خەلیل، شەهید نادر قەشقە، شەهید جەمیل ڕەنجبەر، شەهید عوسمان گچکە، کاک کۆسرەت، کاک شاخەوان، کاک تەلعەت خدر، کاک ڕێباز، کاک فەیزوللا، کاک قاسم عەزیز، کاک سەفین، کاک تەحسین کاوانی، مامۆستا بەکر، کاک مەلا غەفور، کاک فاروق عەلی مەولود، کاک یوسفی بەحرکە، کاک مەلا سلێمان، کاک مەجیدی عەبدولا دەرویش، کاک ڕزگار زاهیر، کاک حەمید کەریم، وریا حەوێز جوکل، ڕەسول مەحمود - هەوراز- عەبدولا تۆفیق ). ئەوە جگە لە

هاوڕێیانی کۆیە و چۆمان و گەڵاڵە، کە لە خوالێخۆش بوو (قادر خەبات) و هاوڕێکانی، لە ١٩٧٦/٦/٨، دەستەیەکیان لەگەڵ شەهید (خەلیلی برای ئیبراهیم جەلال و مام عەبدوڵا و مەحمود سەیدە و فەقێ حەسەن)دا، پێکهێناو شوێنێکی گرنگی شاخەکان و سەنگەرەکانیان ئاوەدانکردەوە، ئیتر سلێمانیش خەتەکانی رێکخستن لە رانیە و قەڵادزە و هەڵەبجە و هەورامان و پێنجوین و قەرەداغ و شارباژێر، وەکو خۆیان سەلامەت مابوونەوە!

* بە بیرم دێ (سەبیحە) خانی ژنی (جەبار فرمان) چەند جارێک هەواڵ و نامەی لە ناو شقارتەدا بۆ کاک (جەبار) نارد، شقارتەکەشی لە ناو بەستە شقارتەکاندا بە شێوەیەکی جوان و وەک خۆی دەپێچایەوە، تا لەکاتی پشکنیندا زەفەری پێ نەبەن! جارێکیش (دارۆ)، بەهۆی (رەفیق پشدەری)یەوە چاوپێکەوتنێکی بۆ سازکرا، ئەگینا ئاگادار بوونی ئێمە لە هەواڵی دەرەوە و هی دەرەوەش لە ئێمە کارێکی زۆر سەخت بوو!

* راستەوخۆ دوای ئێمە و هەموو هاوڕێیانی ترمان، هەر یەکە لە شوێنی خۆیەوە کاری خۆی دەکرد و تەقەلای زۆریان دا، منیش هەم کاتێ لە گرتووخانەی پێنجوێن بووین و دواتریش بە رێگەیەک جوابم بۆ (عبدالرزاق) نارد، کە هاوکاریی (کۆمیتەی هەرێمەکان) بکەن و بە هەموو تواناوە لەگەڵ شەهید (ئارام و مەلا بەختیار) و برایانی تر هاوکاری بکەن. (ئیبراهیم جەلال)، تەقەلایەکی دا بۆ ژیاندنەوەی (کۆمیتەی شارەکان) هاوکاری بوین، شەهید (سیروان)، لە (مەلا بەختیار) نزیک بوو ئاگاداریی رێگە و شوێنی بوو، چونکە ئەو دەمە بە نهێنی هەڵسوکەوتی دەکرد، بۆیە شەهیدان (سیروان و عەبدول رەزاق)، لە هاوڕێکانی تر زۆرتر ئامادە بوون بۆ هاوکاریی (کۆمیتەی هەرێمەکان)! هەریەکە لە هاوڕێیان (حەمیدە سوور و ئەحمەد کرێکار

و ئیحسان نەجم)یش، لە شوێنی خۆیانەوە لەگەڵ (ئیبراهیم جەلال) دا، چالاکیی خویان دەکرد و یەکێک لە چالاکییەکانیشیان بەیانێک بوو، کە بۆ ریسواکردنی رژیم دەریانکرد! .

هیشتا ئیمە لە زیندانی ئێران بووین، هەندێ چاوپێکەوتن لە نێوان (شەهید ئارام و سالار عەزیز و شەهید ئازاد هەورامی و عەبدول رەزاق و ئیبراهیم جەلال) بە تاک و بە کۆ رویان دا بوو، تا بتوانن هەموویان پێکەوە تواناکانیان یەکخەن، بەڵام پێموایە وەک پێویست سەری نەگرتبوو!

## کاک (ئارام) و کۆمیتەی هەرێمەکان!

شەهید (ئارام) تێکۆشەرێکی پڕ و ژیر و هوشیار بوو، لە هاوڕێکانی تری (کۆمیتەی هەرێمەکان)، هێمنتربوو بە بێ کینە و حەساسییەت، کارەکانی رێک دەخست و ژمارەیەک تێکۆشەری چاک و چالاکیشی لە دەوری خۆی کۆ کردبویەوە و (کۆمیتەی هەرێمەکان)یان پێکهێنابوو! بۆ مێژوو دەیڵێم.. ئەگەر ئەوکاتە هەریەکێک لە ئێمە دەنگمان بگەیشتایە بە هاوڕێیانی رێکخستن لە خوارەوە، بێگومان هەموویانمان وا ئاراستە دەکرد، کە گوێڕایەڵی ئەوان بن! بە کردەوەش هەروامان کرد و لە یەکەمین دەرفەتدا کە هاوڕێیان هاتن بۆ لامان بۆ زیندان، بەوجۆرە ئامۆژگاریمان کردن! ئیتر (کۆمیتەی هەرێمەکان)، توانییان بە گوێرەی هەلومەرجە نوێیەکە، هەم کاری رێکخراوەیی و هەم کاری پێشمەرگانەی ناو شار رێک بخەن و لە رووداوەکاندا رۆڵی قارەمانانە و کاریگەریان نواند!

پاش ئەو رووداوانەی کە بەسەر (کۆمەڵە) هات، ئیتر شەهید (ئارام)

و هاوڕێیانـی (کۆمیتـەی هەرێمـەکان)، چاکـی مەردانـەی لـێ هەڵدەکـەن و دەست دەکەن بە ئامادە کردن و ناردنە دەرەوەی چەندین دەستەی پێشمەرگەی سەرەتایی بۆ شاخەکانی کوردستان! خودی کاک ( ئارام) خۆیشی بەپێی نەخشەیەکی ورد بڕیار دەدات و دەچێتە دەرەوە بۆ ڕێبەری کردنی کاری ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانەی (کۆمەڵە)! لە قۆڵێکی تریشەوە (سالار عەزیز)یش، دەچێتە شاخ! سەرەتا شەهید (ئارام)، لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی دەبێت و جگە لە ڕێکخستن و بە دەستەوە گرتنی رایەڵەکانی کاری (کۆمەڵە)، لەگەڵ شەهید (عەلی عەسکەری)دا، پەیوەندییەکی باش و برایانە دادەمەزرێنێ و پاشان دەچێتە ناوچەی قەرەداخ و لەوێ بە چاو و ئەقڵێکی کراوە و باوەڕ بە خەباتی شۆڕشگێڕانە و بە (کۆمەڵە) و زەحمەتکێشانی گەلەکەمان و بە یەکێتیی ریزەکانی گەل، لە چوارچێوەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دا و لەسەر ڕێبازی کوردستانی بوونی (کۆمەڵە) و دوور لە تێزی ئاڵۆز و شێواوی (بان چەپ)، هێمن و سادە و لەسەرخۆ لە ماوەیەکی کەمی پێشمەرگایەتیدا دەبێتە خۆشەویستی هەموو هاوڕێکانمان و خوشەویستی خەڵکی کوردستان!

ئێمە لە ناو زینداندا هەلومەرجێکی زۆر سەختمان هەبوو، یەک دوو جار نەبێت، ئەویش لە سەرەتاوە کە ڕێکەوت، ئیتر نەمانتوانی ڕاستەوخۆ لەو هەڵسانەوە گەورەیەدا ڕۆڵمان هەبێت، ئیتر نەمانتوانی وەک پێویست لە تەخت کردنی کۆسپەکانی بەردەم ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە)دا هاوکارییان بکەین! بەڵام ئەو هاوڕێیانەی کارەکانی ئێمەیان گرتە دەست، زۆر ژیرانەو ئازایەنە توانییان درێژە بە کارەکان بدەن و ببنە جێگەی شانازی ئێمەش! کاک (ئارام)نەک هەر کاری پێشمەرگانە و رابەری کردنی (کۆمەڵە)ی گرتبووە ئەستۆ، بەڵکو بۆ گەیاندنی

بیرو بۆچوونەکانی (کۆمەڵـە)و بـۆ بایـەخ دان بـە بـواری فیکـری، ئـەوا لـە گونـدی (گوربـاز)، دەسـتی کـرد بـە دەرکردنـی رۆژنامەیـەک بەنـاوی ( ئـاڵای شـۆڕش ) و رێکخسـتنی بنکەیەکی سـوور و سـەرکردایەتی کردنـی (کۆمەڵـە)! ئیمـە ئاگامـان لـەو کەیـن و بەینـە نەبوو تـا مانگی نیسـانی ١٩٧٦، کاتێ (ئیبراهیـم جـەلال و عەبدوالرەزاق) هاتنـە لامـان بـۆ (فەزیلیـە)، لـەوێ پـاش گێڕانـەوەی هەمـوو رووداوەکان، هەموومـان پیمانوتـن :

نابێت دوو کۆمیتـە هەبێت و دەبێت هـاوکاری (ئـارام و مـەلا بەختیـار) و هاوڕێکانیـان بکـەن و واز لـەو رەخنـە و گلەییانـە بهێنن، ئێسـتا کاتـی ئـەوە نییـە و یـەک ریزیـی (کۆمەڵـە)، لـە پێش هەمـوو شـتێکی ترەوەیـە! چەندیـن جـاری تریـش کـە هاتـوون بـۆلای ئێمـە، هـەر بـەو جـۆرە ئامۆژگاریمـان کردوون!

## زیندانی ئەبو غرێب!

دوای دادگایی کردنەکەمان بە دەروازەیەکی پشتەوەدا و بە دزیەوە بردینیان سواری ئۆتۆمبیلیان کردین و بەرەو خوارووی خۆرئاوای بەغداد، تا زیندانی (ئەبو غرێب) نەیانوەستاندین! لەوێ هێشتا لە گەڵ کاک (شەهاب) و هاورێکانی ترمان لە یەکتر جیا نەکرابووینەوە، هەم پیاوی باش و هەم هەندێ سیخوڕی دەزگای ئەمنی زیندان هاتن و کەوتنە دواندمان و هەوڵیان دەدا لێمان نزیک ببنەوە. باشەکان ئامۆژگارییان کردین، کە ئاگادار بین و هیچ قسەیەک نەکەین! لەو بەشەی کە ئێمەیان بۆ برد گیراوی تریشی لێ بوو، ئیتر بەپێی نۆرە و جۆری (مەسەلە)کان، دابەشیان کردین بە سەر بەشەکاندا! نزیکەی دوو رۆژ ماینەوە تا هاورێیان (شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر)یان جیا کردەوە و بردنیان بۆ بەشی لە سێدارەدان! یەک یەک و دوو دوو ئیمەشیان دابەشکرد بەسەر (ق) و (م) ەکانی بەشی حوکمە قورسەکانی زیندانی ئەبو غرێب!

ئەو زیندانە دابەش کرا بوو بەسەر هەشت بەشی گەورەدا، کە پێیان دەوترا (ق)! ڕەنگە لە وشەی (قاعە) وەرگیرابێت. بینایەکی دوو نهۆم بوو ژوورەکانی بە شیش لە یەکتر جیا کرابونەوە! بەشە بچکۆلەکانیش پێیاندەوترا (م)! من بەر (ق- ٥) کەوتم، لەوێ (حمید عوبەیدی)، هات بردمیە لای خۆی - ئەو زاتە لە کەرکووک ناسیاوم بوو، کەسێکی یاسا ناس بوو کاتی خۆی لە دادگای کەرکووک کاری دەکرد و لە هۆزی عوبێد بوو! خزم و هاوڕێی (ئەلمان و مەحمود) کوڕانی (شێخ مزهەر عاصی) سەرۆکی هۆزی (عوبێد) بوو، لە ئاستی سەرکردایەتیی باڵی (چەپی بەعس)یەکان بوو، هاوڕێی گیانی بە گیانی (عبد حمدانی) بوو، کە بە قارەمانیی ناو زیندان ناوی دەرکرد بوو! (حمدانی) بە سێ مانگ بەر لە هاتنی ئێمە بۆ ئەم زیندانە لە سێدارە درابوو! (حمید) یش سەرکردەیەکی ئەو لایەنە بوو، کە لە (بەعس)ی فەرمانڕەوا جیابووبوونەوە و سەر بە (بەعس)ی سوریا بوون - !

لە ناو زینداندا ئەوانە حەوت کەس بوون یەکێکیان ناوی (اسغر) و یەکێکی تریشیان ناوی (جومعە) بوو، ئیتر ناوی ئەوانی ترم بیرچۆتەوە. ئەوانە هەموو لەگەڵ من دۆستانە مامەڵەیان دەکرد! تا ئێستاش (حمید) هەر هاوڕێ و دۆستمە، بەداخەوە تووشی نەخۆشی فەرامۆشی (زەهایمەر) بووە!

پاش چەند ڕۆژێک لە زیندان هەموو شارەزای جێگە و ڕێگە و شوێنی یەکتر بووین. لەوێ هەریەکەمان چووینە کۆرسی فێربوونی دارتاشی و ئەلەکتریکی و میکانیکییەوە و فێری کاری باش بووین! کتێبخانەی زیندانیش نزیکی شوێنی کۆرسەکەمان بوو، زوو زوو سەردانمان دەکرد و کتێبمان لێ وەردەگرت!

ڕۆژێک پیاوێکی خۆپارێزی دیپلۆمات، ناوی ( عبدالوهاب الوکیلی) بوو

هاتە لام، وتی من لە ژوریکدام و بە تەنیام وەرە با بچین پێکەوە تۆزێک دانیشین! کە چوومە لای شەربەتێکی بۆ کردم و کەوتە قسە کردن، وتی: من نوێنەری عێراق بوم لە (رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان)، بە توانا و شارەزایی خۆم کاری باشم دەکرد، لەپڕ بوختانێکیان بۆ هەڵبەستم و حوکمی لە سێدارەدان درام، بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری کەس و کارم بۆیان کردوم بە (ئەبەدی)، ئێستا بە تەواوی وەرس و بێتاقەت بووم! باسی هەندێ دەردیسەری بۆ کردم، کە ئەمنەکانی زیندان بەسەریاندا هێناوە! لەبەر ئەوە ئامۆژگاری کردم و ناوی هەندێ کوردیشی هێنا، کە هەم زمان لێدان و هەم بوختانیان لەدەست دێت! قسەکەشی راست دەرچوو، جارێکیان لێپرسراوی ئەمنی زیندان، یەکێک لەوانەی کە زیندانی و سیخوڕ بوو ناوی (عەلی) بوو، رایسپارد بوو کەتنێک بەرامبەر من بکات! ئەویش ئێوارەیەک درەنگ لە حەوشەی (ق - ٥) لە ناکاو و بێ ئەوەی بیبینم و ئاگاداری هیچ شتێک بم خشتێکی دا بەسەرما، خەریک بو کەللەم بپژێنێت، ئەگەر ئەو کاتە وەرزشکار و بە توانا نەبوومایە بە زەحمەت لە دەستی رزگارم دەبوو! (حمید عوبەیدی) لەو رووداوەدا لەگەڵ کۆمەڵێ لە بەعسیە چەپەکانی هاوڕێی، کە زۆربەیان کوڕی سەرەک هۆزەکان بوون، لەوانە (رعد دلێمی)و (ولید اعزمی) و (خیری هیتی)، پیاوانە لە پشتم وەستان و کردیان بە هەرایەکی گەورە، ئیتر ئەمنەکان ناچار بوون ئەو (عەلی) ناوە لە (ق- ٥) بگوێزنەوە!

رۆژێک هاو ئاهانگییەکمان کرد، کاک (شەهاب و جەعفەر) ببینین! وامان رێکخست کە هەر دوولا لە کاتێکی دیاریکراودا بچینە نەخۆشخانەی زیندانەکە! ئیتر وامانکرد و لەوێ (دارۆ) و من چاومان پێیانکەوت و توانیمان بە قەرەباڵخی دروست کردنێک لەبەردەمی دەرمانخانەکەدا و

بە بیانووی دەرمان وەرگرتن لە غەفڵەتی پاسەوانەکە سوود وەرگرین و نەختێک قسە بکەین! کاک (شەهاب)، بە منی وت..

بە هاوڕێ (عەبدول ڕەزاق) و ئەوان (مەبەستی کەرکووکە) بڵێم، کە لەگەڵ کاک (ئارام) و ئەوان هاوکاری بکەن و یەکگرتووبن. (جەعفەر) یش نوکتەیەکی تازەی پێبوو بۆیگێڕامەوە، تێر پێکەنیم و وتم توخوا وەختی ئەوەیە برا! خوا هەڵناگرێ بە دەم بزە و رووییەکی گەشەوە، وتی.. هەموو کات وەختە، بۆ وەخت نییە! (دارۆ) چەندە بە بینینیان زیندوو بووەوە، من دە ئەوەندە! ئاخر بۆ من ئەو بینینە لەو کاتەدا هێزی دڵ و ئەژنۆ بوو!

لە جارێکی تری چاوپێکەوتنی کەس و کاردا، شەهید (جەمالە رەش)، هاتەوە سەردانم، داوای چەک و هەندێ لەو پێویستیانەی کرد، کە من کاتی خۆی شاردبوونمەوە و هەڵمگرتبوون! منیش ناوی خزمانی (سەرکان و دەشتی خەرمان و ئاروزەر)م پێدا، تا بچێت وەریانبگرێت، بۆ تایپ و رۆنیۆش وتم.. بچێت لە ( عومەر فەتاح) بپرسێت، ئەو ئاگادارە و هەڵی گرتوون!

هەر لەو رۆژەدا بە (پاکیزە) خانی خیزانمدا جوابم نارد بۆ هاوڕێیانی کەرکووک، بە تایبەتی (عەبدوالرزاق و ئیبراهیم جەلال و سیروان تاڵەبانی و ئیحسان نەجم)، کە یەکێتی ڕیزەکانی (کۆمەڵە) بپارێزن و ببنە هۆی بەهێز کردنی و شتی رابوردوو هەمووی فەرامۆش بکەن و هێندە شوێن ئەو قسەو باسانە نەکەون، کە زیان بە تەلاری رێکخراوەیی (کۆمەڵە)، دەگەیەنێت!

## لە سێدارەدانی سێ قارەمانەکەی (کۆمەڵە)!

ڕۆژی ۱۹۷٦/۱۱/۲۰ لە هەموو ڕۆژێکی تر بۆ ئێمە ناخۆشتر بوو، ئاخر گەر بڵێم لە ڕۆژی ۱۹۷٦/۹/۱٤ وە واتە لەو چرکە ساتە هەستیارەی، کە بڕیار دەدەین و بەرە و چارەنووسێکی نادیار ملی ڕێ دەگرین تا ئەمڕۆ، سەرباری گرتنمان لە ئێران و زیندانی و دواتر تەسلیم کردنەوەمان بە ڕژێم و هەموو ئەو ئەشکەنجە و ئازار و مەینەتییانەی لە ماوەی ئەم ساڵ و دوو مانگەدا چەشتوومانە و بە سەرمان هاتووە، هیچ ساتێکی یەک لە سەر سەدی ئەمڕۆ خەم و پەژارەی لە ڕوو نەپژاندووین، مەڵێن ڕاست ناکەن! ئاخر ئەمڕۆ بۆ ئێمە و بۆ مێژووی (کۆمەڵە) سەرباری فەخر و شانازییەکی گەورە، ڕۆژێکی هەرە ناخۆش و کارەساتباریشە! چونکە ئەمڕۆ هەموو هاوڕێیان زانیمان، کە ئیتر سبەینێ ۱۹۷٦/۱۱/۲۱ هاوڕێیان (شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدول واحید، ئەنوەر زۆراب)، لە سێدارە دەدرێن!

لەدوای تەواوبوونی سەر ژمێریی، (دارۆ)ی برای کاک (شەهاب) و من

کەوتینـە داواکردنـی سـەردانیی هاوڕێکانمـان! (دارۆ) وتـی.. (شـەهاب) برامـە و منیـش وتـم خاڵمـە. ئـەو ڕۆژە کـە دەرگاکانـی بەشـەکانیان داخسـت ئێمـە هەردووکمـان نەچووینـە نـاو بەشـەکان و لـە ڕاڕەوکانـدا ماینـەوە و چەنـد زۆریـان لێکردین ئێمە هـەر ملمـان نـەدا و سووربووین لەسـەر چاوپێکەوتنیـان! لـەو لاشـەوە لـە بەشـەکەی ئـەوان ڕێگـەی دواییـن چاوپێکەوتنـی خـزم و کـەس و کاریـان دابـوو، تەنانـەت (پاکیـزە) ی خێزانیشـم هاتبـوو بـۆ سـەردانیان! لەدواییـدا بەڵێنیـان بـە ئێمـەدا، کـە بوارمـان بـدەن بچیـن سـەردانیان بکەیـن، بـەڵام بـە مەرجێـک چـاوەڕوان بین تـا کاتەکە گونجاو دەبێت! هەستمان کرد ئیدارەی زیندان بـە ئەمنی زیندانیشـەوە هەمـوو ترسـی ئەوەیـان هەبـوو، کـە پشـێویەک دروسـت ببێـت، بۆیـە هەمـوو هاتوچـۆ و دەرگا کردنەوەیەکیـان قەدەغـە کـرد، ڕۆژێکـی نائاسـایی بـوو و ڕاڕەوەکان چـۆڵ و کـش و مـات بـوون!

عەسـر پـاش تەواوبوونـی چاوپێکەوتنـی کـەس و کار، یەکێـک لـە پاسـەوانەکان، کـە پیاوێکـی باشـیش بـوو لەگەڵمـان هـات و ئێمـەی بـرد بـۆ لای ئـەوان، هـەر کـە لـە دوورەوە دەرکەوتین شـەهید (جەعفـەر) بـە دەنگـە خۆشـەکەی و ئەوانـی تریـش لەگەڵیـدا دەسـتیان بـە سـروودی..

ئازادیخوای کوردین ئێمە .. شورەی پۆڵاو بەردین ئێمە

پشتی جووتیاری زەبونین .. ئاڵای بەرزی چون یەک بونین

زنجیری سەد بەندیخانە .. ئالاتی دەستی بێگانە

یەک زەڕە کارمات تێ ناکا.. تەرکی ڕێگامان پێ ناکا

تا ماوین لەم ڕێگە و بانە .. نابین بە پیاوی بێگانە

تـا گەیشـتینە لایـان! دیـار بـوو شـەهید (جەعفـەر) لەسـەر ئـاو بـوو پانتۆڵەکـەی هەڵدەکێشـا، پێـی وتـم : دە وەرە بـۆم هەڵکێشـە و دەسـتیکرد بـە قاقـای پێکەنیـن و بـە نوکتـە گێڕانـەوە! پاسـەوانەکە کـە ئـەو دیمەنـەی بینـی، لـە

هەیبەت و شکۆی ئەو دیدارە شەرمی کرد بووەستێت، رۆیشت بە تەنها جێی هیشتین، بۆیە وتی.. من دەڕۆم ئێوە بۆ خۆتان قسە بکەن!
کاک (شەهاب) دەتووت جارانە و لە کۆبونەوەداین، وتی:
( من ئێستا ئاسوودەم و بە شەهید بوونی ئێمە دەستی براکانمان لەو شاخانە ئاوەڵاتر دەکەین، رێکخستنەکانمان زیاتر ترسیان دەشکێت! ئەوان تائێستا لە ترسی ئەوەی کە دەرفەتێک هەڵبکەوێ و لە سێدارە نەدرێین و رزگارمان بێت، لە زۆر چالاکی پێویست خۆیان پاراستووە! ئێوە و ئەمانەتی هاوڕێکانمان و ئەم رێبازە .. تکام وایە یەکێتیی ریزەکانی خۆتان بپارێزن و قەدری (مام جەلال) بزانن، ئێستا ئیتر برایانمان لە شار و لە شاخ ئازادانە تر کار دەکەن .. ئێوەش ئازاد دەبن، هەرگیز بیرتان نەچێت، کە ئەم دوژمنە بە زەبرو زەنگی شۆڕشگێڕانە نەبێت لەناو ناچێت، ئێوەش چیتان پێدەکرێ بۆ پەرەسەندنی خەباتی چەکدارانە دریخی مەکەن)!
شەهید (جەعفەر)یش بە زمانی نوکتە بازی وتی: هەرچی کاک (شەهاب) وتی راست دەکات، من دەڵێم. ئەوانەی کە نزیکی خۆتانن رێگەیان مەدەن زوو زوو بێنە سەردانتان، بە دەوری و هەرجارە و کەسێک. ئەمانەتی ئێوە و ئەو رێبازە! ئەو قسانەیان بە دەنگێکی دلێر و گەروویەکی ساف و رەوان و بە روویەکی گەش و خۆشەوە بۆ کردین. خوا حافیزیشمان بە سروودێکی (کۆمەڵە) بوو، کە ئێمەش لەگەڵمان وتنەوە! ئیتر کە گەڕاینەوە بە ئەندازەی کێوێک ورەمان بەرزو پڕ بە رۆحمان گەوهەری خەندە و وانە بەنرخەکانیانمان لەگەڵ خۆمان هێنایەوە!
بەشی حوکمە قورسەکانی زیندان گۆڕەپانێکی گەورەی هەبوو، هەمیشە دەچووین لەوێ یاری فوتبۆڵێنمان دەکرد! لەوێ هەندێ لە (شیوعی) یەکانم بینیەوە، هەستێکی خۆش بوو، کە (کازم خلف)ی یاریزانی

هەڵبـژاردەی عێـراق حوکمەکـەی دابەزیبـوو بـۆ ئەبـەدی! لەگـەڵ (کەمـال شـاکیر)، کە ئەویش یاریزانێکی ناسـراو بـوو، پیاوێکی هوشیار و بـاش بـوو، لـەم سـاڵانەی رابـوردودا لـە کوردسـتان وەزیـری تەندروسـتی بـوو، یەکمـان دییـەوە! ئیتـر لـەو کاتـەوە لەگـەڵ ئـەو برادەرانـە پەیوەندییەکـی برایانەمـان درێـژەی کێشـا! جـارو بـار لەگـەڵ هاوڕێیـان (جەبـار فرمـان و جومعـە) بـۆ مەشـق کـردن یـاری فوتبۆڵمـان دەکـرد. (کەمـال شـاکیر)، خانەقینـی بـوو، تێکۆشـەرێکی ئـازاو هەڵکەوتـوو بـوو، کەسـێکی راسـتگۆ و بـە رەوشـت بـوو، زۆری نەمابـوو ئەویـش لـە سـێدارە بدەن و بـە سـەختی رزگار کـرا! (جومعـە) ش، یەکێـک بـوو لـە هاوڕێکانـی (حمیـد عبیـدی)!

نزیکـەی دوو سـاڵ لـەو بەشـەی زینـدان مایـنەوە، تـا بڕیـاری گوێزانەوەمـان دەرچـوو بـۆ بەشـێکی تـری زینـدان، کـە نـاوی (بەشـی حوکمـە تایبەتـەکان) بـوو! لـەوێ هاوڕێیـان (عەلـی بچکـۆل و جەبـار فرمـان) و مـن بـەر بەشـێک کەوتیـن، کـە کەوتبـووە نهۆمـی دووەمـی زیندانەکـەوە! مـن لـە سـووچی راسـتی شـوێنەکە و (عەلـی بچکـۆل)، لـە سـوچی چـەپ و (جەبـار فرمـان) یـش لـە بەرامبـەر جێگەکـەی مـن جێگیـر بوویـن و بوویـن بـە هاوسـفرەی یەکتریـش. لـەو ماوەیـەدا باشـتر شـارەزای (جەبـار فرمـان) بـووم، بـە راسـتی جگـە لـەوەی کوڕێکـی ئـازا و چـاو نەتـرس بـوو، هەمیشـەیش ئامـادە بـوو لـە پێنـاوی (کۆمەڵـە) و هاوڕێکانیـدا روو بـەڕووی مەترسـی بێتـەوە! پیاوێکـی لـەش سـووک و بـە خزمـەت و خـۆ نەویسـتیش بـوو، ئامـادە بـوو لـە هەموومـان زیاتـر ئیش بـکات و لـە باتـی ئێمـەش ئـەرک بکێشـێ، بـە بـێ ئـەوەی هیـچ نارەحەتییەکیـش بـە روویـەوە دیاربێـت! دواتریـش بـەو ئـاکار و بیروبـاوەڕەوە توانـی ببێتـە یەکێـک لـە سـەرکردەکان و فەرماندەیەکـی ئـازا و بەناوبانـگ لـە ریـزی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتاندا!

لـەم شـوێنە تازەیـە جگـە لـە چنین و خوێندنـەوە - کتێبخانەیەکـی بـاش لـەو

بەشـەدا هەبـوو - خەریکـی فوتبۆڵێـن بوویـن! کـوردەکان تیپێکـی رێکـو پێکمـان بـۆ خۆمـان دروسـت کـرد بـوو! جارێکیـان لەگـەڵ ئیـدارەی زینـدان وا هەماهەنگیمـان کـرد، کـە لەگـەڵ تیپـی عەرەبەکانـدا کێبڕکـێ بکەیـن! تیپـی ئـەوان دوو سـێ سـیخوڕی تێدا بـوو، ئەمنـی زیندانەکـە زۆری لا مەبەسـت بـوو، کـە لـەو کێبڕکێیـەدا ئـەوان بـراوە و ئێمـە دۆڕاو بیـن! ئـەوی بیـرم دێ (شـاهۆی مـەلا ئەحمـەد)، کـە بـە کوڕێکـی خۆگـر و ئـازا ناسـراو بـوو لـە نـاو زیندانـا، پێکـەوە بوویـن! لـەو یارییـەدا مـن لـە دەسـتە راسـتی سـەنتەر لـە هێڵـی هێـرش بـردن یاریـم دەکـرد و هـاوڕێ (جەبار)یش بەرگـری ناوەڕاسـت بـوو! لـە تیپەکـەی ئـەولاش کوڕێکـی سـیخوڕی تێدابـوو نـاوی (موحسـین) بـوو، لـە بەرگـری یـاری دەکـرد! زیاتـر لـە چـوار جـار بـە ئەنقەسـت شـەقی تونـدی لێدام لەبـەر ئـەوەی زۆر زل و کەتـە بـوو، دەیخسـتم! ئێمـە بـە دوو گـۆڵ لەپێشـەوە بوویـن، کاک (جەبـار) دوو جـار ئـاگاداری کـرد و پێـی وت.. کـە بـەو جـۆرە نابێـت خـراپ یـاری بـکات، کەچـی ئـەو هـەر گوێـی نەدایـە! لـە کۆتایـی یـاری نزیـک بووبووینـەوە، کـە نزیـک گۆڵەگـەی ئـەوان تـۆپ کەوتـە بـەر قاچـم، منیـش بـاش رام دەکـرد، (موحسـین) هـات و بـە تونـدی شـەقێکی تـری لـە قاچـم هەڵـدا و خسـتمی و زۆریـش ئازاریـدام! یەکسـەر بـێ قسـە کـردن (جەبـار فەرمـان) بـە راکـردن بـۆی چـوو بـە هەمـوو هێـزی خـۆی شـەقێکی تێهەڵـدا و خسـتی، ئەنجـا (عوسـمان هـەژار)، بـە بۆکـس کەوتـە وێـزەی و لـە ئەنجامـدا بـو بـە شـەڕێکی گـەورە! ئەمنەکـە هـات و فیکـەی بـە حەکـەم لێدا کـە ئـەوان بـراوە و ئێمـە دۆڕاویـن و چـوار کەسیشـیان بردینـە بـەر دارکاریکـردن و ژووری ئینفیـرادی!

## ئازاری کارەساتی هەکاری!

بەر لە ئازاد بوونمان و لە کۆتاییەکانی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٨ دا، هەواڵی (کارەساتی هەکاری) مان پێگەیشت، بەلای ئێمەوە ناخۆشترین کارەساتی جووڵانەوەی کورد و شۆڕشی نوێ بوو، کە لە دوای هەرەسهێنانی ساڵی ١٩٧٥ وە تووشی گەلەکەمان بووەوە! چونکە ژمارەیەک لە سەرکردە باڵا و دیارەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، شەهید بوون، لەوانە هەڤاڵان (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید سەعید، حسێن بابە شێخ)، کە بە دیل گیران و لە ئەنجامدا بە شێوەیەکی دوژمنکارانە و بێبەزەییانە و بێ هیچ لێکدانەوەیەکی نەتەوەیی و نیشتمانی، گوللە باران کران و چەندین سەرکردەی تری وەک (ملازم عومەر و تایەری عەلی والی بەگ و ئازاد هەورامی و حامیدی حاجی غالی و شێخ عەلی) و ژمارەیەکیش فەرماندەی پێشمەرگە لەلایەن (سەرکردایەتی کاتی – القیادة الموقتة) ی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، لە نزیک هەکاری گیران و زیندانی کران! بەوەش هێزێکی

(٨٠٠) کەسی پێشمەرگەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، یا گیران و شەهید و پەڕەوازە بوون و بە ناچاری تەسلیم بە رژێمی عێراق بونەوە، یا لە شوێنێکی دوورە دەستی وەک ناوچەی (سێ سنوور)ی ئێران و تورکیا و عێراق، لە گوندە سەر سنوورییەکانی کوردستانی باکور، تیاچوون و رەق بوونەوە! ئەو کارەساتە بۆ هەموو هاوڕێیانی زیندان کۆستێکی ئێجگار جەرگبڕ و کارەساتێکی نەتەوەیی گەورە بوو! بەڵام بۆ من لەوەش زیاتر بوو، چونکە سەرەڕای ئەو خەسارەتە گەورەیە، ئەوا لەلایەنی عاتفی و شەخسییەوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر برینداربوونی هەست و دڵم کرد، چونکە ئەگەر کارەساتەکە بۆ خۆی سوێیەکی پڕ ئازار بێت، ئەوا بۆ من لە زینداندا و لەو شوێنەدا، کە لەبەر کورد بوون و سوور بوونم لەسەر مافی کورد و کوردستان و دوای جۆرەها ئەشکەنجە و ئازاردانی بەعسییانە، کە دەبینم هێزێکی کوردی بە دەستی هێزێکی تری کورد، پێشمەرگە و سەرکردەی دەکوژێت و بە دیلی دەیگرێت و زیندانی دەکات، هەر ئەوە بوو لە خەم و حەسرەتا نە دەمردم! ئازارەکەی تریشم ئەوە بوو، (عەلی عەسکەری)، کە هاوڕێ و خزم و مامۆستا و خۆشەویستم بوو، (ئازاد هەورامی)یش، کە بە دیلی گیرابوو،لاوە هەڵکەوتووەکەی کەرکووک و هاوڕێی پێنج ساڵ خەباتی نهێنی ڕێکخستنەکانم بوو لە کەرکووک، شەهید و زیندانی کرابوون! ئای کە چ ئازارێکی سەخت و ناخۆش و چ تیرێکی ژەهراوی بوو کە لەو رۆژگارە هەستیارەدا لەسەر دڵی ئومێدی دام! بۆ نەگبەتی ئەو کارەساتە کەوتبووە یادی چەندین ساڵەی لە دەستدانی تێکۆشەری گەورەی کورد (شێخ سەعیدی پیران)، کە لە حوزەیرانی ١٩٢٥ دا، لە سێدارە درا و هاوکات یادی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرە قارەمانەکەی کوردیش بوو لە باشوری کوردستان، کە

لە دوای ئازاری روخانی هیوای کورد لە کۆماری مەهاباد رووی دا! ئەوانیش (خەیرولا و عیزەت و مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی) بوون! هەروەها یادی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣ بوو، کە بەعسیەکان بە فەرماندەیی (زەعیم سدیق)ی تاوانبار گوللە بارانی لاوانی کوردیان لە حامیەی سلیمانی کرد! ئیتر بەم جۆرە مانگی حوزەیران، بووە مانگی رووداو و کارەساتە ناخۆشەکان بۆ گەلەکەمان!

لە دواییدا برایانی رێکخستن بۆیان باس کردین، کە ئەو کاتە بارەگای سەرکردایەتیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لە گوندێکی دوورە دەستی سەر سنووری ئێران و لەسەر دوایین خاڵی سنوور بوو بە ناوی (نۆکان)! کەچی رژێمی (شاهەنشا)ی ئێران داوای لە سەرکردایەتیی کرد، کە دەبێت لەو ناوچەیە بکشێنەوە و چۆڵی بکەن، بۆ ئەوەش گوشارێکی زۆری خستبووە سەریان. ئەوانیش لە کۆبونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتیدا تەگبیر دەکەن چی بکەن و بیر دەکەنەوە کە بچنە ناوچەکانی برادۆست و لە ناوچەی (سێ سنوور)ی ئێران، تورکیا و عێراق، بارەگای سەرکردایەتی دابنێن! چونکە ئەو شوێنە لەو کاتەدا لەم روانەوە شوێنێکی گرنگ و پر بایەخ بوو :

- دەکرێ لەوێوە رێگەی هێنانی چەک و تەقەمەنی دابین بکەن!
- نزیک بوو لە سوریاوە و بۆ هەموو کارێکی سیاسی و لۆجستیکی و شوێنێکی باش و لەبار بوو، بە تایبەتی بۆ هاتوچۆو پەیوەندییەکانی (یەکێتی) و دۆستەکانی لە ( التجمع الوطنی العراقی)دا!
- نزیکیی ئەو ناوچەیە لە رێکخراوی (دەدەقەدە)، لە باکوری کوردستان، کە چەند جارێک داوایان کرد بوو (یەکێتی)، لە سنووری تورکیا نزیک بێتەوە، کارێکی گونجاو بوو!
- ناوچەیەکی شاخاویی قایم بوو، بۆ دانانی بارەگاکانی سەرکردایەتی

(یەکێتی نیشتمانی کوردستان) !
ئیتر بەڕێکردنی هێزیکی گەورە بەبێ ئەوەی هێزەکەی تر لەدوایەوە ڕێ بکات و ببێتە پشتیوانی، بە فەرماندەیی شەهیدان (عەلی عەسکەری، خالید سەعید، حسێن بابە شیخ و تایەری عەلی والی بەگ) و بە هاوکاریی (ملازم عومەر و شەهید ئازاد هەورامی) و چەند فەرماندەیەکی تری ناسراو، لە ژێر گوشاری ئەو هەلومەرجە سەختەدا و بەو مەبەستە ئەو کارەساتەی لێکەوتەوە، کە لە مێژودا بە (کارەساتی هەکاری) ناسراوە!
لە گۆڕەپانی گەورەی زینداندا، هاوڕێکانمان سەریان کردبوو بەیەکدا و هەر دووسێ کەسیان خڕبووبوونەوە و پێکەوە قوژبن و پەنایەکیان گرتبوو، هەواڵەکانی کارەساتی هەکاری، کە لە چاوپێکەوتنەکانی هاوڕێ و کەس و کاریانەوە پێیان گەیشتبوو، لەگەڵ یەک دەگۆڕیەوە! هەموومان ڕەنگ و ڕوومان خەم و پەژارەی لێدەباری و تابلێی ڕۆژێکی ناخۆش و هەواڵی ناخۆش و خراپ بوو لە مێژوی گەلەکەماندا، چونکە: ئەگەرچی زۆربەی هەڤاڵانی فەرماندەی ئەو ٨٠٠ پێشمەرگەیەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، کە بەرە و هەکاری کەوتبوونە ڕێ، پێشتر سەرکردایەتیی (پارتی) یان ئاگادار کرد بوو، لە مەبەستی چوونی ئەو هێزە بۆ ناوچەی سێ سنوور و تەنانەت بۆ ئەو مەبەستەش نامەیان بۆ (ئیدریس بارزانی و حەمایل خانی دایکی مەسعود بارزانی و ڕەشید سندی) نوسیبوو، ئاگاداریان کرد بوون، ئەو هێزە دەچێت تا هەوڵی ئەوەبدات، کە ڕێگەیەک بۆ هێنانی چەک و تەقەمەنی بو کوردستانی باشوور بکەنەوە! ئەوانیش لە وەرامەکانیاندا رازی بوون و نیازی خراپیان نیشان نەدابوو، بگرە گفتی ئەوەشیان دابوو، کە دەست نەهێننە ڕێگەیان! بەڵام لە ١٩٧٨/٦/١ دا، سەرکردایەتیی (پارتی دیموکراتی

کوردستان)، بە هاندانی عەشیرەتەکانی سەر سنوور پەلاماری هێزەکانی (یەکێتی) یاندا و پاشان سەرەک خێڵێکی وەک (شێخ موسی کەرەڤان) و عەشیرەتی (گۆیی)یان، تێبەردان و بەمەش ئەو کارەساتە گەورەیان خوڵقاند و ئەو رەفتارەش مانایەکی ناخۆش و پڕ لەمەترسی نیشان دا، کە باوەڕ و متمانە بە یەکتر کردنی لەناو هێزە کوردییەکاندا نەهێشت! بەمەش رێگا بۆ ئاگری شەڕێکی سەختی ناوخۆ خۆش بوو، کە زیانێکی گەورەی بە دۆزی کورد و بە جووڵانەوەکە گەیاند و سەدان لاوی تێکۆشەریش لە هەردوولا بوونە سووتەمەنی شەڕ! لەلایەکی تریشەوە دڵی رژێم و دوژمنانی کوردیشی بەوە خۆشکرد، کە هەمیشە دوژمنان دەتوانن پواز لە جەستەی کورد دروست بکەن! لێرەش لە ناو زینداندا سیخوڕ و ئەمنەکان بە پلار و تانەوە دەیانگووت.. کە ئەوە هەر لە سەرەتاوە دەبێتە هەرەسێکی تری شۆڕشی کورد، کە هێشتا بەتەواوی لەسەر پێی خۆی نەوەستاوە!

## گۆڕینی ناوی (کۆمەڵە)!

دوای ناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٨، واتە دوای کارەساتی هەکاری بە پێنج مانگ، بەهۆی (پاکیزە)ی خێزانمەوە، نامەیەکی پێچراوەی (نەوشیروان مستەفا)یان بۆ هێنام، کە باسی کۆبوونەوەی شێنێ و ناو گۆڕینی (کۆمەڵە) و باسێکی کورتی هەلومەرجەکەیشی تێدا کرد بوو، کۆبوونەوەکە سەرباری ئەوەی کە سەرکردایەتیەکیی هەڵبژارد بوو، ناوی (کۆمەڵە)شی لە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)ەوە گۆڕی بوو بۆ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)!
پاش کارەساتی هەکاری بەرە بەرە رووداوەکانی ناو ئێران ئاقارێکی وایان گرتبوە بەر، کە چیتر گوشاری ئێران بۆ چۆڵ کردنی سەرکردایەتی لە نۆکان نەمێنێت. بەمەش خۆ پیشاندانەکانی خەڵکی ئێران رۆژ بە رۆژ پەرەیدەسەند و گەشەی دەکرد، تا کار گەیشت بەوەی شاری تەورێز و لە سەرەتای ئەیلولی ساڵی ١٩٧٨ یشەوە، خۆ پیشاندانی گەورە لە تارانی پایتەخت، ئێرانی هێنایە لەرزە و لە رۆژی ١٩٧٨/٩/٨ یشدا

خۆپیشـاندانەکانی ڕۆژی (هەینـی ڕەش) ی تـاران، کە لـە دواییـدا بـوو بـە خۆپیشـاندانی دوو ملیۆنـی لـە مەیدانـی ئـازادی، ئاسـۆیەکی ڕووناکتـری بـۆ شۆڕشـی گەلانـی ئێران و لـە ناویانـدا بـۆ کوردسـتان و بـۆ (یەکێتـی نیشتمانی کوردستان)، هێنایە ئاراوە، کە هاوڕێیانمـان بتوانن بە ئاسـانی لـە ناوچەکانـی سـنوور و لـە (نۆکان)یـش بمێننـەوە، بـێ ئـەوەی ڕژێمـی (شاهەنشـاه)ی ئێران بـەزۆر پێیـان چۆڵ بکات !

لـە ڕۆژی ١٩٧٨/٩/٥دا، بڕیـاری کوبوونەوەیەکـی فراوانـی کادیرەکانـی (کۆمەڵـە) درا. چونکـە تـا ئـەو کاتـە (کۆمەڵـە)، بـە ڕەسـمی کۆمیتەیەکـی سـەرکردایەتی نەبوو، جگە لە (کۆمیتـەی هەرێمـەکان)! ئیتر کە کاک (ئارام) لـە ١٩٧٨/١/٣١، لـە بـەری قـەراغ و لـە گونـدی تەنگیسـەر شـەهید دەبێت و (سـالار عەزیز)یش لـە دەرەوەی وڵات بـوو، کە هێشـتا نەگەڕابووەوە و لەسـەر گەڕانـەوە بـوو، تەنها (مـەلا بەختیـار) و شـەهید (ئـازاد هەورامـی) لـە شاخ و لـە ناوچەکانـی سـەرکردایەتی مابوون! لـە هاوڕێیانـی کۆمیتـەی شـارەکانیش (ئیبراهیـم جـەلال و ئیحسـان نەجـم - ئەبـو شـەهاب - ) مابـوون و هەردووکیـان لـە شـاخ بـوون! (نەوشـیروان مسـنەفا)ش تـا ئـەو کاتـە ئەندامـی سـەرکردایەتی (کۆمەڵـە) نەبـوو، بۆیـە کۆبونەووەیەکـی فـراوان پێویسـت بـوو، کـە هـەم بـە فەرمـی دەسـتەیەکی سـەرکردایەتیی بۆ (کۆمەڵـە) هەڵبژێرن، هـەم چاوێک بە بارودۆخـی (کۆمەڵـە) و شۆڕشـدا بخشـێنێتەوە! بۆیـە کۆبوونەوەیەکـی فـراوان بـە ئامادەبونـی ٢٠ کادری (کۆمەڵـە)، لـە ١٩٧٨/١١/٥ لـە گونـدی (شـێنێ) ی بنـاری شـاخی مامەنـدە بەسـترا! لـەدوا سـاتەکانی کۆبوونەوەکەشـدا (سـالار عەزیـز)، فریاکـەوت و ئامـادە بـوو، جگـە لـە ناوبراوانـی پێشـوو هەریەکـە لـە (مـلازم عومـەر و مـلازم سـەید کەریـم و شـەهید ڕێبـاز و ئـازادی سـەگرمە و ئیبراهیـم جـەلال)، لـە ئامادەبووانـی ئـەو کۆبوونەوەیـە بـوون!

جگە لە لێدوانی تێرو تەسەلی هەلومەرجی ناوچەکە و کوردستان و بارودۆخی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و بڕیاردان لە پێویستی دەرکردنی گۆڤاری (کومەڵە) و گۆڕینی ناوی (کۆمەڵە)، هەستان بە دانانی سەرکردایەتییەک بۆ (کۆمەڵە)، کە لە ١١ ئەندام پێکهاتبوو، ئەوانیش بریتی بوون لە (نەوشیروان مستەفا، مەلا بەختیار، سالار عەزیز، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، فازیل کەریم - مامۆستا جەعفەر- ، ملازم سەید کەریم، ئیحسان نەجم و ئیبراهیم جەلال) بە مەرجێک ئەو هاوڕێیانەی سەرکردایەتی (کۆمەڵە) کە لە زیندانانندان، مافی ئەندامی سەرکردایەتییان هەبێت تا ئازاد دەبن! دوای دابەش بوونی هاوڕێیانی سەرکردایەتیی (کومەڵە) لە کۆتایی سالی ١٩٧٨ دا، یەکەمین ژمارەی بڵاوکراوەی گۆڤاری (کۆمەڵە)، وەک ئۆرگانی (ناوەندی کۆمەڵە) دەرکرا!

## (صدام)، نەیارە سەرکردەکانی (بەعس)، دەنێرێ بۆ زیندان!

ئەو رۆژانە، کە ئێمە لە (ئەمنی عامە) ئەشکەنجە دەدراین، جارو بار گوێمان لە دەنگی کابرایەکی عەرەب دەبوو، کە لە گیراوێکی ئاسایی نە دەچوو بە تەنها لە ژوورێکی بچووکدا زیندانی کرا بوو! دەیووت.. بۆچی ئێمە ئاژەڵین لێرەیان داناوین! دیار بوو کەسێک بوو بە خۆی دەنازی و پاسەوان و ئەمنەکانیش رێزیان دەگرت! دوایی زانیمان یەکێک بوو لە سەرکردە و هاورێکانی (صدام حسین) لە حیزبی بەعسدا! ئەو کابرایە (عەبدوڵلا سلوم سامرائی) بوو، ئەندامی سەرکردایەتیی نەتەوایەتی عەرەبی(هەرێمی عێراق) بوو، لە سەرەتاکانی سالی ١٩٦٩یشدا، وەزیری راگەیاندن بوو!

هەر لەو کاتەدا هاورێیەکی تری، واتە (عبدالخالق سامرائی) لە سەرکردایەتیدا، کە پیاوێکی هێندە نەرم و نیان و خۆش روو بوو (بارزانی) لەبارەیەوە وتبووی.. ئەو پیاوە کۆتری ئاشتییە، کەچی بە تەنها لە زیندانێکی تەنهاییدا لە بەرامبەر موخابەرات، زیندانی کرا

بـوو! (صـدام) بەوجـۆرە رەفتـارە ناسـرا بـوو، کـە هەرکـەس بـە توانـا بێـت و مەترسـیی بـۆ سـەر کەسـایەتیی ئـەو هەبێت، ئـەوا بـۆ نـاو و بەرزبوونـەوەی پلـەی خـۆی تەڵەیەکی بـۆ دەنێتـەوە و بـە کوشـتن یـا بـە زینـدان ئـەو مەترسـییە لەخـۆی دوور دەخاتـەوە!

ماوەیەکی کـەم بـەر لـە ئـازاد کردنمـان، (صـدام حسـین) کۆمەڵێکـی تـری لـە سـەرکردە ناسـراوەکانی حیزبـی (بەعـس)، نـاردە زیندانەکـەی ئێمـە (زیندانـی حوکمـە تایبەتەکانـی ئەبـو غرێـب)، بـۆ ئـەو بەدبەختانـە (دارۆ و جەبـار فرمـان) و منیـان بانـگ کـرد، کـە قاوشـەکەیان لـە دەرەوە تەختـە بەنـد بکەیـن! ئاخـر ئێمـە ئەوکاتـە هەرسـێکمان بـە پلـەی سـەرکەوتوو کۆرسـی دارتاشـیمان تـەواو کـرد بـوو، ئیتـر بەڕێوەبـەری بەشـی دارتاشـی ئێمـەی لەگـەڵ خـۆی بـرد تـا ئـەو کارەی بـۆ ئەنجـام بدەیـن!

دیوارەکانی قاوشـەکە بـە شـیش دروسـت کـرا بـوون، هـەم خەڵـک ئەوانـی دەبینـی و هـەم ئەوانیـش خەڵکیـان دەبینـی! بۆیـە تەختـە بەسـتیان دەکـرد تـا بـەر بـەو بینینـە بگـرن! ئێمـە بـەر لـە گەیشـتنمان بـۆ ئـەوێ نەمانزانـی کێـی تێدایـە، بـەڵام کـە گەیشـتین روانیمـان ئـەوە (شـوکری حدیسـی، مرتـەزا عبـدول باقـی و محمـد حدیسـی) و هەندێکـی تـر بـوون، کـە لـە سـەرکردەکانی حیزبـی (بەعـس)ن و کەچـی وەک ئێمـە کەوتوونەتـە زینـدان! کارەکەمـان تـەواو کـرد و گەڕاینـەوە، بـۆ هاوڕێکانمـان گێڕایـەوە، ئەوانیـش بـەو هەواڵـە شـادومان بـوون! ئیتـر لـەو رۆژەوە ئێمـە زیاتـر هەسـتمان بـەوە کـرد، کـە دوژمنەکەمـان حاڵـی لـە ئێمـەی کـورد باشـتر نییـە و هەنـاوی پـڕە لـە ململانـێ و ناکۆکیـی! کودەتاکـەی (صـدام) بـە سـەر (احمـد حسـن بکـر) دا و لادانـی لـە سـەرۆک کۆمـار و پاشـان مردنـی کتوپـڕ و گومانـاوی (بەکـر) و دواتریـش لەناوبردنـی (محەمـەد)ی کـوڕی، بـە رووداوی گومانـاوی ئوتۆمبیـل، لـەو کـارە دزێوانـەی (صـدام)و حیزبـی

(بەعس) بوون، کە لە ئەنجامی ململانێی ناوخۆیی، دژی (رەفیق)ەکانی خۆیان ئەنجامی دا! پاشان ئەو هەموو گرتن و کوشتنەی سەرکردە گەورە و ناسراوانەی حیزبی (بەعس) و حکومەتی عێراق، زەمینەیان بۆ ئەوە خۆش کرد، کە (صدام) ئەو رووداوە گەورەیە بە رووداوێکی تر داپۆشێت و لەبیری خەڵکی بباتەوە، ئەویش کارێک بوو کە پەیوەندیی راستەوخۆ و نا راستەوخۆی بەسەر زۆربەی خێزان و بنەماڵەکانی خەڵکی عێراقەوە هەبوو، کە بریتی بوو لە ئازاد کردنی هەمو زیندانییە سیاسییەکانی کورد و عەرەب و تورکمان و ئاشوری، بە یەک بڕیار لە لایەن (صدام حسین)ەوە!

پاش دەرچونی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش بە ئیمزای (صدام حسین) و بە لێبوردنی گشتی بۆ زیندانییەکان و بڕیاری سپیکردنەوەی زیندانەکان، ئەوا بە چەند رۆژێک هەر یەکە و فۆرمێکیان بە ناو و ناونیشان و هەموو زانیارییەکی شەخسی پێ پڕ کردینەوە و تاقم تاقم بە نۆبە ئازادیان کردین و لە دەرگای زیندان دەست بەردارمان بوون! ئەوی لەو ساتەدا لە هەمووی زیاتر جێگەی داخ و کەسەرێکی ناخۆش و گەورە بوو، ئەوە بوو کە هاوڕێکانمان شەهیدان (شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر) مان لەگەڵ نەبوو! چونکە (صدام) لە سێدارەی دابوون و بەوە تاوانێکی تریشی خستە سەر زنجیرەی تاوانەکانی دەرهەق بە کوردستان! هاوکات دەیان هاوڕێی تریشمان، کە ساڵانی دوایی لە سێدارە دران و هەوای ئازادییان هەڵ نەمژی، داخێکی تر بوو، کە بیرچونەوەی ئاسان نەبوو!

لەگەڵ هاوڕێکانمان دەستی یەکترمان گوشی و ماڵ ئاواییمان کرد! پێشتریش تەگبیری تەواومان کرد بوو هەر یەکە چی بکەین و چۆن بکەین! لەبەر دەرگای زیندان هاوڕێ و کەس و کار سواری ئۆتۆمبیلیان

کردین و هەریەکەمان رووممان کردە ئەو شوێنەی کە دەبوو بۆی بچین! لە بیرم ناچێتەوە لە هاوڕێکانی (کۆمەڵە)، کاک ( مەجید سەلیم و نوری حاجی عەبداللە)، دوو بازرگانی سلێمانی بوون، کە لەگەڵ کەس و کارماندا هاتبوون بە پیرمانەوە !

## هەوای ئازادی!

یەکەمین رۆژی ئازادی و دوور لە دیوارەکانی زیندان و دوور لەچاوی ئەمن و پاسەوانەکان، ئێوارە رۆژێکی ئێجگار جیاواز و خۆش بوو! چاومان بەو کەسانە کەوتەوە کە چوارساڵ بوو چاویان لە قاپی زیندان بوو، تا رۆژێک ئەو دەرگا گەورەیەی زیندانمان لەسەر بکرێتەوە و لە چنگی رەش و مەترسیداری بەردەوامی ئەگەرەکانی زیندان دەرباز بین! چەند رۆژێک لە بەغدا لە ماڵی (بەختیار)ی برام لەگەل ژن و منداڵەکانم و باوکم و باوەژن و خوشک و براکانمدا پشوم دا و پاشان گەڕامەوە بۆ سلێمانی. لەوێش چاومان بە هاوڕێ و خزم و ماڵ و منداڵی شەهیدەکان کەوت، یەکەمین ژنە شەهید (گوڵاڵە)ی خێزانی شەهید (عەلی ئامەخان) براژنی (پاکیزە)ی خێزانم، پێشوازی لێکردین و لەسەر شانم زۆر فرمێسکی پڕ لە سوێ و گەرمی رشت! دوایی چوومە لای دایکی شەهید (جەمالە رەش)و کەس و کاری کاکە (شەهاب)! خوا هەڵناگرێ رۆژانە خەڵکێکی زۆر بەڕێوە بوون بۆ سەردان و چاو و

روونـی کـردن لـە کـەس و کارمـان، خۆشـی و شـادیی خۆیـان بـە ئـازاد بوونمـان دەردەبـڕی! بـەڵام لای مـن دنیـای ئـازاد ئـەو شـاخانە و ئـەو دنیایە بـوو، کـە هـاوڕێ پێشـمەرگەکانمی لـێ بـوو! بۆیـە لـە گێژەنـی ئـەو قەرەباڵغی و میهرەبانـی دۆسـت و خـزم و هاوڕێیانـەدا، مـن هـەر بیـرم لای ئـەوە بـوو: کـەی و چـۆن بگەمـە دنیـای ئـازادی و باوەشـی چیـا گـەردن کەشـەکانی کوردسـتان! بۆیـە کاتـێ بەجەسـتە لـە نـاو کـەس و کار و خـزم و خوێشـدا بووم، کەچی بیـر و هۆشـم لای دانانـی نەخشـەیەک بـوو، بـۆ مـاڵ ئاوایـی کـردن لـەم زیندانـە گەورەیـەی سـلێمانی و گەیشـتن بـە هـەوای ئازادیی شـاخەکان! لـەو ماوەیـەدا جگـە لـە کـەس و کاری شـەهیدان (جەعفـەر و ئەنـوەر زۆراب)، کـە هەندێکیـان لـە دووریشـەوە هاتبـوون، مامۆسـتا (جەمـال تایـەر) و هـاوڕێ (جەبـاری حاجـی ڕەشید)یشـم بینـی! نەخشـەکەمان وابـوو، کـە سـەرەتا زۆر ئـارام و لەسـەرخۆ و دوور لـە چالاکی سیاسـی و ڕێکخراوەیی خەریکی ژیانـی ئاسـایی خۆمـان بیـن، تـا لـە دوژمـن بگەیەنیـن، کـە هەقمـان بەسـەر هیـچ شـتێکەوە نییـە و بـە ئارامـی دانیشـتووین و دەسـتمان گرتـووە بـە کڵاوی خۆمانـەوە تـا بـا نەیبـات! بـە کورتییەکـەی وا نیشـانی بدەیـن، کـە خەریکـی ژیانێکـی ئاسـایی و ڕێکخسـتی مـاڵ و خیـزان و ژیـان و گوزەرانـی خۆمانیـن، تـا بتوانییـن سـەرکەوتووانە و دوور لـە داو و بۆسـەی دوژمـن، لـە شـار دەربـاز بیـن! بـۆ ئـەوەش کار ئاسـانی و پەیوەندییەکانمـان بـۆ چوونـە شـاخ خۆمـان ئەنجامـان نەئـەدا، بەڵکـو ئـەو کارەمـان بەهـۆی کەسـی نزیـک و هـاوڕێ نـە ناسـراوەکانەوە جێبەجـێ دەکـرد! لـەو ماوەیـەدا مـن لەگـەل خاڵـە (بەکـر)م، لـە دوکانـی دارتاشـخانەکەی لەگـەڵ خۆیـدا دارتاشـیم دەکـرد و چالاکیهی ئاشـکراکانم تەختـە و بلـۆک و ئیسـپرتۆ کـردن و دروسـت کردنـی مۆبیلات و ژوری نووسـتنی جـوان بـوو! سـەردانی دکتـۆر (جەمیل حاجـی

عەبدوڵا) و (دکتۆر هوشیار)م کرد، کە خزم و دۆستی خۆم بوون! ڕۆژێک لە پشتی خاڵمەوە بە سواری ماتۆڕێک دەچووین بو ماڵی یەکێک لە برادەرەکان، کە مامۆستا (جەمال تایەر)، ئەو کاتە گەورە لێپرسراوی شار بوو، هاوکات هۆی ڕێکخستنی پەیوەندیم بوو لەگەڵ شاخ، لەوێ چاوەڕوانی دەکردم! لەپڕ تاکسییەک بەرە و رومان هات و بە شێوەیەکی سەیر و گوماناوی لێیداین، ماتۆرەکە پەڕی و منیش لەگەڵیا کەوتمە تەقلە لێدان و لەو ڕووداوەدا قاچم شکا! دوای ئەوەی کە لێکدانەوەیەکی زۆرمان بۆ ئەو کارەی خاوەن تەکسی کرد، وتیان بە فیتی لێپرسراوانی ئەمن ئەو کارە ئەنجام دراوە ، بێ ئەوەی خۆم هیچ لە ڕاستی ڕووداوەکە بگەم! ئیتر پاش هەندێ چارەسەر هەوڵمدا هەرچی زوترە بڕۆمە دەرەوە بۆ شاخ و لەوە زیاتر خۆم نەخەمە بەر ئەگەری هات و نەهات!

## پێشمەرگایەتی!

لەگەڵ هاوڕێ (عەلی بچکۆل)، هاوئاهەنگیەکی ڕێک و پێکمان کرد و لەسەر زەمان و زەمینی چوونە دەرەوە ڕێککەوتین! بۆ ئەوەش بڕیارمان دا خۆمان بگەیەنینە ناوچەی سوورقاوشانی چەمی ڕێزان، کە ئەو بەرد بە بەردی ئەو ناوچەیە شارەزا بوو. بڕیار وابوو ئەو بەر لە ئێمە بگاتە ئەوێ و لەوێ چاوەڕوانمان بکات، تا پێکەوە لەوێوە بەرەو سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بڕۆین لە (خڕی ناوزەنگ) لە بناری شاخی مامەندە!

(شەماڵی بەهجەت کابان)، کە ئەوکاتە لاوێک بوو لە ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە)دا کاری دەکرد، کوڕێکی ئازا و چاک بوو، لەگەڵ (سالار و کامەران)ی برامدا هاوڕێ بوون! ڕۆژێک بە ئۆتۆمبیلەکەی (شەماڵ)، پڕ لە ژن و منداڵ لەگەل (سالار و کامەران)ی برامدا بە بیانووی سەیرانی دوکان لە ئاستی ڕێگەیەک، کە بۆ (سور قاوشان) دەچوو، دابەزین و وەک سەیرانکەر بڵاوبووینەوە! پێشتر هاوڕێ (عەلی بچکۆل)، مشووری

خوارد بوو کارەکانی ڕێک خستبوو، کە بە تێکۆشەریکی تردا بە ناوی (مام ئەوڕەحمانی) سورقاوشان، کە ئەویش هەر هاوڕێی (کۆمەڵە)بوو، وڵاخێکی بۆ نارد بووم! منیش سواری وڵاخە بۆر بووم و لەگەڵ ئەو برایەدا کەوتینە رێ بەرەو (سورقاوشان) و چەمی رێزان. ئێوارەیەکی درەنگ، کاتی شێوی ئێوارە بوو گەیشتینە گوندی (سورقاوشان) کە تەنها ماڵی (مام ئەوڕەحمان) و و ئامۆزایەکی بە دزی رژێمەوە لەو گوندە مابوون و لە خانوویەکی بەردین و گڵدا دەژیان! وابزانم ئەو ماڵەش هەر وەک مام (ئەوڕەحمان) بۆ راییکردنی کاروباری پێشمەرگە بە نهێنی و لەناو چەمی (سورقاوشان)دا لەوێ حەشار درابوو!

هیچ روناکییەک لە گوندەکەدا نەبوو، لە ترسی جاش و چاودێری حکومەت بە تاریکی، شەویان رۆژ دەکردەوە تا کەس هەست بە بوونی ئەوان نەکات لەو شوێنەدا ! مام (ئەوڕەحمان)، بە شڕە بەتانییەکی کۆن دەرگا و پەنجەرەکانی کون بڕ کرد بوو، تا هیچ رووناکیەک لە دەرەوە دیار نەبێت! تەنها (عەلی بچکۆل و شەهید ئەنوەر حەسەن)، بە یاوەری دوو تفەنگی کلاشینکۆف لە ماڵ بوون! پرسیارم کرد و وتم: ئەوە بەم شەوە و لەناو ئەم بێشەلانەدا بەو ئەندازەیە سڵ لە روناکی چرا دەکەنەوە! مام (ئەوڕەحمان)، وەرامی دامەوە و وتی: پێرێ شەو جاشەکانی (قالە فەرەج) هاتبوون بۆ ئەم ناوە و سۆراخی ئاوەدانی و یەک رۆح لەبەری ئێرەیان دەکرد، دەستی شکاوم بۆ پێشمەرگە و چوار تفەنگی تر، نەمانتوانی تەقەیان لێ بکەین، ئەگینا کەوتبوونە بۆسەی ئێمەوە! لە گەرمەی باسی جاشەکانی (قالە فەرەج و حەمەی شێخ حەسەنی بەفراو)دا بووین، (عەلی بچکۆل)، چوار هەناری لە کونە دیوارێکدا دەرهێناو بۆ سوعبەت وتی: ئەمشەو یەکی لەتێ هەنار بخۆن لەوە باشترە باسی فرسەتی لەدەست چووی دوێنێ

شـەو بکـەن! ئـەو شـەوە زۆر مانـدوو نەبـووم، کەمێـک نووسـتم! مـام (ئەوڕەحمـان) و کاک (عەلـی) بـە نۆبـە حەراسـەتیان گرتبـوو!
بەیانـی زوو هێشـتا روناکـی زەفـەری بـە تاریکـی دۆڵەکـە نەبـرد بـوو، کەوتینـە رێ بـەرەو (زەرزی)و (قزقاپـان)، لـەوێ تووشـی هێـزی پێشـمەرگە بووین، هـاوڕێ (سـەلاح چاوشـین) فەرمانـدەی تیپەکـە بـوو، پێشـوازییەکی گەرمـی لـێ کردین و بـێ ئـەوەی ناومـان بهێنێت بـە زۆربـەی ئامر کـەرت و مەفرەزەکانـی ناسـاندین و هەریەکـەش ناوێکـی نهێنییـان لـێ نابوویـن، مـن نـاوم (حەسـەن ) بـوو. لـەوێ هاوڕێیـان (سـەلاح چاوشین)، فەرماندەی هەرێـم و (غەریـب سـەعید) کـە فەرمانـدەی کـەرت بـوو، هەردووکیـان کۆنـە هاوڕێم بـوون، بۆیـە ئـەوان منیـان دەناسـی! باقی پێشـمەرگەکان لاوی تـازە پێگەیشـتو بـوون و بـە رەنـگ و روو دەموچـاو منیـان نەدەناسـی! بـەلام هـاوڕێ (عەلـی بچکـۆل) ناسـراوتر بـوو، ئەویـش بـەو حوکمـەی لەنـاو پێشـمەرگەکاندا کـە هەندێکیـان خەڵکـی ناوچەکـەی ئـەوان بـوون لـە (قـەلا سـێوکە)وە تـا دەکاتـە سـنووری (عەسـکەر و سـۆتکە و ئاغجەلـەر و ناوچـەی چەمـی ریـزان)، ئـەوا کاک (عەلی)یـان دەناسـی!
لای ئێوارە کاک (سـەلاح چاوشین)، ( غەریب سـەعید )ی فەرماندەی کەرت و هەنـدێ پێشـمەرگەی ئـازا و شـارەزای لەگـەڵ ناردیـن تـا بمانگەیەننـە سـەرکردایەتی! شـەو لـە جـادەی قیـر پەڕینـەوە بـۆ مێرگەپـان، شـەوێ لـە رەشماڵەکانی مـەڕدارەکان لـە لای کاک (مەولود)ی مـەڕدار ماینەوە، چونکە هەمـوو زۆر مانـدوو بویـن، زوو خەومـان لێکـەوت! رۆژی دوایـی، دوای نـان خواردنێکـی تێـر و تەسـەل بـە سـەر شـاخی چەرماوەنـدا هەڵگەڕایـن تـا بگەینـە مالوومـە بـۆلای شـەهید (جەمالـی عەلـی باپیـر)، لـە گونـدی (مالوومـە)! ڕێگاکـە بـەرەو رەزەکانـی نێوان گونـدی (یاخسـەمەر) و گونـدی (چۆخمـاخ )، شـۆڕی کردینـەوە، کاک (غەریـب سـەعید)، زوو بـە دووربیـن

تەماشایەکی ناوچەکەی کرد، هەستی کرد کە هێزیکی سوپای عێراق هاتوونەتە گوندی (چۆخماخ)، لەو سەر شاخە خۆمان قایم کرد تا باشتر دۆخەکەمان بۆ روون دەبێتەوە! کاک (غەریب) دەیویست تا بۆی بکرێ تووشی شەڕ نەبێت، بۆ ئەوەی ئێمە بەسەلامەتی بگەیەنێتە سەرکردایەتی! لە ناکاو جووتیارێکی ناو گوندەکە بە پەلە پەیدا بوو، لەوە دەچوو ئەویش کاتی شالاوی هیزەکەی دوژمن لە ناو رەز و باخدا بوبێت و لەترسا لەو شاخە خۆی شاردبووەوە، تا تووشی کاک (غەریب) بوو ناسی و هاتە لای. باسی کرد و وتی.. من هەندێ کارم هەبوو ئەمڕۆش دەبوو خۆم بە ئاودانەوە خەریک بکەم، بەڵام هێشتا لە ناو مازووەکاندا بووم، کە ئەو هێزە زۆرە وەک کوللە دابارینە ناو دێ و دەستیان کرد بە پشکنین، من بزانم شوێن (جەمالی عەلی باپیر) کەوتوون، چونکە دوو رۆژ پێشتر لە چۆخماخ بوو!

دوای ئەوە پێشمەرگە ئاسا لە هەندێ شوێنی باڵادەستی شاخ دامەزراین، نەوەک هێزی دوژمن روو بکەنە شاخەکە! زۆری نەبرد لە خوار خۆمانەوە گوێمان لە دەنگی سەربازەکان بوو، کە بە بێتەل قسەیان لەگەڵ هێزی ناو دێکەیان دەکرد. بەڵام کاک (غەریب) فەرمانیدا، کە نامانەوێت تووشی شەڕ بین لەگەڵ هێزێکی گەورەی دوژمندا، چونکە ئەرکەکەمان شتێکی ترە نەک ئەم شەڕە! دوایی بۆمان دەرکەوت، کە رۆژی پێشتر هاورێیان (عومەری سەید عەلی و ئاسۆی شێخ نوری) یش لەو گوندە بوون و چوونەتە شاخ خۆیان حەشارداوە! پاش چەند رۆژێک لە رۆیشتن و دێ بەدێ و شاخ بە شاخ کردن، یەک رۆژ دوای گەیشتنی کاک (عومەر و ئاسۆی شێخ نوری ) گەیشتینە (خڕی نێو زەنگ)، کە ئەو کاتە بارەگاکانی سەرکردایەتی لەوێ و لەو دەورو بەرەدا بوون!

لەوێ (مام جەلال)، زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردین، ناردی بە شوێن کاکە نەوە (نەوشیروان مستەفا)دا، ئەویش لە بەرزاییەکی بڵند بوو بە ناوی (زینۆی سوور)، خێرا هاتە خوارەوە و پاشان بە گەرمی باوەشی پێدا کردین و خۆشحاڵیی خۆی نیشاندا! (نەوشیروان مستەفا و مام جەلال) هەر دوو بە میهرەبانی زۆر و برایانە پێشوازییان لێکردین و وتیان: هاتنتان لەم کاتەدا هێز دەداتە بەر شۆڕش و لە کاتێکی زۆر باشدا گەیشتن، بەخێربێن سەرچاو! بەرەبەرە (ملازم عومەر و ئازاد هەورامی)ش، کە لە زەڵێ گەڕابوونەوە هاتن و بە هەمان جۆری هاوڕێیان، ئەوانیش خۆشحاڵییان نیشان دا! هەواڵی هاوڕێکانی ترمان پرسی، وتیان.. لە ( توژەڵەن)! رۆژی پێشووتر (عومەری سەید عەلی و نەوشیروان)، یەکتریان بینیبوو، بەڵام لە هەڵساندا (نەوشیروان)، (عومەری سەید عەلی) و منی بردە لای خۆی!

ماوەیەکی زۆر هەر لەگەڵ (نەوشیروان)و لە بارەگاکەی ئەو ماینەوە! لە ژورێکدا کە بە کەڵەکە بەرد دروست کرابوو کون و کەلەبەری زۆر بوو، با لە نێو درز و کەلێنەکانیەوە دەهاتە ژورەوە ! فەرماندەی پێشمەرگاکانی یاوەریی هاوڕێیەکی وریا و میهرەبان بوو، بەڵام کەمێ تورە بوو، ئێستا بە ناوی (ئازادی سەگرمە)، بەناو بانگە! ئەم لاوە خوێندنی ئاستی پەیمانگا بوو، کوڕێکی ژیر و ئازا بوو، لە رۆژانی سەختدا فەرماندەی تیپی پێشمەرگەی (سەگرمە) بوو! دوای کیمیاباران و هێرشە گەورەکانی رژێم بۆ سەر سەرکردایەتی، ئەو هاوڕێیە یەکێک بوو لە فەرماندە هەڵکەوتووەکانی شەڕی پارتیزانی( رۆژگاری پارتیزانەکان ) و بە خەستی بریندار دەبێت! رێکخستەکانی شاری سلێمانی زۆر قارەمانانە دەربازیان کرد بۆ تیمارکردن و لە مەرگ رزگاریان کرد! ئەو زاتە پاکە تا ئێستاش هەر خۆی بە تێکۆشەر

و دڵسـۆزی (یەکێتـی) دەزانـێ، بـێ ئـەوەی تـا ئەمـڕۆ کارێکـی بـۆ دیـاری کرابێـت!

لـەو بارەگایـەدا لەگـەڵ کاک (نەوشـیروان) لـە زۆر لایەنـی جووڵانەوەکـە و هێـزەکان و ناکۆکیـی و ململانێـکان شـارەزا بوویـن، شـەو تـا درەنـگ راسـتگۆیانە دیاردەکانـی هەڵدەسـەنگاند و بـۆی بـاس دەکردیـن! لەسـەر جیابونـەوەی (بزوتنـەوەی سۆسیالیسـت) و (رەسـول مامەنـد و دکتـۆر مەحمـود)، کـە ئـەو دەمـە پێکهاتەیەکـی هەبـوو بـە نـاوی (کۆمیتـەی ئامادەکـردن - اللجنـە التحضریـة )، قسـەی بـۆ کردیـن! پیشـتر هەواڵـی هەندێ نـا تەبایی نێوان (نەوشـیروان) و لاوەکانـی (کۆمیتـەی هەرێمـەکان) مـان بیستبوو، چەند جارێک دەمویست رای ئەو لە سەریان بزانم، کە لـەو بارەیـەوە پرسـیارم لێدەکـرد، خـوا هەڵناگرێـت بەستایشـەوە باسـی دەکردن و بەچاکە نـاوی (مـەلا بەختیـار)ی دەهێنـا و زەمـی (سـالار عەزیـز) یشـی نەدەکـرد! تەنانـەت لەبـارەی ئـەو وتـارەوە کـە (مـەلا بەختیـار) لـە ژمـارە شەشـی بڵاوکراوەی (کۆمەڵـە)دا، بـەر لەگەیشـتنمان بـۆ بارەگاکانـی (خڕی نـاو زەنـگ)، بـڵاوی کردبووەوە و تیایدا بـە شـێوەیەکی نادروسـتانە پـلاری گرتبـووە سـەرکردایەتی پێشـووی (کۆمەڵـە)! یاخـود لـە بـارەی ناوەرۆکـی (راپۆرتـی شـوبات)ی کۆمیتـەی هەرێمەکانـەوە، کـە پرسـیارمان لێدەکـرد، ئـەو هەوڵـی دەدا لامـان ئاسـان بکات و تەقـەلای نەئـەدا لـە دژی هاوڕێیانـی کۆمیتـەی هەرێمـەکان هانمـان بـدات!

(راپۆرتـی شـوبات) یاخـود (بەیانـی شـوبات)، بریتـی بـوو لـەو نووسـینەی، کـە لـە بـاری سـەرنجی شـەهید (ئـارام) و کۆمیتـەی هەرێمەکانـەوە لەسـەر بارودۆخـی فیکـری و سیاسـی و رێکخراوەیـی (کۆمەڵـە) و رۆڵـی سـەرکردایەتیی پێشـووی (کۆمەڵـە)، کـە لـە شـوباتی سـاڵی ١٩٧٦ دا نووسـراوە، بڵاوکراوەتـەوە! ئـەو راپۆرتـە زۆر نـان و پیـازی پێـوە دەخـورا،

بڕوا دەکەن ئێستەشی لەگەڵدا بێت، نە دیومە و نەخوێندوشمەتەوە! هێندە نەبێت جارێکیان شەهید (عەبدولڕەزاق) بۆی گێڕامەوە و وتی.. ئەو ڕاپۆرتە لایەنی زۆر ژیرانە و باشیشی لەخۆ گرتبوو، تەنها لایەنە خراپەکەی ئەوە بوو، کە ئێمە هێشتا لەژێر گیر و گازی ئەشکەنجەدا بووین و هێشتا ملمان لە ژێر چەقۆدا بوو، کە ئەو هاوڕێیانە ئەو بەیانەیان نووسی و بڵاویشیان کردەوە! جا ئەگەر ئەو ڕاپۆرتە دەست دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم بکەوتایە، دەکرا لە دژمان ببێتە بەڵگە بۆ تاوانبارکردنمان بە دەست دوژمنەوە! ئەو وتارەش کە (مەلا بەختیار)، لە ژمارە شەشی گۆڤاری (کۆمەڵە)دا، بە ناوی (باوکی ئاوارە) و لە ژێر ناونیشانی (چەند تیشکێ، بەسەر هەندێ لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا) بڵاوی کردبووەوە، لە ناواخنی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندا جۆرێک لە ڕەخنە گرتن بوو لە سەرکردایەتیی پێشوی (کۆمەڵە)، کە سیانیان لە سێدارە درابوون و ئەوانی تریشمان تازە لە زیندان ئازاد کرابووین! ئەوەی ئەو کاتە دڵگرانی کردبووین ئەوە بوو، کە ئێمە چاوەڕوانییەکی باشترمان لە پێشوازیی هاوڕێکانمان دەکرد، ئەگینا هەر تێڕوانین و هەرچی ڕەخنەیەک لە هەر ڕووداوێک بگیرێت، ئاساییە و مافی خۆیەتی و دەکرێ بە سلبی وەرنەگیرێت!

دۆستایەتی و ناسیاویمان لەگەڵ (نەوشیروان) لەوانی تر کۆنتر و زۆرتر بوو، ئەویش تەجروبەی لەوانی تر زۆرتر بوو! لەبەر ئەوە زۆرتر ناڕەحەتی و ناڕەزاییەکانمان ئاراستەی ئەو دەکرد، ئەویش سەرەڕای ئەوەی باسی ئەوەی دەکرد، کە لەوکاتەدا، واتە کاتی نووسین و بڵاوکردنەوەی وتارەکە ئەو لەدەرەوە بووە و ئاگادار نەبووە، هاوکات هەوڵی دەدا لە ئازاری ئەو کارە کەم بکاتەوە و زۆری لێ نەپێچێنەوە و تەنها تێبینیی ئەوەندە بوو، کە دەیوت: لەگەڵ ئەوەشدا ئەو برایانە

دڵسۆز و چالاکن، بەڵام گەنج و بێ تەجروبەن. کە لەسەر راستیی رووداوەکانی جیابونەوەی بزووتنەوەش پرسیارمان لێکرد، دەیوت: ئەگەرچی (مام جەلال) لای وایە هەندێک، نەک هەموو بزووتنەوە جیابوونەتەوە، بەڵام راستیەکەی بزووتنەوە ئەوەیە کە جیابۆتەوە و ئەوەی ماوە (مام جەلال) بەرەبەرە بە نامە لە شارەوە دەیانهێنێتە دەرەوە. ئەوانەش کە جیابوونەتەوە جگە لە بادانەوەکانی خۆیان، لایان وایە بەو جیابوونەوەیە سەربەخۆیی سیاسی و رێکخراوەیی و سەربازی بە دەست دەهێنن و زیاتر گەشە دەکەن و رەنگە بە نیازی ئەوەش بن خەتی سێیەم پێک بهێنن! بە قسەی خۆیان ئیتر لە تاکرەوی (مام جەلال)، رزگار دەبن و گلەیی زۆریش لەوە دەکەن، کە (مام جەلال) گوێ بە سەرکردایەتیی بە کۆمەڵ نادات!

راستە ئەوانەی جیابوونەوە و رۆیشتن پاش شەهید کردنی (عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید) لە ناو بزووتنەوەدا، ئەوانەی جیابەونەوە و گرنگ و کاریگەر بوون (رەسول مامەند، دکتۆر مەحمود عوسمان، تایەری عەلی والی، حاجی حاجی ئیبراهیم، قادر جەباری، سەید کاکە، قادر عەزیز، مەلا ناصیح، عەدنان موفتی) و زیاتر لە ١٥٠ کەسی تر، سەرەرای (عادل موراد) و دەستەیەکی تریش، کە لەسەر ئەوان حساب بوون، بەو جیابوونەوەیە بۆشاییەکی گەورەیان خستە ناو یەکێتییەوە! ئەمانەش هەموو دەنگوباسی ناخۆش بوون و نیگەرانییەکی زۆریان لە یەکێتیدا بەجێهێشت!

ئەوانە هەم بزووتنەوە و هەم (کۆمیتەی ئامادەکردن –اللجنە التحضیریة - دکتۆر مەحمود عوسمان)، لە ئابی ١٩٧٩دا، کۆبوونەوەیەکی فراوانیان بەستبوو لەو کۆبوونەوەیەدا یەکیان گرت و خۆیان ناو نا (حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوی کوردستان - حسیک -) و لە رۆژانی دواییدا بوون

بە (حسک، حیزبی سۆسیالیستی کوردستان)! ئەو رۆژە هەواڵی هیچ یەک لە هاوڕێیان (مەلا بەختیار و سالار عەزیز و فازیل کەریم) مان نەبیست و دیار نەبوون، پاشان هاتن و چاومان پێیان کەوت!

پاش بینینی هاوڕێیان (مەلا بەختیار، سالار عەزیز، ملازم عومەر و مامۆستا جەعفەر)، هەندێ لێدوان لە دیار نەبوونیان لە کاتی گەیشتنماندا لای (مام جەلال) و لە ژوورەکەی ئەودا باسی لێکرا! پاش دوو سێ هەفتە کۆبوونەوەیەکمان کرد بە ئامادە بوونی (مام جەلال، نەوشیروان، مەلا بەختیار، سالار عەزیز، مامۆستا جەعفەر، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، عەلی بچکۆل، عومەری سەید عەلی، ئاسۆی شێخ نوری)، بۆ بە رەسمی هەڵبژاردنەوەمان لە سەرکردایەتی (کۆمەڵە)دا !

پاش چەند کۆبوونەوەیەک و ئاسایی رۆیشتنی پەیوەندییەکانمان، هەستم کرد لە ناو کادیرەکانی (کۆمەڵە)دا، جۆرێک لە بایەخ دان بەرامبەر ئەو هاوڕێیانە پەیدا دەبێت کە لە زیندان ئازاد بووبوون ! لە راستیدا ئێمە دەستە و باند نەبووین، بەڵکو وەک شتێکی ئاسایی لەبەر ئەوەی، کە چوار ساڵ لە زینداندا پێکەوە بووین و پێکەوە رووبەڕووی مەترسییەکان و ئە شکەنجەدان و دادگا بووبووینەوە و پێکەوە ئازاری دەنگ و باسەکانی (راپۆرتی شوبات)، رووی تێکردبووین و رەخنەکانی ئەو راپۆرتەش هەمووومانی پێکابوو، ئەوا نایشارمەوە جۆرێ لە سۆز و لە خۆشەویستی لە نێوانماندا هەبوو، ئیتر هەموو ئەو هۆکارانە پێکەوە وایان کردبوو، کە لە یەکتر نزیک بین! لەبەر ئەوەش ناویان نابووین (دەستەی زیندان) و دواتریش ناو نراین بە (تەکەتولی زیندان )! ئەو ساڵەی ئێمە لە زیندان ئازاد کراین و گەڕاینەوە لای هاوڕێکانمان لە شاخ، ساڵێکی پڕ لە رووداو بوو، بۆ نموونە..

- (صدام حسین)، کە هەرچەندە بە کردەوە، خۆی سەرکۆماری عێراق

بوو، بەڵام لەو ساڵەدا (احمد حسن بكر) ی لەسەر كورسی سەرۆك كۆمار لاداو خۆی چووە شوێنی! ئیتر پاش ئەو رووداوە زۆر هەڵوێست و رووداوی گەورەی دەرەكی و ناوخۆیی، گۆڕانكاریی بەسەر عێراق و رژێمی (بەعس)دا هێنا!

- (صدام حسين) لە گێچەڵێكی گەورە و لە شانۆگەرییەكی دەستكردا، زۆربەی نەیارەكانی خۆی و سەركردە ناودارەكانی حیزبی (بەعس)ی بە كوشتن و زیندانی و دەركردن گەیاند و خۆی بە كردەوە كردە كەسی یەكەم و دیكتاتۆری دڵرەقی عێراق و نەیارەكانی خۆی لە حیزب و لە دەسەڵاتدا پاك كردەوە!

- سەرەتای ئەو ساڵە شۆڕشی ئیسلامی توانی (شا)ی ئێران و دار و دەستەكەی شار بەدەر بكات و دەزگای (ساواك) و هێزە سەربازییەكانی (شا) لە ریشە دەربهێنێ! ئەمەش گۆڕانكاریی گرنگی لە ئێران و ناوچەكەدا بەدوای خۆیدا هێنا و كۆماری ئیسلامی ئێران توانی دەسەڵات بگرێتە دەست!

- هێزی پێشمەرگە لە شەڕی گەورەی سماقوڵیدا دەنگدانەوەیەكی گەورەی لە كوردستاندا بە دەستهێنا، لەو شەڕەشدا فەرماندەی قارەمان (سەید سەلیم)، شەهید كرا !

- لەو ساڵەدا لە زیندانی مووسڵ زیاتر لە ١٠ هاوڕێی (كۆمەڵە) لە سێدارە دران (حسێن مەولود - مەلا عەلی - مامۆستا عەزیز مەحمود، عوسمان عەسكەری كە بە دكتور مارف ناسرا بوو، رەسول عومەری خەیات، هوشیار ساڵح، كەمال سلێمان، ئازاد حەمە توفیق، ئیسماعیل كەریم، بەرزان و ئەڵوەند عومەر عەلی)، كە هەر دووكیان برا بوون، ئەوانە هەموو نموونەی لاوی قارەمانی گەلەكەمان و تێكۆشەرانی (كۆمەڵە) بوون!

- لە سەرەتای مارتی ئەو ساڵەدا سەرۆكی شۆڕشی ئەیلول و (پارتی دیموكراتی كوردستان)، (مستەفا بارزانی) لە هەلومەرجی ناكۆكیی و پارچە

پارچەیـی هێـزە کوردسـتانییەکاندا، کۆچـی دوایـی کـرد و بـە شـێوەیەکی دراماتیکـی کۆتایـی بـە ژیانـی پـر لـە خەبـات و تێکۆشـانی هـات، بـەڵام وەک سـەرکردەیەکی گرنـگ و کاریگـەر لـە مێـژودا مایـەوە!

- کوردسـتانی ئێـران و بـە تایبەتـی شـاری سـنە و زۆربـەی شـارەکانی کوردسـتانی رۆژهـەڵات، کەوتنـە بـەر شـاڵاوی پەلامـاردان و کوشـت و بـڕ و حکومەتـی (بەنـی سـەدر)ی کۆمـاری ئیسـلامی ئێـران کاری بێبەزەیـی زۆری دژی خەڵکـی کـورد ئەنجـام دا!

- (یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان)، توشـی کـەرت بـوون و زیانێکـی گـەورە هـات، بە جیابوونـەوەی هەڤاڵانی (بزووتنـەوەی سۆسیالیستی کوردسـتان) و سـەرکردە گرنگەکانـی!

- سـەرهەڵدانی دانوسـتاندن لـە نێـوان دەسـەڵاتدارانی ئێـران و جووڵانـەوەی کوردسـتانی ئێرانـدا هاتـە کایـەوە و هـەر لەسـەرەتاکەیدا بـە هاندانـی رژێمـی عێـراق و تەقـە کردنـی هەنـدێ لایـەن و ئەوانـەی لـە سـەر (کۆمەڵـەی زەحمەتکێشـانی ئێـران)، حسـاب بـوون، کۆسـپ بـۆ گفتوگـۆکان دانـرا!

- (پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان)، کـە ئـەو کاتـە بـە ( قیادە موەقەتـە) دەناسـرا، کۆنگرەیەکـی بەسـت و کێشـەکانی ناویـان سـەری هەڵدا و (سـامی عبدالرحمـن)، وەک نەیارێکـی (بارزانـی) دەرکەوت!

- (صـدام حسـین) بـۆ پەردەپۆشـکردنی رووداوی لادانـی (احمـد حسـن بکـر)، بڕیـاری لێبوردنـی گشـتی بـۆ زیندانییـە سیاسـییەکانی عێـراق دەرکـرد و بـە پرۆسـەی سـپیکردنەوەی زیندان، هەزارەهـا تێکۆشـەری ئۆپۆزیسیونی عێراق لـە زینـدان ئـازاد بـوون! ئێمـەش دەسـتەیەک بوویـن لـەو تێکۆشـەرانەی (کۆمەڵە) و یەکێتـی، کـە لـەو پرۆسـەیەدا ئـازاد کرایـن و چووینـەوە شـاخ!

## ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٠!

دوای وەدەرنانی (شا) و دارودەستەکەی و سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران، لە سەرەتای ساڵدا (بەنی صەدر)، کرا بە سەرۆک کۆماری ئێران، کە یەکێک بوو لە کەسە نزیکەکانی رابەری شۆڕشی ئێران، خوالێخۆش بوو (ئیمام خومەینی)! ئەو ماوەیەی کە (ئیمام خومەینی) لە پاریس خەریکی چالاکی بوو، (بەنی صەدر) یەکێک بوو لە نزیکەکانی و لەو دەستەیەدا بوو، کە کاروبارەکانی (خومەینی) یان ڕێک دەخست! لە پاش خۆپیشاندانە فراوانەکانی خوێندکاران و ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٦٣ لە ئێراندا لە ناو خوێندکاراندا ناسرا و سەرپەرشتی کۆمەڵەیەکی خوێندکارانی تارانی دەکرد و یەکێکش بوو لەوانەی لە بەرەی نیشتمانی (دکتۆر موصەدەق)ەوە نزیک بوو، چونکە بە باشی زمانی عەرەبی لە تەک فەرەنسیدا دەزانی لە چەپە فەلەستینییە کانیشەوە نزیک بوو! دۆستی گرووپەکەی (منیر شفیق و فازیلی مەلا مەحمود و ئەحمەد بن بیلای جەزایر و عادل عبدول مهدی)، کۆنە (قیادەی مەرکەزی حیزبی

شیوعی) و تازە ئیسلامی بوو! ئەو گرووپە لەو کەسانە بوون، کە باوەڕیان بە (مارکسیزم) لەق ببوو، روویان لە ( گەڕانەوە بۆ ریشە - العوده الی الجذور) واتە گەڕانەوە بۆ ئیسلام، کرد بوو! لە سەرەتادا کە (ئیمام خومەینی)، گوێی لێدەگرت هەوڵێکی زۆری لە گەڵدا، کە پیاوانی ئاینی خۆیان تێکەڵی کاری دەسەلات نەکەن، چونکە بەو کارە بەرە بەرە لە هەیبەت و کەسایەتییان کەم دەبێتەوە! ئەم پیاوە ئەگەرچی هەڵوێستی لە بەرانبەر کورد خراپ بوو، بەڵام لە دواییەکەیدا دەستەی ئاینی زەفەریان پێبرد و راویان نا بۆ هەندەران!

یەکەم جار بوو لە شاخ کۆبوونەوەیەکی فراوانی (یەکێتی)، بکرێت و ئێمەش ئەوانەی لە زیندان ئازاد کرا بووین بەشداری تێدا بکەین! کۆبوونەوەی سەرکردایەتی و کادر و فەرماندە پێشکەوتووەکانی (یەکێتی)  بوو، کە لە ٢ مارتی ١٩٨٠ دا کرا و هەفتەیەکی خایاند! لەو کۆبوونەوەیەدا حاڵی بووم لەوەی، کە پاش جیابوونەوەی (بزوتنەوە) ش، کەچی هێشتا لەناو باڵەکانی (یەکێتی)دا، ناتەبایی و نەگونجان هەر بەردەوامە! ئامادەبووانی ئەو کۆبوونەوەیە لە (نەوشیروان مستەفا)وە تا زۆربەی رەخنەی تایبەتی خۆیان لە ئیدارەی (مام جەلال) هەبوو، بەڵام دیار بوو کەس نەیدەویست رەوتی کۆبوونەوەکە بشێوێت، بۆیە رەخنەکانیان بە قسە خۆشەکانی (قادرخەبات) سپارد! ئەویش ئەو تێکۆشەرە گەورەیە بوو، کە (مام جەلال)، لە رەخنە و قسەکانی ناڕەحەت نە دەبوو! رەخنەکان و خۆپاریزی سەرکردەکان  لە دەربڕینی راشکاوانە، هەر زوو ئەوەیان تێگەیاندم، کە مەترسی لە تووڕە بوون و تاکڕەوی (مام جەلال)، هێشتا شوێنەواری بنبڕ نەبووە. دیار بوو زۆر بوون ئەوانەی وەک (قادر خەبات) گلەییان هەبوو، بەڵام ئەو بۆی لوا بوو بە رەوانی لەباتی هەموویان قسە بکات و ئەوانی تر بێدەنگ بن!

پاش ئەو کۆبوونەوە فراوانە، (عەلی بچکۆل) ڕەوانەی ناوچەی کەرکووک کرا و بوو بە فەرماندەی هەرێمی سێ و (ئەنوەر حەسەن) بە لێپرسراوی سیاسی هەرێم و (بێستون مەحمود)یش، کە کوڕە زەحمەتکێشێکی کەرکووکی بوو لەپاشدا شەهید بوو، کرا بە لێپرسراوی ڕێکخراوی (کۆمەڵە)! هاوکات (جەبار فرمان)یش دانرا بە لێپرسراوی ڕێکخراوی (کۆمەڵە) لە سنووری ناوچەکانی هەرێمی چوار لەگەڵ شەهید (جەمالی عەلی باپیر)، کە فەرماندەی سەربازی هەرێمی ناوچەکە بوو! منیش کە هەر لە سەرەتاوە بەڕێوەبردنی (رادیۆ) یان پێ سپارد بووم، لە شوێنی خۆم مامەوە! ئیتر لەو ماوەیەدا بۆ کردنەوەی بەشی عەرەبی وتارێکم نووسی و بە دەنگی خۆم خوێندمەوە، ئەو کاتە (ئەرسەلان بایز) یش، کە وەک یارمەتیدەر دەستنیشان کرابوو، لەو ماوە کەمەدا پێکەوە هاوکاری یەکتر بووین!

پەیوەندییەکانی (یەکێتی،) لەگەڵ (حیزبی دیموکراتی ئێران)، لە ئاستی پێویستدا نەبوو، زۆرتر پەیوەندییەکی ساکار و ڕواڵەتی بوو، نەک پەیوەندیی توند و تۆل و قوڵ! لەبەر ئەوە بڕیاردرا لە نیسانی ساڵی ١٩٨٠ دا، (نەوشیروان مستەفا)، بە یاوەری (شازاد سائیب و عومەر شێخموس و جەمال حکیم)، ڕەوانە بکرێن بۆ مهاباد تا گفتوگۆی جیدییان لەو بارەیەوە لەگەڵدا بکەن و هەوڵ بدەن ئەو پەیوەندییە بۆ ئاستی باڵا و پێویست بەرن!

لە مانگی مایسی ١٩٨٠ دا (مام جەلال)، بە نیازی سەفەری تاران، ناوزەنگی بەجێهێشت! لە تارانیش لە باتی کار ئاسانی و سەرگرتنی هەوڵەکانی بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییەکان و ڕێگە خۆش کردن بۆ هێنانی چەک لە (لیبیا و سوریا) وە، هێندەی نەمابوو لەگەڵ پاسداراندا توشی کێشە و گێچەڵ بێت و بەلایەکیشی بەسەر بێت! ئیتر لەوێوە

ڕۆیشت بۆ شام و ماوەیەکی درێژ عاسی بوو، چونکە گەڕانەوەی بۆ ئێران و لەوێشەوە بۆ کوردستان ئاسان و ئەمین نەبوو!

لە بیرەوەریی دامەزراندنی (کۆمەڵە)دا، وتارێکم نووسی و کرا بە نامیلکەیەک! لەو وتارەدا مەسەلە بنەڕەتییەکانی بیرو بۆچوونی (کۆمەڵە)م تێدا دووپات کردەوە. دوای ئەوە زۆری نەبرد لە مانگی تەموزدا سەفەرێکم کرد بۆ شام و لەوێشەوە بو نەمسا و ئیتر کاری بەڕێوەبردنی رادیۆ بە سەر (ئەرسەلان بایز)دا مایەوە، کە خوا هەڵناگرێت تا سەر (ئەرسەلان) ئەو کارەی بە باشی و بە سەرکەوتویی ئەنجام دا، ئەگەرچی بەختی نە لەگەڵ (مامۆستا جەعفەر- فازیل کەریم)، کە ئەو رۆژگارە لێپرسراوی دەزگای راگەیاندن بوو، نە لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا)دا، سوار نەبوو! هەرچی کۆششی کرد لە دڵی هیچیاندا جێی نەبووەوە، بۆیە بەو هۆیەوە هەمیشە گیروگرفتی لە گەڵیاندا هەبوو!

## حیزبی شیوعی و شاخ!

لە راستیدا (حیزبی شیوعی)، لە مێژووی عێراقدا، بە حیزبێکی تێکۆشەر و کۆڵنەدەر ناسرا بوو! لە خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی دژی رژێمی عێراق و ئیستیعمار و پەیمانە ناڕەواکانی سەردەمی پاشایەتی، هەمیشە رۆڵی دیاری خۆی هەبووە! تێکۆشەری ناسراوی وەک (یوسف سلمان - فەهد) ی سەرکردەی کردە قۆچی قوربانی بۆ ئامانجەکانی! لە سالآنی سەرەتای فەرمانڕەوایی (عبدالکریم قاسم)دا، گەشە کردنێکی فراوانی بە خۆوە بینی، ئەگەر چی مێژووی تێکۆشانی ئەو حیزبە پڕ بوو لە ململانێ و کەرت بوون و یەکگرتنەوە، بەلام گەر سیاسەتێکی دروستی هەبوایە، دەیتوانی زۆر لەوە کاریگەرتر رۆڵی هەبێت و لەسەر رەوتی رووداوەکان نەخشی خۆی هەبێت! کەچی دواتر بینیمان، کە حیزبی بچکۆلە تری وەک (بەعس) و ناسیۆنالیستەکان توانییان دەسەلاتی حوکم لە عێراقدا بگرنە دەست، بەلام شیوعییەکان نەیانتوانی لە گرتنە دەستی دەسەلاتدا هێندەی ئەوانیان پێبکرێت! مەگەر بەشدارییان پێکرابێ و بە

بارێکی گران و قورس بار کرابن بۆ حیزبێکی تر، دەنا وەک خۆیان لە مێژووی خۆیاندا نەیانتوانیوە حیزبی یەکەمی فەرمانڕەوا بن!
حیزبی (شیوعی)، سەرەڕای ئەوەی، کە لە یەکەمین کودەتای بەعسییەکاندا لە ساڵی ١٩٦٣ زەبری کوشندەیان بەرکەوت، کەچی ڕۆژگارەکانی دواتر، ماوەیەکی باش هاوکاریی ڕژێمی بەعسی قبوڵ کرد! ئاخر کاتێک پەیمانی هاوکاریی و بەرەی سیاسییان لەگەڵ حیزبی (بەعس)ی فەرمانڕەوا مۆر کرد، کە (بەعس)، قەڵاچۆی حیزبە ناسیۆنالیست و نیشتمانییەکانی تری دەکرد! لەو ماوەیەدا لەژێر چەتری (بەعس)دا و لە بەرەیەکدا بوون، کە (بەعس) نوزەی بە دیاردە دیموکراتییەکانی وڵات نەهێشتبوو، هەرچی کاری بەد و خراپیشە لە تیرۆر کردن و سەرنگونکردنی سەرکردە و تێکۆشەرەکانی حیزبەکەیان، گرتبوویە بەر! ئەو ڕەخنانەی، کە ئەو کاتە ئێمە و (قیادە مەرکەزی) لەو حیزبەمان هەبوو، ئەوە بوو کە ئەو حیزبە لە ڕێبازی کۆمۆنیستی و تێکۆشانی دروست لایداوە و دوور لە گرتنە بەری هەڵوێستی ڕاست و دروستی نیشتمانی، خەریکی کلکایەتی کردنە بۆ یەکێتی سۆڤیەت و تەنانەت پاکانە بۆ سیاسەتە خراپەکانی ڕژێمێکی فاشستی وەک (بەعس) یش دەکات و پروپاگاندەی نیشتمانپەروەری و پێشکەوتنخوازییان بۆ دەکات و بگرە بەوانەشەوە نەوەستا و ساڵی ١٩٧٥ پاش هەرەسی شۆڕش، بەیانێکی بە دڵی بەعسییەکان دژی هەرەسهێنانی جووڵانەوەی کورد دەرکرد!
لە ساڵی ١٩٧٨ بە دواوە، حیزبی (بەعس) و ڕژێمەکەی کاریان بە (حیزبی شیوعی عێراق)، نەما بوو، بۆیە بەرەبەرە و زیاتر لە جاران تەنگیان پێ هەڵچنین و لە ڕۆژنامەکاندا کەوتنە لێ خوێندنیان و بە خراپ لە سەریان دەدوان! تا وای لێهات کەوتنە سووکایەتی کردن

بە ئەندامان و کادیرەکانیان و بە یەک بڕیار زیاتر لە ٣٠ ئەندامی ڕێکخراوەکانی حیزبی (شیوعی)، کە لەناو سوپادا کاریان دەکرد، لە سێدارە دران! .ئیتر ئەوانیش بە خۆکەوتن و وردە وردە سەرکردەکانیان خۆیان پەرێز گرت، تا هەرچۆنێک بوو هەندێکیان توانییان خۆیان لە وڵات دەرباز بکەن و بڕۆن بۆ هەندەران و هەندێکیشیان ڕوویان کردە شاخ بۆ لای هێزی پێشمەرگەی کوردستان!

لە شوباتی ساڵی ١٩٧٩ دا، (مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی) بە ناو هێزی پێشمەرگەدا خۆی گەیاندە لای (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، تا بەختی خۆی تاقی بکاتەوە و لای ئەوان شوێن و پەناگایەک بۆ هاوڕێ هەڵهاتوەکانی حیزبەکەی پەیدا بکات! کە لەو هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئیتر چوو لە خڕی نێو زەنگ بارەگایەکی کردەوە و دواتریش (کەریم ئەحمەد و بەهادین نوری) شوێن پێی ئەویان هەڵگرت و ڕوویان کردە شاخ و (فاتیح ڕەسوڵ)یش، کە پێشتر گەیشتبووە ئەوێ جێی بۆ ئەوانی تر خۆش کردا!

پاش کودەتای دووەمی بەعسیەکان و پاوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی، ئەوا حیزبی (شیوعی)، هەر زوو تاوانەکانی ساڵی ١٩٦٣ ی بەعسییان فەرامۆش کرد! بەعسییەکانیش بۆ تاکتیک و تەنها لەبەر خاتری ئەوەی خۆیان بە هێز بکەن، خۆیان لە سۆڤیەت نزیک کردەوە و پەیمانی دۆستایەتی و هاوکارییان لەگەڵ سۆڤیەت ئیمزا کرد، بەمەش حیزبی (شیوعی)، لەگەڵ بەعسییەکاندا چوونە ئەو بەرەیەوە کە حیزبی (بەعس) سەرکردە و ئەوانیش تیایدا بوونە حیزبی پاشکۆ! ئیتر بە خواستی خۆیان بوونە شاهیدی درۆ بۆ سەرانی (بەعس) و کەوتنە وتار نووسین و پیاهەڵدانی (بەعس) و کارەکانی ڕژێمەکەی، تا کار گەیشتە ئەوەی چاو و دڵی بەعسییان بە شکستی شۆڕشی کورد خۆش بکەن و ڕاپۆرتی

سکرتێر و مەکتەبی سیاسییان بۆ کۆنگرە و کوبونەوە فراوانەکانیان لە یاد و بۆنەکاندا ببێتە زورنا بۆ جوانکردنی تاوانەکانی رژێمی (بەعس)! لەوانە تاوانی قەلاچۆکردن و لە رەگ و ریشە هەڵکێشانی حیزبەکانی ئۆپۆزیسیۆن و نارازی لە عێراقدا و شالاوی پەلاماردان و کوشت و بڕی خەڵکی ئازادیخواز و راگوێزان و بە عەرەبکردنی کوردستان و رێککەوتن لەگەڵ (شا)ی ئێران و بە دەستەوەدانی بەرژەوەندییەکانی عێراق و فرۆشتنیان، تەنها بۆ لە ناوبردنی جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان! هەموو ئەوانە و کوشتنی تێکوشەرەکانی حیزبەکەی خۆشی بە ستایشی (مسیره العراق التقدمیه)، لە قەڵەم بدات و هاوکات هاواری ئەندامە تێکوشەرەکانی خۆی و دەنگی بێزاری گەلانی عێراق و ناڵەی جەماوەری چەوساوەی کوردستان بە ( اتساع الحمله الفکریه و الاعلامیه الامبریالیه الرجعیه ضد العراق لشق الصف الوطنی و التحالف بین حزب البعث العربی و الحزب الشیوعی العراقی) وەڵام بداتەوە، وەک لە راپۆرتی خۆیاندا و لە کۆبونەوەی سەرکردایەتییەکەیاندا رەنگی دابووەوە!

ئیتر دوای ئەو هەڵمەتە شۆفێنییانەی رژێم بۆ سەر سەرکردە و ئەندامانی حیزبی (شیوعی)، شیوعییەکان بە تاک و بە کۆمەڵ، سەرکردە و کادر و ئەندامانیان، روویان کردە ناوچە ئازادەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بە تایبەتی بۆ نزیک بارەگاکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)! بە بیرم دێت، کە تازە چووبوومە دەرەوە لەگەڵ هاورێکانماندا باسمان لەوە دەکرد، کە جیابوونەوەی حیزبی (شیوعی) لە حیزبی (بەعس) و لە هاوپەیمانی بەعسییان لەبەر ئەوە نییە، کە بڕوایان بەوە بێت جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی و خەباتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، جووڵانەوە و خەباتێکی رەوا و عادیلانەی

خەڵكی كوردستانە، نەخێر! بەڵكو لەبەر ئەوەیە كە چیتر حیزبی (بەعس)، ڕێگە نادات حیزبی (شیوعی)، بە سەربەرزی و سەلامەتی لە شارەكانی عێراق و لە سایەی بەعسدا بژی!
(فاتیح رەسول)، كە یەكێك بوو لە سەركردەكانی حیزبی (شیوعی) و خەڵكی كۆیە بوو، هەم دوورە خزمایەتییەكم لەگەڵی هەبوو، هەم برایەتیشمان خۆش بوو. بۆیە جارو بار سەردانم دەكرد و دەكەوتینە قسە و باس و دەردە دڵ. لە ناخیدا پیاوێكی كوردپەروەر بوو، هەستی بە هەڵەكانی حیزبەكەی دەكرد و دەیزانی هەڵەكانیان لە كوێوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام تازە مێژوو كە ڕۆشت ناگەڕێتەوە! ئەو ساڵە زستانەكەی سەخت بوو لافاوێكی باراناوی هات و بەداخەوە ژنەكەی (مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی)، برد و خنكاندی، زۆرمان پێناخۆش بوو، بۆیە هەموو بەشداری ناشتنی و خەمەكانیمان كرد!
لە سەروبەندی شەڕی ناوخۆدا، (حیزبی شیوعی عێراق)، خۆی بە ناوبژیكەری لایەنە كوردییە ناكۆكەكان دەزانی، هەرچەندە بارەگاكانی لە (یەكێتی)ەوە نزیک بوون، بەڵام دڵی لای (پارتی) بوو! لەگەڵ (یەكێتی) لە بەرەیەكدا بوو بە ناوی (الجبهة الوطنية القومية الديمقراطية - جوقد)، كە لە ١٩٨٠/١١/١٢ دا پێكهات! لە پاش دوو هەفتە لەگەڵ (پارتی) ش چووە بەرەیەكەوە بە ناوی (الجبهة الوطنية الديمقراطية - جود) ! لە زنجیرە ناوبژیوانییەكەی حیزبی (شیوعی) دا، منیش جارێكیان لە بارەگاكەیان لەگەڵ (دكتور خدر مەعسوم هەورامی)، لە ناوچەی پشت ئاشان كۆبوونەوەیەكی ئاشتیم لەگەڵ نوێنەرانی (پارتی) كرد، كە (محەمەدی مەلا قادر و مەغدید) ناوێک، ئامادەبوون!
ناكۆكیی و ململانێی خوێناویی هێزە كوردییەكان و هێزەكانی سەر گۆڕەپانی كوردستان، بەلامەوە كارێكی هەڵە و نادروست و نابەجێ و تاڵ بوو! هەر

لە رۆژگارەکانی زیندانەوە ئەم نا تەبایی و ململانێ خراپە، ئازارێکی پڕ لە سوێیان کردبووە دڵمەوە! بۆیە لەسەر ئەو حاڵە ناشیرینەی هێزەکانی کوردستان، زۆرجار بەر توانج و پلاری برا عەرەبەکانی ناو زیندان دەکەوتین و منیش پێی تەریق دەبوومەوە! کە لە زیندان ئازاد بووم، بەرە بەرە بوونم لەگەڵ برایانی (کۆمەڵە)دا، ئاسایی گەشەی کرد و دردۆنگی و دڵ رەنجانیش لە بیر چوونەوە و وەک ئەندامی سەرکردایەتی تەماشایان دەکردم! ئیتر ئەوسا توانیم لە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیدا بەشداری پەیدا بکەم و قسەی خۆم بکەم. ئەوسا کەوتمە وێزەی ئەو تێگەیشتنە چەوتە، کە ئەو کاتە لە ریزەکانی (کۆمەڵە)و یەکێتیدا، وا باوبوو، کە گوایا ناکۆکیی لەگەڵ (پارتی - قیادە موەقەتە)دا، ناکۆکیی سەرەکییە! منیش ئەوەم بە هەڵەیەکی گەورە دەزانی و پێم وابوو ئەو جۆرە تێڕوانینە هەڵەیەکی تیۆری و سیاسی زۆر زەقە و دەبێت ئەو ناکۆکییە سەرەکییە لەگەڵ داگیر کەرانی کوردستان و زەوتکەرانی مافی نەتەوەکەماندا بێت! لەو سۆنگەیەوە وتارێکم لە ژمارە حەوتی (کۆمەڵە)دا نووسی! ئیتر کاک ( نەوشیروان) لە کۆبوونەوەدا پێشنیاری کرد، کە من یەکێک بم لەوانەی گفتوگۆ لەگەڵ (پارتی)دا بکەین. بۆ ئەو مەبەستە و پاش هاوئاهەنگی لە رێگەی حیزبی (شیوعی)یەوە چووینە بارەگاکانی حیزبی (شیوعی)، لە پشت ئاشان و لەوێ لەگەڵ (پارتی)، رێککەوتنێکمان ئیمزا کرد، تا ببێتە دەروازەیەک بۆ رێککەوتنێکی قووڵتر و فراوانتر! ناوەرۆکەکەی بریتیبوو لەم سێ خاڵە سەرەکییە..

* دەبێت هەموو کێشە و گیرو گرفتەکان بە رێگەی سیاسی و بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێن!
* بە زووترین کات زمانی زبر و شەڕ بەلاوە بنرێت!
* هەمووومان پێکەوە و بە ئاشتی لە هەموو کوردستاندا، چالاکی سیاسی

و پێشمەرگانە ئەنجام بدەین و لە پەیوەندیماندا هاوئاهەنگی یەکتری بکەین!

جوولانەوەی کورد، کە جارێکی تر لە سالی ١٩٧٦ وە سەری هەلدایەوە، سەرەتا دەنگدانەوە و پشتیوانیی ناوچەیی و عەرەبی و جیهانی کز و لاواز بوو! تا جەنگی (عێراق - ئێران)، هەلنەگیرسا لە سوریا و لیبیا بەو لاوە، هیچ پشتیوانێکی تری نەبوو! ئێرانیش لە تەنگ هەلچنین بەولاوە، بە هیچ جۆرێک بواری راگەیاندن و دەنگدانەوەی شۆرشی کوردی نەئەدا! سوریاش هەلوێستە نەرێیەکانی (صدام حسین) و سەرانی رژێمەکەی نەبوایە بەرامبەری و لەبەر خاتری ئەو بالە (بەعس)یە نەبووایە، کە سەر بە سوریا بوو، ئەوا حەتمەن ئەویش هەلوێستێکی تری دەبوو! لە سەرەتاشدا لیبیا بەو ئەندازەیە پشتیوانیی لێنەکردین، لە لێدوانێکی ناوخۆیی خۆماندا جارێکیان باسمان لەوە کرد چۆن کارێ بکەین پردێک لەگەل سۆڤیەتیەکاندا دروست بکەین! بۆ ئەو مەبەستە لە سەردانێکی (عومەری سەید عەلی) و مندا، بۆ لای (فاتیح رەسول) و بارەگا خنجیلانەکەی حیزبی ( شیوعی)، ئەو مەسەلەیەمان وروژاند! ئەوانیش گەلێک بەو ئاقارەدا هانیان داین و وتیان رەنگە گەر وەک (کۆمەلە) هەولێکی لەو جۆرە بدەن و ئەو مەسەلەیە بجوولێنن، ئەنجامێکی باشتری هەبێت! ئێمەش ماوەی زیاتر لە چوارسال بوو لە ئێران و لە عێراق بووین و دوور بوین لە رووداوە زیندوەکان، بۆیە لە بێخەبەریی خۆماندا واماندەزانی کلیلی مۆسکۆ لای ئەمانە! ئیتر کە گەراینەوە، چووم بە عەرەبییەکی باش نامەیەکم نووسی بۆ (حیزبی شیوعی مەزنی سۆڤێت) و نامەکەم بۆ کاک (نەوشیروان) خوێندەوە، وتی : مادام واجوانت نووسیوە با بەخەسار نەچێت، بیدە بە شیوعییەکان با ئەوان بینێرن و لای کەسیش باسی نەکەن، لام وابوو لە دلی خۆشیدا گالتەی بە عەقلم دەهات! ئیتر ئێمەش بە عەقلی

ئـەو سـەردەمە نامەکەمـان دا بـە کلیل بـە دەستەکانی دەرگای مۆسـکۆ، بـێ ئـەوەی تـا ئێستاش وەرامێکی وەربگرینـەوە !

ڕووداوەکانـی ئێران و کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات تـا دەهـات خوێناویتـر دەبوو، سنە و سـەقز لـە لایـەن ئێرانـەوە بۆردومـان کران! بۆیـە بۆ تاووتوێکردنـی دۆخەکـە و هەڵسـەنگاندنی هەلومەرجەکـە، (حیزبـی دیموکـرات و چریکـی فیدایـی) لـە مهابـاد، کـۆڕی گەورەیـان بەسـت و خەڵکێکـی زۆریـش ئامـادە بـوون و گوێگریـان بـوون!

هاوینـی سـاڵی ١٩٨٠ بـوو، زۆربـەی بارەگاکانمـان لـە توژەڵـە بـوون، کـە لەنـاکاو بارەگاکانـی ڕاگەیانـدن و سـکرتاریەت بـەر بۆردومانێکـی خەسـتی فڕۆکـە جەنگییەکانـی عێـراق کەوتـن. بۆردومانەکـە شـپرزەییەکی زۆری خسـتەوە و چەنـد شـەهیدێکمان لـە بـارەگای ڕاگەیانـدن و لـە سـکرتاریەتی (مـام جەلال)دا و بریندارێکـی زۆریشـمان هەبـوو، کـە ٩ کەسـیان لـە هاوڕێیانی ڕاگەیاندن بـوون! شـوێنی ئێمـە ئـەو کاتـە لەگـەڵ (عومـەری سـەید عەلـی) لـە کەپرێکـی پەنـا و لاتەریکدا بـوو، کـە فڕۆکـە جەنگییەکانـی عێراق هاتنـە سـەر ناوچەکەمـان و بـە خەسـتی لـە بـارەگای ڕاگەیانـدن و لـە هەنـدێ بارەگایـان دا، ڕاگەیانـدن شـەهید و برینـداری هەبـوو، لای کاک (نەوشـیروان)یش، بریندار هەبـوو! ئیتـر لـەو ڕۆژەوە وریـای بۆردومانـی فڕۆکەکانـی عێراق بووین، بۆیـە لـە بارەگاکـەی ئێمـەدا ڕۆژانـە هـەر لـە تاریـک و ڕوونیـەوە پێشـمەرگە ئامـادە دەبـوون و کونـە تەیـارە و پەناگایـان دروسـت دەکـرد! چەنـد جارێکـی تریـش فڕۆکـە کارەسـاتی تـری لـەو شـێوەیەی دووبـارە کـردەوە، بـەڵام ئەوانـەی پەناگایـان دروسـت کـرد بـوو، دوور بـوون لـە زیانـی شـەهید و برینـدار بـوون!

## سەفەری هەندەران!

لەو ساڵانەی کە هێشتا لە زینـــداندا بووم بە ماوەیەکی کەم بەر لە ئازاد بوونم، جارێکیان (پاکــیزە)ی خێزانم، هـــەردوو کوڕەکەم ( بێستون و شـوان )ی بـە مەبەسـتی چاوپێکەوتـن لەگـەڵ خـۆی هێنابـوون بـۆ زینـدان، کـە ئەوکاتـە هـەر دووکیـان تەمەنیـان ٧ سـاڵان و ٨ سـاڵان بـوو! کە گەڕابوونـەوە بۆ سلێمانی، ڕۆژێک مامۆستایەکی لـە مەکتـەب لەسـەر ئـەوەی ڕۆژێ لـە دەوام دواکەوتـووە، خـراپ ڕەفتـار لەگـەڵ (شـوان )دا دەکات و بەشـێوەیەکی وا قایـم سـەری کێشـا بـوو بـە دیـواری پۆلـدا، ئیتر (شوان)، لەو کاتەوە زیانێکی زۆر بەر (شـەبەکیە)ی چاوی دەکەوێ! (پاکیـزە) ی خێزانیشـم دەرفـەت و توانـای چارەسـەری تـەواوی نابێـت، بۆیـە کـە ئـازاد بـووم و بـەو ڕووداوەم زانـی سـەرباری ئـەوەی کـە زۆر کاری تێکردم، ئـەوا لـە یەکەمیـن ڕۆژی ئازاد بوونیشـمەوە هـەر بیـرم لـە چارەسـەری دەکردەوە! لە نـاو خزم و هاوڕێکانمدا، کە چەندین پزیشـک و شـارەزا هەبـوون، لـەوە حاڵییـان کـردم کـە بـەو توانـا پزیشـکییەی کـە

ئەوسا لە ولاتدا هەبوو، چارەسەر ناکرێت! لە شاخ ڕێگەی تاران - سوریا ئاسان بووبوو. (ملازم عومەر)، بەو گرفتەی دەزانیم بۆیە لە کۆبوونەوەیکدا پێشنیاری ئەوەی کرد، کار ئاسانیم بۆ سەفەر و بۆ عیلاجی کوڕەکەم بۆ بکرێت! نزیکەی ٥٠٠ دۆلاریشیان بۆ پەیدا کردم، گوایا هەر ئەوەندەم زەحمەتە تا دەگەمە شام، ئیتر (مام جەلال) لە شامە و لەسەر پارە پەکم ناکەوێت.

چەند رۆژێ بەر لەوەی سەفەر بکەم، کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیمان هەبوو لە ( توژەڵە ). لەو کۆبوونەوەیەدا لەسەر هەندێ لە یەکتر نەگەیشتن کاک (نەوشیروان)، هەڵپژا بە رووی مامۆستا (جەعفەر) و (عومەر عەزیز)ی بزووتنەوە دا. منیش هەوڵم دا ئارامی کۆبوونەوەکە بپارێزم و دڵی شکاوی ئەو دوو زاتە چاک بکەمەوە، بەلام ئەوان دەستیان کرد بە زووخاو هەڵڕشتن لە دەست تووڕە بوون و قسەی رەقی (نەوشیروان)! تەنها بە زمانێکی نەرم هەندێ هەوڵی ناوبژییەکی دۆستانەم دا، بەلام دواجار کۆبوونەوەکە بە زویر بوونی هەردوولا لە یەکتر کۆتاییهات!

لە ئێرانەوە بە یارمەتی مامۆستا (موحسین علی اکبر)، کە یەکێکە لە هاوڕێ خۆشەویست و هوشیارەکانم و ئەوکاتە لە پەیوەندییەکانی خۆمان بوو لە تاران و پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەڵ زۆر لایەنی سیاسیدا و خۆیشی پیاوێکی بیر رووناک و رووخۆش و ئەدەب دۆست و قسە زان و دەنگ خۆش بوو، ئەوا هەموو ئەو سیفەتە جوانانەی مامۆستا (موحسین)، بووبوونە هۆی دروست بوونی پەیوەندییەکی فراوان لەگەڵ (جمعیت کوردی تاران) و هەموو رێکخراوە چەپەکانی ئێران و هاوکات لەگەڵ (داریوشی فروهەر) و چەند لایەنێکی گرنگی وەک (چریک)دا، نێوانێکی باش و خۆشی هەبوو! (عەبدول رەزاق فەیلی)

ش، کە هاوڕێی نزیک و خۆشەویستی ڕۆژانی خوێندن و بەغدام بوو، لەگەڵ (فازیلی مەلا مەحمود، دارۆی شێخ نوری، شاسوار جەلال، فازیل تەیب)دا، لە سەفارەتی سوریا و لای لایەنە رەسمییەکانی ئێران مانەوەیەکی چەند ڕۆژەی بە سوودیان لە تاران بۆ ڕێکخستم و سەفەرەکەشیان لەگەڵ (شوانە )ی کوڕمدا بۆ ئاسان کردم.

کە گەیشتمە سوریا، لە شام لە شوقەکەی (شازاد سائیب)، جێگیر بووین! کاک (شازاد) کە بەهۆی ماڵی (عادل عیرفان)ەوە، ناسیم، لە ڕۆژگاری خوێندنی ناوەندییەوە کە من خولیای نیگار کێشان و شێوەکاری و ئەویش خولیای مۆسیقا و ئۆکردیۆنی هەبوو، بووبوو بە هاوڕێم !ئەو شوقەیە بۆ ئێمە وەک ماڵەکەی لانەوازان وابوو، ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەرانی کوردی تورکیا و سوریا ڕوویان تێدەکرد! لە (عەبدوڵا ئوجەلان)ەوە تا میانڕەوەکان لەوێ و لە دەوری (یەکێتی) دەبینران و هاتوچۆی ئەو شوقەیان دەکرد! منیش خۆشی خۆشیمە، کە (مام جەلال) لەوێیەو فرسەتە هەم هەندێ لە ڕێکخراوە عەرەبییەکان دەبینم و هەم کوردە تیکۆشەرەکانی تورکیا بناسم و تێکەڵیان بم و وەک (کۆمەڵە)، پردی پەیوەندی لەگەڵ چەپەکانیان دروست بکەم، کەچی بەهۆی شەڕێکی نەخوازراوەوە کە (مام جەلال) پێی فرۆشتم بێ هیوا بووم!

ئاخر من بۆ خۆم دوای ئەو هەموو نەهامەتییەی ساڵانی پێشوو، دوای چوار ساڵ ئەشکەنجە و زیندان هاتوومەتە سوریا، کە بتوانم لەوێوە بە مەبەستی چارەسەرێکی پزیشکی بۆ (شوانە) ی کوڕم سەفەر بەرەو هەندەران بکەم، نەمزانی سەفەرەکەم لێ تاڵ دەبێت! ئەو کاتە سوریا بووبوو بە مەڵبەندی کۆبوونەوەی زۆربەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی! (مام جەلال)، خانوویەکی لە شام هەبوو پاسەوانیشیان لێدەکرد و نێوانی

لەگەڵ هەموو کاربەدەستانی حیزب و حکومەتی سوریا خۆش بوو! رۆژێکیان بانگی کردم بۆ خوانی نیوەڕۆ و لەوێش هەندێ قسە بکەین، کە چوومە ئەوێ خوالێخۆش بوو (عومەر مستەفا - عومەر دەبابە -) لەوێ بوو، کاک (عومەر) منی خۆش دەویست و منیش زور رێزم لێدەگرت، دوای ئەوەی چاک و چۆنیمان کرد، قسە و باس هاتە پێشەوە و (مام جەلال)، هەواڵی برادەران و پەیوندییەکانی نێوانمانی پرسی! من بەمەبەست خۆمم لێپاراست و بە گشتی ووتم باشە و خراپ نییە! باسی کۆبوونەوەکەی توژەڵە و ساردیی ئەو برایانە و (نەوشیروان)ی لێ پرسیم، منیش نەمزانی لەبەر هەر هۆیەکی شاردراوە، کە نەمدەزانی چییە خۆی بۆ نابوومەوە شەڕێکم لەگەڵ ساز بکات، بە سادەیی و راستگۆیی خۆم چۆن لە مەسەلەکە گەیشتبووم دەستم کرد بە باسکردنی رووداوەکە و وتم: لەوە دەچێت کاک (نەوشیروان)، لە رووی دەروونییەوە تاڕادەیەک ماندوو بێت، بۆیە نەختێ توورە دیارە و زوو زووش هەڵدەچێ، شتێکی وا نەوتراوە خوانەخواستە مەبەستێکی تێدا بێت یاخود بێڕێزی نیشان درابێت، تەنها هەندێ هەڵچون و توورە بوون بووە و هیچی دی، ئێمەش برایانە رەخنەمان لە هەردولا گرتووە و هیچ نییە و بە ئاسانی تێپەڕ بووە! قسەکانم تەواو نەکرد لێم راپەری و کەوتە خۆ توورە کردن و سەرزەنشت، بە جۆریک خۆی نارەحەت کرد، کە گوایا من خەتایەکی گەورەم کردبێت و وتی:

ئێوە هاتوون شۆڕش تێک بدەن و گەلەکۆمەکێ لە کاک (نەوشیروان) دەکەن. ئەو توورە بووە دەڵێت شۆڕش بەجێ دەهێڵم و دەڕۆم، تۆ راستییەکان چەواشە دەکەیت، ئەوانە بێ ئەدەبی دەکەن بەرامبەر کاک (نەوشیروان)، تۆش پشتگیرییان لێ دەکەیت!

لە راستیدا ئەو هەڵوێست و بەگژاچونەی (مام جەلال)، هەم شتێکی

چاوەڕوانکراو نەبوو، هەم شتێکی ناڕاست بوو! چونکە (مام جەلال)، لە هەموو کەس باشتر لە پەیوەندییەکانی ناوخۆی ئێمەی دەزانی! مامۆستا (جەعفەر)، خۆی ڕەخنە و گلەیی لە من و لە هاوڕێکانی زیندانم هەبوو، ئێمە هێشتا هەڵوێستی بە ساردی پێشوازی کردنمان لە لایەن ئەو هاوڕێیانەوە لەبیر نەچووبووەوە و (بزوتنەوە) و (خەتی گشتی)ش، کە هەڤاڵ (عومەر عەزیز)، نمایندەی دەکرد، لە ئێمەی (کۆمەڵە) زۆر ڕازی نەبوون و ڕەخنەیان لە ئێمە و بە حساب لە باڵا دەستیی (کۆمەڵە)، هەبوو! لەناو (یەکێتی)دا و من بۆخۆیشم لەگەڵ کاک (نەوشیروان)، شەو ڕۆژ پێکەوە بووین و هاوڕێ بووین، ئیتر ئەو داستانە ناکرێت ڕاست بیت و ئاخۆ دەبێت بۆچی و لەسەر چی من لەگەڵ ئەو برادەرانە بەرامبەر (نەوشیروان) سەنگەر بگرم! بە ڕاستی زۆر ناڕەحەت بووم و بە ناهەقییەکی گەورەشم دەزانی! چونکە ئەگەر ئەو ڕۆژگارە لە کێشەیەکی وەهادا ڕەخنەم لێ بگیرێت، دەبوو ڕێک پێچەوانەکەی ڕاست بێت!خۆ ئەگەر لە چوارچێوەی نەریت و بەهاکانی حیزبایەتیشدا بە هەر هاوڕێیەکم وتبێ : تۆ کارێکی باش ناکەیت لەو برایانە تووڕە دەبیت، ئەوە نە تێکدان بووە لەگەڵ کەس و نە تێکدانی شۆڕشەکەش بووە! بۆیە منیش ئەو کاتە بە گەنجێتی خۆم و بەپێی تیگەیشتنی خۆم وەرامی گونجاوم دایەوە، کە تا کۆتایی سەفەرەکەم ساردییەکی لەگەڵ (مام جەلال)دا، بۆ دروست کردم!

لە هاتنە دەرەوەدا لەگەڵ کاک (عومەر مستەفا)، ئەو بە سەر سوڕمانەوە وتی.. خۆ (عومەر عەزیز)، برادەری ئێمەیە و لەسەر من حسابە، دەبوو من لەکەڵ تۆ وەک نوێنەری (کۆمەڵە)، لە سەر ئەوە قرەت لەگەڵ بکەم، کە تۆ بۆچی بە هەموو جۆر پشتی (نەوشیروان) دەگریت، نەک پێچەوانەکەی! بەڵام لەسەر ئەوەی کە وەڵامی (مام جەلال)م دایەوە،

هەندێ سەرزەنشتیی کردم! ئیتر سەفەرەکەم لێ ناخۆش بوو، پارەشم نەبوو ناچار لە (ئەبو شەوقی)م قەرز کرد، دوایی (دارۆ)ی رەحمەتی قەرزەکەی بۆ دابوومەوە!

لەوە سەیرتر ئەوە بوو جارێکیان (مام جەلال) بە (سالار عەزیز)دا، نامەیەکی رەخنە ئامیزی لە داکۆکی نەکردنم لە (نەوشیروان مستەفا) نووسیبوو، رەخنەی لە رەفتاری من بۆ هاورێیانی سەرکردایەتی (کۆمەڵە) گرتبوو! بە مەرجێ خۆی هەمیشە لە ناتەبایی (سالار عەزیز و نەوشیروان) دا، لایەنگر و پشتیوانی (نەوشیروان)ی دەکرد دژی کاک (سالار)! کەچی دوای سەفەرەکەم بۆ نەمسا لە لای (سالار عەزیز)، رەخنەی لە من گرتبوو، کە گوایا من بە خراپە باسی (نەوشیروان)م کردووە و وتومە.. پیاوێکی توورە و قسە رەق و روو شکێنە و لەو نامەیەدا بێزاریی خۆی لە قسە و هەڵوێستی من نیشاندابوو، بۆیە (مەلا بەختیار)، کاتی خوێندنەوەی ئەو نامەیە وتبوی.. ئەو ماستە بێ موو نییە و ئەوە هۆی کێشەکە نیە، بزانە لەسەر چیتر لێی نارازییە! پاش تێپەڕبوونی زەمانە زانیم، کە من کاتی خۆی وتارێکم نووسیبوو لەسەر بیر و بۆچونە بنەڕەتییەکانی (کۆمەڵە) و لەو نووسینەدا هەڵسەنگاندنێکم بۆ حیزبەکانی پیشوو کرد بوو لە کوردستان، کە باڵی (جەلالی)ش لەو هەڵسەنگاندنە بەدەر نەبوو! ئیتر تێگەیشتم ئەو باس و بۆچوونە دوور نەبوو لە زیز بوونی (مام جەلال) و کەتنەکەی شام!

لە نەمسا (سەعدی پیرە و هەنریتا)ی هاوسەری و (فوئادی مەلا مەحمود و خەبات عەبدول کەریم و حسێن شەنگاری) هەموو پێویستییەکیان بۆ جێبەجێکردم و نەیانهێشت هیچ کەم و کووڕیمان هەبێت! خوا هەڵناگرێت هەموو دەرگای دڵ و ماڵی خۆیان بۆ کردینەوە و زۆریش کار ئاسانییان بۆ کردین و توانییان لای باشترین پزیشکی

چاو، کە ناوی (پرۆفیسۆر روبی) بوو، ڕێگەی چارەسەری پزیشکی بۆ (شوان) بکەنەوە و هێندەشی لە توانادا مابوو چارەسەری بۆ کرا و زیاتر لە یەک مانگ لەوێ مایەوە! لەو ماوەیەدا (ڕێکخکراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی - منظمە العفو الدولیە)، چەندین چاو پێکەوتنیان لەگەڵ کردم و منیش وەک شاهیدێکی ناو زیندانەکانی رژێم و رەفتارە خراپ و قێزەونەکانیان دەرهەق بە هەموو ژنان و گیراوەکان، بۆ باس کردن! (فوئادی مەلا مەحمود)، کە برای (فازیلی مەلا مەحمود)ە، تێکۆشەرێکی دێرین و لەناو خوێندکاراندا کەسێکی خۆشەویست بوو، کاتی خۆی سەرۆکی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) بوو، پیاوێکی زیرەک و خوێندەوار بوو! چەند ساڵێک بوو لە ڤێننا بوو، حەیف دوچاری نەخۆشی شێرپەنجە بووبوو، بەلام ئازا و خۆراگر شەڕی لەگەڵ نەخۆشییەکەیدا دەکرد و لە دوای شۆڕشی نوێشەوە بووبوو بە کادرێکی چالاکی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)!
لە ڤێنای پایتەختی نەمسا بووم، رۆژێک سەردانی (خەبات)م کرد، لەوێ هەواڵی کودەتا سەربازییەکەی تورکیام بەرگوێ کەوت، کە لە ١٢- ئەیلولی ١٩٨٠ دا (کەنعان ئەڤرین)، بە کودەتایەکی سەربازی خۆی کردە سەرکۆماری تورکیا و هەر لەو مانگەشدا بوو، کە جەنگی ٨ ساڵەی نێوان (عێراق - ئێران) بەرپا بوو!
لە مانگی ئەیلولدا کۆتاییم بە سەفەرەکەم هێنا و گەڕاینەوە بۆ شام، تا لەوێ (مام جەلال) و برایانی تر ببینین و بزانین بەر لە گەڕانەوە بۆ شاخ چی هەیە جێبەجێی بکەین و لەوێشەوە بگەڕێینەوە بۆ کوردستان! هێشتا بە ڕێگەوە بووین هەواڵی جەنگی (عێراق - ئێران) پەیدا بوو! لە رۆژی ١٩٨٠/٩/١٧ دا (صدام حسین)، ڕێکەوتنی جەزایری لەگەڵ ئێران هەڵوەشاندەوە و لە وتارێکدا بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق، زەنگی

جەنگێکی گەورەی لێدا!

لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی (صدام حسین) لەگەڵ ئێراندا، (صدام) دیمەنێکی وای لە توانا سەربازی و لۆجستییەکانی ئێران و تەرازووی هێزەکانی خستبووە مێشکی خۆیەوە، کە بتوانێت بە زەبری جەنگ هەم رێ لە مەرامی ناردنە دەرەوەی شۆڕشی ئیسلامی بۆ وڵاتانی عەرەبی و عێراق بگرێ، هەم ئەو رێککەوتنامەی، کە بە مەبەستی هەرەس هێنانی شۆڕشی کورد، لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ (شا)ی ئێران کردوویەتی، هەڵبوەشێنێتەوە!

کۆماری ئیسلامی ئێران لەو ساڵەدا تەنها ١٥٠٠٠٠ سەربازی پیادە و ٩٠٠٠٠ سەربازی لە هێزی ئاسمانی و دەریاییدا هەبوو. تازەش هێزی پاسدارانی دروست دەکرد کە لە ٣٠٠٠٠ تێپەڕی نەدەکرد و نزیکە لە٪٦٠ ئەفسەرە مەشق دیدەکانی سوپاکەی بە کوشتن و زیندان و راونان لە هێزەکەی دوور خستبووەوە و بەشی زۆری فڕۆکە و هێلیکۆپتەرەکانیشی لە کار کەوتبون و ئەمریکا و رۆژئاواش چی پسپۆڕ و شارەزای عەسکەرییان هەبوو، هەموویان کێشابووەوە و حاڵی تۆپ و تانکەکانیشی لەوە باشتر نەبوون! بە پێچەوانەی کۆماری ئیسلامییەوە، ئێران لە سەردەمی (شا)دا، بە یارمەتیی ئەمریکا و رۆژئاوا توانی ببێتە یەکێک لە گەورەترین هێزی سەربازی ناوچەکە! ئەو کاتە خاوەنی ١٠ فیرقە سەرباز بوو، کە ٤ فیرقەیان زرێپۆش و دوانی تریش گاردی شاهەنشایی بون و خۆیان لە ٤٥٠٠٠٠ سەرباز دەدا! جگە لە هێزی ئاسمانی و هێزی دەریایی، کە نزیکەی ١٨٥٠ فڕۆکەی جەنگی جۆری (فانتۆم) و جۆرەکانی تری هەبوو، لەگەڵ ١٩٠٠ تانکی جۆراو جۆر بە تۆپخانەیەکی زەبەلاحەوە لە تەک هێزی دەریایی و کەشتی جەنگیدا، کە بە فەرماندەیی سەدان جەنەراڵ و ئەفسەری شارەزای ئەمریکی و

بەریتانی و فەرەنسی، سوپای ئێرانیان دەبرد بەڕێوە، کەچی هەموو ئەوانە بە هاتنی کۆماری ئیسلامی نەمان و پووکانەوە!

## جەنگی عێراق – ئێران!

رۆژی ٢٢ ئەیلولی ١٩٨٠ هێزەکانی رژێمی عێراق بە دەیان فڕۆکەی جەنگی، پەلاماری چەندین شوێنی گرنگ و ستراتیجیی ولاتی ئێرانیان دا، لەوانە لە فڕۆکەخانەی (نێودەوڵەتی تاران)یان دا، زیانێکی زۆریان پێگەیاند و بووە هۆی پەکخستنی هاتوچۆی ئاسایی فڕۆکەکان! ئیتر بەهۆی ئەوەوە گەڕانەوەم کارێکی ئاسان نەبوو! (مام جەلال)یش وەک کاتی پێش سەفەرەکەم نەمابوو، لەگەڵم دۆستانە تر و میهرەبانترو روو خۆشتر بوو، ئیتر هەردوو لامان ئەو ساردییەمان تێپەڕاند و کێشە و گرفتەکەی جاری پیشوومان لەبیر خۆمان بردەوە! لەو ماوەیەدا چەند جارێک لای (مام جەلال)، (نۆجەلان) و هاوڕێکانیم دی! (مام جەلال)، تەقەلای لەگەڵ دەدان، لەگەل رێکخراوەکانی تر ململانێی نابەجێ نەکەن و بۆ خەباتی چەکدارانە و شەڕی پارتیزانی هانی دەدان! کادیرەکای (ئالای رزگاری) شم بینی، ئەوان بڕیاری خەباتی چەکدارییان دابوو! بەهۆی ئەوەوە کە هیچ فڕۆکەیەک نەبوو سەفەری پێ بکەم، لە

تەگبیری ئەوەدا بووم لە ڕێگەی (باکۆ) وە بگەڕێمەوە بۆ کوردستان! (مام جەلال)، هەوڵێکی زوری دا، کە ڕێگەیکم بو بدۆزێتەوە، سەرەتا بێ هومێد بووین! تا ڕۆژێک ئاگاداری کردم، کە (فازیلی مەلا مەحمود)، تەلەفۆنی بۆ کردووە و ڕێگەیەک پەیدا بووە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە، کە سەرکۆماری ئێران ( بەنی صەدر)، بۆ هاتنی (فازیلی مەلا مەحمود و عادل عبدول مهدی و روجیە گارودی و احمد بن بیلا) و هەندێکی تر بۆ تاران، کە بڕیارە بەشداری  کۆنگرەیەک بکەن، فڕۆکەیەکی تەرخان کردووە بۆیان و دەتوانن جێگەی منیش بکەنەوە! نایشارمەوە ئەو کار ئاسانییە لەو کاتەدا بۆ من، دڵی خۆش کردم! (مام جەلال)، لە شام مایەوە و لە هەوڵی سازدانی لایەنە عێراقییەکاندا بوو، تا لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان دەست بکەن بە پێکهینانی بەرەیەکی نیشتیمانیی فراوان! منیش لەگەڵ (فازیل) و ئەوان گەڕامەوە و لە ڕێگایش لەناو فڕۆکە و لە تاران، زۆر قسەمان لەسەر جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی ناوچەکە و شۆڕشی ئێران کرد! ئەوان خەیاڵی گەورەیان لەسەر ئەو گۆڕانکارییانەی ئەم دواییەی ئێران هەڵچنیبوو، لایان وابوو،  کە ٣ ئاراستە لەو شۆڕشەدا ململانێ دەکات.

یەکەمیان (خومەینی)یە، کە ئیسلام ئامانجەکەیەتی و دووەمیان ڕووناکبیر و چەپەکانن، کە ئیسلام  لای ئەوان  هۆ و ئامرازە نەک ئامانج و خوازیاری عەدالەتی کۆمەڵایەتین و سێهەمیشیان تەنها ئامانجیان گەشەپێدانی ئابوورییە، کە لاوەکانی زانکۆ و تەکنوکراتەکانن! ئەوان لەگەڵ (بەنی صەدر)لایان وایە ( ئیمام خومەینی)، قایل دەکەن بەوەی عەدالەتی کومەلایەتی ئامانج بێت! (عادل عەبدول مهدی)، کە ئێستا وەزیری نەوتە لە عێراق و پێشتر لە ساڵی ٢٠٠٥ جێگری سەرکۆماری عێراق و لە حوکومەتەکەی (ایاد علاوی)شدا، وەزیری دارایی بوو!

لـه خێزانێکـی نـاودار بـوو, کاتـی خـۆی باوکـی جێگـری سـەرۆکی مەجلیسـی ئەعیانـی کاتیـی پاشـایەتی بـوو، لـە فەرەنسـا خوێندوویەتـی و ماوەیـەک لەگـەڵ فەلەسـتینییەکان کاری کـردووە و یەکێکـە لـە دۆسـتە نزیکەکانـی (ئایەتـوڵا محمـد باقرالحکیـم) و سـاڵەکانی هەشـتاکان لەگـەڵ ئـەوان رێکخـراوی (ئەنجومەنـی بـاڵای ئیسـلامی) یـان دروسـت کـردووە! هەرچەنـدە ماوەیەکـی زۆر چـەپ بـووە، بـەڵام لـە سـەرەتای هەشـتاکاندا بووە بـە لایەنگر و هەڵگری بیرو بۆچوونـی ئیسـلامی ! خەلکی (ناصریـە) یەو باوکیشـی وەزیـری زەمانـی پاشـایەتی بوو، خۆیشـی ئێسـتا یەکێکە لـە دۆسـتە نزیکەکانـی (مـام جـەلال) و سـەرکردە کـوردەکان!

## چۆن (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، دامەزرا!

پێشتر ئێمە ئەوانەی کەوتبووینە زیندانەوە و ئەوانەش، کە بە ناوی (کۆمیتەی شارەکان) لە شارەکاندا خەباتیان دەکرد، تا سەر هاوڕێیەتی و نزیکی خۆمان لە گەڵیان پاراست. ئەوانەش کە بە ناوی (کۆمیتەی هەرێمەکان)ەوە چالاکانە شانیان دایە بەر ئەرکەکان و ڕۆڵی گرنگی خۆیان گێڕا لە سەر لەنوی ڕێکخستنەوە و بەهێز کردنەوەی (کۆمەڵە) و لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و لە ڕووداوەکانی دواییدا، ئێمە لای خۆمانەوە هەوڵەکانیانمان بە هێند وەردەگرت! چونکە هەموو ئەو هاوڕێیانە ژمارەیەکی زۆر لاوی تێکۆشەر و فیداکار و ژیریان لە ڕێکخستن و لە شۆڕشدا کۆکردبۆوە و لە ئەنجامدا ئەو تێکۆشەرانە و کاک (نەوشیروان) و بە پشتیوانیی (مام جەلال)، توانییان بەهێزتر و گونجاوتر و پێشکەوتوتر، سەرکردایەتیی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستان بخەنە دەست سەرکردایەتیەکیی چەکدار بە تیۆری شۆڕشگێڕانەی وا، کە لەگەڵ ناوەڕۆکی پێشکەوتنخواز و دیموکراسییانەی

جووڵانەوەکە و ئامانجەکانیدا بگونجێ! سەرکردایەتییەک، کە نزیک بێت لە بەرژەوەندییەکانی زەحمەتکێشانی کوردستان و بە پێکهاتە و بە بەرنامەو بە پراکتیک و بە گوێرەی تاکتیکی دروست و ستراتیجێکی رۆشن، بتوانێ بوێرانە جووڵانەوەکە ئاراستە بکات و بەرەو پێشەوەی ببات!

هاورێیانی (کۆمەڵە)، بەهۆی هەلومەرجە سەختەکەوە و تاڕادەیەکیش بەهۆی لەیەکتر دابڕانەوە، رەنگە ناکۆکیی و جیاوازییان هەبووبێت، بەڵام بە گیانبازی و ئازایەتی و پشوو درێژی و خۆڕاگرییەوە، توانییان قورساییەکی گەورە لە شۆڕشدا بە دەست بهێنن! (مام جەلال)یش لەلایەکەوە لەبەر لێزانی و شارەزایی و ناوبانگیەوە و لەلایەکی تریشەوە بە حوکمی ئەوەی، کە (سکرتێری کۆمەڵە) بووە و بە خۆشی خۆی و لە یەکەمین رۆژی دامەزراندنی (کۆمەڵە)وە لە کارەکانی (کۆمەڵە)دا وەک سکرتێر کاری کردووە و هەموو تێکۆشەرەکانی (کۆمەڵە)ش بەتایبەتی سەرکردایەتییەکەی، رێزیان لە بیرورا و بۆچوون و برا گەورەیی ئەو گرتووە، ئەوا پێکەوە کۆبوونەوەیان کردووە و پێکەوە بەرنامە و دەستووری خەباتیان داناوە! (مام جەلال)، زۆر لە بڵاوکراوەکانی (کۆمەڵە)ی نووسیوە و بەشداری هەموو شتێکی (کۆمەڵە) بووە و لە هەمووومان زیاتر خۆی بە (مارکسی) دەزانی و لە هەمووشمان زیاتر باوەڕی بە (ماوی) بوون و (کۆمەڵە) نیشان دەدا!

• نامەی ئاراستەی سەرکردایەتی (کۆمەڵە) کردووە و بیروڕای خۆی لەبارەی هەموو رووداوەکانەوە بۆ نووسیوین و ئێمەش وەراممان داوەتەوە و بە نامە بۆمان ناردۆتەوە!

• بەردەوام سەرکردەکانی (کۆمەڵە)، چوون سەردانیان کردووە بۆ بێروت و سوریا و ئەوروپا! (شەهابی شێخ نوری) چووە بۆ لای بۆ

بێروت و زیاتر لە ساڵێک لەگەڵی ماوەتەوە و پێکەوە بوون! هەریەکە لە (ئەنوەر زۆراب و جەعفەر عەبدول واحید و شازاد سائیب)، کە سەردانیان کردووە و چونەتە لای، وەک هاوڕێ و هاوکارو (سکرتێری کۆمەڵە)، قسەیان لەگەڵ کردووە و ئامۆژگاریی و بیرو راکانیان هێناوەتەوە بۆ هاوڕێکانی تری ناو ولات! (ناوەندی کۆمەڵە)، بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و دامەزراندنی دەستە چەکدارەکان، نامەیان بۆ ناردووە و رێ و شوێنیان لەگەڵ داناوە! لەناو ولاتەوە (ناوەندی کۆمەڵە)، بە رەسمی (فەرەیدون عەبدول قادر)ی رەوانە کردووە بۆ هەندەران بۆ لای (مام جەلال)، تا وەک (سکرتێری کۆمەڵە) پێکەوە، هەموو زانیارییەکان بگۆڕنەوە و پێکەوە تەگبیر بکەن و پێکەوە رەنگی (یەکێتی نیشتمانی)و پێکهاتەکەی لە ولات برێژن! تا ئەو کاتەش نە (مام جەلال) نە برایەکی تر، کەس خەبەری لە رێکخراوێکی سیاسی تر نەبووە، کە بەرنامەیەکی دارشتبێ بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش! مەگەر بەشێوەی شەخسی و دەستەی تاک و تەرا لەو بارەیەوە هەوڵێ درابێت، دەنا مێژوو شایەتی هیچ هەوڵێکی لەو جۆرە بۆ ئێمە ناگێڕێتەوە!

• خوالێخوش بوو (ساڵح یوسفی) و دەستەیەک لە تێکۆشەرە ناسراوەکانی شۆڕشی ئەیلول، لە تەقەلای ئەوەدا بوون، کە هەوڵ بدەن لەگەڵ حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی هەرچی شتێکیان پێ رزگار دەکرێ، رزگاری بکەن و گەر بکرێت رژێم قایل بکەن بەوەی بوار بە زیندوو کردنەوە، یا هێشتنەوەی پارتییەکی کوردی وەک (پارتی دیموکراتی کوردستان)، یا ناوێکی تر بدات و ئەو یاسای حوکمی ئۆتۆنۆمییەی کوردستان، کە رژێم دەریکردوە بەوان بسپێرێت! لە ئایندەدا بێ ئومێدی لەو تەقەلایە بوو، کە گەیشت بە دامەزراندنی (بزووتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی

کوردستان)، واتە تا ئەو کاتە، هەر (کۆمەڵە) بوو، کە هێزێکی ڕێکخراو بوو، بەرنامەی هەبوو بۆ بەرگری و بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و هەر (کۆمەڵە)ش بوو، کە بە تەقەلای سکرتێرەکەیەوە هەوڵی دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ی دا!

• لە پێناوی یەکخستنی بیروڕاو تەگبیر و یەک هەڵوێستی لەگەڵ (مام جەلالی سکرتێری کۆمەڵە)دا، بۆ بەهێز کردنی (کۆمەڵە)و بۆ پێشەوە چوونی بەرنامەکانی، چەندین سەرکردەی هەڵکەوتووی (کۆمەڵە)، چوونەتە بەر پەتی سێدارە! لەوانە شەهیدان ( شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر)!

• (مام جەلال) وەک (سکرتێری کۆمەڵە)، نەک جیا لە (کۆمەڵە) و بە تەگبیر لەگەڵ هاوڕێیانی (کۆمەڵە)دا، لەگەڵ تێکۆشەرەکانی دەرەوەی وڵات لە هەندەران قسەی کردووە و رایکێشاون بۆ پرۆژەی بەشداریکردن لە دامەزراندن و گەشە پێدانی هەنگاوی دروست کردنی (جغزێک)، بۆ (کۆمەڵە)! واتە لە هێنانەدی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و دواتریش بەشداری لە هەنگاوەکانی شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا!

• (مام جەلال) بەهۆی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە)و تێکۆشەرەکانی (کۆمەڵە)وە، نامەی بۆ کەسایەتییە شۆڕشگێرەکانی ناوەوەی وڵات ناردووە، کە بەشداریی لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشدا بکەن!

• (نەوشیروان مستەفا)، کە یەکێک بووە لە بەشدارە دیارەکانی دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، ئەوا لە دەرەوەی وڵات و تا ئەو رۆژەیش کە چۆتە دەرەوە، پەیوەندیی تاکی بەهۆی سەرکردایەتی (کۆمەڵە)وە بە (کۆمەڵە)وە هەبووە و لە لاوازترین ئەگەردا هیچ نەبێ بە بیر و بە هاوڕێیەتی لە (کۆمەڵە) دوور نەبووە و لە بازنەی (کۆمەڵە) دا بووە!

پێموایە ڕاستییەکە ئەوەیە، کە (کۆمەڵە) بە (مام جەلال)ی سکرتێریشیەوە، خاوەنی بیرۆکەی دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ەو بە دامەزرێنەری ڕاستەقینە و بەکاری ئەو هەنگاوە مێژووییەی دامەزراندنی (یەکێتی) و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ دادەنرێت! باقی تێکۆشەرەکان لە هەر کوێ بووبن، شەرەفی گەورەی بەشداری کردنیان لەو پرۆژە نیشتمانییەدا پێ بڕاوە و ئەوانەی دەرەوەی وڵاتیش بەو حەوت زاتەشەوە، کە لە دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)دا، وەک تێکۆشەری کوردایەتی لە هەندەران، لە سەرەتاوە بەشداری ئەو کارەیان کردووە، شان بە شانی (کۆمەڵە)و لە ئەرکێکی هاوبەشدا، کە بە نهێنیی (کۆمەڵە)، کە سکرتێرەکەی (مام جەلال) بووە کۆی کردوونەتەوە لەو پرۆسەیەدا و شەرەفی ئەو بەشدارییەیان پێ بڕاوە ، ئەنجا لە چایخانەکەی (تولەیتولە) بووبێت لە دیمەشق، یا لە هەر شوێنێکی تر بووبێت!

کاتێ لە دەرەوە یەکەم بەیان دەردەچێ، ئەوا (کۆمەڵە)، نا ڕاستەوخۆ بەهۆی سکرتێرەکەیەوە، کە ڕێبەری ئەو تێکۆشەرانەی کردووە لە هەندەران، پێکەوە بەیانێک بۆ ڕاگەیاندنی دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دەنووسن و هەر لە ڕێگەی سکرتێرەکەی (کۆمەڵە)یشەوە ئەو بەیانە لە ڕادیۆ بڵاو دەکەنەوە! خۆ ئەگەر سەرکردایەتیی ئەو کاتەی (کۆمەڵە)، بەهۆی کەوتنە زیندانەوە نەیانتوانیبێ وەک پێویست ئەرکاکانی (یەکێتی) تەواو بکەن، ئەوا هەم سکرتێرەکەی لە دەرەوە بوو، هەم کاک (ئارام) و (کۆمیتەی هەرێمەکان) و تیکۆشەرەکانی (کۆمەڵە) لە وڵات، ئەوەی بە کەسی تر نەدەکرا بۆ دەنگدانەوەی ( یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، کردییان! ڕەگ و ڕیشە داکوتان و پەلوپۆ هاوێشتنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) لە وڵات، (کۆمەڵە)

نەخشی سەرەکی تیا گێڕاوە! سەرەڕای ئەوەی کە لە سێدارەدانی سەرکردەکانی (کومەڵە)، شەهیدان (شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر) لەو رۆژگارە هەرە رەش و نوتەکەدا، بوو بە زایەڵەی زەنگێکی بەرز بۆ (یەکێتی) و هیچ بەیانێک وەک هێنانەوەی تەرمەکانی ئەو تێکۆشەرانە بۆ ناو جەماوەری شارەکان لە کوردستان، نەیتوانی ببێت بە راگەیاندنێکی بە کار و فراوان بۆ ناوبانگی (یەکێتی نبشتمانی کوردستان) و هێندەش بە شەهید بوونی ئەو سەرکردانە خزمەتی گەشە کردن و بەهێز بوونی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) کرا، دەیان کۆبوونەوە و بەیاننامەی هەندەران نەیانتوانیوە نیو هێندە کاریگەر بن، کە دیارە ئەمانەش هەموو هەم (کۆمەڵە)، کردوونی و هەم (کۆمەڵە)ش نەخشی تێیاندا هەبووە!

لە ١٩٧٥/٦/١دا، لە ئەنجامی تەقەلاکانی (مام جەلال) و بیروڕا گۆڕینەوەی لەگەڵ باقی ئەندامانی سەرکردایەتیی (کۆمەڵە) و دەستەیەک کوردی تێکۆشەری نیشتمانپەروەری هەندەراندا، یەکەمین بەیانی راگەیاندنی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) بڵاوکرایەوە!

لە رۆژی راگەیاندنی دامەزراندنی (یەکێتی)دا، بێجگە لە (کۆمەڵە) هیچ کەسایەتی و لایەنێکی سیاسی تر نەبوو لە کوردستان، کە رێکخراو و خاوەنی رێکخستنێکی نهێنیی سیاسی بێت. بۆیە (کۆمەڵە) و هەموو ئەو تێکۆشەرانەی، کە وەک کەسایەتیی تێکۆشەری کورد باوەڕیان بە رەوایی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان و بووژاندنەوەی خەباتی چەکدارانەی گەلەکەمان هەبوو، هەر زوو لە پێناوی رزگاری و دیموکراسی و پێشکەوتنی کورد و کوردستاندا، هەموو لە دەوری (مام جەلال) و بەرنامەی بووژاندنەوەی سەنگەرە جیاجیاکانی خەباتی شۆڕشگێرانەی کوردستان، کۆبووینەوە! واتە هەر هەمان

ئەو نەخشەیەی، کە لە سەرەتادا و لەگەڵ (کۆمەڵە) دارێژرا بوو، کە (یەکێتی) ببێتە جوغزێکی نیشتمانی فراوانی (کۆمەڵە) و لەسەر ئەو ڕێبازەی کە بۆ سەرکەوتنی ویستی گەلەکەمان و بە دیهێنانی ئامانجەکانی ڕەنگی ڕێژرا، ئێمەش - ناوەندی کۆمەڵە - بەهەموو تواناو نەخشە و زانیارییەکی خۆمانەوە لەگەڵ سکرتێرەکەیدا هەنگاو بە هەنگاو و هەر لە سەرەتاوە و تا گەڕانەوەی (فەرەیدون عەبدول قادر) لەلای (مام جەلال) و بە نامەی بەردەوام و سەردان، تەکبیرمان لە دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) کردووە، وەک ڕێکخراوێکی نیشتمانیی فراوان لە دەوری (کۆمەڵە)!

## ڕووداوەکانی پاش دامەزراندنی (ی ن ک)!

لە ١٩٧٦/٨/١٦ دا ڕێکخراوێکی تری کوردستانی بە ناوی ( بزووتنەوەی سوشیالیستی دیموکراتی کوردستان) ڕاگەیەنرا، بە سەرکردایەتیی کەسایەتیی تێکۆشەری ناسراوی جووڵانەوەی کورد عەلی عەسکەری، خالید سەعید، عومەر مستەفا - دەبابە - ڕەسول مامەند، سەعدی گچکە، مەلا ناسیح)! هەروەها (صالح یوسفی و عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی)ش، کە ئەو کاتە ئاشکرا نەبووبوون و فەرمانەدەی باشی وەک (سەید کاکە و تایەری عەلی والی و ئەحمەد مولود و حەمە غەفور و قادر مستەفا) و هتد!

پێشینەی تەقەلاکانی دروستکردنی ئەو ڕێکخراوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مشتو مڕ و کۆبوونەوانەی، کە پاش شکستی مارتی ١٩٧٥ ی شۆڕشی کوردستان، کران! بە تایبەتی ئەو کۆبوونەوانەی، کە لە مانگی نیسانی ١٩٧٥ دا، نزیکەی ٣٠ سەرکردە و کادری دیار و دێرینی جووڵانەوەی کورد لە شاری ورمێی ئێران و لە ماڵی (عومەر دەبابە) و لە ماڵی

(شێخ عەزیز شەمزینی)، کردیان و پاشان هەندێ لەو تێکۆشەرانە لە گەڕانەوەشیاندا بۆ عێراق و لە بەغدا هەر لە خەم و لە تەگبیردا بوون! ئەو دەمە یەک بیروڕای یەکگرتوو لە ناویاندا نەبوو، هەندێک لەوانە لە بیری ئەوەدا بوون، کە رژێمی عێراق قایل بکەن تا مۆڵەتی کار کردنی حیزبێکی سیاسییان بداتێ و ئەو داو و دەزگایەی رژێم بۆ بەناو ئۆتۆنۆمی کوردستان دروستی کردبوو، ئەوان بەڕێوەی بەرن! بەڵام کە لەو تەکبیرە بێ هیوا بوون، ئیتر لە ئەنجامدا بە ناوی (بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان) و بەو شێوەیە رێکخستنێکی نوێیان راگەیاند و بەشدارییەکی چالاکانەشیان لە خەباتی چەکدارانە و لە تەقەلاکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)دا، بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ کرد! هاوکات لەگەڵ ئەو رووداوانەدا، (دکتور مەحمود عوسمان) لە شام لەگەڵ (شەمسەدین موفتی و قادر جەباری و عەدنان موفتی)، گرووپێکی سیاسیی تریان هێنایە کایەوە بە ناوی (لیژنەی ئامادە کردن - اللجنە التحضیریة -) وەک باڵێک، کە لە (پارتی) جیابووبێتەوە، خۆیان ناساند و پاشان لەگەڵ (بزووتنەوە) تێکەڵ بوون و یەکیان گرت!

هەموو ئەوانە، مەیلی خۆیان نیشان دا بە کار کردن لەگەڵ (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و هاتنە ناو (یەکێتی)یەوە! ئیتر (مام جەلال) بە لێزانینی خۆی (یەکێتی) کردە رێکخراوێکی نیمچە بەرەیی، کە لە (کۆمەڵە) و (بزووتنەوە) و (خەتی گشتی) پێکهاتبوو! خەتی گشتی لەو کەسانە پێکهاتبوو، کە نە (کۆمەڵە) بوون و نە (بزووتنەوە)! بەڵام تا ئەو کاتە هیچ کام لەو دوو رێکخراوە، رێکخستنیان لە شارەکانی کوردستاندا نەبوو! سەرەتا (بزووتنەوە) دەستی کردبوو بە پەیوەندیکردن بە هەندێ لە دۆست و هاورێ شەخسییەکانی خۆیانەوە لە سەرکردە و کادرەکانی پێشووی ناو جووڵانەوەی کوردەوە، بۆ ئەوەش توانیبوویان

شتێک بە شتێک بکەن!

ئەوە راستییەکی مێژوویە، کە (کۆمەڵە) بە (مام جەلال)ی سکرتێریەوە دامەزرێنەری (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بوون و (کۆمەڵە) و دەستەیەک لە تێکۆشەرەکانی دەرەوەی وڵات، کە هەندێکیان تا ئەو کاتەش ئەندامی (کۆمەڵە) بوون، بەشدار بوون لە دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)دا، بەڵام ئەو راستییە وردە وردە و بەشێنەیی گۆڕا و لەباتی ئەو راستییە مێژوویە، حیکایەتێکی تر جێگیر کرا و (کۆمەڵە) وەک دامەزرێنەری ئەساسیی (یەکێتی) باس نەدەکرا!

(یەکێتی،) لەو کاتەدا و پاش جیابونەوەی (بزووتنەوە)، هەندێ لاوازی رووی تێکردبوو، بەڵام بە هاتنە دەرەوەی تێکوشەرەکانی زیندان و ژمارەیەک تێکۆشەری تری ناو شارەکان، کە هەندێ لەوانە جارێکی تر بوون بەهۆی بەهێز کردنەوەی ئەو بەشە کەمەی (بزووتنەوە)، کە لەناو (یەکێتی)دا، مابوو! رووی لە گەشە کردن کردەوە! ئیتر(یەکێتی)ش بەو جۆرە و وەک و جاران هەر لە (کۆمەڵە و بزووتنەوە و خەتی گشتی) پێکهاتبوو!

ئەو سێ رێکخراوەی ناو (یەکێتی)، هەر سێکیان سەربەخۆیی خۆیان و سەرکردایەتی تایبەتی خۆیان و رێکخستن و پەیکەری رێکخستنی خۆیان هەبوو! بەڵام لەناو یەکێتیشدا بۆ (یەکێتی)، سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی هاوبەشیان هەبوو! یەک هێزی پێشمەرگە و یەک دەزگای راگەیاندن و یەک دەزگای پەیوەندییەکان و یەک دادگای باڵای هاوبەش و هاوکات لقی رێکخستنی هاوبەشیان هەبوو!

سەرەڕای ئەوەی، کە ئەندام و لایەنگر و کادر و فەرماندە و سەرکردەکانی (کۆمەڵە)، بەشی هەرە زۆری هێزی پێشمەرگە و رێکخستن و جەماوەری (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ی پێکهێنا بوو،

بەڵام لە سەرکردایەتیی (یەکێتی) و لە مەکتەبی سیاسی و عەسکەری و ڕاگەیاندن و پەیوەندیەکاندا، لەگەڵ (بزووتنەوە)، یاخود لەگەڵ (خەتی گشتی)دا، وەک یەک نوێنەریان لەو کۆمیتانەی (یەکێتی)دا، هەبوو! ئەوەش هەمیشە جێگەی ناڕازی بوونی هاوڕێیانی (کۆمەڵە)بوو! بەو هۆیەوە، کە ژمارەی تێکۆشەرەکانی (کۆمەڵە)، زۆر لە دوو لایەنەکەی تر زۆرتر بوون، کە ئەوکاتە و لە ساڵەکانی ١٩٨٤ بە دواوە هەمیشە ئەوانەی (کۆمەڵە) لە ٧٠٪ ی کۆی گشتی ئەندام و پێشمەرگە و کادر فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە زیاتر بوون، ئەوا بەوپێیە (کۆمەڵە)، زۆربەی هەرێم و تیپەکانی پێشمەرگەی بە دەستەوە بوو! لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستانیشدا، کاریگەریی هاوڕێیانی (کۆمەڵە)، زیاتر و دیارتر بوو! ژمارەی شەهیدە کانیشمان زۆر لە هی ئەوان زیاتر بوو، کەچی دوو ڕێکخراوەکەی تر هەمیشە گلەییان لە باڵا دەستیی (کۆمەڵە) هەبوو!

## ململانێی ناوخۆ!

لە گەڕانەوەدا چەند رۆژێکی کەم لە ئێران ماینەوە، ئیتر زوو لەگەڵ (شوانە)ی کوڕمدا، گەڕامەوە بۆ خڕی نێو زەنگ! تا دەهات، کات لەوە نزیک دەبووەوە، کە بارەگاکانمان لە کەپر و چادرەکانی توژەڵەوە ببەینەوە بۆ نێوزەنگ بۆ ناو خانوو و ژیانی زستانە! ئەو هاوینە هەموومان شانمان دایە بەر دروست کردنی خانووی تازە، بە شێوەیەکی جوان و رێک و پێک و بە قالبی خشتی کاڵ خۆمان و پێشمەرگەکان دەستمان کرد بە خشت بڕین و هەزارەها خشتی کاڵی رێکوپێکمان ئامادە کرد و بە گوێرەی نەخشەی گونجاو خانووەکانمان دروستکرد. خانوویەکی گەورەی دوو نهۆمیمان بۆ بارەگای راگەیاندن و ناوەندی (کۆمەڵە) دروست کرد و هۆڵێکی گەورەشمان بۆ کۆبوونەوە و سیمینار بە ناوی هۆڵی شەهید (شەهاب) دروست کرد. خانوویەکی دوو ژورو هەیوانیم دروست کرد، کە ژورێکیم دا بە شاعیرو نووسەر (حەمەی حەمە باقی و نەجیبە)ی خێزانی، کە تازە هاتبوونە دەرەوە!

لەو کاتانەدا، کە لە ناوزەنگ بووین، هەمیشە لە خەیاڵی ئەوەدا بووم، کە چۆن راسپاردە و وەسیەتی تێکۆشەرەکانی (کۆمەڵە)، کاک (شەهاب) و هاوڕێکانی، کە بۆ پاراستنی (کۆمەڵە) و ڕێبازەکەی خرابوویە ئەستۆمان، بە ئەمانەتەوە جێبەجێ بکەین و بیپارێزین! هەمیشە لە دڵی خۆم و لە ناخی خۆمدا دەمگوت.. ئاخۆ کێ دەتوانی ڕێبازی (کۆمەڵە) و ناسنامەکەی بپارێزێت! ئاخۆ ئەوە بەو لاوە پاک و خوێن گەرمانەی سەرکردایەتی و تێکۆشەرە دێرینەکانی (کۆمەڵە) دەکرێ لەگەڵ هاوڕێ خۆنەویست و قاڵ بووەکان بە بیرو باوەڕ و ڕێبازی (کۆمەڵە)، کە دوای ئێمە لە (کۆمیتەی هەرێمە کان)، لەگەڵ شەهید (ئارام)دا بوون، یاخود بە تێکۆشەرە دێرینەکانی حیزبە کۆنەکەی باڵی (مەکتەبی سیاسی)، کە بە (جەلالی) ناسرا بوون، ئاخۆ ئەمانە دەتوانن ئەو ئەرکە مێژوویە بخەنە سەرشانیان! نایشارمەوە ترسێکی زۆرم هەبوو لەو پێکهاتەی (خەتی پان و بزوتنەوە)و ئەو کەسایەتییانە، کە بە تەواوی جڵەوی سەرکردایەتیی شۆڕشەکە و و ڕووداوەکان بگرنە دەست و (کۆمەڵە) و ئەمانەتەکەی شەهیدان (شەهاب و ئارام) و هاوڕێ شەهیدەکانی تر، بە ئاقارێکی تردا ببەن و بەمەش خەونی هاوڕێیانی (کۆمەڵە) لەبار ببرێت و بە پلان و نەخشەی تایبەت، بکرێت بە حیزبێک لە شێوەی ئەو حیزبە کۆنەی (جەلالی)، کە بە تەجروبە شکا و نەیتوانی لە گێژەنەکانی خەباتدا سیاسەتی پاک و کورد پەروەرانە تا سەر پیادە بکات !

ئێوارەیەک بە بیرمدا هات، جووڵەیەک بکەم بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ (مەلا بەختیار) و هاوڕێیانی (کۆمیتەی هەرێمەکان)! سەرەتا قسەم بۆ (ملازم عومەر و ئازاد هەورامی) کرد و هەوڵم دا، زەمینەیەکی باشی لە یەک تێگەیشتن و هاوکاری ساز بکەین! بەهۆی ئەوانەوە داوام کرد، کە دوو قۆڵی لەگەڵ (مەلا

بەختیار) قسە بکەم، بەڵکو بتوانین بە شێوەیەکی دروستتر و باشتر خۆمان ڕێکخەینەوە، ئیتر دانیشتنێکم ڕێکخست لەگەڵ (مەلا بەختیار) و لە ماڵی (مەلا بەختیار) و لەسەر خوانێکی تایبەتی ماڵی ئەوان! لەو ئێوارە خوان و نیمچە کۆبوونەوەیەدا پێم وت: ئێوە هاوڕێیانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) و ئێمەش ئەو هاوڕێیانەی، کە لە زیندانەوە هاتووینەتەوە و ئەوانەش، کە لە ناو شارو دەرەوە لەم هاوڕێیانە کۆبونەتەوە، هەردوو لامان خاوەنی (کۆمەڵە) و ڕێبازی ڕاستەقینە و ناسنامەی (کۆمەڵە) ین و هەردوو لامان بە ڕێباز و بیرو بۆچوونەکانی (کۆمەڵە) گۆش کراوین و هیچ لایەکیشمان لە دەرەوەی (کۆمەڵە)، نەبووین و لەپڕ نەهاتووین و دەستمان بەسەر (کۆمەڵە)دا نەگرتووە! بۆیە بەڕای من ڕاست وایە هەردوولامان یەک خەت بین! ڕاستە لە ڕابوردوودا بەهۆی لێکدابڕانەوە هەندێ لە یەکتر نەگەیشتن لە نێوانماندا پەیدا بووە و کادیر و ئەندام و پێشمەرگە و هاوڕێیانمان و تەنانەت دۆست و نەیارەکانیشمان، لە شار و لە شاخ بە ناکۆکیی تەماشای دەکەن و دڵسۆز و هوشیارەکان زۆر پێی ناڕەحەتن، بۆیە درێژە کێشانی ئەو حاڵەتە و بەردەوام بوونی، زیانێکی گەورە لە (کۆمەڵە) و لە پێکهاتەو لە بیروبۆچوون و ڕێبازەکەی دەدات! هەق وایە برایانە تەگبیرێ لەم حاڵە بکەین و کۆتایی پێبهێنین و هاوکاری یەکتر بکەین! (مەلا بەختیار)، لە وەرامدا وتی.. زۆر ڕاستە و هیچ ڕایەکی جیاوازم لەو قسانە نیتە و دەبێت ئێمە هەردوولامان هاوڕا و هاوکار بین، بەڵام بوارم بدە تا قسە لەگەڵ هاوڕێکانی تریشدا بکەم! ئیتر هەر ئەو قسەیە بوو، وەرامێکم دەست نەکەوتەوە و ناکۆکییەکانی ناوخۆشمان، نەک هەر لاواز نەبوو، بەڵکو درێژەی کێشا و ئەوەش لە هەموو کۆنفرانس و ڕووداوەکانی دواتردا، تادەهات کاری سەلبی لەسەر پەیوەندیتەکانمان و لەسەر

ئایندەی (کۆمەڵە)ش کـرد!
تـازە لـە ئیش و کاری خانـوو بـارەگا دروسـت کـردن بووبووینـەوە، زۆر نەبـوو چووبووینـە خانـووە تازەکانمـان، کـە هێزیکـی (پارتـی)، پەلامـاری (قەڵاتوکان)یـان دا، لـە شـەڕێکی کـورت خایەنـدا (قەڵاتوکان)یـان داگیـر کـرد! ئیتـر ئـەو شـەڕە کتوپـڕە و داگیـر کردنـی (قەڵاتـوکان)، بـە زۆر پەلکێشـی کردیـن بـۆ سـەردەمێکی نـوێ، بـەڵام ناخـۆش و دژوار! چونکـە پەلاماردانـی هێزەکانـی (یەکێتـی) و داگیـر کردنـی، نیشـانەیەکی خـراپ و سـەرهەڵدانی گێمێکـی تـری شـەڕی ناوخـۆ بـوو!
سـەرەتا بـە شـەڕی راگەیانـدن بەرەبەیانـی ئـەو شـەڕە دەسـتی پیکـرد و رۆژانـە رادیۆکـەی (پارتـی)، وتـار و لێدوانـی شـەڕەنگێز و دوژمنانـەی لـە دژی (یەکێتـی)، بڵاودەکردەوە و ئێمـەش ناچـار بووین وەڵامیـان بدەینـەوە! (قەڵاتـوکان)، بـۆ ئێمـە ناوچەیەکـی گرنـگ بـوو، سـەرەڕێ بـوو بـەرە و قـەلادزە و بـۆ ناوچەکانـی بالیسـان و رەوانـدز و چۆمـان و وەرتـێ و هەولێـر. ئـەوە نەخشـەیەکی رێگـە بـڕی (یەکێتـی) و هێزەکانـی بـوو بـۆ هەمـوو ئـەو ناوچانـە. ئیتـر بـەرە بـەرە هێزەکانـی (پارتـی) روویانکـردە پێکهێنانـی هەڕەشـەیەکی گـەورە بـۆ سـەر بارەگاکانـی (یەکێتـی) لـە خـڕی نێوزەنـگ و توژەڵـە و زەڵـێ و شـێنێ! (پارتـی)، بـە سـەرکردایەتی دکتـور (رۆژ نـوری شـاوەیس و ئـازاد بـەرواری و سـالح جومعـە) و بـە یـاوەری (عەلـی عەبـدوڵا)، هێزێکـی زۆری بـە نـاو ئێرانـدا رەوانـە کـردە شـاخەکانی بەرامبەرمـان بـۆ ناوچەکانـی دۆڵـە تـوو و گوێـزێ و دۆڵـە کۆگـە و لـەم لاشـەوە رژێمـی عێـراق لـە ١٩٨٠/١٠/١٩ دا، بـە هێزێکیـەوە کـە زۆربـەی جاشـەکان بـوون، پەلامـاری پشـت سـەریان دایـن لـە شـاخی مامەنـدە و ئەلقەیەکـی قایمـی گەمارۆدانیـان لـە دەورمـان پێکهێنـا. سـەرەتا بـەو هێزانـەی لەبەردەسـتدا بـوون بـە سـەرکردایەتی (مـلازم عومـەر) لـە

شـەڕێکی قارەمانانـەدا، هێزەکانـی عێـراق تێکشـێندرا و هێزەکـەی (پارتـی) ش بـەو بـەرەوە دەیانبینـی و بـە بێتـەل بـە هێزەکانـی ئێمەشـیان دەوت.. ئاخـۆ بێیـن یارمەتیتـان بدەیـن!

لـە سـەرەتاوە زۆر هەوڵمانـدا بـە رێگـەی ئاسـانتر و بـە گفتوگـۆ و بەهـۆی (حیزبـی شـیوعی عێـراق)ەوە، خۆمـان لـەو شـەڕە بپارێزیـن! پـاش هاتوچۆیەکـی چەندیـن جـارەی (مـەلا ئەحمـەدی بانیخێلانـی و فاتیـح رەسـول) لـە نێـوان هـەردوولادا، لەئەنجامـدا لەسـەر پرۆژەیەکـی چەنـد خاڵـی بـۆ کشـانەوەی هێزەکانـی (پارتـی) و ئاشـتی رێککەوتیـن. پرۆژەکـە (نەوشـیروان مسـتەفا)، بـە راوێـژ لەگـەڵ هاوڕێکانـی ئامـادەی کـرد بـوو، دوای هەنـدێ وردە دەسـکاری لەلایـەن (پارتـی)ەوە دەرگای لەسـەر رەواندنـەوەی دۆخـی شـەڕ کـردەوە و پـاش یـەک مانـگ لـە گـرژی و دۆخـی شـەڕ، هێزەکانی (پارتـی) لـە مانگی یانزەی ١٩٨٠ دا، کشـانەوە و زۆربەیـان رویانکـردە ناوچەکانـی حاجـی هۆمـەران!

هـاوکات لەگـەڵ ئـەم ڕووداوانـەدا (مـام جـەلال)، لـە شـام لـە تەقەلاکانـی خۆیـدا، توانـی بەرەیەکـی ئۆپۆزیسـۆنی عێراقـی بەنـاوی (الجبهـە الوطنیـة القومیـە العراقیـە – جوقـد - ) کـە پێکهاتبـوو لـە (حیزبـی بەعـس - جبـار کوبەیسـی)، سـەر بـە سـوریا و (بزووتنـەوەی سۆسیالیسـتی عەرەبـی عەبدول ئیلا نصـراوی و حیزبـی شـیوعی عێـراق و سـوپای گەلـی رزگاری عێـراق) و چەنـد لایەنێکـی کـوردی وەک (یەکێتـی و سۆسیالیسـت) و فەراموشـکردنی (پارتـی)، لـە ١٩٨٠/١١/١٢ دا پێـک بهێنێـت!

دیـارە (پارتـی)ش بەرامبـەر ئـەو دوورخسـتنەوەیەی خـۆی لـەو بەرەیـەدا دەسـتەووسـتان نەوەسـتا و گوشـارێکی زۆری خسـتە سـەر (حیزبـی شـیوعی و سۆسیالیسـت) و بـەوەش توانـی بـە تەقەلایەکـی کـەم لـە گـەڵ (حیزبـی شـیوعی و سۆسیالیسـت)، بەرەیەکـی تـر بەنـاوی (الجبهـە الوطنیـة

الديمقراطية - جود -) پێک بهێنن بەرامبەر بە (جوقد)! ئەنجا دەبوو سەرئیشەی ئەوەش بگرینە ئەستۆ، کە ئاخۆ کامە بەرە (جوقد یا جود) دەتوانێ هێزەکانی (شیوعی و سۆسیالیست) کۆبکاتەوە!
لە راستیدا بەرەی (جوقد) نەیتوانی تاکتیکێکی سەرکەوتوو بێت بۆ بەهێز کردنی (یەکێتی) و بەهێز کردنی تواناکانی بەرگری و بەگژا چونەووە دژی رژێمی بەغدا و نەشبووە هۆی ئەوەی، کە ململانێ و شەڕی برا کوژی لە کوردستاندا نەهێڵێت و هێز و توانای حیزبی (سۆسیالیست و حیزبی شیوعی)شی بۆ نەخرایە تەک (یەکێتی)! ئیتر کوڵی خۆمان هەر بە کوڵی خۆمانەوە مایەوە و دۆستەکانیشمان لەو بەرەیەدا توانییان سوود لەو دۆکۆمێنتە وەربگرن بۆ خۆیان. (جود) یش هێزێکی سەر زەمینی کوردستانی خستە سەر تواناکانی (پارتی)! راستە لەو گەمە سیاسییەدا حیزبی (شیوعی) یەکی یەک سێوی خستبوە باخەڵی (یەکێتی و پارتی) یەوە و بە دەنگێکی خۆش دەیوت. قوربانی کوڕی سێو لەباخەڵ بم! بەڵام لە دوایین بڕیاردا سەنگەری (پارتی)، هەڵبژارد! ئەوەش بووە هۆی گەمارۆدانێکی سیاسی چەکداری گۆڕەپانی کوردستان، بۆ سەر (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و پەلکێشانی ململانێی ناوخو بۆ شەڕێکی خۆیناوی تر!

## شەڕی ناوخۆ!

بە داخەوە شەڕی (برا کوژی) و شەڕی ناوخۆ، زۆر جار و لەچەند سەردەمێکی جیاجیادا، یەخەی بە هێزەکانی کوردایەتی گرتووە و زیانی گەورەی بە رەوت و ئەنجامەکانی جووڵانەوەی کورد گەیاندوە و هۆیەکی گەورەی دواخستنی (سیاسی و ئابووری و کەلتووری)، کوردستانیش بووە! بەڵام بیرمان نەچێت، ئەم نەهامەتییە لە مێژودا بە تەنها بەشی کورد نەبووە و بگرە شەڕی ناوخۆ بەرۆکی زۆر گەل و زۆر وڵاتی تریشی گرتووە! لە ئەمریکا، ئیسپانیا، روسیا و پاکستان و لە زۆر وڵاتی تر زیانی گەورەی گەیاندووە و کارەساتی زۆریشی خستۆتەوە! بۆ نموونە جەنگی ناوخۆی ئەمریکا لە نێوان باکوور و باشووریدا لە ساڵی ١٨٦١ تا ١٨٦٥، چوار ساڵ زیاتری خایاند و قوربانییەکانیشی زیاتر لە یەک ملیۆن کەس و وێران کردنێکی ئێجگار زۆری شار و مەزراکانی لێ کەوتەوە! ئەو جەنگە لە نێوان دوو بۆچوونی جیاوازدا لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٨٦٠ دا و پاش سەرکەوتنی کۆمارییەکان و

(ئەبراهـام لینکۆڵـن)، کـە دروشـمی دژی کۆیلایەتـی بەکـردەوە جێبەجـێ دەکـرد، ئـەوا لـە ئەنجامـی ئـەوەدا فیدراڵییـەکان لـە حـەوت ویلایەتـی باشـوور، لـە ویلایەتـە یەکگرتـووەکان هەڵگەڕانـەوە و جیابوونـەوە! لـە نیسـانی سـاڵی ١٨٦١ دا شـەڕی سـەخت لەنێـوان باکـوور (ویلایەتـە یەکگرتـووەکان) و (ویلایەتـی کۆنفیدراڵـی)دا، هەڵگیرسـا و ئینگلتـەرا و فەرەنسـا تەقەلایەکـی زۆریـان دا بـە قازانجـی فیدراڵییـەکان دەسـت وەردەنـە جەنگەکـەوە، بـەڵام ئازایەتی و ژیریـی (لینکولـن)، بـواری نـەدان! ئـەوە بـوو بـە تـەواو بوونـی ئـەو جەنگـە کۆیلایەتـی کۆتایـی هـات و بـە کاری دڵسـۆزانەی ئەمریکاییـەکان، وڵاتەکەیـان کـردە زلهێزتریـن هێـزی جیهـان!

لە پاکستان ناکۆکیی و ململانێ خراپەکانی وڵاتەکەیان هـەر لـە سـەردەمی (ئەیـوب خـان)ەوە تـا (یحیـی خـان) و (مجیـب الرحمـن) و (بۆتـۆ) و حیزبەکانیـان و گەندەڵیـی حکوومەتەکانیـان و خسـتنەوەی بـێ عەدالەتـی لـە نێـوان پاکسـتانی رۆژهـەڵات و پاکسـتانی رۆژئـاوادا، تاسـەرکەوتنی (مجیـب الرحمـن) لـە پاکسـتانی خۆرهەڵاتـدا و گرتـن و زیندانـی کردنـی (مجیب الرحمـن) و دەسـت وەردانـی هندسـتان لـە زەمانـی (ئەندێرا غانـدی)، کـە بـە دابەشـبوونی پاکسـتان و دامەزراندنـی دەوڵەتـی بەنگلادیـش لـە سـاڵی ١٩٧١، کۆتایـی هـات! تـا لـە ئەنجامـدا ئـەو ناکۆکیـی و ململانێیـەی پاکسـتان زیانێکـی زۆری لێکەوتـەوە، کـە بـە نزیکـەی ٣ ملیـۆن کـوژراو و هەشـت ملیـۆن ئـاوارەی بلوجیـی پاکسـتانی خۆرهـەڵات بـۆ هیندسـتان و دواکەوتنـی ئابـووری و سیاسـیی و کۆمەڵایەتیـی پاکسـتان تـەواو بـوو!

لـەم رۆژهەڵاتـەی لەمـەڕ خۆشـمان، لوبنـان لـە ناکۆکیـی و شـەڕی ناوخـۆدا تووشـی زیانـی گـەورە و پاشـکەوتنی وڵاتەکـەی هـات، کـە زیاتـر لـە ١٥ سـاڵی خایانـد، بـێ ئـەوەی ئێسـتاش بەرۆکـی بـەردا بێـت! لـە سـاڵی ١٩٧٥

تا ۱۹۹۰ بە چەند قۆناغێک شەڕی ناوخۆی لوبنان درێژەی کێشا. لەو شەڕەدا شیعە و سوننە و دروز و مارۆنییەکان و فەلەستینییەکان و هەموو حیزبەکانیان، سەرەڕای ئیسرائیل و سوریا بەشداری کاریگەریان تێدا کرد و هیچ لایەکیش لە هێزە لوبنانییەکان نەما، دەستی دەوڵەت و هێزێکی بێگانە کێش نەکات بۆ ناو دۆخی سیاسی و ئابووری و کەلتووری و کۆمەلایەتیی لوبنان و هیچ لایەکیشیان بێبەری نەبوون لەوەی، کە لەباتی دەوڵەتان و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتانی ناوچەکە، درێژە بە شەڕ و ململانێیەکان نەدەن! بەمەش ئەو لوبنانەی کە بە بووکی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە قەڵەم دەدرا، کەچی شەڕی ناوخۆ و ناکۆکیی لایەنەکان کردیە کەلاوە و بووە وێرانە!

ئیسپانیا لە ۱۹۳٦ تا ۱۹۳۹ دووچاری شەڕێکی ناوخۆی زۆر سەخت و وێرانکەر بووەوە، کە لەنێوان کۆمارییەکان و ناسیۆنالیستە فاشیستەکاندا لە هەڵبژاردنەکانی۱۹۳۱دا، رووی دا! سۆسیالیستەکان و کۆمۆنیستەکان و سەندیکاکانی کار، لە زۆربەی شارەکانی ئیسپانیادا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، لە رووی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۳٦ دا، جەنراڵ (فرانکۆ و مۆلا و دیانۆ) و هێزی سوپا بۆ رووخاندنی دەسەلاتی سیاسی و دامەزراندنی دیکتاتۆری (فرانکۆ) لە زۆرێ لە شارەکاندا، هەڵگەڕانەوە و بەمەش یاخی بوون رووی دا! بە پشتیوانی ئیتاڵیای فاشستی و ئەڵەمانیای نازی هێرشیان بردە سەر دامەزراوەکانی حکومەتی بەرەی میللی! ئەگەرچی حکومەتی گەلیش بە پشتیوانیی یەکێتیی سۆڤیەت توانییان زورتر لە ۳ ساڵ لە شەڕی سەختی ناوخۆدا بەرگری بکەن، بەلام لە تشرینی دوەمی ۱۹۳۷ دا مەدریدی پایتەخت داگیر بکات و لە سەرەتای ۱۹۳۹دا سەرکەوتنی تەواو بە دەست بهێنێ! بەلام ۳ ساڵ زیاتر ئیسپانیا کرا بە گۆڕەپانی شەڕی سۆڤیەت و فاشیزم و

ئەنجامەکەشی بە کوژرانی نزیکەی نیو ملیۆن ئیسپانی و وێرانکردنی وڵات و لە سێدارەدانی شاعیرو روناکبیری گەورەی ئیسپانیا (لۆرکا) و بۆردومانی درندانەی ئەلمانیا لە شاری (جێرنیکا ) تەواو بوو ، بەمەش سەردەمی دیکتاتۆری (فرانکۆ) دەستی پیکرد!

روسیا پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر کەوتە ناو شەڕێکی ناوخۆی خوێناویی سەختەوە، کە لە ١٩١٧ تا ١٩٢٣ ی خایاند! دوای رووخاندنی دەسەلاتی سیاسیی روسیا، دەسەلاتداران و هێزەکانیان و پارێزکارانی روسیا لە رووی بەلشەوییەکاندا بەرگرییان لە خۆیان و دەسکەوتەکانیان کرد و شەڕی ناوخۆ لە نیوان لەشکری سووری بەلشەویک و لەشکری سپی پارێزکاراندا نزیکەی ٦ ساڵ ئەو وڵاتە و گەلانی سۆڤیەتی لە زیان و کارەسات و وەیشومەی شەڕی ناوخۆوە گلاند. بەمەش ئاگری شەڕی ناوخۆ پانتاییەکی فراوان و زۆری ناوچەکانی گرتەوە! مارتی سالی ١٩١٨ بۆلشەویک بە سەرکردایەتی (لینین)، بۆ دەربازکردنی روسیا لە جەنگی جیهانیدا، پەیمانێکی لەگەڵ ئەڵەمانیای نازی مۆر کرد و بەو پەیمانەش دانی نا بە سەربەخۆیی روسیای سپی و لاتڤیا و فنلەندا و ئۆکرانیا! ئەو کارەش زەمینەی بەرهەڵستی هێزەکانی پارێزگارانی خۆشتر کرد و ئاگری شەڕ کەوتە سیبەریا، ئۆکرانیا و لیتوانیا و بیلە روسیا و شارەکانی خوارووی لێواری شاری پەترۆسبورگ (لینینگراد) و خارکۆف و زیاتر لە پێنج ساڵی خایاند و بە کوژرانی یەک ملیۆن و نیو سەرباز و سەدان هەزار کەس لە خەڵکی بێ تاوان و وێران کردنی باری ئابووری و کۆمەلایەتیی وڵات کۆتایی هات!

زۆر وڵاتی تری وەک ئێرلەندە و یۆنان و نێجیریا و و چین و ئەندەنۆسیا و.. هتد، دوچاری شەڕی ناوخۆ و ماڵوێرانی بوونەتەوە. بەلام نە بۆ ئەوانەو نە بۆ کوردستان هیچ پاساوێک، وەیشومە و زیانەکانی شەڕی

ئەنجامەکەشی بە کوژرانی نزیکەی نیو ملیۆن ئیسپانی و وێرانکردنی وڵات و لە سێدارەدانی شاعیرو روناکبیری گەورەی ئیسپانیا (لۆرکا) و بۆردومانی دڕندانەی ئەلمانیا لە شاری (جێرنیکا ) تەواو بوو ، بەمەش سەردەمی دیکتاتۆری (فرانکۆ) دەستی پێکرد!

روسیا پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر کەوتە ناو شەڕێکی ناوخۆی خوێناویی سەختەوە، کە لە ١٩١٧ تا ١٩٢٣ ی خایاند! دوای رووخاندنی دەسەڵاتی سیاسیی روسیا، دەسەڵاتداران و هێزەکانیان و پارێزکارانی روسیا لە رووی بەلشەوییەکاندا بەرگرییان لە خۆیان و دەسکەوتەکانیان کرد و شەڕی ناوخۆ لە نێوان لەشکری سووری بەلشەویک و لەشکری سپی پارێزکاراندا نزیکەی ٦ ساڵ ئەو وڵاتە و گەلانی سۆڤیەتی لە زیان و کارەسات و وەیشومەی شەڕی ناوخۆوە گلاند. بەمەش ئاگری شەڕی ناوخۆ پانتاییەکی فراوان و زۆری ناوچەکانی گرتەوە! مارتی سالی ١٩١٨ بۆلشەویک بە سەرکردایەتی (لینین)، بۆ دەربازکردنی روسیا لە جەنگی جیهانیدا، پەیمانێکی لەگەڵ ئەڵەمانیای نازی مۆر کرد و بەو پەیمانەش دانی نا بە سەربەخۆیی روسیای سپی و لاتڤیا و فنلەندا و ئۆکرانیا! ئەو کارەش زەمینەی بەرهەڵستی هێزەکانی پارێزگارانی خۆشتر کرد و ئاگری شەڕ کەوتە سیبەریا، ئۆکرانیا و لیتوانیا و بیلە روسیا و شارەکانی خوارووی لێواری شاری پەترۆسبورگ (لینینگراد) و خارکۆف و زیاتر لە پێنج ساڵی خایاند و بە کوژرانی یەک ملیۆن و نیو سەرباز و سەدان هەزار کەس لە خەڵکی بێ تاوان و وێران کردنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی وڵات کۆتایی هات!

زۆر وڵاتی تری وەک ئێرلەندە و یۆنان و نێجیریا و و چین و ئەندەنۆسیا و.. هتد، دوچاری شەڕی ناوخۆ و ماڵوێرانی بوونەتەوە. بەڵام نە بۆ ئەوانەو نە بۆ کوردستان هیچ پاساوێک، وەیشومە و زیانەکانی شەڕی

ناوخۆ پینە ناکات و بۆ هیچ لایەک ئەگەر مایەی شەرمەزاری و خەمباری نەبێت، مایەی شادی و جوامێری نییە! بۆ گەلی بندەستی کوردیش، ئەو هەموو زیانە گەورانەی، کە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆوە بەر جووڵانەوەی گەلەکەمان کەوتووە، ناتوانێ هیچ شانازییەک بۆ هیچ لایەنێ تۆمار بکات!

لەکوردستاندا هۆی سەرەکی شەڕی ناوخۆی لایەنەکان بریتییە لە :

* نەمانتوانیوە و ناتوانین بەشێوەیەکی شارستانی و ژیر و هێمن و بە ڕێگەی ئاشتی و لەسەرخۆ و دوور لە دەمارگیریی حیزبی و شەخسی ناکۆکیی و ململانێکانمان چارەسەر بکەین! بەڵکو بەشێوەیەکی ناپێشکەوتووانە و توورەیی و لە غیابی عەقڵدا، بیر لە بەلادا خستنی کێشەکان و چارەسەریان دەکەینەوە!

* هێشتا نەگەیشتووینەتە ئاستی پێویست و هێشتا لە رووی سیاسی و هۆشیاریی نەتەوەیی و شارستانی و روناکبیریەوە پاشکەوتوو و دواکەوتووین!

* دیموکراتیەت و ژیانی دیموکراتیمان تەنها بە سەرزارەکی قبووڵ کردوە و هەر لایەنەمان خۆمان بە سەروەر و خاوەنی وڵات و گەلەکەمان دەزانین، نەک بە خزمەتکاری گەل و بە تێکوشەری ڕێی رزگاریی گەل و نیشتمان!

* نەمانتوانیوە یەکتر قبووڵ بکەین و ڕێز لە یەکتر و لە هاوکاریی یەکتر و لە بیروڕای یەکتر بگرین! عەقڵیەتی کۆیخایەتی بەسەر هەمووان‌دا زاڵە و هەرلایەک تۆزێک هەستی بە باڵادەستی کرد، ئیتر هەوڵی خۆسەپاندن دەدات و بەسەر ئەوانی تردا و خۆی لێ دەبێتە پارتی پێشرەو و بڕیار بەدەست!

لەبەر ئەوانە لە رابوردوودا نە بەشێوەیەکی راست و دروست کارمان

کردوه و نه ئێستاش توانیومانه بەگوێرەی پرەنسیپ و پێویستییە نیشتیمانی و نەتەوەییەکانی ناو ماڵی کوردستان کار بکەین و خۆمان ڕێکخەین و ڕێز لە یەکترو لە بیروڕاو مافی یەکتر و لە شکۆ و بەهاکانی خەباتی یەکتر و گەلەکەمان بگرین! تا بتوانین گەلەکەمان بەرە و ئەزموونێکی دیموکراسیی ڕاستەقینە و دامەزراوەی سیاسی و یاسایی بەرین! دیارە ئەمانەش هەموو بە زیانی گەلەکەمان شکاوەتەوە!

* بە درێژایی سالانی شەڕی برا کوژی، هەر لایەنە و لەشکری خۆی هەبووە و لە باتی بە هێزو توانای بیری گەش و قەڵەمەوە لە رووی یەکتردا بووەستین و مشتومڕ بکەین، کەچی بە لوولەی چەک و بە زەبری هێزی سەربازی ناکۆکییەکانمان بەلادا خستووە! ئەو واقیعەش ئارەزووی پاوان کردن و زاڵ بوونی لایەکی بە سەر لایەکی تردا، زۆرتر کردووە و ئەمەش زەمینەیەکی ساز و لەباری هەمیشەیی بۆ شەڕی ناوخۆ ساز کردووە!

* بە داخەوە بە گەورە و بچووکەوە، هەموومان خەتامان بە کۆڵی یەکتردا داوە و هێندەی شانازیمان بە سەرکەوتن بەسەر نەیارەکانی ناوخۆدا و بەسەر یەکتردا کردووە، نیو هێندە شانازیمان بە یەکخستنی وزە و توانای گەلەکەمان و بە سەرکەوتنی گەلەکەمان بەسەر دوژمنانی ئازادی و دیموکراسیدا نەکردووە! بۆیە بە درێژایی سالانی ١٩٦٤ - ١٩٧٠، شەڕی ناوخۆی نێوان لایەنەکانی جووڵانەوەی کورد، لە نێوان (جەلالی و مەلایی)، بووە سەرەتایەکی ناشیرین و بەدناو لە شەڕی ناوخۆی برا کوژییدا! چونکە ئەو شەڕە هەم کاری سەلبی و ناشیرینی کردە سەر لایەنەکان، هەم درێژەی کێشا و دەستاو دەست بە میراتی بۆ نەوەی نوێ مایەوە! ئەمەش دواجار بە قازانجی داگیرکەرانی کوردستان شکایەوە!

سەرەتای دزێوی ئەو شەڕە ناوخۆیە بوو، کە بە زیانێکی گەورە لەسەر سروشت و ڕەوشی سیاسیی لایەنەکان بەرێ کرا و هاوکات بیانووی ناڕەوای بە لایەنەکان دا، کە هەڵوێست و مومارەسەی نابەجێ بە قازانجی داگیرکەرانی کوردستان و دژی ویستی گەلەکەمان بکەن! ئێمە هەموو (کۆمەڵە)، لە سەرەتای دامەزراندنیەوە، دژی کارە خراپەکان و شەڕی ناوخۆ بووین! ناشیرینترین ڕەفتاری سیاسی لای ئێمە ئەوە بوو، کە جیاوازیی فیکری و سیاسی لە ریزەکانی گەل و لە ناکۆکییەکانیاندا بە زەبرو زەنگ چارەسەر بکرێت! بۆیە زۆر لامان سەیرو سەمەرە بوو، کە ئێمە بتوانین لەگەڵ دوژمانی گەلەکەمان کۆک بین و کەچی لەگەڵ خۆمان و یەکتردا ناکۆک و دوژمن بین، بە جۆرێ کار بگاتە ئەوەی لەشکر کێشی دژی یەکتر و شەڕی برا کوژیمان لە گفتوگۆ و تەبایی پێ باشتر بێت! بۆیە ئێمە هەرگیز نەمانویستووە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان میراتی ناشیرینی ئەو یەکتر کوشتن و یەکتر سڕینەوەمان بەر بکەوێت و بکەوینە لایەکی شەڕی ناوخۆوە! بەڵام نایشارینەوە ئەو عەقڵیەت و ئاکارە دزێوانە و ئەو واقیعە پڕ ناکۆکییەی گەلەکەمان، دوور لە ویستی خۆمان، ئێمەشی هاوێشتە کوورەی ئاگری شەڕی برا کوژی و شەڕی ناوخۆوە! بەوەش ئێمە بمانەوێ یا نەمانەوێ، لە ڕۆژگار و لە سەردەمێکدا بووینە هۆی زیانیکی گەورەی مرۆیی و سیاسی و ئابووری لە گەلەکەمان و لە دۆزە ڕەواکەی! ئۆباڵی ئەو خەتایە و لێپرسراوێتیی ئەو ململانێ دزێوەش بە تەنها لە ئەستوی هیچ لایەن و هیچ سەرکردەیەکدا نییە و هیچ کەس بە تەنها لەو مەینەتییانە بەر پرسیار نییە! بۆیە ڕەوای هەق نییە کەسمان ئەو لێپرسراوێتییە لە ئەستۆی خۆمان داماڵین و بیخەینە گەردنی ئەم یا ئەو سەرکردەیە! بەڵکو ئێمە پێکەوە و هەموومان شەریکی چاکە و

خراپەکانین و شەریکی هەڵە گەورەکانیشین!
راستە لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا لە سالانی ١٩٧٦ تا ١٩٧٨، لە شوێنە جیا جیاکاندا، جارجار پێکدادان و هەڵپژان و شەڕی ئەم دەستە و ئەو مەفرەزیە روویدەدا، بەڵام لە (هەکاری)دا، گەیشتە ئاستێکی دزێو و ناخۆش و گەیشتە ئاستی لەناوبردنی زۆرترین ژمارەی سەرکردەی هێزی نەیار! بەوەش چەند ساڵێکی تر ئاگری شەڕ رووی کردە سەرلەنوێ پێکدا هەڵپژانی مەفرەزەکانی خوارەوە تا کڵپە سەندنی ململانێکانی حسک لە (سێکانیان)ی دۆڵی جافایەتی لە ناوچەی سلێمانی!

## ڕووداوی سێکانیان!

لە کۆبوونەوەکانی برادۆستەوە سەرکردایەتیی (یەکێتی)، کۆبوونەوەیەکی فراوانی بۆ نەکرابوو، تا بتوانێ بە ڕاشکاوی گرفتە ڕێکخراوەییەکانی خۆی و پەیڕەوێکی هاوچەرخ پیادە بکات و نەخشەیەکی هەمە لایەنە بۆ گەشەکردنی خۆی و چالاکییەکانی دابنێ! لەبەر ئەوە کۆبوونەوەی فراوانی ١٢ تا ١٨ مارتی ساڵی١٩٨٠ ی سەرکردایەتی (یەکێتی)، ئەگەرچی سەرکەوتوو نەبوو لە پەسەند کردنی پەیڕەوێکی ناوخۆی ڕێکوپێک کە بتوانێ نەخشەی کار بۆ دەزگاکانی (یەکێتی) و پەیوەندییە ناوخۆییەکانی و دەسەڵاتەکان دیاری بکات و بەرچاو ڕوونی بۆ تێکۆشەرەکانی دروست بکات! بەڵام لەبەر ڕۆشنایی ڕاپۆرتێکدا کە (مام جەلال)، ئامادەی کردبوو بەناوی (جۆشدانی خەبات)، توانرا هەوڵ بدرێ بۆ پتەوکردنی هەموو تواناکانی (یەکێتی) و هێزەکانی و گرنگییەکی زۆرتر بە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، بەتایبەتی لە (سلێمانی و هەولێر و کەرکووک)، بدرێت! ئەوەش یەکێک

بـوو لـه راسـپاردەکانی ئـەو کۆبونەوەیـە!
لـە کۆتایـی تەممـوزی سـاڵی ١٩٨٠ دا، لـە کۆبوونەوەیەکـی (ناوەنـدی کۆمەڵـە)و دواتریـش لـە مەکتەبـی سیاسـی (یەکێتـی)دا، بـاس لـەوە کـرا، کـە هێزێـک رەوانـە بکرێ بـۆ ناوچەکانـی دۆڵـی جافایەتـی و سـنووری هەرێمـی ٢ کـە (جەمالـی علـی باپیـر)، فەرماندەکـەی بـوو! تەنانـەت قسـە و باسـێکیش لـە ئـارادا بـوو بـۆ ئاڵوگـۆر پێکردنـی و بڕیـار درا (مـەلا بەختیـار)، سـەرکردایەتیی ئـەو هێـزە بـکات و ئەرکەکانـی جێبەجـێ بـکات. (مـەلا بەختیـار) هێزەکـەی (جەمالـی علـی باپیـر)ی لەگەڵـدا بـوو. هێزەکانـی (حسـک) یـش لـەو ناوچەیـە فەرماندەکەیـان (شـێرکۆی شـێخ عەلـی) بـوو. ئـەو ناوچەیـەش وەک هەمـوو شـوێنەکانی تـر، زۆر جار ناکۆکیی و ململانێی نابەجـێ رویـی تێدەکـرد، بـەلام سـەرکردایەتیی (یەکێتـی)، هەوڵـی دەدا بـە رێگـەی ئاشـتی و هێمنانـە چارەسـەریان بکات، ئیتر (جەمالـی عەلـی باپیر)، بۆ بەرقـەرار کردنی ئاشـتی و بە پیرەوە چوونـی داواکەی سـەرکردایەتی بە میوانـی دەچێتـە کانـی رەشـی سـێکانیان! بەداخـەوە لەباتـی ئـەوەی، کـە بتوانـن بـە هێمنـی و لەسـەر پێکـەوە هەڵکـردن رێککـەون، کەچـی دەبێتـە دەمـە قاڵـێ و پێکـدا هەڵپـژان و شـەڕ، لـە ئەنجامـدا رۆژی ١٩٨١/٨/٢٣ ( شـێرکۆ و جەمـال) یەکتـر شـەهید دەکـەن و ١٠ پێشـمەرگەی تریش دەبنـە قوربانـی و تێکـرا لـە هـەردوو لا ١٢ شـەهید و ٩ بریـندار، ئاگـری شـەڕ و ململانێـکان هێنـدەی تـر گـەرم دەکـەن و بەمـەش شـەڕە بەیاننامـە دژی یەکتـر دەرگای بـۆ ئـاوەڵا دەبێـت و زمانـی زبـر و میـل راکێشـانی چـەک لـە یەکتـر، شـوێن بـە ئاشـتی و زمانـی هـاوکاری لێـژ دەکات!
(حسـک) بـە سـەرکردایەتی (سـەید کاکـە)، هێزێکـی نـاردە دۆڵـی جافایەتـی و لـە چەنـد شـوێنێکی جیاجیـادا پەلامـاری هێزەکانـی یەکێتیـان دا و (یەکێتـی)ش هێزیکـی هەرێمـی ٥ ی قەراخـی نـاردە هـاوکاری هێزەکـەی

(یەکێتی)، لە دۆڵی جافایەتی توانیان هێزەکەی (سەید کاکە)، ناچار بکەن بگەڕێتەوە ناوچەی خۆشناوەتی! لە خۆشناوەتی و لە بەری کۆیە و لە بەستی شەرغە چەند جارێک هێزەکانی هەر دوولا دەچوونە سەر یەکتر و لە کوێ فرسەتیان لەیەکتر بهێنایە پەلاماری یەکتریان دەدا و پێشمەرگەی یەکتریان چەک دەکرد! ئیتر ماوەیەک کاری هێزەکەی (حسک)، بووبوو بە چەک کردنی پێشمەرگەی (یەکێتی) و هێزەکانی ئێمەش وەک ئەوان هەرچیان بۆ بکرایە درێخییان نە دەکرد!

بەرە بەرە دوای خۆ رێکخستنی هێزەکان لەناو هەردوو بەرەی (جود) و بەرەی (جوقد)ا، تادەهات ململانێی دوژمنکارانە لە نێوان هێز و لایەنەکانی کوردستاندا تینی دەسەند، تا لە ساڵی ١٩٨١ ە وە کار گەیشتە ئەوەی، کە لایەنەکانی (جود) گەلە کۆمەکێ لە (یەکێتی)، بکەن بە مەبەستی لاواز کردنی و تەنگ پێ هەڵچنینی و بە نیازی خۆ سەپاندنی لایەنەکانی (جود) بەسەر (یەکێتی)دا! کە لە ئەنجامدا ئەو شەڕ و ململانێ ناوخۆییانە بە خوێنی دەیان پێشمەرگە و فەرماندەی قارەمانی کورد تەواو بوو!

دیارە (یەکێتی)ش بێ خەتاو بێ هەڵە نەبووە! لە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی و گەرمیان حەزی بە پەرەسەندنی هێزەکانی تر نەبوو! بۆیە سەرکردایەتیی (یەکێتی)، نەیتوانی سەرکەوتوو بێت لە خاو کردنەوەی لایەنەکانی تردا و نەیتوانی بۆ هاوکاری و برایەتی ڕایانکێشێ. دەمارگیری و زمانی زبری هەندێ لە مەفرەزە و کادیر و فەرماندەی (یەکێتی)ش شتێکی ئەوتۆی لەزمانی لایەنەکانی (جود) کەمتر نەبوو! زۆرجار لە ئاستەکانی خوارەوە و لە ناوچە دوورە دەستەکانی سەرکردایەتی، هەڵەی فەرماندەکانی خوارەوە، سەرکردایەتیی (یەکێتی) بۆ دۆخێکی ئاڵۆز و شەڕاوی کێش دەکرد! لام وایە ئێمەی سەرکردایەتی ئەگەر

هێمنتر و دانا تر و دووربینتر بووینایە، دەمانتوانی بە حیکمەتێکی زۆر ترەوە بەر بەو پەلکێش کردنانە بگرین، کە بەزۆر رایان دەکێشاین بۆ شەڕ و ململانێ! بۆیە دەبوو ئێمە لای خۆمانەوە گێچەڵ و کاری نابەجێی هێزە نەیارەکان، بەرەورووی ئەقڵێکی ئارام و پشوو درێژ بکەینەوە و کۆنترۆڵی رووداوەکان لە دەست نەدەین و رێگەی تەمێکردنی تێکۆشەرەکانی لایەنەکانی تر نەگرینە بەر!

## کێوە ڕەش و پیرانە ڕەشە!

پاش پەلاماردانی (پارتی) بۆ قەڵاتووکان و هێنانی هێزەکانی لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٠ بۆ هەڕەشە لە بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتیی (یەکێتی) بۆ دۆڵەتوو، توانرا بە وتویژو بە ئاشتی چارەسەر بکرێت و بە شێنەیی لەو ناوچانە بکشێنەوە و مەترسی شەڕ لەگەڵ هێزەکانی (پارتی)، لە ئارادا نەمێنێ! بۆیە بڕیاردرا ئەو هێزانەی، کە بۆ پاراستنی سەرکردایەتی کۆمان کردبوونەوە ڕەوانەیان بکەینەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان و بە گوێرەی نەخشەیەک ئاراستەیان بکەین بۆ:

* ڕاگەیاندنی بەرەی (جوقد)، کە جگە لە هێزە عەرەبییەکان (پاسۆک و حسک و حیزبی شیوعی)شی تیا کۆبوونەتەوە و ئەو بەرەیە و ئەرکەکانی بۆ هێز و ڕێکخراوەکانی ناوچەکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی باس بکەین!

* جۆش و خرۆشێک بدەینە هێز و ڕێکخراوەکانمان و جەماوەری ناوچەکە و هانیان بدەین بۆ هەرچی زیاتری خەبات و تێکۆشانە دژی

ڕژێمـی بەعـس!

* چالاکیی پێشمەرگانە  بە شێوەیەکی فراوانتر و کاریگەر تر لە هەموو شوێنەکان ئەنجام بدرێ!

ناوەڕاستی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٠، هێزێکی هەولێر لەگەڵ ملازم (سەید کەریم)، بەرەو ناوچەکانی هەولێر دەڕۆیشتن، کە (عومەری سەید عەلی و جەمیل رەنجبەر) و ژمارەیەک فەرماندەی سیاسی و عەسکەری تریان لەگەڵدا بوو، منیش لەگەڵ (غەریب سەعید و مام رۆستەم) و فەرماندەکانی کەرکووک و گەرمیان پێکەوە لەگەڵ هێزەکەی تر بە نیازی سەردانی قەلاسێوکە و دەشتی کەرکووک و هەندێ لە هێزەکەش بۆ گەڕانەوە بۆ بەری قەراخ و گەرمیان، روو لە قەلاتووکان کەوتینە رێ! شەو ئەو هێزە زۆرە  لە قەلاتوکان لە ناو بەفرا بە ئاگر کردنەوە و هەڵپەرکێ رۆژیان کردەوە. بەرەبەیان بوو نزیکەی دوو سەعاتێ دەبوو، کە لە کیسە خەوێکدا خەوتبووم، (غەریب سەعید)، خەبەری کردمەوە! هێشتا ئاگری ئەو مورە گەورەیەی دارە شەخسەکان، کە کردبوومانەوە تینی بە چەند مەترێک دەگەیشت، هەندێ گونکی هەویری هێنابوو بە خرە بەردەکانی گوێ ئاگرەکە بیان برژێنێ، کەوتە قسە وتن بە هێزەکانی (پارتی) و وتی: ئەو بێ ویژدانانە ئاردەکانیان هەڵڕشتۆتە سەر خاک و خۆڵی  ژور و هەیوانی بارەگاکان و بە پێلەقەش تێی کەوتوون، ئەوە خەپلەتان بۆ دەکەم بیخۆن، بەلام لە خۆڵ و زیخەکەی ببورن! منیش پێم وت: دەەتەوێ لە شەڕ و کوشتاری یەکتریدا، بە سینی پلاو و گۆشتت بۆ بەجێ بهێڵن! بەشی یەکەمی هێزەکەمان بەسەرکردایەتیی (سەید کەریم)، کەوتنەڕێ و ئێمەش پاش ماوەیەکی کەم بەدوایدا رۆیشتین. بۆ پشوو خەوتنی شەو لە گوندی ماخوبزنان ماینەوە و بەیانییەکەی کە

ڕێکەوتی ١٩٨٠/١١/١٨ بوو، هێشتا بە ڕێگەوە بووین دەنگی فڕۆکەی هێلی کۆپتەر ئیستی بە هێزەکەمان کرد! خۆمان بۆ پێشهاتەکەی ئامادە کرد و هەر بەشە بۆ خۆی پێشمەرگە و چەکی کردەی ناردە سەر بەرزاییەکان، بەڵام فڕۆکەکان لە کێوە ڕەش بەمدیودا نەهاتن! کە ئێمە گەیشتینە گوندەکانی مەمک و جەلکان تێگەیشتین، کە ڕۆژی ڕابوردوو هێزێکی (عەبدوڵا سوور)، لەو ناوە چالاکییەکی دژی جاشەکان ئەنجام داوە و ئەم کۆپتەرانەش بە شوێن ئەو ڕووداوەدا هاتوون، شوێن (عەوڵا سوور) بکەون، بەڵام بە نا ئومێدی گەڕانەوە!

هاوڕێیان (سەید کەریم و عومەری سەید عەلی) و هێزەکەیان چوونە گوندەکانی بناری شاخی کێوە ڕەش تا لە پیرانە ڕەشە پشوو بدەن! منیش لە زەنگۆلان و جەلکان و مەمکان لەگەڵ هێزەکەمان مامەوە تا پشوویەک بدەین. پاش نیوەڕۆ بوو (غەریب) ناوێک، کە لەگەڵ (سەردار)ی پورزامدا لە دەرەوەی خانووەکە حەرەس بوون و منیش نامیلکەیەکم دەخوێندەوە، خۆیان کرد بە ژووردا و وتیان دەنگی کۆپتەر دێت! ئیتر بە پەلە قەدی شاخەکەمان گرت و لەگەڵ (مام ڕۆستەم و غەریب سەعید)، ڕێک کەوتین، کە پێشمەرگەکان لەبن دارەکاندا خۆیان قایم بکەن و بەرزاییەکان بگرن و بە ئەندازەی پێویست بە هەموو چەکێک تەقە لە کۆپتەرەکان بکەن! ئیتر هێندەی نەبرد کۆپتەرەکان لە ئێمە ڕەت بوون، بەڵام لە نزیک پیرانە ڕەشە دەنگی تەقەی کۆپتەرەکان دەهات. کەوتمە نیگەرانی و چەند پێشمەرگەیەکمان بە وریایی نارد بۆ پیرانە ڕەشە بۆ لای هاوڕێکانمان. پاش کشانەوەی کۆپتەرەکان خێرا خۆشمان بەڕێکەوتین بۆ لایان، لەوێ تێگەیشتین کە شەهید و بریندارى زۆریان هەیە و ٩ شەهیدو ١٢ بریندارمان لەو شەڕەدا لێکەوت، کە (جەمیل ڕەنجبەر)، لە شەهیدەکان و (عومەری سەید عەلی

و سـابیر ڕەسـول)یش، لـە برینـدارەکان بـوون! سـەرێکم لـە تەرمەکـەی شـەهید (جەمیـل ڕەنجبـەر)دا، کـە چـاوم پێـی کـەوت هەمـوو ئـەو هیـواو ئاواتانـەم بیرکەوتـەوە، کـە ئـەو شـاعیرە لاوە بـۆ ئایندەی کوردسـتان و (کۆمەڵـە) هەیبـوو، بـە دەم ژانـی خەمێکـی تاڵـەوە چوومـە لای (عومـەر)، تەماشام کرد هەموو پشتی پارچەیە و بووە بە بێژنگ، بەلام بێ دەنگ و ئـازا ئۆقـرەی گرتبـوو! (عومـەری سـەید عەلـی)، تێکۆشـەرێکی پشـوو درێـژی کوردایەتـی و سـەرکردەیەکی ئـازا و نەبـەزی (کۆمەڵـە) بـوو، پیاوێکـی پـاک و دڵسـۆز، بـە هەمـوو توانـای لەگـەڵ بیـرو ڕێبـازی چـەپ و ڕەنجدەرانـی کوردسـتاندا بـووە! سـەرەڕای برینـە قورسـەکەی خـۆی، کەچی خەمـی هاوڕێکانـی تـری بـوو یـەک یـەک هەواڵـی دەپرسـین! دکتـۆر (سـاجید)، بـۆ تیمـار کردنـی برینـدارەکان بەجێمـا و (سـەردار) و چەنـد کەسێکیشـمان بـە دیـار (عومـەری سـەید عەلـی) یـەوە بەجـێ هێشـت و لەگـەڵ (سـەید کەریـم)، چوویـن بـەلای ناشـتنی شـەهیدەکانەوە و تەگبیـر لـە دەربـاز کردنـی برینـدارەکان و گەیاندنیـان بـە شـوێنێکی ئەمینتـر بکەیـن، چونکـە ئەگـەری هێرشـی جـاش و پەلاماردانمـان زۆر بـوو!

لـە حاڵـی (عومـەری سـەید عەلـی) تێگەیشـتین، کـە دەبێـت بـە پەلـە بگاتـەوە سـەرکردایەتی تـا لـە ئێـران تیمـار بکرێـت! (سـابیر ڕەسـوڵ) یـش، بـە خەسـتی برینـدار بووبـوو چاوێکیشـی لەدەسـت دابـوو! لەگـەڵ (سـەید کەریـم و عەلـی نەبـی)، ڕێکەوتیـن، کـە (عەلـی نەبـی) ئـەو کارە بگرێتـە ئەسـتۆ و منیـش بـە هێزێکـی باشـەوە لەگـەڵ (مـام ڕۆسـتەم و غەریـب سـەعید)، بەڕێککەوتیـن بـۆ قایمکردنـی شـاخی کێـوەڕەش و دابینکردنـی ئاسایشـی پەڕاندنـەوەی برینـدارەکانی تـر بـۆ دۆڵـی شـاور! ئێـوارە لەگـەڵ تاریـک بوونـدا گەیشـتینە سـەر شـاخ، (مـام ڕۆسـتەم)، لێـی پرسـیم.. ئاگـر بکەینـەوە؟ پێـم وت..چەنـد بۆتـان دەکرێـت لـە هەمـوو قوتەیـەک ئاگـر

بکەنـەوە، بـا دوژمـن هێزەکەمـان لـەوەی کـە هەیـە، بـە زۆرتـر بزانـێ!
(عومـەری سـەید عەلـی)، بەڕێکـرا و یـەک لـەدوای یـەک بریندارەکانیـش بە ڕێکران بەرەو سـەرکەپکان و دۆڵـی شـاور، بە درێژایی ئەو شـەوەش ئێمـە بەپێـوە بوویـن و چاودێـری دەزگا بێسـیمەکانی دوژمـن و جمـو جوڵەکانیانمـان دەکـرد! ئـاگادار بوویـن جاشـەکان بـە یەکتریـان دەوت.. هێزەکـەی پێشـمەرگە هێزیکـی زۆر گەورەیـە و بـەو شـەوە هیـچ ناکـرێ! سـەر لەبەیانـی زوو ئێمـەش کەوتینـە ڕێ بـەرەو سـەرکەپکان، لـەوێ لـە ماڵێک دامەزراین و نـان و چایەکمـان خـوارد، ئیتر دێ بـە دێ کەوتینـە ڕێ تـا گەیشـتینە قەڵاسـێوکە. (سـەید کەریـم) و هێزەکەشـی بـەرەو بالیسـان ڕۆیشـتن!
لـە ١٩٨٠/١١/٢٣ لـە گونـدی عەسـکەر لەگـەڵ (علـی بچکـۆل)، کـە تـازە لـە جەولەیەکـی فـراوان هاتبـووەوە، یەکمـان گرتـەوە. پاشـان لـەوێ سـەردانی چەنـد گوندێکمـان کـرد بـۆ چاوپێکەوتنـی هەنـدێ لـە تێکۆشـەرەکانی ڕێکخسـتنی نـاو شـار بـۆ ئەنجامدانـی هەنـدێ چالاکـی لـە نـاو شـاری کەرکووکـدا.
زۆری نەخایانـد بـوو کـە لـەو سـنوورەی مەڵبەنـد بوویـن، ڕۆژی ١٩٨٠/١١/٢٨ هەواڵیـان بـۆ هێنایـن، کـە گوایـا ڕۆژی دواتـر ئەگـەری زۆر هەیـە ڕژێمـی عێـراق بـە هێزێکـی گـەورەوە پەلامـاری سـنوورەکە بـدات. ئێمـەش بـە نەخشـەی پێشـمەرگانەی (عەلـی بچکـۆل و غەریـب سـەعید)، ئـەو هێـزەی لـە گەڵمـان بـوو لـە شـوێنە قایمـەکان دامەزرایـن! (غەریـب سـەعید) یـش لوغمێکـی زۆری لەبـەر دەسـتدا بـوو، ئـەو ڕێگایانـەی کـە بـە باشـی دەزانـی هەمـووی لوغـم ڕێـژ کـرد و زۆربـەی مەفرەزەکانیـش لـە سـۆتکەو مایلـە و عەسـکەر مانـەوە! ئـەو شـەوە لـە شـوێن بۆسـەیەکی (عەلـی بچکـۆل)، بـە وریایـی خەوتیـن و سـبەی ئێوارەیەکـی درەنـگ،

بینیمان تەپوتۆزی هێزی دوژمن لە گوندەکانی دامێنی عەسکەرەوە وردە وردە پەیدا دەبوو! هێزەکەش ئێجگار زۆر نەبوو، کە لوغمەکان بە دوو ئۆتۆمبیلی سەرباز هەلگردا تەقیبوونەوە و چەندین سەربازی شەل و کوێر کرد بوو، ئیتر لەترسی تاریکی داهاتن هێزەکە بە شکاوی ناوچەکەی بەجێ هێشت و گەڕانەوە!

## شەڕی قەڵاسنج!

هەر دوای ئەو ڕووداوە ناخۆشەی پیرانە ڕەشە، ئیتر (سەید کەریم) چوو بەلای هێزەکەی خۆیەوە و خەمی بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکە نوێیەی بوو، کە کرابوو بە لێپرسراوی هێزەکانی هەولێر! لە سکتان لەگەڵ (سەید کەریم)، تووشی شەهید (ڕێباز و مامۆستا بکر و مامۆستا کاوە) و هێزەکانیان بووین. لەوێ من قسەم بۆ کردن و لە ناو قسەکاندا باسی شەهید بوونی (جەمیل ڕەنجبەر)م کرد، نەمزانی (سدیق)ی برای، کە تازە هاتووە و لە تەنیشتم دانیشتووە! ئەو قسانەم بۆی بوو بە بروسکەی ئازار و خەفەت و ئیتر ناچار بووم واز لە قسە بێنم و بکەومە دڵدانەوەی ئەو! شەهید (سەید کەریم)، لەگەڵ هێزەکەی خۆی دەستی کرد بە جەولە بۆ دۆڵی بالیسان و نازەنین و دۆڵی سماقولی، منیش لەگەڵ هێزەکەی خۆماندا ڕوو لە کەرکووک بەرەو دەشتی کۆیە ڕۆیشتم!

(سەید کەریم) و هێزەکەی دەستەیەک فەرماندە و هاوڕێی باشی

(کۆمەڵە)یان لەگەڵ بوو (سەفین، ڕێباز، مامۆستا بکر، مامۆستا کاوە، ئازاد خۆشناو، عەلی سالح، فاروق عەلی مەولود و کاوە مەخموری و ئەنوەر) و ژمارەیەکی باشی تر، (کامەرانی برام و حاجی کەمال)یش لەگەڵ (سەید کەریم) بوون لە بناری چیای سەفین! لە ۱۹۸۰/۱۲/۱٤ شەڕێکی گەورەیان لە گوندی قەلاسنج بە سەرکردایتی ملازم (سەید کەریم)، لەگەڵ هێزەکانی ڕژێم و جاشەکاندا کرد، کە زیاتر لە ۸ سەعاتی خایاند. لەو شەڕەدا مامۆستا کاوە و ئەنوەر شەهید بوون و نزیکەی ۱۹ کەسیش لە دوژمن کوژرا و بە شکاوی دۆژمن گەرایەوە! (مامۆستا کاوە)، کادرێکی هەڵکەوتوو و نموونەی ڕەوشت بەرزی بوو، لەو دەورەی کادیرانی سەرکردایەتی، کە لە بارەگای (یەکێتی)، بەڕێوە چوو، یەکەمی دەورەکە بوو، (مام جەلال)، کلاشینکۆفێکی بە دیاری پیشکەش کرد و لە وتاری تەواوبوونی دەورەکەش بۆ ڕێز لێنان لە (مامۆستا کاوە)ی یەکەم وتی: شەهید (کاوە) هێندە چالاک و زیرەک و بە توانایە لەهەر ناوچەیەک، گەر۱۰ کادیری لەم شێوەیەمان هەبێت، دەتوانین سەرکەوتن مسۆگەر بکەین!

لە ڕۆژی ۱۹۸۰/۱۲/۱۷ بە نیازی پەڕینەوە بۆ دۆڵی جافایەتی ڕوومان کردە مایلە و سۆتکە و ئەنجا گەورەدێ، تازەش بەفرێکی تەنک ڕێگەکانی ناخۆش کرد بوو بەهەر حاڵ توانیمان خۆ بگەیەنینە قزلەر و پاشان شۆڕبووینەوە بو گوندی چۆخماخ!

## گرتنی کاک (نەوشیروان)!

هێشتا لە گوندی چۆخماخ بووم، کە زانیم (سالار عەزیز)، لەو ناوە بووە و بەڵام چۆتە شارباژێری ئەو بەر! لەوێ هەواڵێکی سەیریم بیست، گوایا (نەوشیروان مستەفا)، لەگەڵ دوو سێ پێشمەرگەدا چۆتە سنووری هەرێمی یەک لە شارەزور و بێدەنگە! لە نیگەرانی و بیرکردنەوەدا بووم، کە هەواڵم پێ گەیشت پێویستە بگەڕێمەوە بۆ سەرکردایەتی! دەست بەسەر کردنی (نەوشیروان مستەفا)، کارێکی خراپی دوور لە تەگبیری سیاسی و دوژمن کارانە بوو، تووڕەبون لە (حسک) و هەستی دەمارگیری لەلا ورووژاندین، ئەمەش کارێکی خراپی کردە سەر رەوتی رووداوەکان!

لە گوندی بێتوش زانیم، کە لە گوندی سلێمانە دەستەیەک لە پێشمەرگەکانی (حسک)، تەقەیان لە (نەوشیروان)، کردووە، کە تەنها چەند کەسێکی کەمی لەگەڵ بووە! پاشان لە گوندی هۆزخواجە لەو کاتەدا کە سەردانی (تایەری عەلی والی بەگ)ی کردووە و میوان بووە

لای ئەو، لە لایەن (حسک )ە وە گیراوە و ئێستا لای (حسک )ە لە شاخی سووڕێن! سۆراخی هەواڵم کرد زانیم (مەلا بەختیار و سالار عزیز)، بە هێزێکی زۆرەوە لە دەورو بەری ناوچەکەن و هەرچییان بۆ بکرێت بۆ ئازاد کردنی کاک (نەوشیروان) دەیکەن! ماوەتەوە بچین بە رێگەی سیاسی و هێمنانە چارەسەری بکەین و نەهێڵین ببێ بە شەڕ و خوانەخواستە لەو شەڕەدا بیفەوتێنن! بۆیە بە پەلە خۆم گەیاندەوە سەرکردایەتی لە ناوزەنگ، لەوێ سەرکردایەتی لە رێگەی (عزیز محەمەد) و سەرکردایەتیی حیزبی (شیوعی) یەوە کەوتە تەقەلا بۆ دۆزینەوەی رێگەیەک بۆ ئازاد کردنی و بەیاننامەیەکیش لەبارەی گرتنەکەی و شوێنەوارە خراپەکانیەوە دەرکرا! سەر ئەنجام حیزبی (شیوعی) ئاگاداریان کردینەوە، کە گوایا سەرکردایەتی (حسک)، بڕیاری ئازاد کردنیان داوە. لەبەر ئەوە شاندێک لە (یەکێتی)، کە پێکهاتبوو لە (جەمال حەکیم و دارا حفید) و لە حیزبی (شیوعی)ش، (قادر رەشید) و یەکێکی تر، نامەیەکی سەرکردایەتی (حسک) یان، برد بۆ (تایەری عەلی والی بەگ)، بۆ ئەوەی بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی خۆیان جێبەجێ بکات! بەڵام لەوێ لەباتی بەو بڕیارەی مەکتەبی سیاسیی خۆیان کار بکەن و (نەوشیروان) ئازاد بکەن، داوایان لە (جەمال حەکیم) کرد بوو، کە دەبێت ١٠٠ تفەنگیان بدەنێ، ئەویش لەبەر ناسکی بارو دۆخەکە ئەو مەرجەی قبوڵ کرد بوو، گەڕابووەوە لای هێزەکانی خۆمان تا تەگبیری کۆکردنەوەی چەکەکان بکەن! لە هەمان کاتیشدا بڕیار دەدەن (نەوشیروان)، بگوێزنەوە بۆ بانی شار و رەنگە تەسلیم بە (پارتی) بکەن!

(نەوشیروان مستەفا) لە ترسی نیاز خراپی (حسک). بیر لە راکردن دەکاتەوە، ئیتر بە هاوکاری (کاوەی شێخ لەتیفی حەفید)، دەرفەتێک

دەدۆزنـەوە و نیـوە شـەوێ خـۆی دەربـاز دەکات و خـۆی دەگەیەنێتـەوە نـاو هێزەکانـی خۆمـان و لـە ١٩٨١/١/٢٧دا، گەیشـتەوە خـڕی ناوزەنگ!بـە هاتنـەوەی کاک (نەوشـیروان) پێشـمەرگە و لێپرسـراوەکان کردیـان بـە ئاهەنـگ و شـادی! (نەوشـیروان مستەفا)، بـە کـردەوە سـکرتێری (کۆمەڵـە) بـوو، تێکۆشـەریکی خۆشەویست و پیاوێکـی گرنـگ بـوو لـە نـاو (کۆمەڵـە) و (یەکێتـی)دا، بۆیـە بـە دەربـاز بوونـی خوشـی و شـادیەکی زۆری لای سـەرجەم ئەنـدام و کادیرەکانـی (کۆمەڵـە) و لەنـاو پێشـمەرگە و فەرماندەکانی(یەکێتـی)دا خسـتەوە! بـەڵام لەپـای ئـەو کارەدا، داخێکـی زۆر لـەو رەفتـارەی (حسـک)، هەبـوو! ئـەوەش کارێکـی وای کـرد بـوو، کـە پێشـمەرگەکانی (یەکێتـی) لێـو لـە (حسـک) بکـرۆژن!

کـە دەرفـەت پەیـدا بـو (نەوشـیروان)، چیرۆکـی رۆیشـتن و کەوتنـە داوەوەی، کـە بـە درێـژی لـە کتێبـی (پەنجـەکان یەکتـری ئەشـکێنن - دیـوی نـاوەوەی رووداوەکانـی کوردسـتانی عیـراق ١٩٧٩-١٩٨٣ )دا، ئـەو داسـتانەی نووسـیوە و بـەم جـۆرە بـۆی گێڕاوینەتـەوە:

(زۆر لـە ئێـوە دەمێکـە گوشـارتان خسـتۆتە سـەرم کـە ژن بهێنـم، منیـش کەسـێکم دۆزیوەتـەوە و هەنـگاو و تەگبیـری پێویسـتم بـۆ کـردووە، بـەڵام چەنـد کۆسـپێکم لـێ قـوت بۆتـەوە! یەکێکیـان ئەوەیـە (مـام جـەلال) زۆر مەحتـەل بـوو منیـش بەخێرێ دەمویسـت بچمـە دەرەوە لـە ئەورووپـا کارەکانی ژن هێنانەکـەم تـەواو بکـەم. لەلایەکـی تـرەوە دایـک و خوشـکم و ماڵـی (بەختیـار)ی بـرام لـە ترسـی رژێـم هەڵهاتـوون و لـەلای خزمەکانمـان لـە لادێ و لـەوێ خۆیـان شـاردبوەوە. دایکـم گلەیـی زۆری هەیـە وا دەزانـێ مـن فەرامۆشـم کـردوون و لـە فیکریـا نیـم. بـە باشـم زانـی لـە شـوێنێکی لەبـار چـاوم بـە دایـک و خوشـک و کـەس و کارم بکەوێـت و هەنـدێ دڵیـان بدەمـەوە و رازیـان بکـەم بێنـە خـڕی ناوزەنـگ، تـا لـە نزیـک خۆمـەوە

بن! منیش بۆ ئەوە بە نهێنی رۆیشتم و تەنها دوو پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد، تا نەبێتە قاو. توانیم کەس و کار ببینم و رازییان بکەم بێنە ناوزەنگ و بگەڕێمەوە. لە گەڕانەوەکەمدا لەگەڵ (حەمەی حاجی سابیر) و چەند پێشمەرگەیەکدا چووینە چەمی گەلاڵ، (کەمال شاکر) یش هاتە لامان و نیوەرۆ لامان دایە ماڵێکی باش (کەمال و حەمە)، لەگەڵ خۆمدا لەو ماڵە خەریکی نان خواردن بووین، کە خاوەن ماڵەکە هاتە ژورەوە وتی: دەورتان بە چەکدار گیراوە و سەرشاخەکانیان لێگرتون، کە چووینە دەرەوە بزانین چییە و بگەینە شوێنێکی قایم لە شاخەکەوە گوللە بارانیان کردین، (کامەران)یان پێکا و ئێمەش خۆمان گەیاندە شاخەکەی بەرامبەرمان و لە شوێنێکی ئەمین خۆمان قایم کرد! لە دواییدا زانیمان، کە رۆژی پێشوو (فەرەیدون حەمە ساڵح)، لە گوندی بیوەک هەندێ چەکداری (حسک) ی چەک کردووە و ئەوانەش کە هاتنە سەرمان نەیاندەزانی ئێمە کێین، لەوە زیاتر کە پێشمەرگەی (ی ن ک) ین! شەو چووینە قەویلە و لەوێ نامەیەکم بۆ (تایەر) نووسی و ئاگادارم کرد، کە من بۆ کارێکی خۆم هاتومەتە ئەم ناوە. بەڵام دەتوانین یەکتر ببینین و پێکەوە هاوکاری بکەین بۆ خاو کردنەوەی وەزعە گرژەکە! دیارە لە دڵ سافیەوە هەڵەیەکی گەورەم کرد، کە بێ خۆ ئامادە کردنی پێویست بەو رادەیە متمانەم کرد. لە جوابی نامەکەدا گلەیی زۆری لە رەفتاری برادەرەکانمان کرد بوو بەخێر هاتنی کرد بووم و ئامادەییشی نیشاندابوو بۆ یەکتر بینین! بەرە بەیانی رۆژی ئایندە هێشتا لە قەویلە بووین زانیمان، کە چەکدارێکی زۆری (حسک) رژاونەتە ناو ئاواییەکە. ناردم مەسئولێکیان بێت تا بزانین چی هەیە! (قالە چاو شین)ی کۆنە برادەری خۆمان هاتە لام و منیش هەواڵی (تایەری عەلی والی)م لێ پرسین، وتی.. لە هۆزخواجە یە! ئیتر

هەڵسـاین بەڕێکەوتین بۆ لای (تایـەر)، لـەوێ (تایـەر) و مەسئولەکانیان بـە پیرمانـەوە هاتـن، بـۆ نیوەڕۆش خواردنێکی باشیان بۆ ئامـادە کردبووین و پێکـەوە نانمـان خـوارد! ئەنجـا کەوتـە گلەیـی و وتـی: (مـەلا بەختیـار)، هێزیکـی زۆری کۆکردۆتـەوە چەنـد جـار رێگای پـێ گرتووین و تەنگیـان پـێ هەڵچنیویـن و گەلـێ پێشـمەرگەیان چـەک کردوویـن! ئیتـر منیـش باسـی ئـەوەم لەگـەڵ دامەزرانـدن، کـە چـۆن وەزعـی گـرژی ناوچەکـە خـاو بکەینـەوە، هەسـتم کـرد وەزعیـان تـەواو نییـە و پەشـۆکاوییان پێـوە دیـار بـوو (تایـەر)، خـۆی هیـچ قسـەیەکی نەکـرد، بـەڵام تفەنگەکـەم کـە بـە دیوارەکـەدا هەڵپەسـێردرا بـوو، (خولـەی حەمـە تاتـە)، دەسـتی دایـە و بردی بـە منجـە منج تێیـان گەیاندم، کـە دەست بەسـەرم بـە بیانووی ئـەوە برادەرانـی ئـەوان دەترسـن هێزەکـەی (یەکێتـی)، بچنـە سـەریان باشـتر وایـە تـۆ لەگـەڵ ئەمـان بمێنیتـەوە! وەکـو دوایـی بیسـتم (قـادر جەبـاری و تایـەر)، لەژیـر گوشـاری هەڕەشـەی (رەئوفـی خەلیفـە سـەعید و کەریمـی دادە مەنـە و خولـەی حەمـە تاتـە)دا منیـان گل دابـووەوە. وتبوویـان گـەر ئـازادی بکـەن ئـەوا ئێمـە دەیکوژیـن و تەسـلیم دەبینـەوە. بـۆ سـەلامەتی هێزەکەمـان وا باشـە وەکـو بارمتـە گلـی بدەینـەوە! ئیتـر لـە هـۆز خواجـەوە دێ بـە دێ کەوتنـە گـەڕان تـا گەیشـتنە شـاخەکە لای قـەلای سـروچک و لەوێشـەوە خۆیـان رانەگـرت و بـە شـانەدەریدا هەڵکشـان بـۆ سـووریێ و منیشـیان لەگـەڵ خۆیـان دەبـرد. لـەو ماوانەشـدا رۆژێکیـان لـە دەرەگـوڵان بووین (عەلـی بەگـی باوکـی تایـەر) هـات، راسـپاردەی بەڕێوەبـەری ئەمنـی عامـە (فـازل بـراک)ی بـۆ هێنابـوون. جوابـی بـۆ ناردبـوون کـە بـە هـەر رێگەیـەک بـۆ ئـەوان گونجـاوە وابکـەن منیـان تەسـلیم بکـەن، بەرامبـەر ئـەوەش نیـو ملیـۆن دیناریـان بدەنـێ! منیـش ئەمزانـی مـلازم (تایـەر)، کاری وای لـێ ناوەشـێتەوە. خۆشـم چەنـد دەرفەتێکـم بـۆ رێکـەوت (خولـەی

حەمە تاتە)، خۆی پێشنیاری کرد، کە ئەگەر لە سەر شتی کۆن موحاسەبەی نەکەین و ڕێزی لێبگرم، ئەوا ئامادەیە دەربازم بکات و لە گەڵم بێت، بەڵام هیچ متمانەم پێی نەبوو، دوور نەبوو بمفرۆشێتەوە بە ڕژێم! (کاوەی شێخ لە تیف و ناسر حەفید)، هەوڵیان بۆ بەردانم دابوو، بەڵام (حسک)، بە گوێیان نەکرد بوون! بۆیە داوایان لێکردبون و ڕازییان کردبون تا چارەنووسی ڕوون دەبێتەوە لای من بمێننەوە. دەرفەتیشم بۆ هەڵکەوت لەبەر ئەو دوامخست تا ئەمجارە خۆی ڕازی بوو، کە گوێ بە (حسک) و ئەنجامەکەی نەدا و منیش هەڵهاتم و دەرباز بووم، بەڵام ئەمجارەش وابزانم دەرفەتی ڕێکخستنی ژنهێنانم لە کیس چوو!)

لەو ماوەیەدا کە (نەوشیروان مستەفا)، بەو ڕووداوە گیری خوارد بوو، (مەلا بەختیار و سالار عەزیز) یش لە بەری شارباژێر بوون! ئیتر بە باشمان زانی زنجیرەیەک کۆڕ و لێدوانی فیکری لەسەر مەسەلەکان ببە ستین! لەبری ئەوەی بوار بدەین ئەو ڕووداوانە کار لە ورە و باوەڕی کادر و تێکۆشەرەکانمان بکەن، تین و تاوێک لە ناویاندا ببزوێنین، کە مایەی مشتوماڵ کردنەوەی بیروڕا و مەسەلە بنەڕەتییەکان بێت، باشترە! لە زەڵێ بارەگایەکمان هەبوو ژوورێکی گەورەی تێدا بوو لەگەڵ (فازیل کەریم - مامۆستا جەعفەر- و ئاسۆی شێخ نوری و ئەرسەلان بایز و ئازاد هەورامی)، زنجیرەیەک کۆڕمان بەست! لە یەکەمین جاردا گرتنەکەی (نەوشیروان) و ڕەنگدانەوەی ئەو کارەی (حسک) و شوێنەوارەکانی لەسەر پەیوەندییەکانی ناو جووڵانەوەی کوردستان، بابەتێک بوو! لە یەکێکی تردا باسی (جود و جوقد) و زیان و سوودەکانی ئەو دوو بەرەیەمان بۆ کوردستان و جووڵانەوەی کورد کردە بابەتێکی تر! لە باسێکی تردا، دەنگوباسی هاتنی (سامی عەبدول

ڕەحمان) و حیزبی (گەل) و ئەگەری هاتنی بۆ ناو (یەکێتی)، باسێکی تر بوو! ئیتر بەوجۆرە باسەکان رایانکێشاین بۆ زیاتر چەسپاندنی سەربەخۆیی فیکری و سیاسیی (کۆمەڵە) و پاراستنی لە نقووم بوونی لەناو بیر و سیاسەت و مومارەسەکانی حیزبە کلاسیکییەکاندا! ئەم بابەتەی دواییان چەند کۆبوونەوەیەکی خایاند و بەلای کادرەکانی (کۆمەڵە) وە، کە ژمارەیەکیان وەک (ئازاد حەمە غەریب و دانا ئەحمەد مەجید و سەلاح قەزاز و مامۆستا ئەنوەر و شۆڕش)، کە زۆر نەبوو لە دەورەیەکی مەشق و پەروەردەکردن لای فەلەستینییەکان گەڕابونەوە و هەندێکی تر، کە کادری دێرین و هوشیاری (کۆمەڵە)، بوون، بایەخێکی زۆرتری هەبوو!

## کۆنفرانسی (کۆمەڵە) و ناکۆکییەکان!

دوای کۆتایی هاتنی گێچەڵەکەی (حسک) و هاتنەوەی (نەوشیروان)، بۆ ناوزەنگ، بە مەبەستی پێگەیاندنی کادیران و پەروەردەکردنی دروستی هاورێ و فەرماندەکانی (کۆمەڵە)، کاک (نەوشیروان) بابەتیکی جوانی لەسەر رەوشتی هاورێی (کۆمەڵە) نووسی! ئەو بابەتە لە ریزەکانی رێکخستندا بۆ چەندین ساڵ وەک خۆراکی مێشک و پەروەردەکردنی لێهات و لە ریزەکانی (کۆمەڵە)دا، دەستا و دەست دەکرا و بە زیندویی مایەوە!

لە ریزەکانی (کۆمەڵە)دا، جۆرێ ناکۆکیی و ململانێی ئاشکرا سەری هەڵدا بوو، جارو بار بە شێوەی تێزێکی چەپ و بان چەپ لە هەندێ گفتوگۆ و قسە و باسدا خۆی نیشان دەدا. راستییەکەی ئەو ناکۆکییانە بەم جۆرە بوون:

* جۆرێ لە نەگونجان لە نێوان (نەوشیروان مستەفا) و سەرکردەکانی (کۆمەڵە)، کە لە (کۆمیتەی هەرێمەکان)دا بوون، (سالار عەزیز، مەلا

بەختیار، ئازاد هەورامی، فازیل کەریم)، هەر لە کۆبوونەوەی (ڕۆستێ)ی سەر سێ سنوورەوە پەیدا بووبوو! ئەوەش زیاتر لە قسە و باسێکی سادەوە، کە لە نێوان (نەوشیروان و سالار)دا دروست بوو، سەری هەڵدا! ئەوە یەکەمین کۆبوونەوە و عەقلیەت و کەسایەتیی هەر دووکیان بوو، هەر دووکیان دوو تێکۆشەری پێویست و بە بایەخ بوون، کەچی نەیانتوانی لە یەکتر تێ بگەن، ئەوە یەکەمین بە هەڵە و بەد حاڵی بوون و نادروست تێگەشتن و یەکتر ناسینی ئەو دوو هاوڕێیە بوو لەیەکتر!

(نەوشیروان مستەفا)، تێکۆشەرێکی ناسراو و دێرینی سیاسیی کورد و شاسوارێکی خەباتی خوێندکاری و نووسەرێکی بە توانا و کوردی زانێکی لێوەشاوە و زمان ڕەوان بوو، خەریکی خوێندن و تەواو کردنی خوێندنی باڵا بوو لە شاری (ڤێنا)ی هونەرو ڕوناکبیری و موسیقادا و لەوێ دەژیا و دەیخوێند! داوای لێکرابوو بێتەوە بۆ کوردستان بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، ئەویش بەوپەڕی باوەڕی خۆیەوە و لەسەر داوای (مام جەلال)، خوێندن و هاوڕێکانی و ڤێنای بەجێ هێشتبوو بەرەو شاخ و بەرەو دۆخێکی ئالۆز و سەختی پڕ لە کینە و ململانێی ناڕەوا ملی ڕێی خەبات دەگرێتە بەر! دیارە چاوەڕوانییەکانی ئەو لەو تێکۆشەرانەی وڵات لەوە زیاتر بوو، کە خۆی لە زیهنی خۆیدا وێنای کرد بوو! بۆیە دەبوو لە گەڵیان ڕوو بەڕووی سەختییەکان و وەیشوومەکانی خەبات و مەرگ بێتەوە، بەڵام بە داخەوە نەیانتوانیبوو زوو پردی خۆشەویستی و برایەتی دروست بکەن! چونکە دەبوو پەیوەندییەکانی نێوانیان لەو قسە و باسانەی، کە لە یەکەمین بەرخوردی نێوان خۆی و (سالار)دا ڕوویدا، هەورازتر بوایە!

(سالار عەزیز)یش، لاوێکی ئازا و هەڵکەوتوو و هاوڕێی شەهید (ئارام)!

(ئارام)ی کەم نموونەی کۆڕی داستانی هەڵسانەوەی (کۆمەڵە)و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان و (ئارام)ی دڵپاک و دەم بە خەندە و ڕوو خۆش، (ئارام)ی زایەڵەی زەنگێکی نوێی خەباتی شۆڕشگێڕانە! (سالار)، یەکێک بوو لە ئەو لاوە قارەمانانەی (کۆمەڵە)، کە لە ڕۆژگارێکدا (کۆمەڵە)، لە گێژاوی مەینەتییەکی گەورەدا بوو، کە لەگەڵ (ئارام) و تێکۆشەرەکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان)دا، شانی داوەتە بەر ئەرکێکی ئێجگار گەورە و ئازایانە (کۆمەڵە)یان ڕێکخستۆتەوە و بەگژ مەحاڵدا چوون! (سالار)، لەگەڵ (ئارام) و هاوڕێکانیاندا بە ورەی گەورە و تەوژمی باوەڕی شۆڕشگێڕانە، گیانیان خستۆتە سەر لەپی دەستیان و سەر قافڵە بوون و بنکەی سووریان دامەزراندوە و شۆڕشی شکاوی کوردیان زیندو کردۆتەوە! ئەویش یەکێک بووە لە لاوە تێکۆشەر و ناسراوەکانی خوێندکاران و لە خۆوە پەیدا نەبوو بوو، ئەویش بەو هەستەوە و چاوەڕوانییەکانی لە کاک (نەوشیروان)، کە لە ئاستی ئەو یەکەمین دیدارەدا نابێ، ئیتر ئەوە دەبێتە هۆی ناکۆکییەکی شەخسی و تایبەتی لە نێوانیاندا!

* ناکۆکیی هاوڕێیانی زیندان لەگەڵ هاوڕێکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) و ئەو هەموو پروپاگاندەیەش، کە لەسەر (ڕاپۆرتی شوبات) و کەم لوتفی ئەو هاوڕێیانە لەکاتی ئازاد بوونی هاوڕێکانیان لە زیندان و ئەو پێشوازییە سارد و سڕە و وتارەکەی ژمارە شەشی (کۆمەڵە) و وەرام نەدانەوەی دەسپێشخەرییە دۆستانەکەی (فەرەیدون)، لەلایەن ئەو هاوڕێیانەوە، ئەمانە هەموو توانییان زەمینەی ناکۆکییەکی تر لە ڕیزەکانی (کۆمەڵە)دا داڕێژن و ئەو ناکۆکییەش لە کاری ڕۆژانە و بە درێژایی ڕۆژگاریش پەرە بسێنێ!

* ناکۆکیی لە نێوان (کۆمەڵە) و باڵەکانی تری (یەکێتی)دا، جۆرێکی تر

بوون لە ناکۆکیی، کە بێ ڕەنگدانەوە نەبوون لەناو (کۆمەڵە) و لە کارو بارەکانی (کۆمەڵە)دا!

* ناکۆکیی و ململانێکانی (یەکێتی) لەگەڵ لایەنەکانی تر، (پارتی و حسک و پاسۆک)، کە لەناو بەرەی (جود)دا، کۆبووبوونەوە، کاریگەری خۆی هەبوو! چونکە ئەم ناکۆکییە زۆر سەخت و ناخۆش و کاریگەر بوو، کاردانەوەی ناخۆشی لەسەر سەرجەم باری ناوخۆی (یەکێتی و کۆمەڵە) هەبوو! بۆیە لە ناخدا هەندێ لە هاوڕێکانمان کاتێ ڕووداوێکی دیاریکراو، کە لەم ناوچە یا لە شوێنێکی تر ڕوویدەدا، ئەوا وایان لێکدەدایەوە، کە هاوڕێیەکی تری (کۆمەڵە) و ئەندامێکی تری سەرکردایەتی دەستی تێدا هەبووە! ئیتر ئەم جۆرە دوو دڵی و بێمتمانەییە بووە تیراوێ بۆ پەیوەندییەکانی ناوخۆی هاوڕێیان! لەکاتێکدا بۆ مێژوو بۆ ویژدان دەڵێم..لە مێژووی (کۆمەڵە) و (یەکێتی) دا، باوەڕ ناکەم هیچ ڕووداوێک لە لایەن هاوڕێیەکەوە بە دەستی ئەنقەست، ڕوویدابێ یا ساز کرابێت! ڕەنگە لە پراکتیکدا هەموومان هەڵەمان کردبێت و بڕیاری نا مەنتقیمان دابێ، بەڵام هیچ هاوڕێیەک نیازی وەها و بەرنامەی لەو جۆرەی نەبووە، کێشە ساز بکات و کار لە هاوڕێکانی تری تێک بدات!

(کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)، لە گێژەنی ئەو هەلومەرجە ناوخۆییە خراپ و سەختەدا، بیری لە بەستنی کۆنفرانس کردەوە و ڕێ و شوێنی بۆ دیاریکرد و لە شار و لە شاخەوە هاوڕێیان ئامادە بوون و لە ڕۆژی ١٩٨١/٥/٧دا، لە بناری شاخی بلفەت، پشتی گوندی کانی زەرد لە دۆڵی (مالیمۆس)، ١٨٥ تێکۆشەری نموونەیی لە هاوڕێیانی (کۆمەڵە)، کۆبوونەوە، کە ١٧٥ ئەندامیان لە هەرەتی لاوێتیدا بوون و تەنها ١٠ تێکۆشەریان تەمەنیان لە سەرو ٤٠ ساڵەوە بوو، زۆربەی زۆریان

پێشمەرگە و ئەوانی تریش نوێنەرانی ڕێکخستنە نهێنییەکانی شارەکان بوون، کە یەکی رووپۆشێکیان لە سەردا بوو، تا نەناسرێنەوە!
دەستەی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرا و بەرنامەکانی بە سروودی (بەری رەنج)، کە سروودی (کۆمەڵە) بوو، شەهید (ئازاد هەورامی) داینا بوو دەستی پێکردا!
لەپاش راپۆرت خوێندنەوە، یەکێک لە بەرنامەکانی کۆنفرانس گێڕانەوەی مێژووی خەباتی (کۆمەڵە) بوو! لێرەدا دوولایەن کە لە دوو بەرەدا بوون، هەر یەکەیان دەیویست ئەو راستییە بسەلمێنێ، کە تا ئەوکاتە کرابوو بەژێر دەست و پێوە! بۆیە لایەک لە هاوڕێیان دەیانویست ئەو حەقیقەتە زیاتر بەرجەستە بکەن، کە سەرکردایەتیی (کۆمەڵە)، بە شەهید (شەهاب)یشەوە، بەر لە (کۆمیتەی هەرێمەکان)، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان داوە، تا (کۆمەڵە) بالای کردووە و گەیشتۆتە دەست (کۆمیتەی هەرێمەکان) و بەم رۆژە گەیشتووە! راستە هەڵەشیان کردووە، بەلام دەبێ باش دەرک بەوەش بکرێ، کە لە زینداندا جگە لە (حەمەی میرزا سەعید)، هەموو زۆر و کەم رۆڵەی ئازای (کۆمەڵە) و گەلەکەیان بوون و لەژێر زەبری ئازار و ئەشکەنجەی زۆریشدا، توانیویانە زۆر لە نهێنی ڕێکخستنەکان بپارێزن و گیانی زۆر لە هاوڕێیانیش رزگار بکەن! بۆیە دەبوو ئەو تێکۆشەرانە نەخرێنە بەر تیر و توانج و بەیان لەسەر دەرکردن و لەبیر بردنەوە!
لایەکەی تریش لە هاوڕێیان دەیویست تەنها رۆڵی گەورە و قارەمانانەی (کۆمیتەی هەرێمەکان)، لە دەرباز کردنی(کۆمەڵە)، لەو تەنگژە و بارودۆخە سەختەی، کە رووی دا و لە گەشە پێدانی (کۆمەڵە)و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشدا بەرجەستە بکات و لەسەر بۆچوونەکانی پێشوی خۆی سوور بوو، کە گوایە ئەو سەرکردایەتییەی پێشوو بەزیو و راکردوو بووە!

له راستیدا ئەو دوو لایەنە، هەر دووکیان لە تێکۆشەرە دڵسۆزەکانی (کۆمەڵە) بوون و هیچ لایەک ناتوانێت ڕۆڵی گەورە و کاریگەریی ئەوی تریان بسڕێتەوە و هیچ لایەکیشیان بێ هەڵە و کەم و کورتی نەبوون! (نەوشیروان مستەفا)، کە تا ئەو ساتە بەکردار سکرتێری (کۆمەڵە) بوو، بێ ئەوەی لە پلینیۆم یا لە کۆنفرانسێکی (کۆمەڵە)دا بۆ ئەو پلەیە هەڵبژێرابێت، تەنها بە حوکمی دەسپێشخەری لە کۆبونەوەی (شێنێ)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٨دا، ئەو دەورەی وەرگرت! لە راستیدا ئاراستە کردنی ئاقار و ئەنجامەکانی کونفرانس (نەوشیروان) خۆی ڕەنگی دەڕێژا و خۆی بە ئارامی و لەسەرخۆ هەنگاوی بۆ دەنا! لەکاتی پێویستدا لەسەر هەق قسەی خێری بۆ ئەم لا یا ئەولا دەکرد و هەوڵی دەدا ناکۆکییەکان نەگەنە ئاستی تەقینەوە و لێکدابڕان! نایشارمەوە بزیسکی ئاگری ئەو ململانێیەش، جگە لە هەندێ هەڵەی تێکۆشەرەکانی هەردوو بەرەکە، کە لە کات و هەلومەرجی تایبەتیدا و لە کۆڕی خەبات و تێکۆشاندا ئەو هەڵانە ڕوودەدەن، هیچی تر نەبوو! ئیتر گەرم بوونی ژیلەمۆی ئەو ناکۆکیی و پەیوەندییە نادروستە بوو، کە هەردوو لایەن بەرامبەر یەکتر هەیان بوو!

کونفرانس و بەرنامەکانی و کێشە و گرفتەکانی دوو هەفتەی خایاند! کونفرانس بەشێکی زۆری بەرنامەکانی تەرخان بوو، بۆ بەلادا خستنی ناکۆکیی و ململانێکان! دواتر لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکەیدا وەک هەموو کارێکی تری کورد، لایەکی (کۆمەڵە) بەسەر لایەکەی تری خۆیدا زاڵ بوو، کە لە راستیدا ئەوەی زاڵ بوو (نەوشیروان مستەفا) بوو! ئیتر ئەویش توانی تا ئەندازەیەک وەک خۆی ویستی ڕەوتی گەشە پێدانی (کۆمەڵە) بەرەو پێش بەرێت!

## بەشی یەکەمی شەڕی ناوخۆ!

هاوینی ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ گەرم بوونی ئاو و هەوادا، لەسەر ئاستی ناوخۆ تادەهات ململانێ ناوخۆییەکان گەرمتر دەبوون و و لەسەر ئاستی دەرەوەش پەیوەندیی نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و (یەکێتی)، ساردتر دەبوو! هێزەکانی (حسک)، کە بە ژمارە لە هی لایەنەکانی تری (جود) زیاتر بوون و لە هەمووشیان زیاتر گێچەڵیان بۆ (یەکێتی) ساز دەکرد و سووکایەتیان بە ئەنجومەنی گوندەکان دەکرد! ئەو ئەنجومەنانەی کە داهێنانی (یەکێتی) بوون، بەڵام خەڵکی گوندەکان لەناو خۆیاندا هەڵیان دەبژاردن، تا لەکاتی پێویستدا هەم کاروباری گوندەکەی خۆیان جێبەجێ بکەن و هەم کار ئاسانی بۆ پێداویستییەکانی هێزی پێشمەرگە بکەن! چەک کردن و چەک فڕاندن و شەڕی مەفرەزەکانی خوارەوە لەسەر ئەو گێچەڵانە بەردەوام بوو. لە ڕۆژانی ٢٢ و ٢٣ /٦/ ١٩٨١ دا، لە شارباژێڕ بەهۆی گێچەڵێکی هەندێ پێشمەرگەی (پاسۆک) بە (یەکێتی)، دوو شەڕ لەنێوان مەفرەزەکانی (یەکێتی و پاسۆک)دا، ڕووی

دا! لـه ئەنجامـدا ٩ پێشـمەرگەی (یەکێتـی)، شـەهید بـوون! لـە رووداوێکـی تـر لـە گونـدی فەقێیـان مەفرەزەیەکـی حیزبـی (شـیوعی)، ٦ پێشـمەرگەی (یەکێتـی) شـەهید دەکـەن! هێزەکانـی (حسـک) یش لـە ناوچەکانـی کۆیـە و خۆشـناوەتی، زیاترلـە ١٠ جـار شـەڕ و گێچەڵیـان بـە هێزەکانـی (یەکێتـی) کـرد، تـا لـە مانگـی ئەیلولـدا بـە بڕیـاری سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) کاک (نەوشـیروان)، چـووە ناوچەکانـی دۆڵـی بالیسـان و دۆڵـی مەلـەکان، تـا ئەگەرەکانـی خڕبوونـەوەی هێزەکانـی (جـود) چارەسـەر بکات! ئیتر شـەڕی گەرم لـە دۆڵـە رەقـە دەسـتی پێکـرد و هێزەکـەی (حسـک)، بـە فەرماندەیـی (عـەوڵا سـوور)، گەمـارۆ درا و تێکشـکێنرا و (عـەوڵا سـوور) و هەندێکیـان بـە دیـل گیـران و لـە دواییـدا (عـەوڵا سـوور) بـە دیلـی کـوژرا! راسـتیەکەی (عـەوڵا سـوور) یەکێـک بـوو لـە فەرمانـدە ئـازا و هەڵکەوتووەکانـی هێـزی پێشـمەرگە، بـەڵام بەداخـەوە لـە شـەڕی براکانـدا گیانـی لـە دەسـتدا! ئەنجـا لـە ١١/٢٥/ ٩٨١ تـا ١٩٨١/١٢/٣ شـەڕ و پەلاماردانـی هێزەکانـی (جـود) بـۆ سـەر دۆڵـی خانەقـا و وەرتـێ و زینـۆی ئەسـتێرۆکان و پاشـان رزگار کردنـەوەی لەلایـەن هێزەکانـی (یەکێتـی)، شـەڕ و کوشـتار درێـژەی کێشـا و لـە ئەنجامـدا هێزەکانـی (جـود)، پاشەکشـەیان کـرد بـۆ پشـت ئاشـان!

## تەقەڵای ئاشتی!

ئـەو ململانـێ خوێناوییـەی شـەڕی ناوخـۆ ڕەنگدانەوەیەکـی نەرێیـی و ناخۆشـی لەسـەر جەمـاوەری گەلەکەمـان و ڕوناکبیـران و لـە سـەر خوشـمان دروسـت کـرد بـوو!

* پێشـمەرگەیەکی زۆر لـە (یەکێتـی) و لـە لایەنەکانـی تـر، کـە دەبـوو لـە شـەڕی دژ بـە ڕژێمـی داگیرکـەری عێراقـدا، شـەهید و بریـندار بوونایـە و ببونایەتـە قوربانـی ڕزگار کردنـی گـەل و وڵات، کەچـی بـە دەسـتی یەکتـر و لـە ناکۆکیـی و ململانێی ناوخـۆ و لـە شـەڕی براکوژیدا لەنـاو دەچـوون!

* لـەو کاتـەدا، کـە ڕژێمـی عێـراق دووچـاری شـەڕێکی گـەورەی کاولکـەر بوبـوو، شـەڕێک بـوو خوێن لەبـەر ڕۆیشـتنێکی زۆری (مرۆیـی و ئابـووری و سیاسـی) و تەنانـەت زیانـی گـەورەی کۆمەڵایەتیشـی لێکەوتبـووەوە! لـەو کاتـەدا، کـە زۆربـەی هێـزە چەکدارەکانـی عێـراق سـەرقاڵی مەیدانەکانـی ئـەو شـەڕە نەگریسـە بـوون، ئـەوەش هەلێکـی زێڕیـن و دەرفەتێکـی گـەورەی ڕەخسـاند بـوو، تـا بتوانیـن بـە یەکڕیـزی و هاوکاریـی یەکتـرو

بە نەخشـەی ڕێکوپێک سـەرکەوتنی گـەورە بەسـەر دوژمنـدا بەدەسـت بهێنیـن و جووڵانـەوەی کـورد بـۆ پێشـەوە بەریـن، کەچـی ئیمـەی هێـز و لایەنەکانـی سـەر گۆڕەپانـی کوردسـتان لەوکاتـە لەبـارەدا کەوتبووینـە گیانـی یەکتـری و ڕێگـە گرتـن لـە یەکتـر! لەباتـی ئـەوەی مشـووری یـەک ڕیـزی بخۆیـن و هەوڵـی جێبەجـی کردنـی نەخشـە و بەرنامـەی بـاش بدەیـن بـۆ خزمەتکردنـی کۆمەڵـی کـوردەواری، کەچـی هـەر خەریکـی یەکتـر قـڕ کـردن بوویـن!

* لەبری زیاتر چاندنی هیـوای سـەرکەوتن لـە ناخی خەڵکە تێکۆشـەرەکاندا و شـانازی کـردن بـە هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتانەوە، وەک هێزێکـی چەکداری سیاسـی و هوشـیار، کـە تێدەکۆشـێ بـۆ مەسـەلەی ڕەوای گەلەکـەی، کـە ئازادی و ڕزگاریی کـورد و کوردسـتانە، کەچی بـەو شـەڕە نەگریسـەی ناوخـۆ، جەمـاوەری گەلەکەمـان بـێ هیـوا دەکـرد و بـاوەڕ و متمانـەی گەلەکەمـان بـە خۆمـان لاواز دەکـرد!

* لـە درێـژەی ئـەو ململانـێ نـا بەجێیـەدا، هەنـدێ لایـەن ناچـار دەبـوون هەرچۆنـێ بێـت هێـز و ژمـارەی زۆری چەکدار لەسـەر حسـابی چۆنایەتـی و پـاک و پوختیـی تێکۆشـەرەکان کۆبکەنـەوە! ئـەوەش دەرفەتـی بـۆ دوژمـن سـاز دەکـرد، کـە کەسـانی خـراپ بخەنـە نـاو ڕیزەکانـی لایەنـە سیاسـییەکان و هێـزی پێشـمەرگەوە و بەمـەش بـوار بـۆ کەسـانی پۆخـل و پیـاو خـراپ و دز و درۆزن ڕەخسـا، کـە کنـە بکەنـە نـاو هێـزی پێشـمەرگە و پاکـی و جوانـی هێزەکـە بشـێوێنن!

* کەلێنـی بـۆ دەوڵەتانـی داگیرکـەری کوردسـتان خـۆش کـرد، کـە لـە شـەبەقی ئـەو کەلێنـە گەورانـەوە دزە بکـەن و نەخشـە و پیلانەکانـی خۆیـان لەنـاو جووڵانـەوەی کـورد و لـە دژی ڕێبـاز و ئامانجـە باڵاکانـی جێبەجـێ بکـەن و گیانـی پاشـکۆیەتی لەنـاو لایەنـەکان و جووڵانەوەکـەدا

دروست بکەن!
ئەمانە و چەندەها ئاسەواری نەرێیی تر، بەرهەمی شەڕی نەگریسی ناوخۆ بوون! ئێمە وەک (کۆمەڵە)، لەو بارەیەوە چەندەها ئامۆژکاری و داوای دڵسۆزانی گەلەکەمان چ بە نامەو چ بە سەردانی راستەوخۆ لە شارەوە پێدەگەیشت، کە هەموویان لە خەمی ئەوەدا بوون، (یەکێتی)، کە جێگەی هیوای گەلەکەمانە تێدا بچێت و دڵی دوژمنمانی پێ خۆش بێت! ئیتر ئێمە بە بۆچوون و بڕوای خۆمانەوە، دەستمان کرد بە دارشتنی نەخشە ریگایەک بۆ ئاشتی و نەهێشتنی ململانێ و شەڕ لە کوردستاندا !
* ئەو دەمە (حەمەی حەمە باقی) شاعیر، نزیکی ئێمە بوو. خۆشی پیاوێکی کوردپەروەری دڵسۆز بوو، لەو ناتەباییەی لایەنە سیاسیەکان نیگەران بوو، پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ شاعیرو روناکبیرانی تردا هەبوو! پەیوەندیی باشی لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس و رەووف بێگەرد و مستەفا سالح کەریم و لەتیف هەڵمەت) و هاوکات لەگەڵ (فلک الدین کاکەیی) لە (پارتی) و (رەفیق سابیر و دکتور عیزەدین) لە حیزبی (شیوعی) و (رەووف حەسەن و عەبدولا پەشێو) و روناکبیرانی تردا هەبوو! هاوڕێیانمان هانیاندا بەڵکو بەهۆی تەقەلای یەکخستنی (یەکێتیی نووسەرانی کورد) و روناکبیرانەوە، کەناڵێک بۆ ئاشتی ئاوەڵا ببێت!
سەرەتا بەهۆی هەوڵێکی ئەوەوە و لە رێگەی (حاجی حاجی ئیبراهیم)، کە دۆستی بوو، کۆبونەوەیەکی (یەکێتی و حسک)، لە شێنێ رێکخرا! لە (یەکێتی)، هەریەکە لە هاوڕێیان (نەوشیروان مستەفا و ملازم عومەر) و لە (حسک)، (تایەری عەلی والی بەگ و حاجی حاجی ئیبراهیم)، ئامادەی بوون! ئەنجامەکەی گەیشتە ئەوەی، کە (یەکێتی)، لە ٩٨٢/٣/٩ دا، پرۆژەیەکی ئاشتی پێشکەش بکات بە چوار بەش، کە بەو پێیە

هـەردوولا لـە رووی سیاسـی و پێشـمەرگە و ئیـدارە و مالییـەوە یـەک بخـات!
ئێمـە لـەو پرۆژەیـەدا دەمانویسـت کارێکـی وابکەیـن، کـە زەمینـە و هۆکارەکانـی ململانێـکان بنبـڕ بکەیـن و میلیشـیای زۆر و جیـا جیـا، کـە هەندێکیـان میلیشـیای زۆر بێسـەروبەر و بـێ دیسـپلین بـوون و هۆیەکـی گـەورەی ئـەو شـەڕ و گـرژی و ناتەباییانـە بـوون، لەسـەر دەسـەڵات نەهێڵیـن و لـەو ڕێیەشـەوە مەسـەلەکان چارەسـەر بکەیـن!
لەسـەر داوای سـەرکردایەتیی (یەکێتـی)، جارێـک لـە مارتـی ١٩٨٢ دا و جارێکـی تریش لـە نیسـانی هەمـان سـاڵدا، (حەمـەی حەمـە باقی) شـاعیر، نێردرا بۆ لای (پارتـی)، کە بـە تەنهـا (فلک الدین کاکەیی) دیبوو، ئیتر پاش گەیاندنـی راسـپاردەکانی (یەکێتـی) و بـاری سـەرنجی خـۆی، وەرامەکـە ئـەوە بـوو، کـە ئـەوان بەهـۆی حیزبـی (شـیوعی) یـەوە ئاگاداری (یەکێتـی)، دەکەنـەوە! بـەڵام (پارتـی) تـا تەمـوزی١٩٨٢ جوابێکیـان نەبـوو، ئـەوکات بڕیـاری کۆبوونەوەیەکـی هاوبـەش بـە میوانـی حیزبـی (شـیوعی) درا!
لـە سـەرکردایەتی (یەکێتـی)، (فەرەیـدون عەبدولقـادر و دکتـور خـدر موعسـوم)، لـە ١٩٨٢/٧/٢٨ لـە پشـت ئاشـان لەگـەڵ نوێنەرانـی (پارتـی)، (محەمـەد مـەلا قـادر و مەغدیـد ئەحمـد)، لـە بـارەگای حیزبـی (شـیوعی) کۆبووینـەوە! لـەو کۆبوونەوەیـەدا هەوڵمانـدا لـە گرفتـە سیاسـییەکانەوە دەسـت پـێ بکەیـن و خاڵـی هاوبـەش بدۆزینـەوە بـۆ داڕشـتنی بناغەیەکـی باشـی ڕێککەوتـن! بـەڵام نوێنەرانـی (پارتـی)، بـەو رادەیـە ئامـادە نەبـوون، بۆیـە تەنهـا لەسـەر ئـەوە پێکهاتیـن، کـە کێشـەکان بـە ڕێگـەی سیاسـی چارەسـەر بکرێن و پەنـا نەبرێتـە بـەر چـەک و کوردسـتان لـە خانەقینـەوە تـا زاخـۆ مەیدانیکـی ئـازاد بـێ بـۆ چالاکیـی سیاسـی و پێشـمەرگەیی هەمـوو لایەنـەکان! بـەڵام بـۆ دوورخسـتنەوەی ئەگـەری پێکدا هەڵپـژان و

شەڕ نەکەوتنەوە، هێزەکانیان بەبێ ئاگاداری یەکتر نەچنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکترەوە و جارێ حوکمڕانی ناوچەکان وەک خۆی بمێنێتەوە !

لە ١٩٨٢/١١/٢١ سەرکردایەتیی (یەکێتی)، هەر یەکە لە (دکتۆر کەمال خۆشناو، ئازاد هەورامی، خدر مەعسوم)ی نارد بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ حیزبی (شیوعی)، لە پشت ئاشان، لە بارەگای حیزبی (شیوعی)، کۆبوونەوە لەگەڵ نوێنەرانی ئەو حیزبە (عومەر عەلی شێخ، مەلا ئەحمەد بانیخێلانی و فاتیح رەسوڵ)دا، کرا! لەو کۆبوونەوەیەدا باس لە پەیوەندیی دوو قۆڵی و پەیوەندیی نێوان لایەنەکانی تر کرا، لەوێ لەوان تێگەیشتین، کە (پارتی)، لە رێککەوتنەکەی پشت ئاشان پەشیمان بۆتەوە و رازی نییە هێزەکانی (یەکێتی)، بچنە بادینان، بەڵام ئەوان هێزەکانی خۆیان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی (یەکێتی)، هێنا بوو! ئەم جارەش هەوڵ و تەقەلای (یەکێتی)، بە ئاشتییەکی رەوا و تۆکمە نەگەیشت و بە تەنها هێزەکانی (جود)، بەو هەوڵە توانییان بنکە و بارەگای خۆیان بهێننەوە، ئیتر بەو میلیشیا جیاجیا و سەرە رۆیە دۆخەکە سەرلەنوێ و جارێکی تر رووی لە ئاڵۆزی کردەوە!

## خۆپیشاندانەکانی ساڵی١٩٨٢!

* لە مانگی شوباتی ئەو ساڵەدا و لە سوریا، رژێمی سوریا لە جموجووڵی خۆ پڕ چەککردنی رێکخراوەکانی (ئیخوان المسلیمین)، لە شاری حەما، ترسێکی زۆریان لێ نیشتبوو! بۆیە بەشێوەیەکی زۆر توند و تیژ پەلاماری ئەو شارەی دا و ئیخوانەکانی سەرکوت کرد! لە ئەنجامدا هەزاران کەس کوژران و بوونە قوربانی!

* هەر لە مانگی ئەیلولی ئەو ساڵەدا، ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانی لە لوبنان پەلاماری ئۆردوگای (سەبرا و شاتیلا)ی رۆژئاوای (بێروت) یان دا و کوشتارێکی گەورەیان تێدا کرد، کە ژمارەی کوژراوەکانیان لە ٧٠٠ کەس تێپەڕی دەکرد!

* لە هەمان ساڵدا تەرازووی جەنگی (عێراق - ئێران)، بە قازانجی کۆماری ئیسلامی وەرگەڕا و ئێران زۆربەی ناوچە داگیرکراوەکانی خۆی ئازاد کرد و دەسپێشخەری سەربازی کەوتە دەست ئێران! بەوەش رژێمی عێراق زۆری بۆ هات و پێشنیاری ئاگر بەستی کرد،

بـەڵام کۆمـاری ئیسـلامی ئێران بڕیـاری دا تـا سـەرنگونیی (صـدام حسـین) جەنگەکـە رانەگرێـت!

* لـە ڕۆژی ١٩٨١/٧/٨دا، (صـدام حسـین)، لـە سـەردانێکیدا بـۆ شـارۆچکەی (دوجێـل)، لـە پارێـزگای دیالـە، ١٠ چەکـداری ناوچەکـە ڕێگەیـان بـە کاروانەکـەی گرت و گوللە بارانیـان کـردن، کە لـە ئەنجامـدا دوو لـە پاسـەوانە تایبەتەکانـی دەسـتەی پارێـزگاری (صـدام) کـوژران! هێزەکانـی (صـدام) یـش لـە تۆڵـەی ئـەو چالاکییـەدا، کەوتنـە وێـزەی خەڵـک و کوشـتارێکی زۆریـان لـێ کـردن!

* لـە کوردسـتانیش لـەو سـاڵەدا خۆپیشـاندانی فـراوان، زۆربـەی ناوچەکانـی سـلێمانی و کەرکـووک و زانکـۆی سـەلاحەدینی لـە هەولێـر گرتـەوە و تینـی ئـەو ناڕەزاییـی و ڕاپەڕینـەش گەیشـتە زانکـۆی بەغـدا!

* لە ڕۆژی ٧ /١ /١٩٨٢دا، بـە هاندانـی ڕێکخسـتنەکانی نـاو شـار و بـە ئاراسـتە کردنـی مامۆسـتا (جەمـال تایـەر)، جموجووڵـی خوێنـدکاران لـە سلێمانی جۆرێـک لـە خۆپیشـاندانی گرتـە خۆ!

* لـە قـەڵادزەش دوای پێشـنیار و بـاری سـەرنجی ڕێکخسـتنەکانمان و هەڵسـەنگاندنی ئامادەیـی خەڵـک بـۆ ڕاپەڕیـن، (ناوەنـدی کۆمەڵـە)، بیرۆکـەی بۆنـەی ٤/٢٤ کـە سـاڵیادی بۆردومانەکـەی سـاڵی ١٩٧٤ قـەڵادزێ بـوو، کـردە هۆکارێکـی سـەرەکی بـۆ هاندانـی خەڵـک و خۆپیشـاندان! ئیتـر سـەرکردایەتیی (یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان) و بـە تایبەتـی (نەوشـیروان مسـتەفا)، ئیزگەکـە، کـە لـەو ڕۆژگارەدا دەنـگ و پێگەیەکـی تایبەتیـی هەبـوو، خسـتە ئامـادە باشـی بـۆ خزمەتـی ڕێکخسـتنەکان و گەیاندنـی دەنگـی خەڵکـی ڕاپەڕیـوی قـەڵادزێ! پاشـان هەمـوو ڕێکخسـتنەکانی شـارەکانی تـری کوردسـتانی ئـاگادار کـردەوە بـۆ هەڵسـەنگاندنی دۆخەکـە و ئامادەکردنـی پێداویسـتەکانی

خۆپیشـاندان! بەوجـۆرە لـە ماوەیەکـی کورتـدا خۆپیشـاندانێکی گـەورە شـاری قـەڵادزێ و دەڤەرەکـەی گرتـەوە! لـە ڕێکخسـتەکانی قـەلادزێ سـەرباری ڕۆڵـی جوامێرانـەی سـەرجەم هاوڕێیـان، ئـەوا ناکرێ ڕۆڵـی دوو هاوڕێـی (کۆمەڵـە)، هـاوڕێ (کاکەمیـن) و هـاوڕێ (شاسـوار) نادیدە بگریـن، کـە ڕۆڵـی دیـار و بەرچاویـان لـە خۆپیشـاندانەکاندا هەبـوو!
* ڕوژی ١٩٨٢/٤/٢٤ خەڵکـی و کەسـوکاری شـەهیدان بـە هاندانـی ڕێکخسـتنەکان، بـۆ بـەرز ڕاگرتنـی یـادی شـەهیدان دەچـن بـۆ سـەر مـەزاری شـەهیدەکانی ئـەو کارەسـاتە لەسـەر قەبران! کـە دەگەڕێنـەوە خەڵکێکـی زۆر بەشـداری دەکـەن، کـە پێشـتر لافیتـە و دروشـمیان نووسـیوە و خۆیـان ئامـادە کـردووە، ئیتـر لەوێـوە یەکـەم بزیسـکی ڕاپەڕیـن چەخماخـە دەدات و بـەرە بـەرە خۆپیشـاندانەکە گـەورە دەبێت! هێزەکانـی ڕژێمیـش کـە پێـی دەزانـن دەکەونـە تەقـە کـردن لێیـان و لـە ئەنجامـدا (دایکـە ئامینـە و مامۆسـتا سـنۆبەر) شـەهید دەبـن و پیاوەکانـی ڕژێـم دەکەونـە وێـزەی خەڵـک و ٨٥ لاوی شـارەکە لـە کـوڕ و کـچ دەگـرن و دەسـت بەسـەریان دەکـەن! دانیشـتوانی شـاریش بـۆ هاوخەمـی ئـەو دوو شـەهیدە و پشـتگیری کـەس و کاری گیراویـان، دەست دەکەن بە ناڕەزایی زیاتر و مانگرتـن! ئەو بارو دۆخە پشێوی و نـا ئارامـی بـۆ ڕژێـم دروسـت کـرد و نزیکـەی هەفتەیەکـی خایانـد! ئێمـەش لـە شـاخ، ئێزگەکەمـان و ڕاگەیاندمـان کەوتنـە بڵاوکردنـەوەی هەواڵـەکان و لێدوانـی هاوولاتییـان و هانـدان و تۆمـاری ڕووداو و دەنـگ و دروشـم و تەقـە و گرمـە و دەنگـە دەنگـی خەڵکـە ڕاپەڕیوەکـە و هـاوکات سـەدان پۆسـتەر و دروشـم و ئامۆژگاریمـان بـۆ چـاپ کـردن و گەیاندمانـە دەسـتیان! هێنـدەی نەبـرد ئۆردوگاکانـی (بەستەسـتێن، ژاراوە، سەنگەسـەر، تـووە سـووران و شـاری ڕانیـە)ش، بـۆ هاودەنگـی

قەڵادزێ دەستیان کرد بە خۆپیشاندان!

* لە رۆژی ٤/٢٦ یشدا لە هەڵەبجە، کە لەوێش ساڵیادی بۆردومانەکەی ساڵی ١٩٧٤ بوو، دەستکرا بە راپەڕین و خۆپیشاندان و لە ٥/٧ یشدا، لە هەندێ شوێنی شاری کەرکووک و لە ٥/١٦ لە زانکۆی سەلاحەدین و لە شاری سلێمانی، خۆپیشاندان دەستی پێ کرد! دروشم و داخوازییەکانی خۆپیشاندانەکان لە سەرەتادا بە شێوەیەکی خۆرسکی بوو! هەرچەندە هەندێ کەس لە هەڵوێست و حەماسی شۆڕشگێڕانەی خۆیانەوە، ویستیان ئاستی راپەڕینەکە بەرز بکەنەوە بۆ داوایەکی گەورەتر و قورستر، بۆ ئەوەش هاواری روخانی رژێمیان دەکرد! بەڵام بە زیرەکی رێکخستنەکان و ئەو هاوڕێیانەی سەرپەرشتیان دەکرد، توانرا خۆپیشاندانەکان چوارچێوەیەکیان بۆ دابنرێ و داواکان تایبەت بکرێن بە ئازاد کردنی زیندانییە سیاسییەکان و گەڕانەوەی دێهاتەکان!

ئەوکاتە رژێمی عێراق و بەرەکانی جەنگ و نارەزایی زۆری شیعەی عێراق لە بارێکدا نەبوو، کە رژێم بتوانێ ئەو خۆپیشاندانەی خەڵکی کوردستان نادیدە بکات! بۆیە لە ١٩٨٢/٧/١٤ دا، رژێم لێبوردنی گشتی بۆ زیندانییە سیاسییەکان دەرکرد و بەمەش یەکێک لە دەسکەوتەکانی ئەو راپەڕینە ئازاد بوونی مامۆستا (جەمال تایەر) بوو، دواتریش رژێم لە ژێر گوشاری ئەو راپەڕینەدا ئامۆژگاری هەندێ لە هێزە سەربازییە مەحەلیەکانی کرد، کە چاوپۆشی لە هاتووچۆی جووتیارانی کورد بۆ مەزرا و گوندەکانی پێشووی خۆیان بکەن و هەندێ لە ئەفسەرە تاواتکارەکانی ئەمنیشیان لە کوردستانەوە گوێزایەوە بۆ خواروی عێراق!

## کوردستانی رۆژهەڵات و پشتیوانی!

لە دوای هاوینی ساڵی ١٩٨٢، هێرش و پەلاماردانی هێزەکانی ئێران بۆ سەر جووڵانەوەی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان بەردەوام بوو، بەوەش زەبرێکی گەورەی لە هێزەکان و بنکە و بارەگاکانی (حیزبی دیموکرات) و (کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران)دا! بۆیە گوشارێکی زۆر کەوتبووە سەر بنکەکانی سەرکردایەتیی (حیزبی دیموکرات) و گوێزانەوەی رادیۆ و کەلوپەلە گرنگەکانی سەرکردایەتییان، کارێکی ئاسان نەبوو! لە مانگی ئەیلولدا، تادەهات ئێران زیاتر تەنگی بە (حیزبی دیموکرات) هەڵدەچنی، هێزەکانی (حیزبی دیموکرات) یش، لە بەرەنگارییەکی زۆر سەختدا بوون و تەنگیان پێ هەڵچنرابوو!

دکتۆر (قاسملۆ)، داوای لە حیزبی (شیوعی) و لە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) کرد، کە بە دەنگیانەوە بچن و لە بەرگریدا هاوکارییان بکەن و یارمەتییان بدەن! (مام جەلال) لە کۆبوونەوەیەکدا، کە (نەوشیروان مستەفا)ش ئامادەی بوو لە ١٩٨٢/٩/١٥دا، لە وەرامی ئەو داوایەدا بە

دکتۆر (قاسملۆ)ی وتبوو: ئەگەر (یەکێتی)ش لە پاراستنی جووڵانەوەی ڕزگاریی نیشتیمانیی کوردستانی ئێراندا شەهید بێت، بۆ ئێمە مایەی شانازیە و ئامادەین بۆ یارمەتی دانتان! بەڵام لایەنەکانی تر لە کوردستانی باشوور دڵی (کۆماری ئیسلامی ئێران)یان، نەگۆڕیەوە بۆ گەورەترین ئەرکی نەتەوەیی!

ئێمە کە ئیتر بڕیاری مەبدەئیمان دا، کەوتینە هەڵسەنگاندی مەیدانی و وردبوونەوە لە بارو دۆخەکە، (ملازم عومەر)، کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو، بۆی دەرکەوت هێزەکانی (حیزبی دیموکرات)، تاڕادەیەک شپرزە و ماندوو کەم توانا بوون! لەبەر ئەوە سەرکردایەتیی (یەکێتی) نزیکەی دوو هەزار پێشمەرگەی لە هێزی مەڵبەندەکان کۆکردەوە و خودی (مام جەلال) یش بۆ بەهەند وەرگرتنی ئەو ئەرکە خۆی چووە ئەودیو و لە دەشتی ساوێن بارەگای خۆی دانا و ڕاستەوخۆ سەرکردایەتیی هێزەکانی کرد و (ملازم عومەر) و ژمارەیەک لە ئەندامانی سەرکردایەتی و فەرماندە ناسراوەکانیشی لەگەڵ خۆی برد! هێزەکانی (یەکێتی)، ڕۆڵێکی باشیان بینی و لە چەندین شوێن شەڕی قارەمانانەیان کرد و دەستی باشیان وەشاند و چەندین شەهید و بریندار‌ی دا! ئیتر بەوجۆرە هێزەکەی (یەکێتی) بووە (هێزی پشتیوان)، لە کوردستانی ڕۆژهەلات!

بە داخەوە ئەوکاتەی کە هێزەکانی (یەکێتی)، پشتیوانییان لە کورد و لە کوردستانی ڕۆژهەلات دەکرد، لایەنە کوردییەکان هەموو لە یەک بەرەدا نەبوون و یەک هەڵوێست نەبوون! (پارتی)، بە هاوکاریی ئێران لە شەڕەکاندا و هێزەکانی تری (جود) یش، لەگەڵ (پارتی) دا بە هێرشی ڕاگەیاندن پەلاماری (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) یان دەدا! لەسەر ئەو هاوکارییەی کوردی ڕۆژهەلات هەوڵیان دەدا ئەو ئەرکە

نەتەوەیی و مێژوییەی (یەکێتی)، بە خزمەتی رژێمی عێراق لە قەڵەم بدەن! لەبەر ئەوە ئێمەش رادیۆ و دەزگای راگەیاندمان گەرم کرد و بەوەرامدانەوەیەکی ژیرانە لەگەڵ (نەوشیروان) و هاوڕێ (رێکەوتی عوسمان بەگ)دا، پێکەوە زنجیرەیەک وتاری یەک لەدوای یەکمان نووسی، لە ژێر ناوی (مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە، یا چەند مەسەلەیەک) و رۆژانە بە زنجیرە لە ئێزگەکە بڵاومان دەکردەوە!

لە ریزەکانی خۆشماندا و لە ژێر زەبری ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ناو (کۆمەڵە)دا، رەخنەیەکی زۆر ئاراستەی ئەو هەڵوێستەی (یەکێتی) دەکرا و زۆر لەو هاوڕێیانە بە کارێکی هەڵە و نا دروستیان لە قەڵەمدا و بگرە هەندێ جار لەوەش زبر تر قسەیان لەسەر دەکرد! راستییەکەی بەو جۆرەی لەو زنجیرە وتارەدا باسمان کرد بوو، ئێمە پێمان وا بوو، کە ئەو هەڵوێست و هاوکارییە بڕیارێکی سەرپێیی و عاتیفی نییە و بەڵکو ئەرکێکی نەتەوەییە، بۆیە دەبێ لەکاتی تەنگانە و پێویستیدا، پارچەیەکی کوردستان بە تەنگ پارچەیەکی تری نیشتیمانەکەیەوە بچێت! چونکە پەروەردە کردنی هێزەکانی هەردوو پارچەکە بە هەستێکی نیشتیمانی و بە یەکێتیی پرسە نەتەوەییەکانی کوردستان و جۆشدانی گیانی هاوکاری، ئاوڕ دانەوەیە لە قووڵایی ستراتیجی جووڵانەوەی کورد لە پارچەکانی تر! راستە ئەو هاوکارییەی هێزی پشتیوانیی (یەکێتی)، بۆ کوردی کوردستانی رۆژهەڵات نەبووە هۆی هەڵسانەوەی (حیزبی دیموکرات)، بەڵام بووە هۆی ئەوەی کە:

* هەستی نیشتمانی و یەک پارچەیی مەسەلەی نەتەوەیی کورد، لە هەر دوو کوردستانی باشوور و رۆژهەڵات، بەهێز بکات!

* هاوکاری و تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان (یەکێتی) و (حیزبی دیموکرات)دا، بەهێز تر و قووڵتر بکات و بوار بۆ داڕشتنی ستراتیجی

هاوبەشـی جووڵانـەوەی نەتـەوەی کـورد بڕەخسـێنێ و بـە کـردەوەش لەگـەڵ (حیزبی دیموکرات و پەکەکە)، بۆ ئـەو باسـانە کۆبونـەوە و قسـە و باسـی جددیشـی لەسـەر کـرا!

* بواریـی دا بـە (حیزبـی دیموکـرات)، کـە بـە شـێنەیی رادیۆکەیـان و کەلوپەلـی مەکتەبـی سیاسـی و بنکەکانیـان بگوێزنـەوە، بـۆ ناوچەیەکـی سـنووریی سـەلامەتتر و ئەمینتـر!

* کۆمـاری ئیسـلامیی ئێـران، توندتـر و دژتـر بێـت بەرامبـەر بـە (یەکێتـی) و ئـەو هاوکارییـەی (حیزبی دیموکرات)، بـە کارێکـی لـە بەخشـین نەهاتـوو لـە قەڵـەم بـدات!

* تادەهـات ناکۆکییەکانـی (یەکێتـی)، لەگـەڵ لایەنەکانـی (جـود) تونـد تـر دەبـوو! چونکـە لـەو ماوەیـەدا (پارتـی)، شـان بـە شـانی هێزەکانـی ئێـران دژی (حیزبـی دیموکـرات و یەکێتـی) لـە شـەڕدا بـوو، تەنانـەت لـە هەنـدێ شـوێن لـە هێـزە شـەڕکەرەکانی بـەرەی (جـود)، لـە لایـەن (یەکێتـی) ەوە بـە دیل گیران! ئیتر بـەرە بـەرە لق و ناوچەکانـی (پارتـی)، لـە ناوچەکانـی ژێـر دەسـەڵاتی (یەکێتـی)، کەوتنـە گێچەڵـی بـەردەوام و ئاڵۆزکردنـی ناکۆکییـەکان! بەمـەش بەرەبەیانیکـی تەمـاوی بـۆ جەولەیەکـی نوێـی شـەڕی ناوخـۆ هاتەکایـەوە!

## گۆڕینی هەیکەلی ڕێکخستنی (یەکێتی) و هێزی پێشمەرگە!

یەکێک لە داهێنانە باشەکانی (نەوشیروان مستەفا)، ڕێکخستنەوەی هەیکەلی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانەی (یەکێتی) بوو، لە لقەکانی (یەکێتی) یەوە بۆ مەڵبەندەکانی (یەکێتی) و پێکهێنانی چوار مەڵبەند بە زۆرترین دەسەڵاتی نامەرکەزییەوە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆیاندا و هەروەها گۆڕینی ناوی (هەرێم)ەکانی پێشمەرگە بوو بۆ نزیکەی٣٠ (تیپ)ی پێشمەرگە! ئەمە لەو پرۆژە و داهێنانە نوێیە بوو، کە کاک (نەوشیروان) تەبەنی کرد!

بەهۆی جەنگی (عێراق - ئێران)ەوە و لاواز بوونی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق لە زۆر ناوچەی کوردستان، خەڵکی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە، بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆیان و بۆ بەلادا خستنی کێشە و گیرو گرفتەکانیان لەسەر زەوی و ئاو و ئاودێری و لەوەڕگە و پووش و پاوان و لە سەر قەرز و ژن و ژنخوازی، ئەوا بۆ چارەسەر کردنی ئەوانە و زۆرێ لە کێشە کۆمەلایەتییەکانیان، روویان دەکردە

پێشمەرگە و دام و دەزگاکانی (یەکێتی)! بەرپرس و لێپرسراوەکانی (یەکێتی)ش، کە ڕەنگ بوو هەندێ جار حوکم و ڕەفتارەکانیان لە ئاستی پێویستدا نەبووبێ، بەڵام بەگشتی ڕۆڵێکی داهێنەرانەیان لە چارەسەر کردنی کێشەکانی دانیشتوانی ناوچەکەدا هەبوو! چونکە ئەو بەرپرسانە سەرباری ئەوەی کە پێویست بوو پارێزگاری ناوچەکە لە هێرش و پەلامارەکانی ڕژێم بکەن، دەبوو بە کردەوەش حوکمڕانیی ئەو ناوچانەش بگرنە ئەستۆ، دیارە ئەوەش ئەرکەکەیانی قورستر و گرانتر کرد بوو! هەروەها هەر بەهۆی بارودۆخی جەنگەوە ژمارەیەکی زۆر سەربازی کورد، لەوانەی کە نەیاندەویست بەشداری بەرەکانی جەنگ بکەن و لە دەسەڵاتی ڕژێم هەڵهاتبوون و هاتبوونە ناوچەکانی بن دەستی پێشمەرگە، دۆخێکی تری بۆ هێزی پێشمەرگە دروست کرد بوو! هەرچەندە زۆرێ لەوانە، کە نزیکەی ٥٠٠ کەس دەبوون، دواتر بوون بە پێشمەرگە، بەڵام پێویستییان بە جۆرێکی جیاوازتر هەبوو لە مامەڵەکردن لە گەڵیاندا! بۆیە ئەوانە لە هەرێمەکانی ئەو کاتە ڕێک نەخران و فەرماندەیی نەدەکران. چونکە پرۆژەکەی (نەوشیروان)، شێوەیەکی نوێ و ژمارەیەکی زۆرتری لە یەکەی پێشمەرگە پێویست بوو، تا بتوانێ ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە بگرێتە خۆ و ژمارەیەکی زۆرتریش فەرماندەی پێشمەرگەیی پێ بگەیەنێ!

پرۆژەکەی (نەوشیروان مستەفا) بەم جۆرە دارێژرا و جێبەجێ کرا:

• مەڵبەندی یەک بۆ شارباژێڕی ئەوبەر و هەورامان و بەری قەرەداخ دیاریکرا! ئەو دەمە بارەگاکەی لە حاجی مامەند بوو، بەڵام دوایی بەهۆی جەنگی (عێراق - ئێران) ەوە، کە نزیک بووبووەوە لە دەڤەری پێنجوێن، گوێزرایەوە بۆ بەلەکەجار لە بەری قەرەداخ. لێپرسراوەکەی لە سەرەتادا (مەلا بەختیار) و پاشان (جەبار فرمان) بوو، لێپرسراوی

پێشمەرگەش خوالێخۆش بوو (بەکری حاجی سەفەر) بوو! تیپەکانی مەڵبەندەکەش بریتی بوون لە تیپی ١٥ ی هەورامان، ١١ ی شارەزور، ٣١ ی بەرزنجە ، ٣٣ ی سلێمانی و ٣٧ ی شارباژێڕ!

• مەڵبەندی دوو، تایبەت بوو بە دۆڵی جافایەتی و تا دەچێتەوە سەر ناوچەکانی مەرگە و رانیە و قەلادزێ و هەر دوو بەری کەرکووک و گەرمیان! بارەگاکەی لە سەرگەڵوو بوو، لێپرسراوەکەی (عەلی بچکۆل) و لێپرسراوی پێشمەرگەش (مستەفا چاوڕەش) بوو! تیپەکانیشی بریتی بوون لە تیپی ١٢ ی کەرکووک، ٤٧ ی پیرەمەگرون، ٢١ ی سورداش، ٥٧ ی سەگرمە، ٥١ ی گەرمیان، ٤٣ ی ئاسۆس، ٦٨ ی مامەندە، ٤٤ ی چەکوچ و ٦١ ی جووتیاران!

• مەڵبەندی سێ، تایبەت بوو بە ناوچەکانی رەواندوز، باڵەکایەتی، دۆڵی وەرتێ و دۆڵی خانەقا و دۆڵی شاور! تیپەکانیشی بریتی بوون لە تیپی ١٢ ی سۆران، ١٤ ی ئاکۆ، ٧٤ ی باڵەک، ٧٧ ی کۆدۆ و ٧٨ کارۆخ، لێپرسراوەکەی شەهید (حەسەن کوێستانی) بوو، هەرچەندە لە سەرەتاوە بۆماوەیەکی کورت لێپرسراوەکەی ( سەید مەجید) بوو!

• مەڵبەندی چوار، بارەگاکەی لە بالیسان بوو، سەرەتا دکتور (کەمال خۆشناو) و پاشان (کۆسرەت رەسول)، لێپرسراوی بوون! ئەم مەڵبەندە تایبەت بوو بە ناوچەکانی هەولێر لە بالیسانەوە تا دوا سنووری هەولێر. تیپەکانیشی بریتی بوون لە تیپی ٨٦ ی هەولێر، ٨٣ ی هەورێ، ٩١ ی سەفین، ٩٣ ی کۆسرەت، ٩٩ ی بیتوێن!

مەڵبەندەکان لە ناوچەکانی خۆیاندا هەر یەکەیان سەرکردایەتییەکیان هەبوو! هەر مەڵبەندەی لە چەند بەشێ پێکهاتبوو. بەشەکانیش، بەشی (عەسکەری، مالی، کۆمەڵایەتی و راگەیاندن)، بوون! لە رووی سیاسییەوە جگە لە بڕیاری شەڕ و ئاشتی و هاوپەیمانی و لە بواری

پێشمەرگایەتیشدا جگە لە دانانی سەرتیپ و ئەندامانی مەڵبەندەکان، دەسەڵاتی هەموو کاروبارێکی خۆیان هەبوو! هاوکات هەر مەڵبەندە نەخۆشخانە و پزیشکی تایبەت و دادگایەکی خۆی هەبوو!

(کۆمەڵە)ش لە سنووری هەر مەڵبەندێکدا رێکخراوی تایبەتیی خۆی هەبوو بۆ راپەراندنی کاروباری رێکخستنەکانی خۆی، راستەوخوش بەسترابوونەوە بە ( ناوەندی کۆمەڵە) وە!

ئەو گۆڕانکارییەی مەڵبەندەکان، تاقیکردنەوەیەکی پە سوود و سەرکوتوو بوو! چونکە تەکانێکی گەورەی دا بە گەشەکردنی (یەکێتی) و توانی دەسەڵاتی (یەکێتی)، بە باشی لەو سنوورەدا بچەسپێنێ و زۆرتر جەماوەر لە دەوری (یەکێتی) کۆبکاتەوە و پەیوەندی و رایەڵی راستەوخۆ و تۆکمەیان لەگەڵ دابمەزرێنێ و گورێکی باشتریش بە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە بدات! بەمەش هێزی پێشمەرگە دەسەڵاتێکی زۆرتری بەسەر زۆرێ لە ناوچەکانی تری کوردستاندا بۆ رەخسا! بەڵام حەیف نەیتوانی شتێ لە هۆکارەکانی ململانێی ناوخۆی لایەنە سیاسییەکانی کوردستان کەم بکاتەوە، بگرە تا توانا و دەسەڵاتی (یەکێتی) زیاتر دەبوو، بەهۆی ئیرەیی هێزەکانی ترەوە لە (یەکێتی)، ژیلەمۆی ئاگری شەڕی دەسەڵات لە بنەوە تا دەهات زیاتر تینی دەسەند!

## بەشی دووەمی شەڕی ناوخۆ!

لە سەرەتای سالی ١٩٨٣ و لە ١/١٧ ئەو ساڵەدا، شەڕێکی ناخۆش لە نێوان پێشمەرگەکانی (حسک) و پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، لە گوندی نێرەگین لە ناوچەی کۆیە رووی دا! وارێدەکەوێ پێشمەرگەکانی (یەکێتی) و ئەوانەی (حسک)، پێکەوە دەکەونە ئەو گوندەوە، پێشمەرگەکانی (حسک)، ژمارەیان زۆرتر دەبێت، بۆیە هەوڵ دەدەن پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، چەک بکەن! لە ئەنجامدا دەبێتە شەڕە تفەنگ و کادرێکی (یەکێتی)، شەهید دەبێت و ٢ پێشمەرگەش بریندار دەبن!

لە دوای ئەو رووداوە و لە مانگی دووی هەمان ساڵدا، هەوڵێکی زۆر لە ئارادا بوو بۆ جێگیر بوونی ئاشتی، چونکە کۆبوونەوەیەکی گرنگی هەموو حیزب و لایەنەکانی عێراق بە کوردیشەوە لە ئارادا بوو! سەرکردایەتیی (یەکێتی)، ئامۆژگاریی هێزەکانی خۆی کرد، کە خۆیان لە هەڵچوون و بارگرژی و شەڕ بپارێزن! ئەوەندەی نەبرد لە ١٩٨٣/٢/٦ دا، پاش کۆبوونەوەی لیبیا، کە ١٩ لایەنی سیاسی عێراقی و

یە بەشداریی (یەکێتی و پارتی و حسک و حیزبی شیوعی)، ڕێککەوتنێک لە نێوان هەموو ئەو لایەنانەدا ئیمزا کرا، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی فراوان بە ئامانجی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراق، کە تیایدا (ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەسەلمێنێ و دابین دەکا). بە پێی ئەو ڕێککەوتنە بڕیاردرا بوو دەست بەجێ شەڕ لەنێو لایەنە کوردی و کوردستانییەکاندا ڕابگیرێ!

هەر لەو ڕۆژانەدا و لە ٢/٦ /١٩٨٣ دا، لە ناوزەنگ لە کۆبوونەوەیەکی دوو قۆڵی لە نێوان (یەکێتی و حیزبی شیوعی)دا، هەمان بڕیارەکانی کۆبوونەوەکەی لیبیا پەسەند کران! ئاگاداریش کران ئەگەر بێت و برادەرانی (جود)، هێزەکانیان کونترۆڵ نەکەن، ئەوا دۆخەکە بە ئاقارێکی وادا دەڕوات، کە بارەگا و سەرکردایەتییان نەتوانن بە ئارامی لەو شوێنانەیاندا بمێننەوە! کەچی هێندەی نەبرد لە ١٤/ ٢ / ١٩٨٣دا، هێزێکی (پارتی)، بە فەرماندەیی (حەسۆ میرخان)، لەناو خاکی ئێرانەوە هاتن و بەرامبەر بارەگاکانی سەرکردایەتی (یەکێتی)، لە خڕی ناوزەنگ دامەزران و سەری جاسووسان و قوتە بەرزەکانی ئەوبەریان هەموو گرت! سەرکردایەتیی (یەکێتی)، دەستەیەکیان بۆ کفتووگۆ کردن بە لێپرسراویتی (حەمەی وەتمان)، کە فەرماندەی تیپی ناوچەکە بوو، ناردە لایان، ئەو سەردانەی کاک( محەمەد) و گفتوگۆکانی کاری کردە سەر فەرماندەکانی (پارتی) و خەریک بوو دۆخەکە هێور دەبووەوە، بەڵام سەرکردایەتیی (پارتی)، بە ئاشتی و گفتوگۆکە ڕازی نەبوو، بە نامەش لە ١٩٨٣/٢/٢٨ سەرزەنشتی (حەسۆ میرخان) یان، کرد! لە هەمان کاتدا حیزبی (شیوعی)، لە ڕێککەوتنە ١٩ قۆڵییەکە و لە بەڵێنەکان پەشیمان بووەوە، ئەمانەش هەموو ئاماژە بوون بۆ ڕوودانی دۆخێکی نەخوازراو!

لە ٢/١٢ /١٩٨٣دا، لە دەشتی هەولێر و لە هەندێ شوێنی کۆیە لە نێوان

هێزەکانی (جود) و (یەکێتی)دا، هەندێ شەڕ و پێکدادان روویان دا! بەمەش شەڕی راگەیاندن و رادیۆشی بەدوادا هات! لایەنەکانی جود (حسک و پارتی و حیزبی شیوعی)، نیازیان باش نەبوو، قسەکانیانمان پێ دەگەیشتەوە، کە بۆنی شەڕێکی سەختی لێ دەهات. هەموویان پێکەوە رێککەوتبون لەسەر تەمێکردنی (یەکێتی) و دەرپەڕاندنی هێزەکانی لە ناوچەکانیان. رووداوەکانیش لە بەختی رەشی کورد، پێشبینی باشی لێ نەدەکرا!

لە ١٩٨٣/٤/١دا، (پارتی)، کادرێکی ناسراوی هەبوو بە ناوی (جەزای عەلی کاتب)، کە هاوڕێ و دۆستی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی ئێمە بوو، تێکۆشەێکی باش و خۆشەویست بوو، هاوڕێ و خۆشەویستی (ملازم عومەر) و هاوڕێی سەردەمی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی منیش بوو لە سلێمانی! ئێستاش کوڕی ئەو زاتە ناوی (دانا)یە و ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانیە لەسەر لیستی (پارتی)، کە من بۆ خۆم بە دڵ خۆشم دەوێت و وەک برازای خۆم رێزی لێدەنێم! لە بۆسەیەکدا، کە لە راستیدا وەک دوایی بیستمانەوە، پێشمەرگەکانی شارباژێڕی (یەکێتی) بۆ (عوسمانی قالە منەوەر) یان نابوویەوە تا بیگرن، بۆ ئەوەی بتوانن چەکە رفێنراوەکانی پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، لێ بسێننەوە، کەچی بۆ بەد بەختی (جەزای عەلی کاتب)ی تیا بەر گوللە دەکەوێ و شەهید دەبێت، ئیتر هێندەی تر ئاگری شەڕ گەرم دەبێت! یەک رۆژ دوای ئەو رووداوەی شەهید (جەزا) و هەر لە شارباژێڕ، پێشمەرگەکانی (پارتی)، ئۆتۆمبیلێکی پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، دەدەنە بەر دەسرێژی گوللە و ٨ پێشمەرگەی (یەکێتی) شەهید دەکەن. دوای ئەوەش لەکاتی ناشتنی تەرمەکەی (جەزا)دا، یەکێک لە پێشمەرگە ناسراوەکانی (یەکێتی)، کە خزمی شەهید (جەزا) دەبێت و لەو مەراسیمەدا ئامادە دەبێ، کەچی بە

دەستی (پارتی)، شەهید دەکرێ!

کە هەستمان کرد دۆخەکە بە تەواوی رووی لە ئاڵۆزی کردووە و پێدەچێ رووداوەکان بەرە و دۆخی شەڕێکی گەورەتر بڕوات، پێشتریش نیازی خراپی ئەو قسانەی، کە لە زاری سەرکردەکانی (جود) ەوە پێمان دەگەیشتنەوە و دزەی دەکرد، ئیتر بۆمان دەرکەوت کە دۆخەکە نوقڵانەی ئایندەیەکی باشی لێ ناکرێ! بۆیە (نەوشیروان مستەفا)، بە تەلەفۆنی بێتەلی (حیزبی دیموکرات)ی ئێران، قسەی لەگەڵ لێپرسراوەکانی ئەوروپامان کرد، کە لە لای سوریا و لیبیا و دۆستەکانمان هەوڵێک بدەن جۆرێ لە گوشار بخەنە سەر لایەنەکان، بەڵکو بەر بە هەڵگیرسانی شەڕ بگرن!

لە رۆژی ١٩٨٣/٤/١٥ لە بناری کۆسرەت لە گوندی باداوان، هێزەکانی (حسک و حیزبی شیوعی) بە بێ هۆ تەقە لە فەرماندەی تیپ و (رێباز) ی جێگری فەرماندەی تیپ دەکەن و ٣ پێشمەرگەی تر شەهید دەکەن! شەهید (رێباز) لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویتی و دەڵێت: نیوەڕۆی رۆژی ٤/٢٥ بوو، شەهیدان (شەماڵ و رێباز) لە (چیوە)، لای ئێمە بوون و نانی نیوەڕۆیان لە بارەگاکەی ئێمە خوارد! ئیتر لەوێوە بەڕێکەوتن بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکەی خۆیان، بەهۆی رێکەوتنی ١٩ قۆڵیی لیبیاوە هیچ ترسێکیان نەبوو، کە شەڕ یەخەیان بگرێ. راستییەکەشی ئەوان بێ ئاگا بوون لە پەشیمان بوونەوەی برایانی بەرەی (جود) و ئاگاداری ئەوە نەبوون، کە ئەوان بڕیاری ئەوەیان داوە کۆبنەوە بۆ پەلاماردانی هێزەکانی (یەکێتی)! ناوچەی شارباژێڕ لەسەر لێواری شەڕێکی سەختدا بوو! (مەلا بەختیار) و (بەهادین نوری)، هەوڵیان دا خۆیان دوور بگرن لەو شەڕە و بۆ ئەوەش پێکەوە لەسەر ئەوە رێککەوتن! لە ١٩٨٣/٤/١٩ دا، شەڕ لە نێوان هێزەکانی (جود) و هێزەکانی (یەکێتی)،

بە سەرکردایەتی (مەلا بەختیار)، هەڵگیرسا و شەڕەکە دوو ڕۆژی خایاند، هێزەکانی (جود) شکان و (پارتی و حسک)، گەڕانەوە بۆ ئێران و ئەوانەی حیزبی (شیوعی)ش بەهۆی ڕێککەوتنەکەی نێوان (مەلا بەختیار و بەهادین نوری) ەوە، ڕێگە دران، بە سەلامەتی بکشێنەوە! ئاگری شەڕ تا دەهات پەرەی دەسەند و هەموو ناوچەکانی دەگرتەوە. هێزەکانی بەرەی جود (حسک، پارتی، حیزبی شیوعی)، زۆربەی هێزەکانیان لە ناوچەکانی هەولێر کۆکردەوە لە دەوری مەڵبەندی چوار لە هەولێر و لە بالیسان، لوتکە بەرزەکانی ئەو ناوچانەیان گرت و هێزی خۆیان تیا دامەزراند! هێزەکانی (یەکێتی) ش، لە گوندی بالیسان و بیراوە، کە زیاتر لە ٢٠٠ پێشمەرگەی لەو ناوە نەمابوون و هێزەکانی مەڵبەندی سێیش خەریکی پاراستنی ناوچەکانی خۆیان و گرتنی هەندێ ڕێگەی گرنگ بوون و نەیانتوانی بگەنە کۆمەکیان! ڕۆژی ١٩٨٣/٤/٢٦ لێپرسراوەکانی (یەکێتی)، هەوڵی بێ لایەنکردنی هێزەکانی حیزبی (شیوعی) یان دا و بۆ ئەو مەبەستەش کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ کردن، بەڵام هیچ سوودی نەبوو! (ملازم سەید کەریم)، بە نیازی بەرگری، هێزەکانی لە پشت بالیسان و گوندی شریمک دادەمەزرێنێ و هەر ئەو بەرەبەیانەش شەڕ دەست پێ دەکات و هێزەکانی (جود)، لە هەموو لایەکەوە پەلاماری بالیسان دەدەن! هێزەکانی (یەکێتی)، توانییان تا ئێوارە بەرگری بکەن و ئیتر بە ناچاری و دوای حەوت شەهید، کە لەناویاندا (ئەحمەد قەمبەری)، فەرماندەی خۆشەویستی ناو پێشمەرگە سەرەتاییەکان و مامۆستا (پێشرەو)، شەهید بوون، بەمەش هێزەکانی (یەکێتی)، کشانەوە و هێزەکانی جود (بالیسان) و بارەگای مەڵبەندی (یەکێتی) یان داگیر کرد و تالانیشیان کرد! بەو جۆرە پەلاماردانی بارەگاکانی مەڵبەندی چواری هەولێر بە گەلەکۆمەکێی هێزەکانی (جود)،

سـەرکردایەتی (یەکێتـی)، خسـتە سـەر ئـەو بڕوایـە، کـە دەبێـت پەلامـاری سـەرکردایەتی (حسـک و حشـع) و بنکـەی (پارتـی)، لـە ناوچەکـەدا بدرێت و تۆڵـەی ئـەو هەمـوو شـەڕ و گێچەڵەیـان لـێ بکرێتـەوە، کـە چەندیـن سـاڵە بـە (یەکێتـی) و هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتانی دەفرۆشـن!

## شەڕی قرناقا و پشتاشان!

سەرکردایەتیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بڕیاری دا ئەو هێرشە بە سەرکردایەتی (نەوشیروان مستەفا)، ئەنجام بدات. بۆ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی هێزەکانی مەلبەندی سێیش، شەهید (ئازاد هەورامی) راسپێردرا ئەو کارە بکات! لە ڕێگە لە بەستێی نزیک قەلاتووکان لە پشوودانی هێزەکاندا، هێزەکانی عێراق بە خەستی تۆپبارانی هێزەکە دەکەن و ۷ پێشمەرگە شەهید و ۲۲ پێشمەرگەش بریندار دەبێت و بە ڕێککەوتیش (نەوشیروان مستەفا)، لە گوللە تۆپێک دەربازی دەبێت!

لە رۆژی ۱۹۸۳/٥/۱، بە رەمزی (تۆڵە بە سەبرە، ئەمما بە زەبرە)، کە لە رادیۆکەوە بڵاوکرایەوە شەڕ و پەلامار بۆ سەر بنکە و بارەگاکانی ناوچەکانی (جود)، دەستی پێکرد و لە رۆژی دووەمدا هەموو بارەگاکانی (حسک و حیزبی شیوعی و پارتی و پاسۆک)، گیران و هێزەکەی مەڵبەندی سێ بە سەرپەرشتی شەهید (ئازاد هەورامی)، لە قۆڵی کۆمتانەوە یەکی گرتەوە لەگەڵ هێزە گەورەکەی (یەکێتی)

دا و بەڵگەنامە و نووسراوێکی زۆر کەوتە دەست هێزەکانی (یەکێتی) و ئەنجا هێزەکە کشایەوە بەرەو ناوچەکانی مەڵبەندی چوار، کە هێزەکانی (جود) داگیریان کردبوو، نزیکەی ٩٠٠ پێشمەرگەشیان لەو ناوچەیەدا بوون! زۆری نەخایاند ئەو ناوچانەش کەوتنەوە دەست هێزەکانی (یەکێتی) و هێزەکانی (جود)یش، زۆریان کشانەوە بۆ ناو خاکی ئێران!

لەو شەڕەدا حیزبی (شیوعی)، لە ئاستی باڵایاندا چەند دیلێکیان لێکەوتبوو! (نەوشیروان مستەفا)، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی ئەمیندا بە ڕێزەوە هەریەکە لە (کەریم ئەحمەد و ئەحمەد بانیخێلانی و ئەبوشوان) یان نارد بۆ لای ئێمە! کە هێنایانن بۆلای ئێمە، منیش خێرا (ملازم عومەر) م ئاگادار کرد و ئەویش خێرا بەپەلە هات! چەند توانیمان و بۆمان کرا ڕێزمان لێگرتن و هەوڵماندا هەندێ لەو برینەی دڵیان سارێژ بکەین. خوا هەڵناگرێت (ملازم عومەر)، چونکە خۆی پیاوێکی ڕەوشت بەرزە و دەزانێ چۆن ڕێز لە تێکۆشەری گەورە دەگرێت، زۆر لە منیش زیاتر بە دەوریاندا هات! بەڵام هێندەیان پەشۆکاند بوون وا زوو چاک نەدەبوونەوە !

بەڵگەکان ڕەوانە کران بۆ سەرکردایەتی، پاش خوێندنەوەیان نامیلکەیەکمان لەسەر نووسی و بڵاومان کردەوە تا ڕاستییەکان لای هەموو کەس ڕوون و ئاشکرا بێت، کە چ هێز و لایەنێ هۆکاری سەرەکی ئەم دۆخەیە!

کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ زیاتر تەنگ هەڵچنین بە هێزەکانی (حیزبی دیموکرات) و هێزی پشتیوان، هێزێکی (پارتی) بەو زستانە لە پشتی سەردەشتەوە ناردە بەرزاییەکانی بەرامبەر بارەگاکانی (یەکێتی) و ڕۆژانە بۆ بێزار کردن چەند تۆپێکی دەگرتە ناوچەکانی سەرکردایەتی!

ئێمەش بیرمانکردەوە، کە شوێنێکی لەبارتر بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی پەیدا بکەین! سەرەتا بەرە و کوێستانەکانی جەمالەدین و باوزێ و گوندەکانی دەوروبەریمان هەڵبژارد، لە پێش هەمو شتێکدا رادیۆ و کەلوپەلەکانی راگەیاندنمان گوێزایەوە و پاشان مامۆستا (جەمال تایەر)، بارەگای خۆی بردە ئەوێ. زۆری نەخایاند پاش پاکردنەوەی سنوورەکانی مەڵبەندی سێ و چوار لەسەر خۆ (مام جەلال) یش گوێزایەوە بۆ ناوچەی خوشناوەتی و لە نزیک بالیسان بارەگایەکی دامەزراند! ئەوکاتە (نەوشیروان)، لە دۆڵی بالیسان و لەلای توتمێ شوێنێکی خۆش کرد بوو، منیش رۆژێکیان بۆ هەندێ کاروباری پێویستی (ناوەندی کۆمەڵە)، چووم بۆ لای!

## دیسان شەڕی ناوخۆ (کونە کۆتر)!

پاش ئەو شەڕانەی ناوخۆ و کشانەوەی هێزەکانی (جود) بۆ ئێران. لەوێ هێزەکانی (جود) بە یارمەتی ئێرانییەکان و لە نەخشەیەکی سەربازیی ئێراندا، بۆ گرتنی حاجی هۆمەران و گردمەند، هێزەکانی (جود)ی ڕێکخستەوە و هاوکاریی کردن تا بگەڕێنەوە دۆڵی خانەقا و شێخ شەرۆ و کونە کۆتر! ئێمە بە نەخشەکەمان زانی. ئەو کاتە (مام جەلال)، لە خۆشناوەتی بوو لەگەڵ کاک (نەوشیروان)! داوایان لە (حەسەن کویستانی)، کرد هێزەکانی ئامادە و وریا ڕابگرێ! (سەید کریم) یش بە هێزێکەوە ، کە (ڕێباز و مامۆستا بەکر)ی لەگەڵ بوو زیاتر لە ٥٠ پێشمەرگە دەبوون، لە هەمان کاتدا هێزێکی حکومەتی عێراق دەچونە قەیرێ لای خانەقا و سەری مامە رووت، هێزەکانی ئێمە خۆیان لەو هێزەی عێراق کەڕ کرد، چونکە نەیان دەویست لە یەک کاتدا دوو جەبهە بۆ خۆیان بکەنەوە!

نەخشەکەی (جود) وابوو، سوود لە هێرشەکانی ئێران وەربگرن و

ئەوانیش هەوڵ بدەن بێنە (کونە کۆتر و شێخ ئایش و دەرگەڵە)، لە هەنگاوی دووەمیشدا بێنە (وەرتێ و خانەقا)! پاش ئەوەی هێزەکانمان توانییان لە شوێنەکانی خۆیان ئامادە و تەیار بن، نەخشەیەک کە (نەوشیروان مستەفا)، دایڕشتبوو لە شەوی ١٢ لەسەر ١٩٨٤/٨/١٣، لە سێ قۆڵەوە هێرشی وەرامدانەوەی (یەکێتی) بۆ سەر ناوچەکە و هێزەکانی (جود)، دەستی پێکرد!

١ – (حەسەن کوێستانی)، لە ناوچەکەی خۆیەوە و بە زیاتر لە ١٨٠ پێشمەرگەوە!

٢ – (عەلی بچکۆل)، بە هێزێکەوە، کە لە ١٥٠ پێشمەرگە زیاتر بوون و (نازمی حەمەی سلێمان)ی لەگەڵ بوو، حەیف هەر لەو شەڕەشدا شەهید بوو!

٣- (سەید کەریم)، بە یاوەری خوالێخۆش بوو (قادر خەبات) و (ئەحمەد مەولود و مامۆستا بەکر) و شەهید (ڕێباز)!

پاش چەند سەعاتێک شەڕ توانییان هەموو زنجیرە شاخی (بیبە و سێکانی و کونە کۆتر)، بگرن و خۆیانی تێدا دامەزرێنن، هەرچەندە ئەو قۆڵەی، کە (عەلی بچکۆل)، سەرپەرشتی دەکرد هەندێ دواکەوت!

زۆری نەبرد فڕۆکەکانی عێراق هاتن و بە خەستی و بۆ چەند جارێ هێزەکانی (یەکێتی) یان بۆردومان کرد!

(پارتی)، توانییان سود لە بۆردومانەکەی عێراق وەربگرن و شەڕ لەو ناوە بۆ ماوەی ١٩ ڕۆژ لە نێوان هەردولادا درێژەی کێشا! پاشان (نەوشیروان مستەفا)، بە هێزێکی گەرمیانەوە و (سەید کەریم) یش لەگەڵ فەرماندەکانی جاری پێشودا بە هێزێکی ٣٠٠ کەسییەوە و بە نەخشەکەی (نەوشیروان)، چوون لە پشتەوە هەڵگەڕان بەسەر کونە کۆتردا تا گەیشتنە سەر هێزەکانی (جود)! لەو شەڕەدا بە داخەوە

دوو فەرماندەی باش یەکەمینیان (حەسۆ میرخان) و لە هێرشەکانی دواتریشدا (نازمی حەمەی سلێمان)، بوونە قوربانیی ئەو شەڕە نەگریسە! ماوەیەک من و کاک (نەوشیروان)، لە تووتمێ و خەتێ پێکەوە بووین و لەو ماوەیەدا (مام ڕۆستەم)مان هاندا ژن بهێنێ! ڕۆژێکیان (نەوشیروان)، بە پێکەنینەوە هاتە لام، وتی.. (فەرەیدون) تۆ سەیری (ڕۆستەم) کە، نامەی بۆ نووسیوم دەڵێ: واخەریکم ژنەکە دەگوێزمەوە، بەڵام دڵنیانیم ئەو کارەم پێ دەکرێ، یان نا ! چونکە شەش مانگیش دەبێ هەستم بە حاڵەتەکەی خۆم نەکردوە و یەک جووڵەی نە کردووە، دەبێ چی بکەم؟! کاک (نەوشیروان) قاقا پێدەکەنی و دەیووت.. توخوا (فەرەیدەون)، ئەمە پرسیارە!

## دووەمین کۆنفرانسی (کۆمەڵە)!

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٢دا، دووەمین کۆنفرانسی (کۆمەڵە) بەسترا! لە راستیدا دەبوو لەم بیرەوەرییەدا پێشتر باسم لەو کۆنفرانسە بکردایە، بەڵام لەبەر گرنگیی تاقیکردنەوە تاڵەکانی شەڕی ناوخۆ بە باشم نەزانی زنجیرەی باسی ئەو شەڕانە بقرتێنم و باسی کۆنفرانس بکەم، بۆیە ئەو باسەی کۆنفرانسم خستە پاش ئەو داستانە ناخۆشەی شەڕی برا کوژی!

هەلومەرجی بەر لە کۆنفرانس و وەزعی ناوخۆی (کۆمەڵە)، ناکۆکیی جیددی گرتبووە خۆ، ئەو ناکۆکییانەش رەوتێکی وایان گرتبووە بەر، کە عاقیبەتێکی خێری لێ چاوەڕوان نەکرێ! هەم ململانێی خوێناوی هێزەکانی کوردستان بە جۆرێ بەرۆکی جووڵانەوەی کوردی گرتبوو، کە پرزەی لە هەموولا بڕیبوو هەم هەلومەرجەکە بە تەواوی ناخۆش و دژوار بووبوو!

بەر لەکۆنفرانس خۆمان لەناو (یەکیتی) دا، لەسەر ئەوەی دانوستاندن

لەگەڵ رژێمی عێراق بکەین یان نا، ناکۆک بووین! لەدوای یەکەمین کونفرانسی (کۆمەڵە)وە و لە مایسی ١٩٨١ وە، هاوڕێیانی (کۆمیتەی هەرێمەکان)، رۆژ بە رۆژ زیاتر لەناو (کۆمەڵە) دا هەستیان بە نامۆیی دەکرد و لە سەرجەم شێوازی بەڕێوەبردنی کارەکان نارازی بوون و تا دەهات گلەیی و بێزارییەکانیشیان کەڵەکەی دەکرد! ئێمە بۆ دۆزینەوەی رێگە چارەیەک پەنامان بردە بەر بەستنی کۆنفرانس.

سەرەتا رێگە و شوێنی رێکوپێک بۆ کۆنفرانس و بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی هێزی پێشمەرگە، دانرا! (مەلا بەختیار) یش رۆیشت بۆ ناو شاری هەولێر، کە کۆمیتەی رێکخستنی ناوخۆی شارەکان ئامادە بکات و نوێنەرەکانیان بنێرن! ئەوە بوو نوێنەرانی شارەکان گەیشتن تەنها ٣ ژنی تێدا بوو، هەموو چوونە بارەگای کاک (نەوشیروان) و ژنەکانیش لە بارەگای (ناوەند) و لەماڵی ئێمە و (مەلا بەختیار)، مانەوە تا کۆنفرانسەکە تەواو بوو!

دووەمین کونفرانسی (کۆمەڵە) لەو هۆڵە بەسترا، کە ئێمە بە پێشمەرگەکانی (ناوەندی کۆمەڵە)، دروستمان کرد بوو، هۆڵێکی گەورە و خۆش بوو، کورسیی پێویستمان تێدا دروست کرد بوو! لە کاتی دروستکردنیدا گا بەردیکی زۆر گەورە لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا بوو، ئەو کاتە لەبەر زوو تەواو کردنی هۆڵەکە بۆمان وورد نەکرا، ئیتر هەڵمان گرت بۆ کاتی تەواو بوونی تا ئەوسا بە شێنەیی و لە سەرخۆ بیشکێنین! لەو ماوەیەدا (سەردار)ی پوورم لە شاخی مامەندە شەهید بووبوو، باوکی ناوی (وەستا عەبدول) بوو تازە گەیشتبوو، هاتبوو تەرمی کوڕە شەهیدەکەی بباتەوە! کوڕێکی تریشی کە ناوی (بەختیار) بوو لەگەڵ خۆی هێنا بوو، داوای کرد لە شوێنی شەهید (سەردار)ی کوڕی (بەختیار)، تفەنگەکەی هەڵبگرێ و ببێتە

پێشمەرگە! لەو رۆژانەدا کە (وەستا عەبدول) هاتبوو، ئێمە خەریکی شکاندن و لابردنی ئەو گابەردە بووین، هەرچەندە پێشمەرگەکان کوڕی کردەشیان تێدا بوو، بەڵام هەرچەند خەریک بووین دەرەقەتی گا بەرد نەهاتین! وەستا (عەبدول) بە دەوری بەردەکەدا سووڕایەوە و چاکەتەکەی داکەند و کەوتە ویزەی گا بەرد، بڕوا بکەن سەرباری ئەو کۆست و خەمە گەورەیەی خۆی، کەچی تا ووردو خاشی نەکرد نەهاتەوە لای ئێمە!

لەو رۆژانەدا کە بڕیار بوو کۆنفرانس بگیرێ، شەهید (جەمال تایەر) کە بۆ دووەمین جار گیرا بوو هەر دوو جارەکەش زۆر ئەشکەنجە و ئازاریان دابوو، بەڵام چونکە پیاوێکی ئازا و خۆگر و ئەمین بوو، رژێم نەیتوانی هیچ زانیارییەکی لێ بەدەست بهێنێ، بۆیە بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرا بوو! ئەویش لەگەڵ (دلێری ئەحمەد شوکری، شێخ جەمال تاڵەبانی، مامۆستا ئەحمەد عەلی، نزار حەمە رەووف، مەحمود رەزا، جەزای سەید مەجید، فاروقی ئاڵتونچی، شەهید ئاراس مەحمود، وەزیرەی شێخ جەلال و نەزیرە فارس) و ژنێکی تردا هاتبوو! لەگەڵ نوێنەرانی هەولێریش (کۆسرەت رەسول عەلی) هاتبوو! هەرچەندە ململانێ و بیروڕای ناکۆک، بە زۆربەی کارەکانی کونفرانسەکەوە دیار بوو! بەڵام لە ئەنجامدا بڕیار درا :

* شێوەی رێکخستن، کە تا ئەو کاتە لە شێوەی (رێکخستنی ناوخۆی شارەکان) دا بوو، بگۆڕدرێ بۆ رێکخراوی سەربەخۆ و بۆ هەر شارە بەجیا و پەیوەندی راستەوخۆشیان بە ( ناوەندی کۆمەڵە) وە هەبێت!

* گفتوگۆ کردن لەگەڵ رژێمی عێراق پەسەند بکرێ!

* سەرکردایەتیی (کۆمەڵە) هەڵبژێررا، (نەوشیروان مستەفا، مامۆستا جەمال تایەر، مەلا بەختیار، ملازم عومەر، عەلی بچکۆل، کەمال

خوشـناو و فەرەیـدون عەبدولقـادر) بوونـە ئەندامـی سـەرکردایەتی و (نەوشـیروان مسـتەفا، جەمـال تایـەر، فەرەیـدون عەبـدول قـادر) یـش، بـە (ناوەنـدی کۆمەڵـە) دانـران!

## گەمەی دانوستاندن (مفاوەزات)!

کورد لە مێژە بۆ چارەسەری کێشە و ململانێکانی خۆی، ڕێگەی گفتوگۆی گرتۆتە بەر و بە یەکێک لە ڕێگە باشەکانی گەیشتن بە چارەسەری زانیوە و لە ناکۆکیی و ململانێی نێوان هۆزەکانیدا لەسەر لەوەڕگە و سنووری دەسەڵات و ئاو و پووش و پاوان، تەنانەت دوای شەڕ و تاڵانکردنی یەکتریش پەنای بۆ دانوستاندن بردووە! لە کێشەی نێوان هۆزەکان و و دەسەڵاتی فەرمانڕەوادا ئەو ڕێکارەی بۆ لە یەکتر تێگەیشتن و بۆ چارەسەری ململانێکان و گەیشتن بە مەرامی هاوبەش گرتۆتە بەر! کورد لەململانێکانیدا لەگەڵ دەوڵەتان و داگیرکەران چەند ناچار بووبێت خەباتی چەکدارانە بکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بەڵام هەرکات دەرفەتێک ڕەخسا بێت، هێندەش ناچار بووە، کە ڕێگەی گفتوگۆو دیالۆگ بگرێتە بەرو دانوستاندن ڕەتنەکاتەوە!
گفتوگۆ یا دانوستاندنەکانی جووڵانەوەی کورد لەگەڵ حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق شتێکی تازە نەبووە و ئەوەی ئێمەش یەکەمین

جاری نەبووە لە مێژووی رزگاریخوازانەی جووڵانەوەی کوردا، تا (یەکێتی) بە تەنها بیری لێکردبێتەوە! هەرچەندە ئەو گفتوگۆیەی ئێمە، کە لە ساڵی ١٩٨٣ - ١٩٨٤، (مام جەلال) وتەنی، کە لەگەڵ میری کردمان! هەر لە سەرەتاوە لەسەر پەسەند کردن یاخود نەکردنی، بە جۆرێک قسە و باسی جیاواز و کێشە و ململانێی لەسەر پەیدا بوو، کە لەناو ریزەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دا، بوو بە مایەی ئەوەی، کە دەستەیەک و هەندێ لە سەرکردە و کادیرەکان، بکەونە رەخنە و نارازی بوون و هەڵویست نواندن! لەلای حیزب و هێزە کوردییەکانی تریش، بووە هۆیەکی تری گەرم کردنی ناکۆکییەکانی نێوانمان! ئەوەش بووە بیانوویەک بۆ ئەوەی لایەنەکانی تر بە (یەکێتی) بڵێن خائین و خۆفرۆش! وەک ئەوەی پێش ئێمە هیچ لایەن و دەستە و تاقمێ گفتوگۆی نەکردبێت! یا گفتوگۆ کردن و سوود وەرگرتن لە دانوتسان وەک رێگە و تاکتیکێکی خەبات، کە هێزێ بتوانێ بەهۆیەوە شتێ بۆ گەلەکەی بەدەست بهێنێ بڤەو و حەرام بێت و هەرگیز لە عورفی سیاسی لایەنە نەیارەکاندا پەیرەو نەکرابێ! ئیتر بەو جۆرە گفتوگۆ کرا بە ناسنامەی خیانەت و خۆ فرۆشی و رەتکردنەوەیشی بوو بە راستگۆیی و هەڵویستی نیشتمانی!

دانوستاندن: رێگەیەکە لە رێگەگانی خەبات بۆ هێنانەدیی ئامانجێکی کاتی و بچووکی ئەو قۆناخەی، کە ئەو هێزە سیاسییە کاری خۆی تێدا دەکات، یا هێنانەدی بەشێک لە ئامانجە گەورەکە، یان بۆ کۆتایی هێنان بە دوا قۆناخی ململانێیەکی دوور و درێژ لە نێوان هێزە نەیارەکاندا! شێوەیەکە لە شێوەکانی بەرێوەبردنی ململانێی ئیرادە بە شێوەیەکی ئاشتی و هێمنانە و هاوکات رێگەیەکە لە رێگاکانی کاری دیپلوماسی، کە هوشیاری و دانایی و هونەر و وەستایی خۆی دەوێ، بۆ ئەوەی

کەمترین شت بدەی بەدەستەوە و لە بەرامبەریشدا زۆرترین دەسکەوت بەدەست بهێنی! بەڵام بە داخەوە کورد بەهۆی شارەزا نەبوونی و کەمیی زانیاریی لەسەر ئەم هونەرە، لەم گەمەیەدا سەرکەوتوو نەبووە! بۆیە لەخۆڕا نەوتراوە.. کورد ئەوەی لە خەبات و تێکۆشاندا بە دەستی هێناوە، هەمیشە لەسەر مێزی دانوستاندن و گفتوگۆ لە دەستیداوە!

دانوستاندن لەناو دەوڵەوتان و هێز و لایەنە گەورە و باڵا دەستەکان و لە هەموو کار و چالاکییەکی سیاسی و ئابووری و کەلتووریدا، ڕیگەیەکە بۆ هێنانەدیی دەسکەوتی سیاسی، ئابووری، یاخود هەردووکیان پێکەوە! هەندێ جاریش بە مەبەستی گێڕانەوەی هەندێ میراتی کەلتووری و مێژویی پەنای بۆ براوە! جاریش هەیە لایەنێک یا زیاتر کە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، ئەوا لە ڕێگەی دانوستاندنەوە مەرجەکانی خۆیان بەسەر لایەنی بەرامبەردا فەرز دەکەن و دەیسەپێنن، وەک ئەوەی دوای پاشەکشەی ڕژێمی عێراق لە کوێت و لە خێمەکەی (صەفوان) دا، دیمان! کاتیش هەیە باری لاسەنگی هاوکێشەکان و هەندێ قەیرانی سیاسی و ئابوریی دۆخێکی کتوپڕ و نوێ دێنێتە پێشەوە، کە دەرفەتی دانوستاندن دەرەخسێنێ!

گفتوگۆ و وتوویژ و دانوستاندن، کە لەناو خەڵکیدا (مفاوەزاتی) پێ دەڵێن، ڕێ و شوێنێکی کاری سیاسی و دیپلۆماسی بەرزە بۆ قسە کردن لەنێوان دوو لایەنی ناکۆک و نەیار بۆ لەیەکتر گەیشتن و نزیک بوونەوە لە باری سەرنجی یەکتر، لە پێناوی یەکتر قبووڵکردن و خۆگونجاندن بە مەبەستی گەیشتن بە ڕێکەوتن! گەوهەری کارەکەش شێوەیەکی هێمنانەی ململانێ و ویستی لایەنە ناکۆکەکانە لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، بەمەش هەر لایەک لەلای خۆیەوە دەیەوێ باری

سەرنجی خۆی لەسەر کۆی گشتی مەسەلەکە و وردەکارییە ئاڵۆز و شاراوەکانی دەرببڕێت و قازانج و دەسکەوت و ویستی خۆی لای لایەنەکەی تر شیرین بکات، تا قابیلی قبووڵکردن بێت! دیارە ئەو کارەش بەرچاو روونی و کارامەیی و دانایی شاندی گفتوگۆکەری دەوێت! بۆیە پێویستە ئەندامانی ئەو شاندە لە ئاستێکی بەرزی لێهاتویی و زیرەکیدا بن، کە خۆیان باش بناسن و ( توانا و ئامانج و ویستی خۆیان بە رۆشنی بزانن) و هاوکات (توانا و ئامانج و ویستی لایەنەکەی بەرامبەریشیان بناسن)، تا بتوانن لەو گەمە سیاسییە دیپلۆماسی و هەستیارەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن! دەبێت لایەنەکان لە دانوستاندا ئامانجی سەرەکی و ئامانجی کاتی دیاری بکەن و قۆناخ بە قۆناخی پرۆسەکە لایان روون بێت و بزانن دەبێت چی بە دەستەوە بدەن و چی لە لایەنەکەی بەرامبەریان وەربگرن! هاوکات دەبێت باش شارەزای دۆخەکە بن و ئەو هەلومەرجەش باش هەڵبسەنگێنن، کە ئەوان گفتوگۆی تیادا دەکەن، بۆ ئەوەی لە کاریگەریی و توانای دۆخە تایبەتییەکە بگەن و زەمان و زەمین بە باشی ببینن!
ئەوانە بە گشتی بنچینەی سەرەکی و یاسا و رێساکانی دانوستاندنن! رەنگە گفتوگۆکانی شۆڕشی جەزایر لەگەڵ فەرەنسادا یەکێک بێ لە گفتوگۆ و دانوستاندنە ژیر و سەرکەوتووەکان لە مێژوی ناوچەکەی ئێمەدا، کە تیایدا بەرەی رزگاریی نیشتمانیی جەزایر لەگەڵ فەرەنسا کەوتە گفتوگۆ کردن و دوایین خولی ئەو گفتوگۆیەش تا ٧- مارتی ١٩٦٢ ی خایاند، کە لە ئەنجامدا شاندی جەزایر بە سەرۆکایەتیی (کریم بلقاسم) توانی لەگەڵ شاندی فەرەنسادا رێککەوتنێک رابگەیەنێ، کە بە رێککەوتنی (ئیفیان) ناسرا و تیایدا رێککەوتن لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە کرا :

* راگرتنی ئاگری شەڕ!
* پەسەندکردنی قۆناخێکی کاتیی گواستنەوە !
* گشت پرسی بۆ مافی چارەی خۆنووسینی گەلی جەزایر!
* ئەنجامدانی چەندین ڕێککەوتنی هاوکاری لە ڕووی ئابووری و کەلتوورییەوە، بۆ پتەو کردنی پەیوەندی و دۆستایەتی، کە ٢٠ ساڵ بخایەنێ!
بەو پێیەش جەزایر لە داگیرکاری فەرەنسی رزگاری بوو، دان نرا بەسەروەریی جەزایر بە سەحرای جەزایریشەوە! پرۆسەی ئەو (دانوستاندن)ەی (جەزایر - فەرەنسا)، لە دەیان پەیوەندی و راسپاردە و چاوپێکەوتنی نهێنییەوە هەر لە ساڵی ١٩٥٦ وە تا ساڵی ١٩٦٢ درێژەی کێشا، لە پاڵ خەباتێکی سەخت و قوربانی دانێکی زۆر و بە دەستهێنانی سەرکەوتنی گەورە لە بەرەکانی شەڕدا و هاوکات نواندنی چالاکییەکی زۆری سیاسی و دیپلۆماسی، کە توانی هاوکێشەکان بەجۆرێ بگۆرێ، کە حکومەتی (دیگۆل)، ناچار بکات، بە فەرمی پرۆسەی (دانو ساندن) قبوڵ بکات!
سەرەتا کۆماری فەرەنسا لە ١٤ /١٩٦٠/٦دا ڕایگەیاند، کە ئامادەیە گفتوگۆی فەرمی لەگەڵ (حکومەتی کاتی جەزایر) قبووڵ بکات!
* گفتوگۆکانی نێوان شاندی ١١ کەسی فەرەنسا بە سەرۆکایەتی (لویس جیکس)، لەگەڵ شاندی ٩ کەسی جەزایر لە (مولان)، بە فەرمی دەستی پێکرد. لە سەرەتاوە چاوپێکەوتنی چەند کەسێکی شاندەکەی جەزایر لەگەڵ فەرەنسییەکان، بە باشی لە مەرامە سیاسییە قورسەکانی جەزایر تێگەیشتن و ئەندازەی جیاوازییەکانیان لێ حاڵی بوو! ئاخر تا ئەو کاتە فەرەنسییەکان دەیانویست جەزایر فەرەنسی بێت نەک جەزایری و تەواو سەربەخۆ! جارێکی تریش لە (ئیفیا) لە

١٩٦١/٥/٢٠دا، شـاندی جەزایـر بـە سـەرۆکایەتیی (کریـم بلقاسـم)، لەگـەڵ شـاندی فەرەنسـا کەوتـەوە خولێکـی تـری گفتوگـۆ، بـەڵام ئـەم جارەیـش نەیتوانی بگەنە ڕێکەوتن! تا لە ١٩٦١/٧/٢٠دا، پاش خولێکی تری گفتوگۆ لە (لوغران)، سەرۆکی ئەوکاتەی فەرەنسا جەنەراڵ (دیگۆل) دانی نا بـە سـەروەریی جەزایـر و هەمـوو ناوچـەی بیابانـی خۆرئـاوا.

* لە ١٩٦١/١٠/٢٨ لە شاری (بال) لە سویسرا و جارێکی تریش لە ٩ -١٩٦١/١٢/٣٠، خولێکی تری گفتوگۆکان دەستی پیکرد تاگەیشتە ئەوەی فەرەنسییەکان پرنسیپە بنەڕەتییەکانی سەروەریی جەزایر و قۆناخی کاتی گوێزانەوە و لێبوردنی گشتی بۆ شاندی جەزایری بسەلمێنن! ئەو ئەنجامانە لە لایەن شاندی جەزایرەوە خرانە بەردەستی ئەنجومەنی نیشتمانیی شۆڕشی جەزایر و ئەویش پەسەندی کردا!

* خولی کۆتایی گفتوگۆکان لە ٧- ١٩٦٢/٨/١٨، لە شاری (ئیفیان)ی فەرەنسا لەسەر کەناری دەریا و بەرامبەر شاری (لۆزان) ی سویسرا، ڕێکەوتنی کوتایی ئیمزا کرا و ڕاگەیەندرا.

## وانەکانی (دانوساندن )ی جەزایر لەگەڵ فەرەنسا!

* جەزایریـەکان درێژەیـان بـە پەیوەنـدی و چاوپێکەوتنەکانـی خۆیانـدا و سـەرکردەکانی جەزایـر نەیانویسـت ئـەو زنجیـرە پەیوەندییانـە بپسـێنن!

* لایەنـی جەزایـر لـە دانوسـانەکاندا بەرچـاوی روون بـوو، چونکـە دەیزانـی چـی دەکات و چـی دەوێـت! دیـارە ئەویـش سـەربەخۆیی و سـەروەریی تـەواوی جەزایـر بـوو!

* جەزایرییـەکان لـە دانوسـانەکاندا پـرۆژەی تۆکمـە و رێکوپێکیـان هەبـوو، هـاوکات دەیانزانـی چـۆن خۆیـان بـۆ لێـدوان ئامـادە دەکـەن!

* شـاندی جەزایـر، شـاندێکی کارامـە و لێزان و خاوەنـی زانیاریـی تـەواو بـوون! لـە هەمـووی گرنگتـر ئـەو شـاندە هەمیشـەیی بـوو، بەشـێکیان یـا هەموویـان لـە هەمـوو خولەکانـدا بـۆ ئـەو کارە ئامـادە و تەرخـان کرابـوون!

* جەزایرییـەکان خۆیـان و هـەم فەرەنسـییەکانیان بـاش دەناسـی. واتـە

هـەردوو لایـان بـاش هەڵسـەنگاند بـوو!  دەیانزانـی فەرەنسـییەکان چییـان دەوێ و چـۆن تاکتیکـی گفتوگـۆکان دەگـۆڕن و زۆر بـاش لـە دۆخەکـە و هاوکێشـەکان و لـە تـەرازوی هێـزەکان گەیشـتبوون!

بەکورتـی و بـە کـوردی سـەرکردەکانی جەزایـر بـاش لـە نیـاز و مـەرام و نەخشـەکانی فەرەنسـییەکان تێگەیشـتبون، بۆیـە دەیانزانـی کـە فەرەنسـییەکان زیاتـر لەبـەر ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە مفـاوەزات دەکـەن:

- جەزایریان بە فەرەنسـایی و بە هی فەرەنساشـیان دەزانی!

- درێـژە بـە پەیوەنـدی و چاوپێکەوتـن و زنجیـرەی گفتوگـۆ و دانوسـتاندن دەدەن، بـەو مەبەسـتەی بتوانـن خاڵـە لاوازەکانـی شـۆڕشـی جەزایر بدۆزنـەوە و کنـەی تێدا بکـەن و ریزەکانیـان تێکدەن، تـا بتوانـن شـۆڕشـەکەیان لەنـاو بـەرن!

- جەنـەراڵ (دیگـۆل)، بـە سیاسـەتێکی تونوتیـژ و بـە رێگـەی ئەمنـی و سـەربازی بـە نزیکـەی ٧٥٠,٠٠٠ هـەزار سـەرباز و بـە پەیـڕەو کردنـی سیاسـەتی سـووتاندنی تـەڕ و وشـک و بـە هێرشـە سـەربازییە بەردەوامەکانـی نەخشـەی (شـاڵ و موریـس) و بـە هێرشـە گەورەکانـی جەنەراڵ (شـاڵ) و بە دادگا تایبەتەکان لە دژی ویسـتی رزگاریخوازانەی گەلـی جەزایـر، دەجەنـگا! بۆیـە لـە ماوەیەکـی کەمـدا توانـی زیاتـر لـە چارەکە ملیۆنـێ مروڤی جەزایری ئـاوارە  بکات و بیانکات بە وڵاتانـی مەغریـب و تونـس دا!

- جەزایـر و شـۆڕشـەکەی قوڵاییەکـی عەرەبییـان هەبـوو، ژمارەیەکـی زۆر لـە وڵاتانـی عەرەبـی و هێـزە جیهانییـەکان پشـتیوانییان دەکـرد و رێگـەی چالاکـی سیاسـی و دیپلۆماسـییان بـۆ کردبووەوە!

- جەزایرییـەکان گیانبـازی زۆریـان کـرد و نزیکـەی یـەک ملیـۆن شـەهیدیان دا، سـەرەتا (ئەحمـەد بـن بیـلا)، بـوو بـە سـەرۆکی جەزایـر

و دواتریش لە ساڵی ١٩٦٥دا، (بۆمدین)، کودەتای بەسەر (بن بیلا)دا کرد و ئەو سەرۆکە بووە ئاوارەی وڵاتان و دور لە وڵاتی جەزایر و بە پەنابەر لە وڵاتانی بێگانە ژیانی بردە سەر!

- دەیانزانی تا چالاکیی شۆڕشی جەزایر زیاتر بێت و هەڵمەت و نەبەردەکان و کاری شۆڕشگێڕانەیان زۆرتر و بە زەبرتر بێت، باشتر دەتوانن نەخشە و پیلانەکانی فەرەنسا تێکدەن و درزی گەورە بخەنە ناو سەرانی فەرنساوە و کەلێنی ریزەکانیان گەورەتر بکەن! ئەمە بە کورتی هەندێ وانە و ئەزموون بوو، کە دەبوو ئێمەی کورد لە گفتوگۆکانی جەزایرییەکانەوە فێربوینایە و پەندمان لێ وەرگرتایە!

لە باشووری کوردستاندا و لە دروستبونی دەوڵەتی عێراقەوە، کورد کێشە و گیروگرفتی لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا هەیە! سەران و پارێزەرانی ئەو عێراقە دەسکردەش دەیانەوێ بە زۆر کوردی تیا لە قاڵب بدەن و بەپێی ئارەزووەکانی خۆیان رامی بکەن، بەڵام خۆشبەختانە بەهۆی خەبات و تێکۆشانی بەردەوامی گەلەکەمانەوە هەر لە سەردەمی حوکمڕانی (شێخ مەحمود) و شۆڕشی (بەرزان) و ئەیلول و شۆڕشی نوێوە بۆیان نەکراوە! نابێ بیریشمان بچێ شۆڕش و راپەڕینەکانی کورد لەو پارچەیەدا چەندە خەباتی شۆڕشگێڕانە و چەکدارییی کردووە، ئەوەندەش دانوستاندنی کردووە و گفتوگۆی هێناوەتە کایەوە، کە دەبوو ئێستا خەرمانێک زانیاری و شارەزایی لەسەر ئەو کارە دیپلۆماسییە و وردەکاری و نهێنییەکانی هەبووایە و ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی پارێزراوی لەبەر دەستدا بووایە، کە بیتوانیایە دەیان لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر چونێتیی گفتوگۆ و گەمەی دانوستاندن بنووسیایە! بەڵام بەداخەوە لە رووی بابەتییەوە هەلومەرجی سەختی کوردستان و لە رووی

خودیشــەوە کـەم ســەلیقەیی خۆمــان لــە پاراســتنی ئەرشــیفی ڕووداو و کارەســاتەکان، نەمانتوانیــوە لــەو هونــەرەدا ســەرکەوتنی بەرچــاو بەدەســت بهێنیــن، ئــەوەش بــە درێژایــی مێــژوو بۆتــە کەلێنێکــی گــەورە لــە ئەزموونــی جووڵانــەوەی ڕزگاریخوازانــەی گەلــی کــورد!

## کورد و گفتوگۆ!

بە داخەوە نەریتێکی ناشیرین لە ناو کورد و جووڵانەوە سیاسییەکەیدا هەیە و بەردەوام خۆیشی وێنا دەکات، ئەویش ئەوەیە، کە لەبری ئەوەی لە کاتی ناکۆکییەکاندا پەنا بۆ ململانێی بەجێ و مۆدێرن ببەن و لەتەک بوونی هەر جیاوازییەکدا، لەسەر بەرژەوەندییە باڵاکانی کورد و کوردستان رێک بکەون و هاودەنگ بن و هەڵسەنگاندنی ژیرانە و بابەتییانە بۆ خاڵە ناکۆکەکانی نێوانیان بکەن، کەچی پەنا بردن بۆ بەکارهێنانی چەک و جنێوی ناشیرین و تۆمەت بەخشینەوە دەکەنە ستراتیژی کارەکانیان و بەمەش سووکایەتی کردن بەیەک و بە هەڵوێستی نەشیاو بەرامبەر یەک دەوەستن و راستییەکان دەشێوێنن! بۆیە دەبینین زۆر جار لە مێژووی جووڵانەوەی کوردا پەسەند کردنی دەرفەتی گفتوگۆ و دانوستاندن کراوەتە تۆمەتێکی گەورە بۆ ئەوەی لایەک لە ناکۆکییەکانیدا لە دژی لایەکی تر بەکاری بهێنێ و بە خۆفرۆش و خائین ناوزەدەی بکات!

لە پاش هەرەس و نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ و پاش ئەو نەهامەتییانەی، کە رووبەڕووی گەلەکەمان بوویەوە، تەقەلاکانی ڕێکخستنەوەی بەرگری گەلەکەمان بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، ئەوا هەندێ لایەن و هەندێ بۆچوون لای وابوو، کە ئەو بەرگرییە لەم قۆناخەدا تەنها بۆ ناچار کردنی رژێمی عێراق بەکار بهێنرێ تا ئەو جۆرە لووت بەرزی و لەخۆبایی بوونەی کە نکوولی لە کورد و مافەکانی دەکات نەمێنێ و بەخۆیدا بچێتەوە و شالاوی سڕینەوەی واقیعی نەتەوەیی کوردستان لە رووی دیموگرافی و جوگرافییەوە رابگرێ! بۆ ئەوەی ناچار بکرێ دانوستاندن و گفتوگۆ لەگەڵ کورد بکات و کوردیش لەو بارە گلاوە خراپەی کە تێیکەوتوە شتێک بەدەست بهێنێ! ئیتر لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونەدا، زۆربەی لایەنەکان هەوڵیان دەدا، رژێمی عێراق رابکێشن بۆ دانوستاندن و گفتوگۆیەکی ئابڕوو مەندانە! ئەوە بوو جارێک (عەلی عەسکەری) و جارێک (دکتۆر مەحمود) و لە دواییشدا (پارتی دیموکراتی کوردستان) و لە کوتاییەکانی ساڵی ١٩٨٣ یشدا، (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، دەستی بە گفتوگۆ کردا!

مێژووی کورد لە سەردەمە جیاجیاکاندا و لانی کەم لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانییەوە و لەسەردەمی رووخانی دەوڵەتی عوسمانیدا، کەسایەتییە ناودارەکان و سەرکردەکانی کورد بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی و مافەکانی کورد، چەندین رێگە و هەوڵ و کۆششی دیپلۆماسی و دانوستاندنییان گرتۆتە بەر! دوای ئەوەش جووڵانەوەی کورد لەم بەشەی کوردستانی عێراقدا، لەگەڵ حکوومەتی عێراق چەندین جار رێگەی دانوستاندنی تاقیکردۆتەوە و هەندێ جار بە قازانجی بزوتنەوەکە و زۆر جاریش بە زەرەری شکاوەتەوە، بەڵام هەمیشە دیالۆگ و گفتوگۆی بە کارێکی دیپلۆماسی و سیاسییانە زانیوە!

بۆ نموونە ساڵی ١٩٢٧، پاش هێرش و پەلاماردانی سێ قۆڵی (بەریتانیا، ئێران و عێراق)، بۆ سەر ناوچەکانی پشدەر، (شێخ مەحمودی حەفید)، لەگەڵ بەریتانییەکان و لەگەڵ (کۆرنوالیس)ی نوێنەری بەرزی بەریتانی بە هاوکێشەیەکی نابەرابەر دەستی کرد بە (دانوساندن) لەگەڵ دەسەڵاتی بەریتانیا! لە پاش روخاندنی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد و بانگهێشت کردنی سەرانی کۆماری مەهاباد بۆ تاران و پاشان بەرنامە داڕشتن بۆ لە سێدارەدان و زیندانی کردنی پێشەوا (قازی محەمەد) و هاوەڵەکانی، (مەلامستەفا)ی بارزانیش بانگ کرا، بەڵام ئەو بانگکرا بۆ (دانوساندن) و بۆ قسە کردن لەسەر داماڵینی چەکی بارزانییەکان و هێزەکەی، بەرامبەر ئەوەش نیشتە جێکردنی بارزانیهیکان و خێزانە کانیان لە نزیک هەمەدان! (شا) ی ئێران بەڵێنی پێدا، کە یارمەتی جێگیر کردنیان و ژیان و گوزەرانی بارزانییەکان دابین بکات، بەمەرجێ ئەوانیش چەکەکانیان بە دەستەوە بدەن! (بارزانی)، هوشیارانە لە هەلومەرجەکە و تەرازووی هێزەکان و لە شوێنەواری کارەساتەکە تێگەیشتبوو، بۆیە هەمیشە بیری لە نەخشەی دەرباز بوون دەکردەوە! بۆ ئەوەش بە (شا) ی ئێران و لێپرسراوەکانی تارانی گوت.. ئەو رازییە لەسەر چەک داماڵین و لەسەر ئەو پرۆژەیە، بەڵام بە مەرجێ بواری بدەن تا بچێ بۆ لای (شێخ ئەحمەد)ی برا گەورەی و سەرکردەی رۆحیی بارزانییەکان، تا ئەو کارەی تێبگەیەنێ و رازی بکات! بەوەش (بارزانی)، توانی بەو گفتوگۆیە خۆی دەرباز بکات و دانوساندنێکی سەرکەوتوو ئەنجام بدات و بە سەلامەتی بگەڕێتەوە بۆ لای هێزەکەی و نە چەکیش بە دەستەوە بدات و نە لەبەر دەستی (شا) ی ئێرانیشدا بمێنێتەوە! ئیتر توانی هێزەکەی بە شێوەیەکی باش رێک بخات و بە خاکی عێراقدا و لە شوێنێکی ترەوە خۆی بکاتەوە بە ناو

ئێراندا و لەوێشەوە خۆی بگەیەنێتە سەر رووباری (ئاراس) و ئەنجا تا ناو خاکی یەکێتی سوڤیەت نەوەستێ!

لە شۆڕشی ئەیلولی گەلی کوردا و بۆ یەکەمین جار دوای کودەتای بەعسیەکان لە ١٩٦٣/٢/٨دا، هەلومەرجێک هاتە پێشەوە، کە جوولانەوەی کورد بە سەرۆکایەتیی (بارزانی)، بتوانێ مفاوەزات لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا پەسەند بکات! لە ٣/١٨/ ١٩٦٣دا، (بارزانی)، بە سەرۆکایەتی (مام جەلال)، شاندێکی بۆ گفتوگۆ نارد بۆ بەغدا، کە جگە لە خوالێخۆش بووان (مەسعود محمەد و حەبیب محەمەد کەریم)، هەریەکە لە (بابەکر پشدەری و شێخ حسێنی خانەقا و حەمە سەعید خەفاف و یەدولا فەیلی و ساڵح یوسفی)، ئەندامی ئەو شاندە بوون! ئەو دەمە سەرکردایەتیی شۆڕش پرۆژەیەکی لەژێر ناوی مافی چارەنووس و ئۆتۆنۆمیدا هەبوو، حکومەتیش رەزامەندی بۆ پرۆژەی (لامەرکەزی ئیداری) نیشان دا! ئەو دەمە (علی ساڵح سعدی)، کە بە رەچەڵەک کورد بوو لەگەڵ (ساڵح مهدی عماش) و دواتریش (حازم جواد)، نوێنەری حکومەت بوون! ئەو گەمەیەی دانوستاندن بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ درێژەی کێشا. لە دەرفەتی ئەو پرۆسەیەدا (مام جەلال)، توانی بچێتە میسر و لە سەروبەندی (وحدە) ی عەرەبی (میسر و سوریا) دا، توانی چەند جارێک بە یاوەریی (شەوکەت عەقراوی)، لە مارتی ١٩٦٣دا، سەرۆکی میسر (جمال عبد الناصر و عبدول حکیم عامر)، ببینێ و کاریگەریی لەسەر بیروڕای ئەوان سەبارەت بە مەسەلەی کورد دروست بکات! ئەو دەمە (جمال عبد الناصر)، هاوسۆزی لەگەڵ مەسەلەی کوردا نیشاندا و داوای لێکردن، کە بەردەوام بن لە دیالۆگ و هەوڵبدەن بە ئاشتی لە عێراق بچنە پێشەوە و بە گفتوگۆ مەسەلەکە چارەسەر بکەن، هەرچەندە دەشیزانی کە سەرانی رژێمی عێراق

باوەڕیان بە ڕەوایی مەسەلەی کورد و چارەسەر کردنی نییە! تەنانەت لە قۆناخێکدا (مام جەلال)ی ئاگادار کردەوە، کە نەگەڕێتەوە بۆ بەغدا، چونکە مەترسی لەسەر ژیانی هەیە! لە پاش کودەتای ١٨/١١/ ١٩٦٣ی (عبد السلام عارف)، بەسەر بەعسییەکاندا، جارێکی تر مفاوەزاتی (بارزانی - عێراق)، دەستی پێکردەوە و بەمەش لە ١٩٦٤/١/٣١دا، بۆ یەکەم جار ئاگری شەڕ لە نێوان کورد و حکوومەتی عێراقدا ڕاگیرا! ئەو دەمە لە ڕێگەی خوالێخوش بوو (بابە عەلی شێخ مەحمود) ەوە، (بارزانی) وا حاڵی کرا، کە ئەمریکا پشتیوانی لەو حکومەتەی ئێستای عێراق دەکات و هەوڵی ئاشتیی کورد و حکومەت دەدات و پێی باش نییە کورد شەڕی ئەو حکومەتە بکات! (مام جەلال)، بە درێژی لە کتێبی دوای شەست ساڵ ژیان و بیرەوەریەکانی (جەلال تالەبانی)، نووسینی (عیرفان قانعی فەرد)، باسی لەو ڕاستییە کردووە! گفتوگۆی ئەم جارە و شێوازی درێژە پێدانی، درز و ناکۆکییەکانی نێوان ریزەکانی سەرکردایەتی شۆڕش و (پارتی)، گەورە کرد، چونکە لە نێوان مەکتەبی سیاسی (پارتی) و سەرۆکەکەیدا (بارزانی)، بەهۆی ئەو دانوستاندنەوە ناکۆکییەکان سەریان هەڵدا و زوو گەشەی کرد! بەمەش ململانێیەکی خوێناوی، کە نزیکەی شەش ساڵی خایاند و سەدان رۆڵەی کورد بوون بە قوربانی، ئەو ململانێ نابەجێیە درێژەی کێشا!

ئیتر لایەک بە سەرۆکایەتی (بارزانی)، خۆی و بەو باوەڕەی، کە ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت هەردووکیان پشتیوانی لەو حکوومەتە و لە شەڕ نەکردن دەکەن دژی حکومەت، پەتی داخوازیەکانی کوردی شل کرد! بەوەش کورد گفتوگۆکانی لەگەڵ حکومەتی (عبد السلام عارف) و (حاجی عبدالرزاق محمود) دەستی پێکرد، کە لە ئاستی داخوازی بنەڕەتیی ئۆتۆنۆمی و مافی چارە نووسەوە شۆڕبوەوە بۆ متمانە کردن

بە (عبد السلام عارف) و موسوڵمانێتی سەرانی ئەو حکوومەتە.
لایەنیکی تریش، کە زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندی (پارتی دیموکراتی کوردستان) و مەکتەبی سیاسی لە گەڵدا بوو، لەو شێوازەی گفتوگۆیە نارازی بوون و دەیانویست پێ لەسەر ئۆتۆنۆمی و داخوازییە سیاسییەکانی گەلی کورد دابگرن! ئەم لایەنە لە مەسەلەی قسە کردن لەگەڵ حکومەت و لە زۆر مەسەلەی تردا ناکۆک بوون! (بارزانی)، پێی وابوو خۆی سەرۆکی شۆڕش و کوردە و دەبێت (مەکتەبی سیاسی)، گوێڕایەڵی ئەو بن، ئەوانیش دەیانویست (بارزانی)، لە دەسەڵاتی خۆیان نەچێتە دەرەوە و گوێڕایەڵی بڕیارەکانی کۆمیتەی ناوەندی حیزب بێت!
(بارزانی) ش رازی نە دەبوو بکرێتە سەرۆکێکی رەمزی!
(بارزانی)، رەفتاری لەگەڵ (حیزبی شیوعی عیراق)، نەرمتر و ژیرانە تر بوو، دوور دەیڕوانیە سۆڤیەت و پێویستیی کوردی بۆ پشتیوانی زلهێزەکان، هەمیشە لە خەیاڵ بوو! رەنگە (بارزانی)، هەواڵی ئەوەی کە (خرۆشۆف) ،هاتە سەردانی میسر و لە ئاخاوتنی دۆستانەدا لەگەڵ (جمال عبد الناصر) دا، کە رازی نەبوو تەوقە لەگەڵ سەرۆکی عێراق بکات و پێی وت ئەوانە دەستیان خۆیناوییە بە کوشتنی (شیوعی) یەکانی عێراق، ئەو رووداوە لە بیریدا جێگەی خۆی گرتبێت. بەڵام (مەکتەبی سیاسی) بەهۆی ئەوەی، کە ئەو ساڵانە حیزبی (شیوعی) لە دژی شۆڕشی کورد قسەی نا بەجێیان کرد و لەگەڵ حکومەت هاوپەیمان بوون، ئەوا جگە لە (مام جەلال)، باقی ئەندامانی (مەکتەبی سیاسی)، پەیوەندییەکی سارد و نا دۆستانەیان لەگەڵ سەران و کادرانی حیزبی (شیوعی) دا، هەبوو!
ئیتر بۆ نەگبەتی گەلەکەمان، ئەو ناکۆکییانە تەقینەوە و بەمەش لە جیاتی ئەوەی کورد لە گفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرانی عێراق شتێکی

دەست بکەوێت، کەچی بوون بە دوو کەرتەوە! لە ئەنجامدا (بارزانی)، هێزی ناردە سەر (مەکتەبی سیاسی) و ئەوانیش ناچار بوون روو بکەنە ئێران و پاشان لە (هەمەدان)، گیرسانەوە و ئەوەش یەکەمین جار بوو لە شۆڕشی کوردا ناکۆکیی سیاسی بە زەبری چەک چارەسەر بکرێ، ئیتر لەوێوە سەرەتای شەڕی برا کوژی سەری هەڵدا!

پاش ئەوەی کە حکوومەتی عێراق نیازەکانی خۆی بەرامبەر کورد دەرخست و دەستی کرد بە پاشەکشێ لە بەڵێنەکانی، ئیتر (بارزانی) لە ١٩٦٤/١١/١١ دا، نامەیەکی بۆ (عبد السلام عارف) نووسی و داوای مافەکانی گەلی کوردی کرد. لە وەرامدا (صبحی عبد الحمید)، وەزیری ناوخۆی ئەو کاتەی عێراق بە نامەیەک داوای هەڵوەشانەوەی هێزی پێشمەرگەی کرد! ئەنجا (بارزانی)، لە١٩٦٥/١/١٠دا، (حەبیب محەمەد کەریم)ی نارد بۆ بەغدا و پاش یەک مانگ داوای مانگرتنی گشتی کوردستانی کرد و لە زستانی ١٩٦٥دا، شەڕ هەڵگیرسایەوە! رژێمی عێراقیش لە تۆڵەی ئەوەدا بە فڕۆکە و هێزی سەربازی پەلاماری ناوچە سنووریەکان و شاری (پێنجوێن) یان دا و زیانێکی گیانیی زۆریان بە خەڵکی گەیاند! تەنانەت لە شاری سلێمانیدا بەتانک تەقەیان لە هاوولاتییان کرد!

* لە ١٩٦٥/٩/٣دا، سەرۆک وەزیران (تاهر یەحیا)، کە خۆی بە کورد دەزانی دەستی لەکار کێشایەوە!

* ئاگری شەڕ گەیشتە لێواری دەسەلاتی ئێران و خۆش کردنی ناکۆکییەکانیان. ئیتر ئێران بە رەسمی (عارف)ی تاوانبار کرد، کە دژی ئێران و خاکی ئێران دەستدرێژی کردووە!

* شەڕ گەرم بوو، ئەمریکا راوێژکارێکی خۆی بە ناوی (ریمۆند هەیر) ناردە تاران، تا داوایان لێ بکات یارمەتی (بارزانی) بدەن!

* ئێران یەک لایەنە پەیمانی ١٩٣٧ ی تایبەت بە شەتولعەرەبی هەڵوەشاندەوە!

لە ئەنجامی شەڕی کوردستاندا لە ١٩٦٥/٤/٤ تا ١٩٦٦/١/١٨، نزیکەی ٦٠٠٠ سەربازی عێراقی کوژران!

* لە رۆژی ١٩٦٦/٤/١٣ دا، فڕۆکەکەی (عبد السلام عارف) لە نزیک قورنەی شاری بەسرە کەوتە خوارەوە و (عارف) تیایدا سووتا و مرد!

* لە رۆژی ١٩٦٦/٤/١٧ دا، (عبدالرحمان عارف) ی برای بوو بە سەرکۆمار و (بزاز) بوو بەسەرۆک وەزیران. بەمەش (بارزانی)، شەڕ وەستانی راگەیاند!

* لە رۆژی ١٤/٤/ ١٩٦٦دا، حکوومەتی عێراق چەند کوردێکی نارد، کە قسە لەگەڵ سەرکردایەتی بکەن لەوانە (زەید ئەحمەد عوسمان و ئەحمەد کمال قادر و رەئوف احمد قادر) و ئەفسەرێک بە ناوی (عەلی مەجید) تا زەمینەی گفتوگۆ لەگەڵ (بارزانی)، خۆش بکەن!

* لە رۆژی ١٩٦٦/٤/١٥دا، (بزاز) رایگەیاند، کە بەرنامەیەکی نوێی بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد هەیە! پاش ئەوە لەگەڵ (مام جەلال)، کۆبووەوە و لەوبارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ کرد!

* (بزاز) لە ١٩٦٦/٦/٢٩دا، رێککەوتننامەی خۆی بە ١٢ مادە راگەیاند. بەڵام (عارف عبدالرزاق) لە ١٩٦٦/٦/٣٠دا، بە کودەتایەکی سەربازی (بزاز) یان ئاودیو کرد بۆ تورکیا! لە رۆژی ٢٦/ ١٠ /١٩٦٦دا، (عبدالرحمان عارف)، هاتە کوردستان تا ئاشتی و پێکهاتن رابگەیەنێت!

ئەنجا باڵەکەی تری جووڵانەوەی کورد، کە ناوی باڵی (مەکتەبی سیاسی) بوو، بە نهێنی لەگەڵ حکومەتی بەغدا کەوتە گفتوگۆ بۆ ئەوەی بتوانێ لە رووی سەربازی و لە رووی سیاسیشەوە خۆی بەهێز بکات، تا ریکخراوەکانی و خۆی بپارێزێ و لە روی (بارزانی)

دا، بووەستێت!

(بارزانی) لە هەلومەرجێکی دژواری خۆیدا، لە ١٣/ ٦ / ١٩٦٦ دا، شاندێکی نارد بۆ دانوستاندن لە بەغدا و لەگەڵ حکومەتی (عبدالرحمن بزاز)، گەیشتنە رێکەوتنێک، کە بە بەیانێکی دوانزە بڕگەیی راگەیەنرا! باڵەکەی تریش، کە (مەکتەبی سیاسی) بوو، پشتیوانییان لەو بەیانە کرد، بەڵام بە نهێنی لەگەڵ حکومەتی بەغدا کەوتنە گفتوگۆ! ئیتر بەم هەنگاوەیان رێگای کردنەوەی پەیوەندییان لەگەڵ حکومەتی عێراق خۆش کردا!

(بزاز) و حکومەتەکەی تەمەنیان کورت بوو لە مانگی ئابی ١٩٦٦ دا کۆتایی هات. بەیانی ٢٩ حوزەیران بە لادانی (عبدالرحمن بزاز) و بە هێنانی حکومەتی (ناجی تالیب)، کە هێزەکانی سوپای رژێم پشتیوانی بوون، تین و تاوی لاواز بوو، حکومەتی تازەش رووی خۆشیان بەرامبەر (بارزانی) ترش کردا! ئەگەرچی (بارزانی) بە ئازادی و بە فەرمی لە بەغدای پایتەخت، رۆژنامەی (خەبات)، کە زمان حاڵی حیزبەکەی بوو دەردەکرد و (ئیدریس بارزانی) ش سەردانی بەغدای کرد و سەرکۆماریش سەردانی (بارزانی) کرد و شەڕیش لە نێوان حکومەت و (بارزانی) راگیرا بوو، بەڵام شەڕی براکوژی لە نێوان هەردوو باڵەکەی (پارتی) هەر بەردەوام بوو!

لە رۆژی ١٩٦٨/٧/١٧، حیزبی (بەعس)، دووەمین کودەتای خۆی کرد و بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی گرتەوە دەست! بەعسییەکان لە یەکەمین رۆژی دەسەڵات گرتنە دەستیانەوە بە هوشیارییەکی زۆرتر لە جاران کاریان دەکرد. لە سیاسەتی دەرەوەدا رێگەی خۆ بەهێز کردنیان گرتە بەر و لە ناوخۆشدا بە تاکتیک رووی کردە چارەسەر کردنی کێشەکانی و هەر زوو خۆی لە ئەفسەرە ناسیۆنالیستە عەرەبییەکانی

شەریکی کودەتاکەی ١٧ تەممووز دەرباز کرد و کودەتایەکی خشکەیی کرد بەسەریاندا و بەوەش دەسەڵاتی بۆ هەندێ لە سەرانی حیزبی (بەعس)، پاوانکرد و هاوکات هەوڵی راکێشانی هێزە کوردییەکان و حیزبی (شیوعی) عێراقی دا! ئیتر بەهۆی دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و لەگەڵ وڵاتانی بلۆکی رۆژهەڵات، حیزبی (شیوعی) بەلای خۆیدا راکێشا و توانی باڵی (مەکتەبی سیاسی) یش رازی بکات و بەو هۆیەشەوە دڵی (بارزانی) تۆراند و بە هاوکاریی باڵەکەی تر شەڕی لەگەڵ (بارزانی) هەڵگیرساندەوە! سروشتی شەڕی کوردستانیشی لە شەڕی حکومەت و جووڵانەوەی کوردەوە کردە شەڕی کورد دژی کورد، بێ ئەوەی خۆی ئەرکێکی زۆر بۆ ئاراستەکردنی ئەو شەڕە بکێشێ! سەرەنجام ئەو شەڕی براکوژییە بە قازانجی رژێم شکایەوە و لەباتی هێزەکانی سوپای عێراق کورد کوردی دەکوشت، کە زیاتر لە دوو ساڵی خایاند تا لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٠دا، دانوستاندن لە نێوان حکومەتی عێراق و (بارزانی)دا هاتەوە کایە. (صدام حسین)، خۆی سەرپەرشتی تەقەلاکانی ئەو رێککەوتنەی گرتە ئەستۆ و سەردانی (بارزانی) کرد لە شاخەکانی کوردستان و گەیشت بە رێککەوتنێکی بنەڕەتیی تر و بە بەیانی ١١ ئاداری ١٩٧٠ یش، ئەو رێککەوتنە مۆر کرا!

رژێمی عێراق بۆ یەکەمین جار لە بەڵگەیەکی فەرمیدا، دانی نا بەمافی نەتەوەیی گەلی کوردا و ئەو مافەشی لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی دیاری کرد! لە راستیدا ئەو دانوستاندنە و ئەنجامەکانی لەلایەن سەرکردایەتی (بەعس) ەوە، هۆکار و هەلومەرج و زەمینەی خۆی هەبوو، زادەی هەلومەرجێکی ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانیی دیاری کراو بوو، هەرچەندە دوا ئەنجامی بە پەشیمان بوونەوەی رژێم و

هەڵگیرسانەوەی شەڕ و کارەساتی ڕێککەوتننامەی (جەزایر) کۆتایی هات، بەڵام بەهۆی چوار ساڵی ئارامیی ١٩٧٠ - ١٩٧٤ گەلەکەمان هەنگاوی بەرچاوی نا، لە رووی گەشەکردنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەوە و هاوکات دەرکردنی بەیانی ئادار، بۆخۆی لە مێژوودا هەم وەسیقەیەکی فەرمی بوو هەم قورسایی تایبەتیی خۆی هەبوو! ململانێ و شەڕی ساردی نێوان بلۆکی رۆژهەڵاتی سۆسیالیستی بەرامبەر بلۆکی رۆژئاوا لە رووداوەکانی بەهاری چیکۆسلۆفاکیا و پەلاماردانی دەسەڵاتی ریفۆرمخوازی (الکساندر دۆبشیک)، لەلایەن یەکێتی سوڤیەت و هێزە سەربازییەکانی پەیمانی وارشۆوە، تینی ململانێی هەردوو بلۆکی گەرمتر کرد! چونکە سوڤیەت وای لە قەڵەم دەدا، کە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەست لە کاروباری بلۆکی رۆژهەڵات وەر دەدەن و بۆ تێکدانی کنە دەکەن! لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا و لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦٩دا، (معمر القذافی)، (شا ئیدریس)ی لەسەر تەختی پاشایەتی لیبیا لادا و بنکە سەربازییەکانی ئەمریکای لێکردە دەرەوە! لەلایەکی ترەوە ململانێی (عەرەب - ئسرائیل)، تا دەهات گەرمتر دەبوو! هاوکات هەر لەو ساڵەشدا (یاسر عرفات)، لە قاهیرە بە سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی فەلەستین هەڵبژێرا! ئاگر گرتنی مزگەوتی (ئەقسا)ی پیرۆز، عەرەب و هەستی ئاینی و نەتەوایەتیی عەرەبی دژی ئیسرائیل وروژاند و کۆنگرەی ئیسلامی بە دوای خۆیدا هێنا، کە ٢٧ دەوڵەتی ئیسلامی لە مەغریب تێیدا بەشدار بوون! سەرانی حیزبی (بەعس) یش لە عێراقدا، بە ئاشکرا ١٢ کەسی جوولەکەیان بە تۆمەتی سیخوڕی کردن بۆ ئیسرائیل، لە چەقی شاری بەغدا لە سێدارە دا! لە بەرەکانی شەڕی رۆژانەی نێوان میسر و ئیسرائیل، جەنگی خوێن لەبەر رۆیشتن و شەتەک کردن، لە گەرم بووندا بوو! لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٦٩

وە دەسپێشکەری کەوتە دەست هێزەکانی میسر و سەرانی سوریاش لە رژێمی عێراق بێزار بوون، چونکە باڵی (میشیل عفلق)، کە نەیارێکی سەرسەختی (حافز ئەسد)ی سوریا بوو، فەرمانڕەوای حیزبی (بەعس) و عێراق بوو، عێراقیان کردبووە مەڵبەندی کۆکردنەوەی نەیارەکانی (ئەسد)! ئێرانیش لە مانگی نیسانی ١٩٦٩ دا، ناکۆکییەکانی لەگەڵ عێراق گەیاندە ئاستێکی باڵاتر و یەک لایەنە پەیمانی ساڵی ١٩٣٧ ی دابەش کردنی (شەتول عەرەب)ی هەڵوەشاندەوە!

ئەو رۆژگارە، کە ئەم رووداوە گەرم و نیمچە گەرمانەی تێدا روودەدا، لە ناوەندە سەرەکییەکانی حیزبی (بەعس) دا، هێشتا ململانێی باڵی سەربازی و باڵی مەدەنی بەلادا نەکەوتبوو! لە کوردستانیشدا (بارزانی)، لە لایەکەوە توانی گوشاری سەربازی بۆ سەر عێراق بە گەشە پێدانی چالاکی پێشمەرگانە زۆر بکات و لەلایەکی تریشەوە توانی بە هاوکاری ئێران و لایەنەکانی تر، مەترسی سیاسی لای سەرانی رژێمی عێراق گەورەتر بکات! - گەرچی لە شوێنێکی تری ئەم کتێبەدا باسی ئەم بابەتەم کردوە، بەلام بۆ تەواوکردنی وێنەی هەلومەرجەکە لێرەشدا باسی دەکەمەوە - ئێران یارمەتییەکانی بۆ (بارزانی) و جووڵانەوەکە زیاد کرد و یارمەتی دارایی مانگانە و چەک و تەقەمەنی زۆرتری پێدا و ئەمریکاش ٦ ئەفسەری بۆ مەشق و راهێنان بۆ نارد بوو، کە کاریان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا دەکرد! ئیتر بەوجۆرە چالاکی و زەبری پێشمەرگە گەیشت بەوەی پەلاماری بیرە نەوتەکانی کەرکووک بدەن و بۆ ماوەیەکی زۆر تۆپ بارانی دامەزراوە نەوتییەکان بکەن!

ئیتر لەنێو ئەو هەلومەرجە نێودەوڵەتییە و لەنێو ئەو بارودۆخە سیاسی و ئابووری و گۆڕانکارییەی، کە ناوچەکە بەخۆیەوە بینی، سەرانی بەعس بیریان کردەوە و بڕیاریان دا خۆیان ئامادە بکەن بۆ ساز

کردنـی مفـاوەزات لەگـەڵ (بارزانـی)، بـۆ دوورخسـتنەوەی مەترسـییەکان و دەرفـەت سـاز کـردن بـۆ زیاتـر خـۆ ڕێکخسـتن و خـۆ بەهێـز کـردن، نـەک بۆ بڕوا هێنـان بـە مافی نەتەوەیی کـورد، وەک گەلێکی بێ مـاف و بندەسـت لـە عێراقـی بەعسـدا!

لـە لای (بارزانـی) شـەوە دەرفەتێکی بـاش بـوو بۆ پشـوودانی هێزەکان و خـۆ ڕێکخسـتنەوەیان، چونکـە ئـەو ڕێککەوتنـە سـەرکەوتنێکی گـەورە بـوو بۆ (بارزانی) و زۆرتر پێگەی ئەوی بەهێز کرد و توانی خۆی وەک هێزێکی گەورە و سـەرەکی جووڵانـەوەی کـورد بناسـێنێت و لایەنـە نەیارەکەشـی، کـە باڵـی (مەکتەبـی سیاسـی) بـوو، بخاتـە بـەردەم ئەگـەری فەوتانـدن و نەمانـەوە و لـە دواییشـدا بـە ناچـاری بگەڕێنـەوە بۆ نـاو ڕیزەکانی (پارتی)! هەرچەنـدە ئـەو ڕێککەوتنـەی ١١ ئاداریـش وەک هەمـوو ئەوانـی پێشـوو سـەری نەگـرت و بـە پەلاماردانـەوەی کوردسـتان شـکایەوە و دواتریـش بەهـۆی ڕێکەوتنـی (عێـراق - ئێـران) ەوە، لـە ڕێککەوتنامـەی (جەزایـر) دا، کۆتایـی هـات! بـەڵام بەیانـی ١١ ی ئـادار بـۆ خـۆی سـەنگێکی مێژوویـی هەیـە! ئیتـر پـاش شکسـتی جووڵانـەوەی کـورد و (بارزانـی) لـە ٦ مارتـی ١٩٧٥ دا - کە لە مێژوودا بە خیانەتی پشتیوانەکانی جووڵانـەوەی کورد دەدرێ لـە قەڵـەم - پـاش هەڵگیرسـانەوەی شۆڕشـی نوێـی گەلەکەمـان، بـە ڕابەرایەتیی (یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان)، ئـەوا لـە سـاڵی ١٩٧٩دا، (بزوتنـەوەی سۆسیالیسـتی کوردسـتان) یش، ڕێگـەی دانوسـتاندنی لەگـەڵ ڕژێمی عیراقدا گرتـە بـەر!

سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٩ شـاندێکی (بزووتنـەوە)، بـە سـەرۆکایەتیی دکتـۆر (مەحمـود عوسـمان)، بـە مەبەسـتی ڕێککەوتـن چـوون بـۆ بەغـدا و لـەوێ (صـدام حسـين) یشـیان بینیبوو، بەڵام پاش چەند مانگێ لە درێژە کێشـان و نائومێـد بوونـی (بزووتنـەوە)، ئـەو تەقەلایـەش چـووە خانـەی ئەوانـی

پێشتر و بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشت! (یەکیتی)، لە دوای بەرپا بوونی جەنگی (عێراق - ئێران) ەوە، جاروبار و ناڕاستەوخۆ راسپاردە و ئامادەیی رژێمی عێراقی بۆ دانوستاندن پێ دەگەیشت، بەلام هیچیان نەچوونە بواری فەرمییەوە تا کۆتایی مانگەکانی ساڵی ١٩٨٣ !

ساڵی ١٩٨٠ زۆر نەبوو لە سەفەرەکەی ڤیەننا گەڕابوومەوە، کاک (نەوشیروان) بۆی باس کردم، کە (شێخ محەمەدی شێخ عەبدول کەریمی کەسنەزان)، نامەیەکی بۆ ناردووە و تێیدا و لەسەر راسپاردەی حکومەت داوای کردووە چاوپێکەوتنێ لەگەڵ نوێنەرێکی عێراق بکرێت بۆ قسە کردن لە دانوستاندن و شەڕ راگرتن! هەروەها وتی بەر لەماوەیەک (مامۆستا جەعفەر- فازیل کەریم)، مان نارد و سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە ئەمجارە تۆ بچۆ بزانە چییە و گەر نوێنەریشیان هات قسەیان لەگەڵ بکە! پاش یەک دوو رۆژ کەوتمە رێ بۆ بەری قەراخ و لەوێشەوە و لە رێگەی هەرێمی پێنجەوە و بەهۆی (مستەفا چاو رەش) ەوە، چوومە سەردانی (شێخ محەمەد)! کە گەیشتمە ئەوێ، یەکسەر بە دەمودوویا تێگەیشتم، کە رژێمی عێراق بیروڕای گۆڕیوە و (نوری فیصل شاهر)، کە وەزیری لاوان بوو سەردانەکەی پەک خستووە و نایەت بۆ ئەو چاوپێکەوتنە و لەباتی ئەوە جوابی بۆ (شێخ محەمەد) نارد بوو، کە زۆر ناخایەنێ (یەکێتی)، دەکەوێتە ژێر گوشار و هەلومەرجێکی سەختی کەماشەی نێوان ئێران و (پارتی) یەوە و لاواز دەبێت!

من بۆ خۆم ئاشنایەتیم لەگەڵ (شێخ محەمەد) هەبوو، حەزیشی دەکرد کە رێکەوتنێک لە نێوان کورد و حکوومەتی عێراقدا ساز بێت، لەبەر ئەوە داوای لێکردم دوو رۆژی تریش بمێنمەوە تا ئەو بتوانێت دوا هەڵوێستیان تێ بگات! بەلام مانەوەکەش هیچ سوودێکی نەبوو، تەنها بەو جوابەی حکوومەتەوە گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ و سەفەرەکە

نەیتوانی هیچ هەنگاوێک بۆ دانوستاندن بباتە پێشەوە!
لە کۆتایی مارتی ١٩٨٢دا، لە کۆبوونەوەیەکی دکتۆر (قاسملۆ)، لەگەڵ (مام جەلال) و هەندێ لە سەرکردایەتیی (یەکێتی) دا، باسی (مفاوەزات)، لەگەڵ رژێمی عێراق بەهۆی ئەم هەلومەرجە خۆیی و بابەتییانە، هاتەکایەوە:
* رژێمی عێراق لە جەنگێکی سەختدایە لەگەڵ ئێران!
* کۆماری ئیسلامی ئێران پشتی کردۆتە (یەکێتی)!
* رەنگە عەرەب لەسەر ئەگەری شکستی عێراق لە ئایندەدا بەرۆکی کورد بگرێ!
پێشینان دەڵێن (بۆز بە لەری)، واتە قسە کردن لەگەڵ دوژمنەکەت، کاتێ کە لاوازە ئەنجامەکانی باشتر دەبێت! پاش ئەوە جارو بار لەناو خۆماندا ئەم باسەمان لێکدەدایەوە و لە هەلومەرجی نەتەوەی کورد و جووڵانەوەی کوردستانی باشوور و بارودۆخی (یەکێتی)، دەدواین و هێزەکانی ترمان دەخستە بەر باس و لێکۆڵینەوە، پێمان باش بوو پرۆژەی خۆمان بۆ چارەسەری کێشەی کورد لە رێگەی دکتۆر (قاسملۆ) وە بنێرین بو حکومەتی عێراق! ئەویش پێشنیارەکانی ئێمەی گەیاند بووە شوێنی خۆی. ئیتر ئەوە بوو پاش چەند مانگێ جوابی (صدام حسین) یان هێنایەوە، کە رازییە لەسەر:
١ - راگرتنی شەڕ.
٢- دانوستاندن لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی!
لە رۆژی٢٣/١٠/١٩٨٣، نوێنەرانی حکومەتی عێراق، کە پێکهاتبوون لە سێ کار بەدەستی ئەفسەری باڵای موخابەراتی عێراقی، بۆ بینینی (مام جەلال)، هاتنە لای دکتۆر (قاسملۆ)، لە (گۆڕە شێر)! (خلیل محمد شاکیر، عقید ئیحسان و ئەبو محمد). لەوێ بە ئامادە بوونی (قاسملۆ)، (مام

جەلال و نەوشیروان مستەفا) کۆبوونەوەیان لەگەڵ کردن! نوێنەرانی حکومەتی عێراق پاش گێڕانەوەی دەقی وەرامەکانی حکوومەت رایان گەیاند بوو، کە ئەرکی ئەوان تەنها هێنان و بردنی ئاڵوگۆڕی بیروڕاکانە لە حکومەتەوە بۆ (یەکێتی) و لە (یەکێتی) شەوە، بو حکوومەت!

لەو کۆبونەوەیەدا رای حکومەت وا گەیەندرا، کە حکوومەتی عێراق دەیەوێ کێشەی کورد بە جۆرێکی بنەڕەتی چارەسەر بکات! (مام جەلال) یش داوای کرد بوو، کە لەگەڵ (پارتی) و لایەنەکانی تریش قسە بکەن! بۆ ئەوەش (مام جەلال) بە نامەیەک ناوەرۆکی ئەو کۆبوونەوەیەی بۆ حیزبی (شیوعی) نووسی و ئەوانیش (پارتی) یان لەو ناوەرۆکە ئاگادار کردەوە! ئیتر بەوچەشنە هەر لە سەرەتاوە (یەکێتی)، سەرجەم حیزبە کوردستانییەکانی لە بوونی گفتوگۆکە ئاگادار کردا!

پاش ئەو هەموو گەلەکۆمەکییە زۆرەی ئێران و بەرەی (جود) و تەنگ هەڵچنین بە بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ و دوای ئازاد کردنی ناوچەکانی هەر دوو مەڵبەندی سێ و چوار، (مام جەلال) رویکردە ناوچەی خۆشناوەتی! لە ٢١/ ٦ / ١٩٨٣ دا گەیشتە بالیسان و لە پشتی خەتێ بارەگایەکی بۆ خۆی دامەزراند. منیش هاتبوومە گوندی توتمێ. رۆژێک لە سەرەتاکانی مانگی هەشتدا ناردی بە شوێنمدا، پێکەوە لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا)، لەگەڵی دانیشتین، وتی: خۆت ئامادە بکە، تا بتوانیت رۆژی ٢٤ ی مانگ لە بارەگای (حیزبی دیموکرات) بیت، لەوێ وەفدی حکومەتی عێراق دێت بیانبینە! ئیتر هەردووکیان کەوتنە قسە کردن لەسەر ئەو خاڵە گرنگانەی، کە پێشتر ئەوان لە کۆبوونەوەکانی پێشتردا لە (گۆڕە شێر) و لە ناوزەنگ لە گەڵیان باسیان کرد بوو! منیش لەو رۆژەدا یەکێک لە هاورێکانم بە ناوی (حەمەی تەیب) و ژمارەیەک پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد و رووم کردە ناوچەی

شینکایەتی بۆ شوێنی دیاریکراو! لەوێ لە بارەگای مەکتەبی سیاسی (حیزبی دیموکرات) دکتۆر (قاسملۆ)، خۆی پێشوازی لێکردین و ئەو ئێوارە درەنگە دوو قۆڵی لە کەپرێکی هاوینەی خۆیدا پێکەوە دانیشتین و شل شل گوێم بۆ ئامۆژگاری و قسە خۆشەکانی راگرت! شەوی ٨/٢٥ هەمان دەستەی نوێنەرانی حکوومەتی عێراق گەیشتنە لای دکتۆر (قاسملۆ) و دوای پشوودانێکی باش، بە ئامادە بوونی (قاسملۆ) و مامۆستا (عەبدوڵای حەسەنزادە)ی جێگری، لەگەڵ ئەو نوێنەرانەی حکومەت (خلیل محمد شاکیر، عقید ئیحسان لێپرسراوی موخابەرات لە پارێزگای کەرکووک و ئەبو محمد لێپرسراوی موخابەرات لە سلێمانی)، دانیشتین و کەوتینە قسە کردن و گفتوگۆ لەسەر ئەو سەرەتاو داوا بنەڕەتییانەی، کە (مام جەلال)، لە دوا کۆبوونەوەدا بە نوێنەرانی بەغدای گوتبوو!

لەو کۆبوونەوەیەدا هەوڵمدا لەوە تێبگەم، کە پاش تێشکانی هێزەکانی عێراق لە نەبەردەکانی ئەم مانگانەی دواییدا و بە تایبەتی لە شەڕەکانی (کۆدۆ و گرد مەندیل) لە ١٩٨٣/٧/٢٢ دا و لە ناوچەکانی پێنجوێن و گەرمکدا، ئاخۆ چی بەسەر ورە و هەڵوێستی هێزە چەکدارەکانی رژێمی عێراقدا هاتووە! ئەو نەبەردانە زۆربەیان بە ناوی فەجری یەک و دوو چوارەوە لەلایەن ئێرانەوە ناو نرابوون! دیارە ئەنجامەکان و چارەنووسی جەنگێکی گەورە بەو چەند نەبەردە پێوانە ناکرێت، بەڵام هەموو تێکشکاندنێکیش بێ کاریگەر نابێ و هاوکات شوێنەواری دەروونیی خۆیشی بەجێ دەهێڵێ! بۆیە بۆم دەرکەوت، کە عێراق لە ئامادە کردنی شەپۆلی مرۆیی ئێران لە جەنگەکەدا و لە باسەکانی لەشکری بیست ملیۆنی ئێرانی، ترسێکی زۆری لێنیشتوە! بەوەش ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە سەرانی رژێمی عێراق درەنگ کەوتوون لە

خوێندنـەوەی تـەرازووی هێزەکاندا! ئاخـر هێـزی مرۆیـی ئێران بەرامبـەر بـە عێـراق و توانـای بەکارهێنانـی ناکۆکیـی ناوخۆیـی هـەر لایـەک بـە قازانجـی پشـتیوانی جەنگەکـە، نەدەکـرا حسـابی بـۆ نەکـرێ و بـە هێنـد وەرنەگیـرێ! دوای ئـەوە توانـا ئابوورییەکانـی هـەر دوولا لـە درێژخایەنـی جەنگەکـەدا و توانـای مانـۆڕی هـەر دوولا بـۆ پەیـدا کردنـی پشـتیوان و هاوپەیمانیـی ناوچەیـی و جیهانـی، دەبـوو بەجیددیتـر بیـری لـێ بکرێتـەوە! بەتایبەتـی لەسـەر ئاسـتی ناوچەکـە و گۆڕانکارییـە نێودەوڵەتییەکانیـش، وڵاتـی سـوریا زۆرتـر لـە جـاران و زیاتـر پشـتیوانی کۆمـاری ئیسـلامی ئێرانـی دەکـرد و وڵاتـی (لیبیـا) ش زۆرتـر دژایەتیـی رژێمـی عێراقـی دەکـرد! هەرچـی نرخـی نەوتیشـە هێنـدە هـەڵ نەکشـا بـوو، کـە رژێمـی عێـراق بتوانـێ خەرجیـی جەنگەکـە بـێ قـەرزی بەردەوامـی  وڵاتـە عەرەبییـەکان دابیـن بـکات، ناکۆکییەکانـی بلۆکـی رۆژهـەڵات و رۆژئـاواش، نێوانـی ئەمریـکا و یەکێتیـی سـۆڤیەتی گەرمتـر کردبـوو.. ئەمریـکا لـە تەقاندنەوەکانـی سـەفارەتەکەی لـە (بێـروت)، کـە لـە مانگـی نیسـانی سـاڵی ١٩٨٣ و ١٨- ١٠ -١٩٨٣ دا روویـان دا، زەبرێکـی کاریگـەری پێگەیشـت، کـە بـە تەنهـا لـە رووداوی دووەمـی بنکـەی سـەربازیی ئەمریـکا لـە بێـروت نزیکـەی ٢٦٠ کەسـی لـێ کـوژرا! وڵاتێکـی زلهێـزی وەک  بەریتانیـا لەگـەڵ ئەرجەنتیـن لەسـەر دورگـەی فۆکلانـد تووشـی گیـرو گرفـت بووبـوو، هەمـوو ئەوانـە بـارو دۆخێکـی وای لـە نـاو زلهێزەکانـدا خولقانـد بـوو، کـە هـەم ئێران گـەر بیـەوێ و هـەم عێراق لەگـەڵ ئـەو هیزانـەدا قسـە لـە بەرژەوەنـدی هاوبـەش بکـەن، بـەڵام ئێـران بـەو پانتاییـە جوگرافییـە گەورەیـە و بـەو هێـزە زۆرە مرۆیـەی هەیەتـی و بـە قووڵایـی شارسـتانی و مێـژوی لـەو مانـۆڕەدا بەختـی زیاتـر بـوو!

بۆیـە لام وابـوو ئیتـر ئـەوە کاتێکـی لەبـارە و سـەرانی رژێمـی عێراق روو

له لاواز بوونن و هەست بە مەترسی دەکەن. واتە کاتێکی گونجاوە بۆ پەسەند کردنی بیرۆکەی مفاوەزات لەگەڵ بەغدا! بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانی و ئەوەی جێگەی مەترسی بوو، ئەوە بوو کە کورد لەناو خۆیدا ناتەباو ناکۆک بوو، دیارە بۆ چارەسەری ئەو دۆخەش پێویستی بە کاری گەورە و سەحت هەیە، بۆیە جارێ (یەکێتی)، لەو کارەدا بە تەنها دەبێت، بەڵام ئاخۆ توانای ئەوە پەیدا دەبێت، کە (یەکێتی) بتوانێ جۆرێ لە ئاشتی لەگەڵ هێزەکانی تردا بکات و لەو نەبەردەدا تاسەر بەتەنها نەبێت! ئەوە ئەو کاتە پرسیار و گرێیەکی ئاڵۆز و بێ وەرام بوو!

بەهەر حاڵ لەو دۆخەدا کە (یەکێتی)، کەوتبووە نێوان گوشاری ئێران و ناحەزیی هێزەکانی (جود) ەوە، دەستکردن بە مفاوەزات لەگەڵ رژێمی عێراقدا تاکتیکێکی خراپ نابێ، بە مەرجێ بتوانرێ ژیرانە و لە سەرخۆ کار لەسەر هەموو ئەگەر و لایەنەکانی بکرێ! لەو کۆبوونەوەیەدا رێککەوتین لەسەر سەردانی بەغدا بۆ دانوستاندن لەسەر مەسەلەی راگرتنی شەڕ و مافی نەتەوەیی کورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی! رۆژی دوایی گەڕامەوە و هەموو قسەکانی ئەوان و ئەنجامی چاو پێکەوتنەکەم بۆ (مام جەلال و نەوشیروان)، گێڕایەوە!

لەو مانگەدا هێزی پێشمەرگە زنجیرەیەک چالاکیی سەرکەوتووی ئەنجام دا، هەندێکیان لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە بەڵگەی بەهێز بوون بۆ نیشاندانی توانای زۆری هێزی پێشمەرگە! چونکە ئەو چالاکییانە بۆ حکومەتیان سەلماند، کە شەڕەکانی بەرەی (جود) و گێچەڵی ئێران، توانا و ورەی هێزی پێشمەرگەی کەم نەکردۆتەوە!

## شەڕی بێتواتە!

لە درێژەی سیاسەتی کورد بە کورد بەکوشتندان، حکومەتی عێراق جاشەکانی هان دەدا، کە فەوجی تازە و زۆرتر پێک بهێنن، لەو سیاسەتەشدا (ئەنوەر بەگ)ی بێتواتە، کە خۆی بە میری خۆشناو و گوندەکانی خۆشناوەتی دەزانی، هەوڵیدا گوندەکانی ئەو ناوە، کە بریتی بوون لە (بێتواتە، سێکێل، دواوە، ئەنگوز و ئەندید، شکارتە، میرگە سەر، هەرتەل، زیوە، نواوە، هەرمک، سەردۆڵ، بەرۆژە و هەردوو چیوە)، چەکدار بکات و تەنگ بە (یەکێتی) هەلچنێ، تا بە ئاسانی نەتوانێ بارەگاکانی لەو ناوە بحەوێنێتەوە! بۆ ئەوەش سەرکردایەتیی (یەکێتی)، بڕیاریدا بوار نەدا ئەو پیلانە بۆ (ئەنوەر بەگ) و حکوومەت بچێتە سەر و نەخشەیەکی دارشت، کە (مام جەلال) داینا بوو بە ناوی (سەرکەوت)! سەرکەوت نازناوی مامۆستا (جەمال تایەر)ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی (یەکێتی) بوو، کە لە کارەساتێکی دڵ تەزێندا، سێ مانگ بوو کۆچی دوایی کرد بوو! (مام جەلال) کە خۆی سەرکردایەتیی

هەڵمەتەکانی ئازاد کردنی بێتواتە و ناوچەکە و تەمێکردنی ئەو سەرەک جاشەی دەکرد، نەخشەکەی لە سێ قۆڵەوە دارێشت بوو، یەکێکیان قۆڵی هێزەکانی مەڵبەندی چوار بوو، کە شەهید (شەوکەتی حاجی مشیر)، سەرکردایەتیی دەکرد و منیش وەک ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی چاودێر و هاوکاریان بووم!

لەسەر ئاستی ناوخۆ لە ۱۰/۲۰ /۱۹۸۳ دا، لە قۆڵی مەڵبەندی چوارەوە هێرشەکە دەستی پێکرد. شەوی ۲۱ لە قۆڵی لای (مام جەلال) خۆیەوە، پەلاماری کلاوی دیانە درا و چەند رۆژێکی خایاند بێتواتە ئازاد کرا و هەموو ناوچەکە پاک کرایەوە! لەو رۆژانەدا حکوومەتی بەغدا داوای چوونی (یەکێتی) یان بۆ بەغدا کرد، (مام جەلال و نەوشیروان)، قسەیان لەگەڵ کردم، کە بچم بۆ بەغدا و چی باس بکەم! هەر لەو رۆژانەدا ئێران نیشانی دا، کە دەتوانێ سوود لە هێزە کوردستانییەکان بۆ پشتیوانیی جەنگەکەی وەربگرێ و بەکاریان بهێنێ!

## سەردانی بەغدادا!

رۆژی ٢٤/ ١٠ /١٩٨٣ لەگەڵ هەندێ لێپرسراوی حیزبی (دیموکرات)، کە سەفەرەکەیان ڕێکخستبوو چوم بۆ کەرکووک و لەوێشەوە بۆ بەغداد. پاش قاوە خواردنەوە و پێشوازی و کورتە قسە و باسێک لەگەڵ (بەرزان تکریتی) برای (صدام)، برایانی حیزبی (دیموکرات)، بردمیان بۆ ماڵێک لە گەڕەکی (عامریە)ی بەغدا، کە دکتۆر (قاسملۆ) ش لە هەمان خانو بوو! دکتۆر (قاسملۆ)، پیاوێکی روخۆش و زمان شیرین بوو بە ویڵ و ماریفەتی جوان پێشوازی لێکردم و گەلێ بەسەرهاتی خۆشی خۆی بۆ گێڕامەوە و ئامۆژگاری زۆری کردم لەسەر جۆری بیرکردنەوە و رەفتاری لێپرسراوانی بەعس! رای ئەو وابوو، کە لەم سەفەرەدا (تاریق عزیز) و سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق (سعدون حمادی) و هەندێکی تر ببینم، ئەوان بەلایانەوە گرنگ بوو (مام جەلال)، خۆی بێت و (صدام) ببینێ، بۆیە دکتۆر پێی وابوو لەم سەفەرەدا من (صدام)، نابینم!

رۆژیی دوایی سەعات ١٠ ی سەر لەبەیانی هاتن بە شوێنمدا، من جلی پێشمەرگانەی کوردیم لە بەردا بوو، بردمیان بۆ لای (بەرزان تکریتی)، کە لە مەکتەبی خۆی لە موخابەراتی گشتی بوو! لەوێ (بەرزان) باسی دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ (مام جەلال)، کرد و ستایشی تایبەتی کرد! دوایی کەوتە باسی ئەوەی، کە ئێستا فرسەتێکی باشە پێکەوە بتوانین برینەکانی شەڕی یەکتر کوشتن ساریژ بکەین و پەیوەندیی باش و دۆستانە بەسەر ناحەزیدا زاڵ بکەین. هەروەها باسی ئەوەی کرد، کە سەرکردایەتیی سیاسی (بەعس) بڕیاری وایە، کە مافی نەتەوایەتیی کورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد جێبەجێ بکات و خۆی لە باسی جەنگی (عێراق - ئێران) لادا! بەڵام من بە ئەنقەست هێنامە سەر باسی جەنگ و لێم پرسی، کە ڕەوتی ئەو جەنگە بە چ ئاقارێکدا دەڕوات! ئەویش لە باتی گێڕانەوەی هەواڵەکانی بەرەکانی جەنگ کەوتە سەر باسی مەترسییەکانی ئێرانی خومەینی و خۆی واتەنی (فارسی مەجوس) و لەسەر ئارامیی ناوچەکە بە گشتی و لەسەر عێراق بە تایبەتی و توانای مەزنی عێراق بۆ پاراستنی (دەروازەی ڕۆژهەڵاتی - البوابة الشرقية) نەتەوە و نیشتمانی عەرەب!

پێکەوە ڕۆیشتین بۆ لای (تاریق عزیز)، کە ئەو کاتە جێگری سەرەک وەزیران و وەزیری دەرەوە بوو! لەوێ (عبد الجبار شنشل)، وەزیری بەرگری دانیشتبوو، لەوە دەچوو ئەو لە بەرنامەکەدا نەبووبێ و بەڕێکەوت لەوکاتەدا و بە ئیشی تایبەتی خۆیان لەوێ بووبێ، چونکە زۆری نەبرد خواحافیزی کرد و ڕۆیشت!

بەدەم شیرینی و قاوە خواردنەوەوە، کە (تاریق عزیز) لە گوتاری پێشوازی و هەواڵ پرسینی (مام جەلال) و گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی تاراوگەی سوریای لەگەڵ (مام جەلال) بوویەوە، لێی پرسیم..

ئێوە بیروڕاتان چۆنە و ئاخۆ بە جیددی بڕیارتان داوە، کە بە شێوەیەکی تەواو لەگەڵمان ڕێککەون! منیش ئەو پرۆژانەی، کە لە سەرکردایەتیی خۆمان باسمان کرد بوو، بۆم باس کردن، کە (یەکێتی) ئامادەیە بۆ:

* ڕێککەوتنێکی فراوان و ریشەیی لە چوارچێوەی هاوپەیمانییەکی ستراتیژیی هەر دوو نەتەوەی کورد و عەرەب لەسەر بنچینەی سەلماندنی مافی یەکتری لە سەربەستیی چارەی خۆنووسیندا. بەو پێیەی، کە هەر دوو نەتەوە لە ناوچەکەدا دابەشکراون و ئامانجی خۆیان لە یەکگرتنەوە و پێشکەوتندا هەیە و دەتوانن هاوپەیمانیی ستراتیجی یەکتر بن لە دارشتنی نەخشەی هاوبەش بۆ ئایندە و بۆ پێشەوە چوونیی ناوچەکە و شێوەیەکی باشی پێکەوە ژیان!

* یاخود ڕێککەوتنێکی تایبەتی لە عێراقدا. بە سەلماندنی مافی نەتەوایەتیی کورد لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینە، کە سنووری جوگرافیی کوردستان و هەموو ناوچە راگوێزراوەکان بگرێتەوە و چەوسانەوە و تۆقاندن نەمێنێ و ژیانی دیموکراسی شوێنی بگرێتەوە!

* راگرتنی شەڕ و دانانی رێگە و شوێنی بەجێ بۆ ئەو مەبەستە!

من کە لە پرۆژە و پێشنیارەکانم بوومەوە، (تاریق عزیز)، کەوتە باسی ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان و ستایشی بڕیاری مێژوویی سەرکردایەتیی سیاسی و ئازایەتیی سەرۆکی فەرماندە (صدام حسین) ی کرد، لە جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارەدا و ئەنجا کەوتە تۆمەت وەشاندن لە (بارزانی) و سەرکردایەتیی کورد، کە ئەوەیان قبووڵ نەکرد و نۆکەرایەتیی ئێرانیان پەسەند کرد! پاشان لێی پرسیم .. مەبەستتان لە ئۆتۆنۆمیی راستەقینە چییە!

بۆم باس کردو وتم.. ئەو ئۆتۆنۆمییەی، کە ئەمڕۆ دەسەڵاتی عێراق وەک خەڵات بۆ کوردی باس دەکات، ئەوە کورد پێی رازی نەبوو،

بەهۆی ئەوەشەوە شەڕ و خوێن رشتنێکی زۆر و زیانی مرۆیی و مادی زۆری لە عێراق دا و رێککەوتنی (جەزایری) بە دوای خۆیدا هێنا، ئەو رێککەوتنەی، کە وەک خۆتان دەڵێن مافی عێراقی تیا پێشێل کراوە و بەم جەنگە هەڵتان وەشاندۆتەوە! ئۆتۆنۆمی راستەقینەش ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمییەیە، کە دەتوانێت ئەو راستییە دەربخات ئاخۆ ئێوە دان بە مافی نەتەوەیی کوردا دەنێن یان نا! بۆیە دەبێت دەسەڵاتی تەواوی بەڕێوەبردنی کوردستانی هەبێت و ئازادی و پێشکەوتن بێنێتە دی! ئۆتۆنۆمیی راستەقینە مانای مافی رەوای نەتەوەیی کوردە لە بڕیاردانی چارەنووسی خۆی لە چوارچێوەی عێراقدا و لەسەر ئەساسی یەککگرتنێکی ئازاد. دەسەڵاتەکانیشی جگە لە بەرگری و دارایی و کاروباری دەرەوە، هەموو شتیکی تر بگرێتەوە! لەوەڵامدا (تاریق عزیز) گوتی.. لەسەر بنچینەی ئۆتۆنۆمیی هەموو باسێک بۆ دانوستاندن قبوولە! ئیتر کەوتە سەر باسی ئێران و مەترسییەکانی، خۆی واتەنی (فارسە مەجوسەکان) و مەترسییەکانی جەنگەکە و دەربڕینی نارەزایی لەوەی کە :

* ئەگەر سەرکردەکانی کورد لەسەر ئەو هەڵوێست و مومارەسەیە بەردەوام بن، ئەوا بەوە دوژمنایەتییەکی گەورە بۆ گەلەکەتان دروست دەکەن! عێراق لە جەنگێکی گەورەدایە لەگەڵ ئێران، دوژمنایەتی و جەنگی ئێران بەتەنها لە دژی عێراق نییە، ئەوە لە دژی هەموو نەتەوەی عەرەبە، لەکاتێکدا ئێمە لەو جەنگەداین کورد بە قازانجی ئێران شەڕ لەگەڵ عێراق و سوپاکەی دەکات، ئەو سوپایەی کە پارێزگاری دەروازەی رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبییە! کورد یەک بەش لە سێ بەشی سوپاکەی گیر کردووە بە شەڕێکی ناوخۆوە، لە ٣ فەیلەق یەک فەیلەق سەرقاڵی ئێوەیە و ناتوانێ بەشداری جەنگ دژی ئێران بکات!

بۆیـە گـەر ئێـوە لەسـەر ئـەوە بـەردەوام بـن، ئـەوا عێـراق لـەو جەنگـەدا تووشـی هـەر زیانێـک بـێ، بـە ئێـوەی دەزانیـن و دوایـی خـراپ تۆڵەتـان لـێ دەکەینـەوە، چونکـە کـە جەنگەکـە تـەواو بـوو هەرچـی هێزمـان هەیـە دەیهێنینـە سـەرتان و کارێکـی خراپتـان پـێ دەکەیـن!

هەڕەشـەکانی بێجـێ بـوون، بۆیـە منیـش وەرامـم دایـەوە وتـم.. ئێمـە لـە هەڕەشـەی ئێـوە ناترسـین، پێشـتریش زۆرتـان هەڕەشـە کـردووە و گوێشـمان پێنـەداوە! ئێمـە کـە دەسـتمان بـە شـۆڕش کـردەوە ژمارەمـان کـەم بـوو، بـە پەنجەکانـی دەسـت دەژمێـرران، زۆرتـان هەڕەشـە لێکردیـن، کەچـی ئێمـە بـەردەوام لـە گەشـە کردنـدا بوویـن، تـا بووینـە هێزێکـی گـەورە و کاریگـەری وا، کـە ئێسـتا ئێـوە مفـاوەزات و گفتوگۆمـان لەگـەڵ دەکـەن!

وەرامـی دامـەوە وتـی.. ئێمـە دەمانـەوی کێشـەکەتان چارەسـەر بکەیـن و کـورد بـە جۆرێکـی وا رازی بکەیـن، کـە ئێـوەش بـە ئەرکـی خۆتانـی بزانـن بەرگـری لـە نیشـتمانی خۆتـان بکـەن، بۆیـە ئێسـتا فرسـەتیکی باشـە، ئوسـتاد (جـەلال) خـۆی بێـت لەگـەڵ سـەرۆک قسـە بـکات و بـە ئاسـانی هەمـوو کێشـەکان چارەسـەر بکـەن!

جارێکـی تریـش (تاریـق عزیـز) م بینیـەوە، قسـەکانی پێشـووی دوبـارە کـردەوە و وتـی سـڵاومان بـۆ (مـام جـەلال)، هەیـە و چاوەڕوانـی هاتنـی دەکەیـن!

لـەم سـەفەرەدا و لـە هاتنـم و لـە گەڕانەوەشـمدا، نازانـم بـە رێکـەوت بـوو یاخـود بـە ئەنقەسـت، هێزێکـی سـەربازی و توانایەکـی زۆری سـوپای عێراقیـان نیشـاندام. هـەر هێـزی گـەورە بـوو بـە تفاقـی جەنگیـی زۆرەوە لەسـەر رێگاکان لـە هاتوچـۆدا بـوون. کـە گەڕامـەوە هەمـوو قسـەکانم بـۆ (مـام جـەلال و نەوشـیروان) و بـۆ ئـەو برایانـەی سـەرکردایەتی گێڕایـەوە، کـە (مـام جـەلال) بـۆ گوێگرتـن ئامـادەی کردبـوون!

(مام جەلال)، خۆی بە تاقیکردنەوەکانی پێشوی تەمەنی، هیچ باوەڕێکی بە سەرانی (بەعس و صدام حسین) نەبوو! لەسەر دانوستاندن لەگەڵ ڕژێمی عێراق و چوونیشی بۆ بەغدا رازی نەبوو، حەزیشی لەوە نەبوو کارێکی وا بکات، سوریا و لیبیا کە پشتیوانی کوردیان دەکرد دردۆنگ بن! بەڵام پێداویستی بار و دۆخەکە بۆ پشودانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و پەیداکردنەوەی دەرفەت بۆ باشتر ڕێکخستنەوەیان و هەڵوێستی نەیارانەی ئێران و ئەو هەموو گەلەکۆمەکییەی هێزەکانی بەرەی (جود) و لە هەمووشیان زیاتر، سڵکردنەوەی سەرکردایەتیی (یەکێتی) بوو، لە وەرگیرانی ئەو هەڵوێستەی، کە شەڕ کردنی کورد بەرامبەر بە ڕژێم بە دوژمنایەتیی گەلی کورد بۆ نەتەوەی عەرەب بدرێ لە قەڵەم! لەو هۆکارە سەرەکییانەی گفتوگۆ کردن بوو، لەگەڵ سەرانی (بەعس)! ئیتر هەموو ئەوانە وایان کرد، کە (مام جەلال) زۆرترین کۆبوونەوە لەگەڵ سەرکردایەتیی (یەکێتی) و لەگەڵ کادر و فەرماندەکان بکات! لە ڕۆژی ١٩٨٣/١١/١٥ لە کۆبونەوەیەکی فراواندا لە بالیسان، کە زیاتر لە ٣٠ کادری سیاسی و پێشمەرگەیی و هەر دوو نووسەر (جەوهەر کرمانج و سەعدوڵا پەرۆش) ئامادەی بوون، (مام جەلال)، بە وردی کەوتە باسی گفتوگۆ و هەلومەرجەکانی و بۆ ئەوەش مەبەستی بوو، کە بیروڕای ئامادە بووان لەسەر ئەو مەسەلەیە بزانێ! لە دوو کادر بەولاوە کەسی تر بە دانوستاندن لەگەڵ ڕژێم نارازی نەبوو!

جارێکی تریش منیان ناردەوە بۆ بەغدا، بۆ ئەوەی لەسەر وەستاندنی شەڕ قسەیان لەگەڵ بکەین و ئەگەری چوونی (مام جەلال) و تەگبیری چۆنێتی ئەو سەفەرە بە هاوکاری دکتۆر قاسملۆ باس بکرێت! لە ١٩٨٣/١٢/٣ دا، بڕیاری ئاگر بڕ و وەستاندنی شەڕ درا و

لای حکومەتیشـەوە شـەڕ ڕاگیرا! ئیتر گەڕامـەوە بۆ زیخـان بۆ لای (مـام جـەلال). لـەو ماوەیـەدا لـە بەغـدا بەردێکـی گـەورە لـە گورچیلەمـدا بـوو لـە نەخۆشـخانەی بەغدا دەریـان هێنـا، ئیتـر هەرچـی هەواڵـی بـزر بوونـی منـی پرسـی بـوو، بـەوە پینەیـان کردبـوو، کـە گوایـا چـووم عەمەلیاتـی گورچیلـەم بکـەم!

ڕۆژێکیـان (مـام جـەلال)، بـە ئامـادە بوونـی (نەوشـیروان و مـلازم عومـەر) و مـن، بـە وردی هەمـوو ئەگەرەکانـی چـوون بـۆ بەغـدای لەگـەڵ دکتـۆر (قاسـملۆ) خسـتە بـەر بـاس و لێکۆڵینـەوە! ئێمـەش دەمانزانـی مەسـەلەکەی پـێ خـۆش نییـە و هیـچ متمانەیەکـی نـە بـە (صـدام) و نـە بـە حیزبەکەیشـی نەبـوو، بـەڵام بـە هەمووومـان هانمانـدا، کـە سـەرکردایەتیی دەسـتەیەکی نوێنەرایەتـی بـکات و بچێـت بـۆ بەغـدا! لـەو کاتانـەدا ژمارەیـەک ڕیـش سـپی و پیـاو ماقوڵـی ناوچەکـە هاتبـوون بـۆ سـەردانی (مـام جـەلال) و نیگەرانیی خۆیـان لـە چوونـی (مـام جـەلال) نیشـان دا و پێیـان وت.. ئەگـەر (صـدام) کوڕێـک یـا برایەکـی بـە متمانـە نەنێرێتـە ئێـرە، هـەق نییـە تـۆ بچیتـە بەغـدا! (مـام جـەلال)، لەوەرامـدا پێـی وتـن: مـن پێشـمەرگەم، گەرچـی خـۆم ڕازی نیـم، بـەڵام بڕیـاری سـەرکردایەتی و ئیـرادەی کادر و فەرماندەکانـە، دەبێـت جێبەجێـی بکـەم! پێشـمەرگەش لـە ژیانـی پێشـمەرگایەتیدا هەمـوو ڕۆژ ڕووبـەڕووی مـردن دەبێتـەوە و ناشـێ سـڵ لـە مـردن بکاتـەوە، چـوون بـۆ بەغـدا و بـۆ مفـاوەزات لەگـەڵ حکوومـەت سـەنگەرێکی تـری خەباتـە لـە پێنـاوی بـە دەسـتهێنانی مافـە ڕەواکانـی گەلەکەمـان! بۆیـە مـن بـاش دەزانـم کـە ئـەو تێکۆشـانەش بـە بـێ ڕیسـک و بـێ مەترسـی نابێـت، بـەڵام تێکۆشـان بـۆ مافـی گەلەکەمـان بەبـێ زاتـی گیانبازیـش سـەرناگرێ، ئـەوە پێشـمەرگایەتییە و دەبێـت ئەرکەکانـی جێبەجـێ بکەیـن!

## (مام جەلال) و گفتوگۆ!

لە رۆژەکانی کۆتا مانگی ساڵی ١٩٨٣ دا، هەلیکۆپتەری سوپای عێراق بە یاوەری دکتۆر (قاسملۆ) و گەورە ئەفسەرێکی دەزگای موخابەرات، هات بە شوێن (مام جەلال) دا، کە ئەو کاتە بە (ئەبوو سەرحان) ناویان دەبرد! ئێمەش شاندێکی (یەکێتی)، بە یاوەری (مام جەلال)، بەرەو کەرکووک سواری کۆپتەر بووین و لەوێشەوە بۆ بەغدا! لەو سەفەرەدا سەرەڕای تەقەلای شاردنەوەی (مام جەلال)، لە ئەفسەرە پایە بەرزەکانی خۆیان لە بارەگاکانی سەربازی رژێم لە کەرکووک و لە بەغدا، بەڵام چەندین جەنەراڵ و ئەفسەری گەورە (مام جەلال) یان ناسیەوە و بە شێوازێکی جوان و بە زەردەخەنەوە سڵاویان لێ دەکرد! لە بەغدا پێشوازییەکی گەرم لە (مام جەلال) و شاندەکەی یاوەری کرا، لە شوێنی تایبەتی حکومەت جێگەیان بۆ ئامادە کرد بووین و لەلایەن گەورە کاربەدەستانەوە سەردانی (مام جەلال) کرا و سەرەتای کۆبوونەوەکانیش هەر لەو نزیکە لە شوێنێکی سەرۆکایەتیی موخابەرات

دەبەسترا!
یەکەمین کۆبوونەوە، شاندی حکومەت بە سەرۆکایەتی (تاریق عزیز) بوو، کە ئەو کاتە بریکاری سەرەک وەزیران و وەزیری دەرەوە بوو، ئەگەرچی (عزت دوری) بە سەرۆکی شاندەکەی حکومەت دانرا بوو، بەلام وەک ئەوەی لە کۆبوونەوەکەدا باس کرا، لەبەر سەرقاڵییەکی کتوپڕی ئەو کاتەی نەیتوانیبوو ئامادە بێت! (سعدی مهدی سالح)، کە ئەو کاتە لێپرسراوی ڕێکخراوی حیزبی (بەعس) بوو، لە باکوری عێراق و (هشام صباح فخری)، کە (صدام)، ناوی نابوو سوارچاکی سواران و سەرۆکی دەزگای موخابەرات بوو، (فازل براک)، کە لێپرسراوی دەزگای گشتی ئاسایش بوو، لەو کۆبوونەوەیەدا ئەندامی شاندەکەی حکومەت بوون!
شاندەکەی (یەکێتی) ش، بە سەرۆکایەتی (مام جەلال) و لە (کۆمەڵە)، (فەرەیدون عەبدولقادر، ملازم عومەر، مەلا بەختیار ! - مەلا بەختیار لە نەیارەکانی ئەو دانوساندنە بوو - دکتۆر (خدر مەعسوم)، کە لە خەتی گشتی بوو، ئەویش نەیاری دانوستاندن بوو، (عومەر عەزیز)یش، کە نوێنەری (بزووتنەوەی سۆسیالیستی) ناو (یەکێتی) بوو، ئەندامانی شاندەکە بوون!
باسەکانی ئەو کۆبوونەوەیە، کە هەموو داواکانی (یەکێتی) گرتبووە خۆ، بابەتە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە :
١- ئۆتۆنۆمیی کوردستان و گەشە پێدانی و فراوان کردنی دەسەلاتی دامو دەزگاکانی و دیاریی کردنی دەسەلاتەکانی حکومەتی مەرکەزی عێراق!
٢ – دیاریی کردنی ئەو شوێنانەی، کە دەکەوینە قەڵەمڕەوی ئۆتۆنۆمیی کوردستانەوە! مەبەست لە دیاریی کردنی سنووری ئۆتۆنۆمیی

کوردستان بـوو!

٣ - ئاسـایی کردنـەوەی گشـتی بارودۆخـی سیاسـی کوردسـتان و ئـەو ناوچانـەی بـەر تەعریـب کەوتـوون! ئاسـایی کردنـەوەی ئاسایشـی ناوچەکانـی کوردسـتان و گونـدە راگوێـزراوەکان و پرۆسـەی خوێنـدن و زمانـی کـوردی و زانکـۆی سـلێمانی!

٤ – دیاریی کردنـی بەشـی کـورد لـە دەزگاکانـی بڕیـاردان لـە عێـراق و حکوومەتـی ناوەنـدی و هـاوکات بەشـی کـورد لـە داهـات و بودجـەی عێراقـدا .

ئـەم خولـەی دانوسـتاندن تـا ئەندازەیەکـی بـاش گفتوگۆکـەی بـردە پێشـەوە، ئەگەرچـی هەلومەرجـی عێـراق و جەنگـی (عێـراق - ئێـران)، لـە رووداوەکانـی ئەوکاتـە و لـە ئامـادە کارییەکانـی شـەپۆلی مرۆیـی و سـازدانی لەشـکری بیسـت ملیۆنـی ئێـران، رژێمـی عێراقـی شـپرزە کـرد بـوو! دوای ئـەوە وەک خۆشـیان دەیانگـوت لـە کـۆی سـێ فەیلەقـی سـەربازی عێراق، یـەک فەیلـەق بـە کێشـەی کوردەوە خەریـک بـوو. بۆیـە عێـراق زۆر پێویسـتی بـە رێککەوتنێـک هەبـوو لەگـەڵ کـورد، کـە رەنگـە ئـەو مفاوەزاتەیـان لەگـەڵ (یەکێتـی)، کلیلـی رێککەوتنیکی وابوایـە! کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا هێشـتا بـە لەخۆبایـی و لـووت بەرزییـەوە دەیانڕوانیـە داوا رەوا و راستەقینەکانی کورد! من بـۆ خـۆم ئـەو لـووت بەرزییـەم لـە باسـەکانی سـنووری ئۆتۆنۆمـی و مەسـەلە بودجـەی کوردسـتاندا بـەدی دەکـرد!

(تاریـق عزیـز)، تەقەلایەکـی زۆری دەدا وەک سـەرکردەیەکی بـە توانـاو بـە دەسـەڵات خـۆی بنوێنێ، بۆیـە کـە قسـەی دەکرد، زیاتر وەک مامۆسـتا و موحازرێـک خـۆی دەنوانـد، تـا وەک سـەرۆکی شـاندێ بـۆ گفتوگـۆ و لەیـەک گەشـتن! بۆیـە کـە هاتـە سـەر قسـەکردن لەسـەر (حافز ئەسـەد ی

سوریا و قەذافی لیبیا)، (مام جەلال)، بەڕوویدا هەڵشاخا و خەجاڵەتی کردا!

دوو ڕووداوی سەیر، کە لەو خولەی دانوساندنەدا ڕوویان دا، دەلاقەیەکی گەورەی کردە لە خۆبایی بوونی سەرانی ڕژێم، لانی کەمی لە بەرچاوی من وابوو :

• یەکەمیان.. کە لەسەر مێزی گفتوگۆ دادەنیشتین، هەر کەسەو لەو شوێنە دادەنیشت، کە ناوەکەی خۆی لەسەر نووسرا بوو، من کەوتبوومە دەستی ڕاستی (مام جەلال) ەوە، کە ڕوانیم لەباتی (فەرەیدون عەبدولقادر فەرەج) نووسراوە (فریدون علی قادر)! بە (مام جەلال)م گوت.. سەیرە ئەمانە ناوی من نازانن، بەڵام جارێ قسە مەکە بابمێنێ!

ئیتر کە کۆبوونەوەکە دەستی پێکرد، هاتنە سەر باسی ئەوەی، کە گوایە ئەوان ئاگاداری هەموو وردە کارییەکانی هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی عێراق و کوردن، بەتایبەتیش زانیاریی وردیان لەسەر (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) هەیە! (تاریق عزیز)، کەوتە خۆ هەڵکێشان و وتی:

ئێمە بە وردی سۆراخی ئێوە و کێشەکان و چالاکیەکانمان کردووە و بە وردی ئاگامان لە پێکهاتە و کێشە و بەرنامەکانتان هەبووەو، زانیاریی تەواومان لەسەرتان هەیە! منیش کاتەکەم بە گونجاو و دەرفەتێکی باش زانی، بۆیە دوای ئەوەی مۆڵەتم لە (مام جەلال) وەرگرت.. کارتی ناوەکەی بەردەمم بەرزکردەوە و وتم.. بەم کارتەی ناوی مندا دیارە، ئەمە نووسراوە (فریدون علی قادر)، بەڵام من ناوم (فەرەیدون عەبدول قادر) ە ! من لە ئەمنی عامەی ئێوەوە لە ساڵی ١٩٧٥دا، بڕیاری گرتنم بۆ دەرچووە و کون بەکون بە شوێنمدا گەڕاون، پاشان لە ئێرانەوە تەسلیم بە ئێوە کراومەتەوە و دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر، چوار ساڵ

لە زیندانی ئێوەدا بووم، ناوم لە هەموو شوێنەکانی ئەمنی سلێمانی و کەرکووک و رومادی و بەغدا هەیە و پێش ئەم خولەی دانوستاندنەی ئێستاش، چەند جارێکی تر هاتوومەتە لاتان و رێک لەگەڵ جەنابتدا هەنگاوە سەرەتاییەکانی ئەم گفتوگۆیە و هاتنی (مام جەلال) مان دارشتوە و باس کردووە، کەچی هێشتا ناوم بە باشی نازانن!

ئاگام لێ بوو (تاریق عزیز)، ئەو باسەی لا ناخوش بوو، رووی گرژ کرد و بێ وەڵام و بێدەنگ تەماشایەکی کردم! ئیتر لەوە گەیشتم، کە زانیارییەکانیان بە ئەندازەی خۆ هەڵکێشان و لووت بەرزییان نییە!

• دوەمیان.. تووڕە بوونی (مام جەلال) بوو لە (تاریق عزیز): باس گەرم بوو لەسەر دامەزراندنەوەی زانکۆی سلێمانی و کۆلێجەکانی، (مام جەلال)، بە درێژی باسی لە گرنگیی خوێندن و زانکۆی لە کۆمەڵ و ژیان و پێشکەوتندا کرد و باسی لە گرنگی شاری سلێمانی و بایەخی رۆشنبیری لەو شارەدا کرد، بۆ ئەوەش داوای کرد، کە پێویستە ئەو زانکۆیە بە بودجەیەکی باش دابمەزرێتەوە!

• لە وەڵامدا (تاریق عزیز) وتی: باشە، بەڵام پارەمان نییە بودجەی بۆ تەرخان بکەین!

کە (مام جەلال) گوێی لەو وەڵامە بوو وتی: جا ئەوە کەی رازیبون و دامەزراندنەوەیە !

• (تاریق عزیز)، بە زمانی نیوە قۆشمە و نیوە پلارەوە وتی: (حافز اسد و قزافی) هاورێتانن، داوای بودجە لەوان بکە !

(مام جەلال) وتی.. سوریا و ئەسەد، قەذافی و لیبیا، دۆستی رۆژگارێکی تەنگانەی ئێمە بوون، ئێمە هەرگیز چاکەی ئەوانە لەبیر ناکەین، زۆر باشە ئەگەر ئێوە زانکۆیەکمان بۆ ئاوەدان نەکەنەوە، ئێمە دەچین داوا لە ئەوان دەکەین، دڵنیاشم ئەوان یارمەتیمان دەدەن!

- لەمەودوا کە ڕێککەوتین هەرکەس لەگەڵ ئەوانەی، کە دوژمنی عێراقن پەیوەندی بکات، لە سەری دەدەین!

ئاگام لێبوو (مام جەلال) شەپۆلێکی تووڕە بوون وڕووژمی بۆ هێنا، لە چاوەکانی و هەموو سیمایدا داخێکی زۆر لە لووت بەرزی و دڕندەیی ڕژێم چەخماخەی دەدا، مات و بێدەنگ بوو، لەپڕ بە تووڕەبونەوە دەستی دایە پاکەتی جگەرەکەی و بێ پرسی کەس جگەرەیەکی برد بۆ لێوی و پاکەتەکەشی بە رووی (تاریق عزیز)دا، فڕێدایە سەر مێزەکە و جگەرەکانی ناوی هەموو بڵاوبوونەوە، ئەنجا بە توندی کڵاو و جامانەکەی خستە سەر مێزەکە و وتی :

فەرموو ئەوە لەبەر دەستداین .. بزانم چۆن سەرمان دەپەڕێنی!

ماوەیەک بەدەم گرژ بوونی (تاریق عزیز) ەوە هەموو بێدەنگ بووین، تا لە پڕ (مام جەلال)، هەستاو مێزەکەی بەجێهێشت، ئێمەش لەگەڵی هەستاین! شاندەکەی حکومەت لە (مام جەلال) ەوە ئاڵان و داوای لێ بوردنیان لێ کرد! لیوا (محمود شکور شاهین)، هات و (مام جەلال) ی بردە ئەو لاوە و پێی وت ئەوە هەڵەوەڕە، نابێ زویر بیت! ئەنجا دکتور (قاسملۆ) و ئەوانی تریش تکایان لە (مام جەلال) کرد، کە بێتەوە سەر مێزەکە دابنیشێتەوە. هەموو وتیان دانیشتنەکە سەرکەوتووە و باش دەڕوا، با تێک نەچێ! (تاریق عزیز) وتی.. من گاڵتەی خۆشیم لەگەڵ (مام جەلال) کردووە و بە ڕاستم نەبووە، بۆیە داوای لێبوردن و سڕینەوەیشی دەکەم لە مەحزەری کۆبوونەوەکە! ئیتر هەموو دڵی (مام جەلال) یان دایەوە و وتیان ئەوا داوای لێبوردنی کرد.. ئیتر تەواو! ویستیان قسە و گفتوگۆ کردن دەست پێبکاتەوە، ڕووی دەمم کردە هەموو شاندەکەی حکومەت و وتم: ئەگەر بەڕێز (تاریق عەزیز)، بە ئەدەب قسە لەگەڵ (مام جەلال) نەکات، ئێمە قبوڵی ناکەین و دانیشتنەکە

بەجێ دەهێڵین، ئەویش لە وەرامدا وتی: خۆمن قسەی وا توندم نەکردووە (مام جەلال)، لێم زویر بوو، پاش ئەوە ئیتر کۆبوونەوەکە ڕێچکەی ئاسایی خۆی وەرگرتەوە!

لەو خولەی گفتوگۆدا لەسەر فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی ئۆتۆنۆمی و لەسەر ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کوردستان و لەسەر هەندێ فراوانکردنی سنوور و لەسەر هێڵی گشتیی دابینکردنی بودجەی ئۆتۆنۆمی پێکهاتین و دوا قسەش، کە لەسەر مەسەلەی کەرکووک بوو، هەڵگیرا بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ (صدام حسین)! ڕۆژیی دوایی کۆبوونەوە بوو لەگەڵ (صدام)، بەر لە کۆبوونەوە لەوە حاڵیمان کردن، کە ئەگەر لە هۆڵێکدا دامان بنێن، ئەوا نەریتی ئێمە وایە لە ماڵی خۆماندا پێشوازی دەکەین، نەک لە جێگە و ماڵی دۆستەکانمان، بۆیە هەرکەس بێتە ژوورەوە ئێمە ناتوانین لەبەری هەڵسین! دیار بوو بەگوێیان کرد بووین، بۆیە کە لە کۆشکی کۆماری بەڕێز چووینە ژوورەوە بۆ لای (صدام حسین)، ئەو لە هۆڵەکەدا بە پێوە ڕاوەستا بوو بەگەرمی پێشوازی و چاک و چۆنی لەگەڵ (مام جەلال) و یەک یەک لەگەڵ ئێمەش کرد! دانیشتنەکە وابوو (مام جەلال)، لە کورسیی تەنیشت کورسیی (صدام) دانیشتبوو، ئیتر لە تەنیشتی ئەویشەوە من و برایانی تر بەڕیز دانیشتین! (عزت دوری)، جێگری (صدام) و (تاریق عزیز) و هەندێکی تری وەک (هیشام صباح فخری و فازل براک) یش، بە ریز دانیشتن! (صدام)، ویستی بە باسی دۆستانە باسەکە دامەزرێنێ و وتی.. (مام جەلال)، ئێوە قەرەبووی زیانەکانتان دەوێت، کە بەهۆی ئەم کفتوگۆ و تێکەڵ بوونەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە، بەڵام (ئەبو احمد - عزت دوری - و تاریق و هشام)، ئەو کارە دەکەن و خۆیشت باش دەزانی، کە ئەوانە هەموویان موسڵاوین، ئاخۆ دەتوانیت شتێ لە

چنگیان دەربهێنێت! (مام جەلال) یش لە مەبەستی ئەو تێگەیشت، قسە و باسی زۆر خۆشی لەو بارەیەوە درێژە پێدا!
ئیتر (صدام حسین)، کەوتە قسەی جیددی و وتی: من بە خۆش حاڵییەوە بەخێر هاتنت دەکەم و ئەم هەنگاوەت لەم کاتەدا بە ئازایەتییەکی باش حسابیی دەکەم، تۆ بەم کارە چاکەمان لەگەڵ دەکەیت، چاکە لەسەر عێراق و چاکە لەسەر حیزب، منیش شتێکی واتان دەدەمێ، تۆ لە بەردەمی کوردا سەربەرز بیت و گەلی کوردمان لە هەموو شوێنێک بیکاتە شایی! ئەنجا وتی: من تەماشای مەحزەری هەموو کوبوونەوەکانم کردوە و گفتوگۆکانتان جیددی بوون و بە نیازی رێککەوتنن، تەنانەت تووڕە بوونەکانیشتان هەر نیشانەی جیددی بوونە! من لەسەر هەموو باسەکان موافیقم، جگە لە مەسەلەی کەرکووک، بۆ کەرکووکیش ناڵێم  کەرکووک شارێکی کوردی نییە و ناشڵێم شارێکی عەرەبیە، تەنانەت دوای راپرسیی گشتیش ئەگەر دەرکەوت زۆرایەتی دانیشتوانەکەی کوردە، ئەو کاتەش هەر سوور دەبم لەسەر ئەوەی، کە کەرکووک شارێکی عێراقی بێت و هەموو عێراق و گەلەکەی سوود لە سامانەکەی وەربگرێ! من دەمەوێ کەرکووک، خەڵکی عێراق پێکەوە گرێ بداتەوە، کورد بۆ ئەوەی کەرکووکی لەدەست نەچێت ئیتر بیر لە جیابوونەوە ناکاتەوە، عەرەبیش بۆ ئەوەی بتوانێ کورد رازی بکات، دژی مافەکانی ناوەستێ! من یەکێتیی عێراق و عێراقییەکانم دەوێ، بۆیە ئێوە دەبن بە بەشێک لە ئێمە و ئێمەش بەشێک دەبین لە ئێوە و بە هەر دوو لامان حاڵەتی عێراقی یەکگرتوو پێک دەهێنین و پێکەوە حوکم دەکەین و پێکەوە دەژین و پێکیشەوە دەمرین، با جارێ شاری کەرکووک لە بەینماندا بمێنێتەوە، کاتی خۆی هەر ئەو قسەیەشم بە کوڕەکانی (بارزانی) وتوە! ئیتر هەندێ وەستا و رووی کردەوە (مام

جەلال) و چاوێکی بە چاوی هەمووماندا گێڕا و وتی .. با ئەم ڕێکەوتنەو ئەم دانیشتنە بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان بڵاوبکرێتەوە! ئیتر بێدەنگ چاوەڕوانی وەرامی (مام جەلال)ی کرد!

(مام جەلال)، بەشێوەیەک بۆ خۆدزینەوە لەو هەڵوێستە کتوپڕەی (صدام) وتی: ڕاستە من سکرتێری گشتی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) م، بەڵام دەبێ کۆمیتەی سەرکردایەتی بانگ بکەم و کۆببنەوە و دەنگی لەسەر بدەن، پاش ڕازی بوونی زۆرینەی سەرکردایەتی ئەنجا دەتوانم شتی وا گرنگ ئیمزا بکەم! لە دەنگداندا دەسەڵاتیشم هەیە، ئەگەر بەڵێ و نەخێر وەک یەک بوون، من لەگەڵ بەڵێ بم دەبێتە ڕازی بوون و بڕیار، بۆیە دەبێت بگەڕێمەوە و پرس بە هاوڕێکانم بکەم! چەند ساتێک هەموو بێدەنگ بووین، (صدام)، ڕووی دەمی کردەوە (عزت دوری) و وتی: هاوڕێ (ئەبو احمد)، لە یارمەتیدانی (یەکێتی)دا، بەخشندەبە! هەندی قسەی خۆش کرا و کۆبوونەوەکە تەواو بوو بە ئومێدی دیدارێکی تر!

لەو کۆبوونەوەیەدا خۆم سەرم سوڕما لە وەرامەکەی (مام جەلال)، کە بۆچی ئەو دەرفەتەی نەقۆستەوە بۆ بە دەستهێنانی بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ کوردستانی باشوور و بۆ نەتەوەی کورد. (مام جەلال)، لە ئێمە باشتر ئەو ڕاستییەی دەزانی، کە هەموو ڕووداوێکی گرنگ و هەموو دەسکەوتێک لە مێژوودا بەری هەلومەرجێکی تایبەتییە و بە کاریگەریی ئەو هاوکێشانەی کە ئەو هەلومەرجە دەیانخوڵقێنێ دروست دەبێ، بۆیە ئەوەی لەو دەرفەتەدا دەکرا بە دەست بێت، ڕەنگە لە کاتێکی تردا مومکین نەبێ! لەو دەمەدا کە (صدام)، ئەو ئامادەییەی دەربڕی، عێراق گیرۆدەی جەنگێکی سەخت و وێرانکەر بووبوو، تەرازووی هێزەکانیش لە شەڕەکەدا هەڕەشە و مەترسییەکی گەورەی

لەسەر عێراق و ئایندەی رژێمی عێراق دروست کرد بوو، (مام جەلال)، باش ئاگاداری بەرەکانی جەنگی (عێراق - ئێران) بوو!
ئاخر سالی ١٩٨٣ و لەو دەمەی، کە ئێمە گفتوگۆمان لەگەڵ رژێم دەکرد، ئێران توانی هێزێکی ئێجگار زۆر ئامادە بکات لە پاسدار و بەسیج، ئەوەش بە هێرشەکانی شەپۆلی مرۆیی دەنگی دایەوە! هێشتا هێرشە یەک لەدوای یەکەکانی ئێران لە بەرەکانی جەنگ لە ناوەڕاست و خواروو دەنگ و باسەکانیان کۆن نەبوو بوو، کە بە ٦ فیرقە توانی پەلاماری هێزەکانی عێراق بدا و رێگەی (بەغدا - بەسرە)، لە هێزەکانی عێراق دابڕێ! سەرەتای سالّی ١٩٨٤ یش، هێرشە گەورەکانی ئێران، کە بە ناوی فەجری پێنج و فەجری شەشەوە لە کەرتی ناوەڕاست و خواروو دژی فەیلەقی دووی عێراق ئەنجام دران و هێرشەکانی تر، کە بە ناوی (خەیبەر) کران، سەرەڕای ئەوەیش، کە ئێران هەموو داواکانی راگرتنی شەڕی رەت دەکردەوە، ئەوا هەموو ئەوانە مایەی زەنگێکی ترسناک و هەڕەشەیەکی گەورە بوون لەسەر عێراق و رژێم! چونکە تا ئەو کاتە ژمارەی راستەقینەی سوپای عێراق هەرچەندە سێ فەیلەق بوو، بەلام نە دەگەیشتە سێ سەد هەزار کەس، کەچی زیاتر لە شەست هەزار کوژراوی هەبوو! ئەو واقیعە عێراقی ناچار کرد بوو، کە شەڕی کورد لە کۆل خۆی بکاتەوە و هێزەکانی بەو شەڕە ناوخۆییەوە گیر نەدا! بۆیە بەڕای من ئەو هەلومەرجە دەیتوانی دەرفەتێکی لەبار بێت، بۆ ئەوەی (صدام حسین)، رێکەوتنێک لەگەڵ کورد ئیمزا بکات، کە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، هێزە گەورە و کاریگەرەکەی نێو گۆڕەپانەکە بوو! رێکەوتنێکی لەو جۆرە ئەگەر هەمووشی جێبەجێ نەکرایە، هێشتا لە رووی مێژوییەوە بایەخێکی گەورەی بۆ مەسەلەی کورد دەبوو!

دەستووری کاتیی عێراق لە زەمانی (عەبدالکریم قاسم)دا دەڵێ.. عەرەب و کورد هاوبەشن لە عێراقدا و دان بە مافی نەتەوەیی کوردا دەنێت، هەرچەندە ئەم دانپیانانە تەنها قسەیە و بە کردار بەرجەستە نەبووە، بەڵام بیرمان نەچێت ئەو دۆکۆمێنتە بایەخی مێژوویی خۆی هەیە بۆ کورد و هەنگاوەکانی بەرە و پێشەوە چوونی مەسەلەی کورد! بەیانی ٢٩ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦، کە سەرەک وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق بە ١٢ مادە، کە گرنگترینیان دانیان بوو بە مافی نەتەوایەتیی و کەلتوری گەلی کورد لە کوردستانی باشووردا، هەرچەندە جێبەجێش نەکرا، بەڵام بە هەمان جۆر ئەویش دۆکومێنتێکی ترە و هەنگاوێکی تری پێشەوە بردنی عەقلی فەرمانڕەواکانی عێراقە بەرامبەر دۆزی کورد.

راستە بەیان و رێکەوتنی ١١ ئاداری ساڵی ١٩٧٠، جێبەجێ نەکرا! بەڵام دواجار ئەو بەیانە بووە بە دۆکۆمێنتێکی گرنگ و هەنگاوێکی گەورە لە مێژووی جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کوردا!

دیارە دوایی لەوە تێگەیشتین، کە (مام جەلال)، بە هیچ شێوەیەک بڕوا و متمانەی بە (صدام) و حیزبی (بەعس) نەبوو، مەترسیی ئەوەشی هەبوو، کە لە ئەنجامدا نەتوانرێ (پارتی) و لایەنەکانی تر رابکێشرێ بۆ دەست هەڵگرتن لە دوژمنایەتی ئەو هەنگاوە و بەمەش هەڵوێست و رووداوەکانی دوای ساڵی ١٩٦٦ دوبارە ببێتەوە!

لە راستیدا ئەو بۆچون و لێکدانەوەیە ناتوانن بایەخی دەسکەوتێکی تری وەک بەیانی ئادار بەلاوە بنێن، چونکە هەڵوێستی راست و دروستی پاش ئەو دەسکەوتە بەرامبەر لایەنە سیاسییەکانی تر لە لایەک و لەگەڵ رژێمی عێراق لە لایەکی ترەوە، دەیانتوانی مەترسی لەو جۆرە دوور بخەنەوە، نەک لە دەستدانی دەرفەتی لەو جۆرە! لە دواییشدا کە ئەو مەسەلەیەمان لەگەڵ (مام جەلال) دا باس کرد، وتی : دەستیشم

ببرن من لەگەڵ (صدام و بەعس)، هیچ ڕێکەوتنێ ئیمزا ناکەم!
خولەکانی دوای ئەو خولە لە ماوەی ساڵێکدا زیاتر لە سەد سەعات کۆبوونەوەی خایاند، تا بەرەبەرە هەلو مەرجەکەی عێراق گۆڕانکارییان بەسەردا هات و عێراق لە بەرەکانی جەنگدا هێرشەکانی ئێران و هەڕەشەی لەشکری بیست ملیۆنی تاقی کردەوە، کە نەیانتوانی گۆڕانکارییەکی گەورە بە قازانجی ئێران بێننە دی و بەمەش عێراق توانی تەرازووی هێزی جەنگەکە بە قازانجی خۆی بپارێزێ! ئەوە بوو لە ڕەوتی درێژی جەنگەکەدا لە ساڵی ١٩٨٨، ئێران ناچار بوو شەڕ ڕابگرێ و کۆتایی بە جەنگی هەشت ساڵەی (عێراق - ئێران) بێت!
لە یەکێک لە سەردانەکانی بەغدا لە گفتوگۆکاندا، کە کاک (نەوشیروان)، سەرۆکایەتیی شاندەکەی (یەکێتی) دەکرد، من لەگەڵ کاک (نەوشیروان) دا، لە یەک سویتی میوانخانەکە پێکەوە بووین، ئەو جارە دانیشتنەکان زۆر سەخت و ناخۆش بوون، پاش دانیشتنێکیان، کە پێ نەدەچوو لە داوا ئەساسییەکان بۆ گێڕانەوەی ناوچە داگیر کراوەکانی کوردستان شتێکی ئەوتۆ بسەلمێنن، کە بەهای ڕێککەوتنەکە بەرز بکاتەوە! کاک (نەوشیروان) زۆر تووڕە بوو، کاتی گەڕانەوەمان بۆ سویتەکەمان لە میوانخانەکە بە نارەحەتییەوە ڕووی تێکردم و وتی : شەرت بێت (پاسدار) یان بۆ بێنمە دەشتی کەرکووک و کارێکیان پێ بکەم تاڵی بکەم بە گەرویاندا! وتم کاکە گیان ئاگادار بە لەم شوێنەدا هەموو قسەکانمان تۆمار دەکرێن هیچ نەبێ با بچینە باخچەکەوە لەوێ ئەو قسانە بکە، ئیتر بردمە باخچەکە و لەوێ وتی.. من دەزانم قسەکانمان تۆمار دەکرێن و دەبیسترێن، بە ئەنقەستیش بەو جۆرە و لەو شوێنەدا وا قسەم کرد، تا گوێیان لێی بێت!
لەو ماوانەی گفتوگۆدا، کاک (کۆسرەت ڕەسول)، چەند جارێک سەردانی

کردین و یەکەمین جاری هاتە بەغدا. من بە ناو دەمناسی و رۆڵیم لە ڕێکخستنی هەولێر و سەرکردایەتیی ڕێکخستنی شارەکاندا دەزانی، لە کۆنفرانسی دووەمی (کۆمەڵە) شدا، بە نهێنی بەشداری کرد بوو لەو هاوڕێیانە بوو، کە بە رووپۆشەوە هاتبوو! سەرەتا ئەوکاتە هەوڵم نەدا دەموچاوی ببینم، بەڵام لە یەکەم سەردانیەوە هاوڕێیەتیمان رووی کردە گەرم بوون و بە هێزی! ئەو هاوڕێیە تێکۆشەرێکی ئازا و زیرەک و چاو نەترس بوو، زۆری لەگەڵ خەریک بووم، کە بێتە دەرەوە بۆ کاری پێشمەرگایەتی و لەگەڵ کاک (نەوشیروان) یش بۆ ئەو مەبەستە قسەم کرد، ئەویش پێی باش بوو! ئەو ماوەیە ئەو ئۆتۆمبیلێکی تۆیۆتای هەبوو، هێنا بووی بۆ ئێمە، ئێمەش هاتووچۆی نێوان سلێمانی و هەولێر و سلێمانی و سیتەکمان پێ دەکرد! (کۆسرەت)، کە هاتە دەرەوە توانی رۆڵێکی کاریگەر لە گەشە پێدانی سەنگی (یەکێتی)، لە ناوچەکانی هەولێردا ببینێ! بەو هۆیەشەوە، کە چالاکیی گەورەی پێشمەرگانەی ئەنجام دەدا و خۆی لە جەرگەی نەبەردەکاندا بەشداری چالاکییەکانی دەکرد، ئەوا هەر زوو بووە خۆشەویستی پێشمەرگە و فەرماندەکان!

## پڕۆژەی دانوستاندن!

سەرکردایەتیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، چوار پڕۆژەی ئامادە کرد، کە هەریەکەیان تایبەت بوو بە بابەتێکەوە:

١ - دەسەڵاتەکانی ئۆتۆنۆمیی کوردستان و دەزگاکانی!

٢- ئاسایی کردنەوەی دۆخی نائاسایی کوردستان لە رووی (ئاسایش و گۆڕانکاریی جوگرافی و دیموگرافی فەرهەنگی) یەوە و هەڵوەشانەوەی هێزە چەکدارە کوردەکانی رژێم، کە پێیان دەوترا (جاش)!

٣ - سنووری جوگرافیی ئۆتۆنۆمی!

٤ - بەشداری کورد لە دەزگا ناوەندییەکانی عێراقدا!

ئەو پڕۆژانەی (یەکێتی)، کران بە پرۆژەی گفتوگۆکانی هەر دوو شاندی (یەکێتی) و حکومەتی عێراق!

لە ماوەی خولەکانی کۆبوونەوەکە و بە درێژایی ئەو ساڵە، لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ وە تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٤،چەند جارێک ساردی کەوتە ناو رەوتی گفتوگۆکان و لەو ماوەیەشدا چەند جارێک گەورە

کار بەدەستانی عێراق دەهاتن بۆ سەردانی (یەکێتی) و خاو کردنەوە و ڕەواندنەوەی ساردییەکان!

## سێیەمین کۆنفرانسی (کۆمەڵە)!

نزیکەی دوو ساڵ بە سەر دووەمین کۆنفرانسی (کۆمەڵە)دا تێپەڕ بووبوو، ناکۆکییەکانی ریزەکانی (کۆمەڵە)، تادەهات زیاتر دەبوون و جێگەیان بە تەبایی ناوخۆی (کۆمەڵە) لێژ دەکرد! ناکۆکییەکان بەشێکیان شەخسی بوون، بۆیە ساردی کەوتبووە نێوانمانەوە و لە پەیوەندییەکاندا گیانی ناتەبایی دروست بوو بوو! هەندێ لە هاوڕێکان دڵیان بە یەکتر خۆش نەبوو، هەندێکی تریشمان لە نێو خۆماندا زۆرتر لەوانی تر پێکەوە بووین و ئاسانتر لەیەک دەگەیشتین و نێوانمان لەگەڵ یەکتر خۆشتر بوو، ئەوەش جۆرێ لە دەستەگەری دروست کرد بوو!

هەندێ لە کێشەکانیش رواڵەتێکی فیکری و بیرو بۆچونی جیاوازیان بە خۆوە گرتبوو. بە نموونە کاک (نەوشیروان) و من و ژمارەیەکی زۆر لە کادیر و سەرکردایەتیی (کۆمەڵە)، خەم و خولیامان هێنانە دی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا نەبوو، خۆبەستنەوەشمان بە دەقەکانی

(مارکسیزم - لینینیزم) و یەکێتیی چینی کرێکاری کوردستانەوە، پێ کارێکی نامۆ بوو، هەر باوەڕیشمان بەوە نەبوو، کە چینی کرێکار هێندە زۆر بووبێت و هێندە گەشەی کردبێت، تا بە چینێکی کامڵ و خەملیوی تێبگەین! چونکە هێشتا پیشەسازی و کاری سەنعەتی لە کوردستاندا ساوا بوو! لای ئێمە زەحمەتکێشانی کوردستان هەبوو، کە چین و توێژێکی فراوان بوون و هێزی گرنگی جووڵانەوەی کورد بوون! بۆیە کار و خولیای ئێمە بە پلەی یەکەم خۆی چڕ کرد بووەوە لە گەشە پێدانی جووڵانەوەی کورد و رزگار بوونی کورد و کوردستان لە داگیر کردن و پاشکەوتن! بۆ ئێمە ئەوە گرنگ بوو، کە چەوسانەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی نەمێنی و رزگاری و پێشکەوتنی کۆمەڵ و جۆرێ لە عەدالەتی کۆمەڵایەتی بێتە دی، نەک دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا، بۆیە مارکسیزم لای ئێمە تیۆری تاکتیکی خەبات بوو، ئەوەندەش بۆ ئێمە گرنگ بوو، کە لەو مەسەلە گرنگانەدا بە دەردمان بخوات، دەنا هیچ کار و بڕوایەکی وامان پێی نەبوو! بەڵام هاوڕێکانی ترمان لەوانە (مەلا بەختیار، سالار عەزیز، شەهید ئازاد هەورامی، مامۆستا.پشکۆ) و بەشێکی تر لە تێکۆشەرەکان، پێ داگرتنی خۆیان لەسەر تێز و دەقەکانی (مارکسیزم - لینینیزم) و خۆ بەستنەوەیان بەو تیۆرەوە لە هەموو شیکردنەوە و لێکدانەوەیەکدا، لە هەموو شتێ لاگرنگتر بوو! بۆیە لەلایەکەوە ئێمەیان بە رەوتێکی ناسیۆنالیستی دەزانی و لەلایەکی تریشەوە هەندێ لە رواڵەت و رەمزەکانی حیزبە مارکسییەکانی جیهان، لەوانە (چەکوش و داس و ئەستێرەی سوور و پرۆلیتاریا)، لەلای ئەوان زۆر گرنگ و موقەدەس بوو! بەکورتییەکەی ئەوان لە ئێمە تۆختر بوون!

هەمو ئەوانە و لەتەک هەندێ نوکتە و قسەی خۆشی پلار ئامێزی

کاک (نەوشیروان) هەبوون، کە ئەو هاوڕێیانەیان یەکجار تووڕە و ناڕەحەت کرد بوو! ئاخر جاری وا هەبوو کاک (نەوشیروان)، لە ناکاودا دەیوت.. ئەرێ برایان بۆ ئەم چەکوش و داسەی ئاڕمی (کۆمەڵە)، دابەش نەکەین، داسەکەیان بدەین بە (قادر خەبات) و چەکوشەکەشی بدەین بە (سەید کەریم)! یا دەیوت بەراستی لەوە دەچێ (مارکسیزم) گەڕ بووبێت! ئەگەرچی ئەو نوکتانە گوزارشتیان لە ناخی کاک (نەوشیروان) دەکرد، بەڵام بۆ ئەو کاتە سەرکردن بوو! ئەگینا ئەو نەیدەشاردەوە، کە هەرگیز باوەڕی بە دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریا و باوەڕی بە ئاڕمی چەکوش و داس و بە هیچ هێما و تێزێکی بان چەپ نەبووە! ئیتر ئەوانە و گلەیی لە تاکڕەوی لەناو (یەکێتی) دا، یەکێکی تر بوو لە رەخنەکانی ئەو هاوڕێیانە، کە تادەهات درزەکان و کەلێنەکانی ناو (کۆمەڵە و یەکێتی)، گەورەتر دەکرد!

مەسەلەی دانوستاندن و گفتوگۆ لەگەل بەغداش، یەکێکی تر بوو لەو بابەتانەی، کە مقۆ مقۆ و ناکۆکیی خستبوە نێو هاوڕێیانەوە! ئەمانەش هەموو پێویستییان بە سەرلەنوێ لێ ورد بوونەوە و هەڵسەنگاندن و بڕیارێکی رێکخراوەیی (کۆمەڵە) دەکرد. تەنانەت مەسەلەی گۆڕینی شێوەی رێکخستنی هێزی پێشمەرگە لە هەرێمەوە بۆ تیپ و مەڵبەندەکان، ئەوەیش بەشی خۆی لێکدانەوەی جیاجیا و گوماناوی بۆ کرا و ناکۆکییەکانی گەورەتر کرد! ململانێی ناو هێزە کوردستانییەکانیش بۆ خۆی بابەتێکی گرنگ بوو، کە قسە لێکردن و لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و تەگبیری زۆر تری دەویست! هەموو ئەوانە و چەندین هۆی شەخسی تر، کە ئێمە بۆ خۆمان زۆر قسە و گفتوگۆمان لەسەر کرد و زۆر وتار و بابەتیشمان لەسەر نوسی، کەچی نەیانتوانی ناکۆکیی ریزەکان چارەسەر بکەن! بۆیە بەڕای ئێمە ئەو مەسەلانە هەموو پێویستیان بە یەکلا کردنەوە هەبوو،

کە ئەویش پێویستی بەوە دەکرد (کۆمەڵە)، کۆنفرانسی سێیەمی خۆی بگرێ! ئیتر ئەوە بوو لە دەرفەتێکی گونجاودا، کە زیاتر مفاوەزات ئەو بوارەی رەخساند، سێیەمین کۆنفرانسی (کومەڵە)، لە ٢/ ٧ / ١٩٨٤ دا. لە بناری چیای پیرەمەگرون لە ناوچەیەکدا کە چەند کانییەکی لێ بوو بە ناوەکانی (کانیی لان، کانی ناوگوێزەکان و کارێزی بناوەڕەش)، لە مێرگەپان بەسترا. لەو کۆبوونەوەیەدا، کە (مام جەلال و د. قاسملۆ)ش بانگ کرابوون، بە ئامادە بوونی ٢٨٧ نوێنەر لە هەڵبژێرراوەکانی مەڵبەند و شارەکان و دەزگاکانی (کۆمەڵە)، کە زۆربەی هەرە زۆریان لە تەمەنی لاوێتی و کەمتر لە ٤٠ ساڵ بوون و ١١ کەسیش وەک چاودێر و بە ئامادە بوونی هەموو ئەو تێکۆشەرانە، کۆبوونەوەکانی کۆنفرانس دەستیان بە کارەکانی کرد!

لە کۆنفرانسەکەدا هەر یەکە لە (مام جەلال)، بە نوێنەرایەتی (یەکێتی شۆڕشگێڕان) و دکتۆر (قاسملۆ)، نوێنەری (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) و (ئیبراهیمی عەلی زادە)، سکرتێری (سازمانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران - کۆمەڵە - )، وتاری تایبەتی خۆیان خوێندەوە.

(نەوشیروان مستەفا) و پاشان (ناوەندی کۆمەڵە)، وتاری سیاسی رێکخراوەیی و پێشمەرگەیی تێر و تەسەلیان خوێندەوە، دەربارەی دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی عێراق بە درێژی و هەمەلایەنە باس و شیکردنەوەی لەسەر کرا و رەوت و هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکانی کران و لەبەر رۆشنایی ئەوەدا بڕیار درا کە:

درێژە بە پرۆسەی دانوستاندن بدرێ، بە مەرجێ ئەو گفتوگۆیانە دەستی (یەکێتی)، لە سەربەخۆیی و کار و چالاکییەکانیدا نەبەستێ!

لەو کونفرانسەدا هەندێ لە تیکۆشەرە دەرکەوتووەکانی رێکخستی شارەکان وەک کاک (کۆسرەت)، بە سەرکردایەتی (کومەڵە)، هەڵبژێردران!

کاک (کۆسرەت)، لە سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانی شارەکاندا لێپرسراوی هەولێر بوو، ڕۆژانی گفتوگۆ لە بەغدا ساڵی ١٩٨٣ بووە هاوڕێی نزیکم، لە بەغدا سەردانی کردین و بە دزیەوە هات بۆ لامان، وەک پێشتر باسم کرد لە سەرەتاکانی گفتوگۆدا ئێمە ئۆتۆمبیلمان نەبوو، من هەر ئەو ئۆتۆمبیلەی ئەوم بەکار دەهێنا! لەو ماوەیەدا روانیم تێکۆشەرێکی زیرەک و ئازا و دڵسۆزە، زۆرم قسە لەگەڵ کرد، کە بێتە دەرەوە بۆ کاروباری پێشمەرگایەتی، لەگەڵ کاک (نەوشیروان) یش قسەم کرد، ئەویش پێی باش بوو، کە بێتە دەرەوە باشترە! کە هاتیشە دەرەوە و دوای کۆنفرانس کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی چواری هەولێر و لەسەر دەستی ئەودا ئەو مەڵبەندە و دەسەلاتی (یەکێتی)، لە ناوچەکانی هەولێردا، زۆر گەشەی کرد! ئیتر هێندەی نەبرد بە ئازایەتی و چالاکییە زۆرەکانی، ناوێکی پڕشنگداری پەیدا کرد! بە حزوری بەردەوامی لە نەبەردەکاندا و لە سەرکردایەتی کردنی چەندین شەڕی گەورەی وەک ئازاد کردنی (سەری ڕەش) و لە شەڕی ئازاد کردنی (دێگەلە) دا، هەر زوو خۆشەویستیی پێشمەرگە و (مام جەلال) ی بەدەست هێنا!

لەو کۆنفرانسەدا هەندێ هاوڕێی تر بوونە ئەندامی سەرکردایەتی، کە لەدواییدا گوڕ و تینی بەرچاویان بە ڕێکخستن و پێشمەرگە و ئۆرگانەکانی (کۆمەڵە)دا! لەوانە دکتۆر (خوسرەو خاڵ و حەسەن کوێستانی)! (کوێستانی) یەکێک بوو لە هاوڕێیانی (کۆمەڵە) و پێشمەرگەیەکی قارەمان و تێکۆشەری ریزەکانی خەبات بوو، پیاوێکی ئازا و قسە خۆش و قارەمان بوو، بە داخەوە بە غەدر لە شەڕی ناوخۆدا شەهید کرا! (عومەر فەتاح)، هاوڕێی (نەوشیروان) و من بوو، تێکۆشەرێکی دێرین بوو لە ڕێکخستنی شارەکاندا و لەخەتی تایبەتیدا بوو! هەر دوو هاوڕێیان (حەمە تۆفیق و دلێری ئەحمەد شوکری)، (حەمە تۆفیق) یان، کوڕێکی زیرەک بوو لە

لەنـدەن خوێندنـی ئەندازیـاری تـەواو کـرد بـوو، سـاڵی ١٩٨٠ گەڕابـووەوە و (دلێر) یش، بە ئەندامی یـەدەک هەڵبژێران! ماباقی لـە هاوڕێیـان (نەوشـیروان مستەفا، مـلازم عومـەر، مـەلا بەختیار، ئـازاد هەورامی، عەلی بچکۆل، قـادری حاجی عەلی، جەبـار فرمـان و فەرەیـدون عەبدولقـادر)، بـە سـەرکردایەتیی (کۆمەڵـە)، هەڵبژێرانـەوە!

لـە ڕۆژانـی کونفرەنســەکەدا بـە تێـرو تەسـەلی بـاس لـە گفتوگـۆ لەگـەڵ حکوومەتی عێراق کرا. گرنگی تاکتیکی گفتوگۆ (دانوستاندن)، لـەو قۆنـاخ و هەلومەرجـەدا، کـە گەلەکەمانـی پیاتێدەپـەڕی و باسـی خولەکانـی گفتوگـۆکان و هـەر چـوار پرۆژەکـەی (یەکێتی) بـۆ کۆبوونەوەکانی لەگـەڵ حکومـەت کرا! دانوسـتاندن و لێدوان و ئامانجەکانـی (یەکێتـی)، بەتایبەتـی (کۆمەڵـە) لـە ڕێ و شـوێنی ئـەو دانوسـانە و هەڵسـەنگاندن بـۆ ئـەو بابەتانـە، بـە گوێگرتـن لـە هەمـوو ڕاو بۆچوونـە جیـاواز و ناکۆکـەکان کـرا!

ئەگەرچی هەندێ کێشـە و دڵگرانی هەندێک لـە هاوڕێکان لـە دوا ڕۆژەکانی کۆنفرانسـەکەدا، بـارو دۆخەکەی تـاڕادەیەک نـا سـازگار و تـاڵ کـرد، بـەڵام لـە کۆتاییدا توانرا - بـە شـێوەیەکی کاتیـش بێـت - بەشـێکی زۆری ئـەو دڵگرانییە چارەسـەر بکرێت! بـەڵام بـە هەمـوو لایەنـە خـۆش و ناخۆشەکانیشـەوە، ئـەو کۆنفرانسـە توانـی بەرچـاو روونـی و تیـن و گوڕمـی نـوێ بکاتـەوە بـە گیـان و جەسـتەی ڕێکخراوەیـی (کۆمەڵـە)دا و تەوژمێکیـش بێـت بـۆ زیاتـر بـەرەو پێشـەوە چوونـی (یەکێتـی)! بۆیـە ئـەو کۆنفرانسـە بـە زۆربـەی زۆری دەنـگ توانی:

(کۆمەڵـە)، وەک ڕێکخراوێکـی چەپـی ڕەنجدەرانـی کوردسـتان بهێڵێتـەوە! ڕێکخراوێکی (مارکسیستی) کوردستانی، کە بۆ ڕزگاری و پێشکەوتنی کورد و کوردسـتان و هێنانـە دیی عەدالەتی کۆمەڵایەتی، تێدەکۆشێ و کار دەکات! هـاوکات شۆڕشـی کوردسـتانیش بـە بەشـێک لـە شۆڕشـی ڕزگاریخوازانـەی

گەلانی جیهان دەزانێ و خەباتی تیا دەکات! ئەو دوو خاڵەی سەرەوە پرانسیپ و گەوهەری خەتی سیاسیی (کۆمەڵە)، بوون لەو قۆناخەدا!

ئیتر دوای کۆنفرانسەکە، تێکۆشەرەکانی (کۆمەڵە)، بە ژمارەیەکی باش بڕیاری سوود بەخش و راسپاردەوە گەڕانەوە بۆ سەر ئیش و کارەکانی خۆیان!

لە هەمان کاتدا (یەکێتیی شۆڕشگێران) یش، کۆنفراسێکی سەرکەوتوویان بەست و بە بێ کێشە و گرفتی وەک ئەوەی ناو (کۆمەڵە)، کارەکەیان ئەنجام دا و ئاسانتر سەرکردایەتییان هەڵبژارد و نەخشە ڕێگەی کار کردنی ئایندەی خۆیشیان دیاری کرد! ئەوەش هەنگاوێکی تری دۆخێکی لەباری کار کردنی هێنایە ئاراوە!

پاش کۆنفرانسی سێیەم، هەندێ گۆڕانکاری لە مەڵبەندەکانی (یەکێتی) و لە ڕێکخراوەکانی (کۆمەڵە) دا کران، بەم جۆرە:

* بۆ باشتر ڕێکخستنەوەی مەڵبەندی یەک، هاوڕێی خوالێخۆش بوو (جەبار فرمان)، دانرا و دەست بەکار بوو!

* کاک (قادری حاجی عەلی)، کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی دوو!

* کاک (کۆسرەت رەسول)، کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی چواری هەولێر!

* کاک (حەمەی فەرەج)، کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی سێ و هاوڕێ شەهید (حەسەن کوێستانی) ش، بە لێپرسراوی یەکەمی کاروباری عەسکەری ئەو مەڵبەندە دانرا!

* شەهید (عەبدول رەزاق)، کرا بە لێپرسراوی ڕێکخراوی سێی هەولێر و هاوڕێ (ئەبو شەهاب - ئیحسان نەجم)، بە لێپرسراوی ڕێکخراوی یەک و مامۆستا (موحسین عەلی ئەکبەر) یش، بە لێپرسراوی ڕێکخراوی دوو دانرا!

## درێژەی گفتوگۆ لەگەڵ رژێم!

لـە مـاوەی خولەکانـی کۆبونەوەکـە بـە درێژایـی ئـەو سـاڵە و لـە مانگـی کانوونی یەکەمـی سـاڵی ١٩٨٣ وە تـا مانگی کۆتایی سـاڵی ١٩٨٤، هەرچۆن چەند جارێک ساردی کەوتـە ناو رەوتـی گفتوگۆکان، لـە هەمـان کاتیشـدا چەنـد جارێـک گـەورە کاربەدەسـتانی حکومەتـی عێـراق دەهاتـن بـۆ سـەردانی (یەکێتـی) و خـاو کردنـەوە و رەواندنـەوەی سـاردییەکان!

* (سـعدی مهدی صالـح)، لـە تەمـوزی ١٩٨٤دا، هاتـە لای سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) و لەسـەر رەوتـی گفتوگـۆکان قسـەی زۆر کـرا، لـە ئەنجامـدا شـاندی (یەکێتـی)، لـە ٢٥ تەممـوزی سـاڵی ١٩٨٤ دا، بـۆ گفتوگۆ جارێکـی تـر چـوو بـۆ بەغـدا!

* جاری دووەم (علی حسـن المجید) و ژمارەیکی زۆر لە بەرپرسـە باڵاکان و (سـعدی مهدی صالـح)، لـە ٢٦ ئابـی ١٩٨٤ دا، هاتـە لای سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) و دوای گفتوگـۆ زەمینـەی سـەردانێکی تـری (یەکێتـی)، بـۆ بەغـدا سـاز کـرد!

* (عـزت دوری و علـی حسـن المجیـد)، لـه ٣ / ٩ / ١٩٨٤ دا، هاتـن بـۆ سـورداش بـۆ سـەردانی (مـام جـەلال) و بـۆ کۆبوونـەوە لەگـەڵ شـاندی (یەکێتـی)، لـەو کۆبوونەوەیـەدا زۆر لـە (یەکێتـی)، هاتنـە پیشـەوە و تەنانـەت وتیـان ئێمـە فەوجەکانـی جاشـمان لـە دژی ئێـوە و بـۆ شـەڕی ئێـوە دروسـت کـردوە، کـە لەگـەڵ ئێـوە ڕێککەوتیـن پێویسـتمان بەوانـە نامێنـێ!

ئێتـر وردە وردە و جارێکـی تـر لـە سـێبەری ئـەو هەلومەرجـە نوێیـەدا، خولەکانـی گفتوگـۆ توانییـان پرۆژەیەکـی چـوار بابەتـی بـە دەسـکەوتی کەمتـر لـەوەی یەکەمیـن کۆبوونـەوە، کـە (صـدام)، تیایـدا ئامـادە بـوو، بـۆ قبـوڵ کـردن و ئیمـزا کـردن ئامـادە بکـرێ!

حکومەتـی عێـراق خەریکـی خـۆ ئامادەکـردن بـوو بـۆ هەڵبژاردنـی ئەنجومەنـی نیشـتمانی (المجلـس الوطنـی)، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش داوایـان کـرد، کـە (یەکێتـی)، پاڵێوراوەکانـی خـۆی بـۆ ئـەو ئەنجومەنـە و بـۆ وەزارەتـە ناوەندییـەکان ئامـادە بـکات! بـۆ ئـەوەش سـەرکردایەتی ئێمـەی نـارد بـۆ شـارەکان تـا پـرس و ڕا بـە کەسـایەتییە ناسـراوەکان بکەیـن و بـە ڕاوێـژ لەگـەڵ ئـەوان، ئـەو پاڵێوراوانـە ئامـادە بکەیـن، کـە بـۆ هەڵبژاردنـی ئەنجومەنـی نیشـتمانیی عێـراق دەسـت دەدەن! ئامۆژگارییەکانیـش وابـوو، کـە نـە هیـچ لێپرسـراوێکی (یەکێتـی) و نـە هیـچ پێشـمەرگەیەکیش لـە کاندیـد و ئەندامانـی ئـەو لیسـتەدا نەبـن! بـۆ ئەنجامدانـی ئـەو کارەش مـن ڕەوانـەی سـلێمانی کـرام! پـاش تـەواو کردنـی ئەرکەکانمـان لـە ٢٤ ئەیلـول، هەمـوو لـە بەغـدا لەگـەڵ (مـام جـەلال)، یەکمـان گرتـەوە، کـە گوایـا ئـەم جـارە شـتێکی وا نەمـاوە و بـەم زووانـە ڕێککەوتنەکـە ئیمـزا دەکـرێ! پاشـان لـە سـلێمانییەوە ئەنجامەکـەم بـردەوە بـۆ (مـام جـەلال) و هاوڕێکانـی تـر لـە بەغـدا! پـاش چەنـد کۆبونەوەیـەک لەگـەڵ شـاندی حکوومـەت و قسـە کردنـی زۆر لەسـەر پـرۆژەکان، توانیمـان هـەر کـەم و کووڕیـەک لـە

پڕۆژەکـەدا هەبـوو چارەسـەری بکەیـن، جگـە لـەو ناوچانـەی لەسـەریان ڕێککەوتین! ئاخر لـە نێوان (مـام جـەلال و عزت دوری) دا، هەندێ ناوچـە بە ناکۆکیی مانـەوە و هەڵگیران بۆ چاو پێکەوتن لەگـەل (صـدام حسـین)! لـە ڕۆژی ١٩٨٤/٩/٢٨ لەسـەر داوای (عـزت دوری)، لـە مەکتەبەکـەی خـۆی لـە کۆشـکی کۆمـاری کۆبووینـەوە، گوایـە بڕیـار وایـە لـەو ڕۆژەدا (صـدام و مـام جـەلال)، ڕێککەوتنەکـە ئیمـزا بکـەن! کـە لای (عـزت دوری)، دانیشـتین زۆر خۆشـحاڵ دەهاتـە بـەر چـاو، لـە خۆشـیدا هەمـوو ڕواڵەتـی پرۆتۆکۆلـی کۆبوونـەوە و چـاو پێکەوتنەکـەی بـەلاوە نابـوو، زۆر خۆمانـە و دۆسـتانە هەڵـس و کـەوت و قسـەی خۆشـی دەکـرد تـا هەڵسـا بـە تەلەفۆن (صـدام حسـین)، ئـاگادار بکات لـە ئامـادە بوونـی (مـام جـەلال) و شـاندی یـاوەری، بـۆ ئـەوەی بمانباتـە لای (صـدام)، بـۆ ئیمـزا کـردن! پـاش تەلەفۆنەکـەی شـادی و کەشـی خۆشـی بـە ڕوویـەوە نەمـا، سـیمای زۆر گـۆڕا و کەوتـە منجـە منـج و وتـی.. دیـارە بیرمـان چـووە هێشـتا مەسـەلەی (بـەرە - الجبهـە)، بـەرەی نیشـتمانی مـاوە و تـەواو نەکـراوە! (مـام جـەلال)، پێـی وت: لـە کۆبونـەوەی پێشـوودا لەگـەڵ سـەرۆک خـۆی وتـی مەسـەلەی جەبهـە پەلـە نییـە و بـە ئاسـانی تـەواو نابێـت، لەگـەڵ حیزبـی (شـیوعی)، بـە ٣ سـاڵ توانیمـان ڕێککەوتنـی لەسـەر ئیمـزا بکەیـن! ئیتـر لـەو کاتـەدا، کـە دەهاتینـە دەرەوە (عـزت دوری)، (مـام جـەلال) ی لەنـاو دەرگاکـەدا گل دایـەوە و چرپانـدی بـە گوێیـدا، کـە گوایـا تورکـەکان ئیمـزا کردنەکەیـان تێکـداوە، بۆیـە داوای لـە (مـام جـەلال)، کـرد بـوو، کـە جـارێ نەگەڕێتـەوە تـا ئـەو خاڵـەش بـە لایەکدا دەخـەن!

لـە ڕۆژی ١٩٨٤/٩/٣٠ شـاندی (یەکێتـی)، جارێکـی تـر لەگـەڵ شـاندی حکوومـەت بـە سـەرۆکایەتیی (عـزت دوری) و بـە یاوەریـی سـەرۆکی شـاندەکەیان (علـی حسـن المجیـد و دکتـۆر مونزیـر الشـاوی وەزیـری داد

و عبدالفتاح یاسین، فازل براک و لیوا محمود شکور شاهین)، ئامادە بوون! لەو کۆبوونەوەیەدا وەک ئەوەی کە هیچ نەکرابێ، وابوو! چونکە پیاچوونەوە کرا بەسەر هەموو پرۆژەکاندا، بەتایبەتی ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی!

جارێکی تر لەسەر داوای (عزت دوری)، چوینەوە، پاش هەندێ کۆبوونەوە کە زۆرتر لە کۆبونەوەی هەڵپەساردنی رێککەوتن دەچوو، لە ٦ /١٠ / ١٩٨٤ دا، داواکراین بچین لەگەڵ (صدام حسین)، کۆبینەوە! سەرەتا چووینە مەکتەبی (عزت دوری) و ئەنجا چوینە لای (صدام حسین)، دانیشتنەکە زۆرتر لە سەردان و دڵدانەوە دەچوو، تا قسە و باس و گفتوگۆیەکی فەرمی، چونکە کۆبوونەوەکە بەرنامە و بابەتی دیاریکراوی نەبوو! (صدام حسین)، پاش هەندێ باسی گشتی رووی دەمی کردە هەردوو لایەنی حکومەت و (یەکێتی) و وتی : هەمو پێکهاتنێک لە خانەی کاری خێر و چاکەدایە، زۆر کات کۆسپ و گیرو گرفت دێتە رێگەی رێککەوتن، بەڵام نیەتی باش و هەست کردن بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر نیشتیمان دەبێت هێزی بۆ پێشەوە چوون و رێکەوتن بەهێز بکات، هیمەت بکەن ئەو شتانەی ماون بە شێنەیی چارەسەریان بکەن! من هەمیشە لەگەڵ ئەم هاورێیانە قسە دەکەم، دەڵێم.. ئێمە ئەگەر نەشتوانین رێک بکەوین دەتوانین دوژمنی یەکتر نەبین، بە هاورێکانم وتووە، کە لە یارمەتی دانی (یەکێتی) دا، بەردەوام بن! کاتی خۆی لە سەردەمی تێکچوونی پەیوەندیمان لەگەل (بارزانی) و کشانەوەیان بۆ شاخەکان، بە لێپرسراوەکانم وت.. دەبێت لە هەموو حاڵەتێکدا خیزانەکانیان و کەسوکاریان بەرێزەوە بنێرن بۆ لایان و هەرواش رەفتاریان لەگەڵ کردن! ئیتر تێگەشتین، کە رێککەوتن بەلارێدا دەڕوا و ناواخنی قسەکانی (صدام) یش، زیاتر باسی لە دوورکەوتنەوەی

ڕێککەوتنەکە دەکرد تا نزیک بوونەوە! بۆیە قسەکانی وەک تەقەلایەک وابوو بۆ هێشتنەوەی پەیوەندی و هەوڵێک بوو، کە بتوانێ درێژە بە بەردەوامیی ئاگر بەست بدات!

ئەو کاتە هەڵگیرسانەوە و گەرم بونەوەی شەڕی کوردستان، شتێکی خراپ بوو بۆ ڕژێمی عێراق و ڕەوتی جەنگی (عێراق - ئێران)! چونکە شەڕی کوردستان دەیتوانی بەشێکی گرنگ لە هێزەکانی سوپای عێراق بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات و بوار نەدا ئەو سوپایە لەو جەنگەدا بەشداری بکات! ئەو ڕستە نەرم و بریقەدارانەش، کە (صدام)، بە دەم بزەیەکی دەسکردەوە ئاخاوتنی پێ دەکرد، نەیانتوانی هەڕەشە ناڕاستەوخۆکانی (صدام)، لە ئێمە بشارنەوە!

ڕۆژانی دوایی (عزت دوری)، بە کۆمەڵێ سەردان و قسە و باسی دۆستانە، گەڕانەوەمانی بۆ کوردستان دواخست! زنجیرەیەک کۆبوونەوەی بێ خێرمان لەگەڵ شاندی حکومەت بۆ باس و خواستی (بەرە - الجبهە)، دەست پێکردەوە، لە ١٣/١٠/ ١٩٨٤ دا، کۆبونەوەیەکی تر کرا لەگەڵ (عزت دوری، نعیم حداد و علی حسن المجید)، بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی دیاری هەبێت!

لە ڕۆژی ١٤/١٠/١٩٨٤ دا، بە دەستی خاڵی گەڕاینەوە بۆ کوردستان. پاش ئەوە سەرکردایەتیی (یەکێتی)، کوبونەوەیەکی کرد و ئەو بۆچوونانەی شاندی حکوومەت، کە لەسەر بەرنامەی بەرەی نیشتیمانی عێراق نوسیبوونی بەپێی باری سەرنجی خۆی دەسکاری کرد و ناردیەوە بۆ بەغدا! ئەوانیش دەربارەی دەسکاری و پێشنیارەکانی (یەکێتی)، بە (عومەر عەزیز) ی نوێنەری (یەکێتی) یان، وتبوو، کە پێشنیارەکانی (یەکێتی)، بۆ ڕێککەوتن نییە، بەڵکو بۆ تێکدانی ڕێککەوتنە!

## ساردبوونەوەی رەوتی گفتوگۆ!

تا دەهات هێرشی راگەیاندنی لایەنەکانی بەرەی (جود)، بەتایبەتی حیزبی (شیوعی و پارتی)، دژی مەسەلەی دانوستاندن و گفتوگۆکانی (یەکێتی)، لەگەڵ رژێمی عێراق گەرمتر دەبوو، هەوڵەکانی (یەکێتی)ش لەگەڵ ئەو لایەنانە بۆ ئاشتی و لەیەکتر گەیشتن ئەنجامێکی وای نەبوو، بۆیە چەندین تەقەلای (یەکێتی)، بۆ ئاشتی لەگەڵ (پارتی) و هێزەکانی تر بە بنبەستی مانەوە! لەم لاشەوە گفتو گۆکانی دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی عێراق هیچی لێ سەوز نەبوو! ئیتر نێوانی عێراق و تورکیا لەسەر حیسابی نە سەلماندنی داواکانی کورد لەلایەن رژێمی عێراقەوە، تادەهات زیاتر گەشەی دەکرد و ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکیا بە بیانووی شوێن کەوتنی (پارتی کرێکارانی کوردستان) و راونانی پێشمەرگەکانی، دۆخێکی ناخۆش و ئاڵۆزی دروست کرد بوو! عێراق لە مانگی ئابی ١٩٨٤ وە دەستی کرد بە گەشە پێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا، بۆ ئەمەش دەستەیەکی باڵا لە

بەرپرسـانی دەوڵـەت بـە سـەرۆکایەتیی جێگری یەکەمـی سـەرەک وەزیران سـەردانی تورکیایان کرد، بە مەبەستی زیاد کردنی هەناردەی نەوتی عێراق لە حەوت سـەد هەزار بەرمیلەوە بۆ یەک ملیۆن بەرمیل رۆژانە، ئەویش بە راکێشانی دووەمین بۆری نەوت بە خاکی تورکیادا! ئەو رێککەوتنە گرنگە لە بواری گازی سروشتی و نەوتدا، رێککەوتنێکی ئەمنیشی بـە دوای خۆیدا هێنا، کـە رێگـەی دا بـە سـوپای تورکیا بتوانێ بـە قوولایـی ١٥ کیلۆمەتـر لـە خاکـی عێراقـدا، شـوێن هێزەکانـی (پارتـی کرێکارانـی کوردسـتان)، بکـەوێ!

لە ناو کاربەدەستە گەورە و بچووکە شۆفێنیستەکانی حکومەتی عێراقدا، بەتایبەتی کاربەدەستە حیزبییـەکان، لـە هەمـوو ناوچەکانی کوردسـتانەوە تـا دەگەشـتە پارێـزگای موصـل، قازانـج و دەسـکەوتیان لـە شـەڕدا بـوو نـەک لـە بەرقـەرار بوونـی ئاشتی، چونکـە ئەوانـە لـە حاڵەتـی شـەڕ و نـا ئاسـاییدا دەسـەلاتیان زۆرتر بـوو، پارە و پـوول و بودجـەی قەبەتریشیان دەکەوتە بەردەست! بۆیـە بـە گـەورە کردنـی مەترسییەکانی کورد و هێزی پێشـمەرگە، حیـزب و رێکخـراوە حیزبییەکانـی رژێـم بـواری زیاتریـان بـۆ دەرەخسـا، کـە بـە نـاوی پاراسـتی شۆڕشـی (حەڤـدە و سـی تەمـوز) ەوە، بـە ئـارەزووی خۆیـان پەلامـاری خەڵکـی بـدەن و داسـتانی سـاختە لـە بەگژا چوونـەوەی پێشـمەرگە و پاراسـتنی دەسـکەوتەکانی حکومـەت بـۆ خۆیـان تۆمـار بکـەن و پڕوپاگانـدەی پێـوە بکـەن! بـەوەش بەسـەر جەسـتەی کـورد و بەنـاوی پاراسـتنی ئاینـدەی عێـراق و ئارامـی و سـەقامگیریی ولاتـەوە، پۆسـتی بالاتریـان بـۆ خۆیـان مسـۆگەر دەکرد!

ئەو جۆرە لێپرسـراوانەی (بەعس) یش، دەسـتی جاشـەکان ئـاوەلا دەکرد، کـە نـاو بەنـاو پیـلان لـە سـەرکردەکانی (یەکێتـی) و لـە فەرماندەکانـی پێشـمەرگە بگێـڕن و دەسـتیان لـێ بووەشـێنن! ئـەوە بـوو لـە ١٩٨٤/٩/١٥

دا، فەرمانـدەی ناسـراو و ئەندامـی سـەرکردایەتی (یەکێتـی)، مـلازم (سـەید کەریـم)، لەلایـەن جاشـەکانی (حەمـەی حەسـۆل) ەوە، بۆسـەی بـۆ دادەنرێت و شـەهید دەکرێ! چوار مانگ دوای ئەو رووداوە و لـە درێژەی ئەو سیاسـەت و پیلانـە رەشـەی رژێمدا، فەرماندەی ئازا و خۆشەویستی نـاو کۆمەڵانـی خەڵـک و هێـزی پێشـمەرگە (مامـە ریشـە)، بـە دەسـتی جاشـی تاوانبـار (تەحسـین شـاوەیس)، لـە پیلانێکدا شـەهید دەکرێ! ئیتـر رژێـم و دارودەسـتەکەی بـەوەوە نەوەسـتان و کەوتنـە گـەڕ و گێچـەڵ کـردن بـە خوێندکارانـی کـورد، بـۆ ئـەوەش لەکاتـی نزیـک بوونـەوە لـە تاقیکردنەوەکانـی کۆتایی سـاڵ، بـەزۆر و هەڕەشـە خوێندکارانیـان ناچـار دەکرد، ببـن بـە (جەیشـی شـەعبی) و هـەر کەسـێکیش بەرەنگاری بـکات، ئەوا رێگەیـان نـادەن بچنە هۆڵەکانی تاقیکردنـەوە! ئەو سیاسـەتە رەشـەی رژێمیش لـە ئەنجامدا بـە نارەزایی و مانگرتنی خوێندکاران کۆتایی هـات، کە ئەوەش بـووە هـۆی گرتن و ئازاردانـی خوێندکاران و دەرکردنیـان لـە خوێنـدن و کۆلێجەکانیـان!

ئـەو هەلومەرجـە هەمـووی پێکـەوە زەمینەیەکـی لەبـاری خـۆش کـرد، بـۆ ئـەوەی پڕوپاگانـدە و شـاڵاوی راگەیاندنـی نەیارەکانـی (یەکێتـی) و نارازییەکانـی نـاو (کۆمەڵـە)، بـە تینتـر و کاریگـەر تربـێ و ببێتـە هـۆی ئەوەی، کە لایەنەکانی بـەرەی (جـود) و کۆمەڵانـی خەڵـک زیاتـر دردۆنگ بـن و بـە خـراپ تەماشـای گفتوگۆکانـی نێـوان (یەکێتی و حکوومـەت) بکـەن، ئیتـر بەوجـۆرە کێشـەکانی (یەکێتـی)، لەگـەڵ حکوومەتـی عێـراق، بـە شـێوەیەکی وا پەرەیسـەند، کـە هەنـدێ لـە سـەرکردە و کادیرەکانـی خـودی (یەکێتی)، بـە تایبەتی هەڤاڵانی (یەکێتی شۆڕشـگێڕان). درێژەدانـی گفتوگۆیـان بـە کارێکـی هەڵـە و خـراپ و بـە کلکایەتـی بـۆ رژێمـی عێـراق دەزانـی! لـە ئەنجامـدا دۆخـی ناوخـۆی (یەکێتـی) ش، پشـێوی زیاتـری

بەخۆیەوە بینی!

لە هەفتەی کۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ دا، بە مەبەستی تاوتوێکردنی هەلومەرجەکە و خولەکانی دانوستاندن و گفتوگۆکانی نێوان (یەکێتی و حکومەت) و ئەنجامەکانی، کۆبوونەوەیەک ساز کرا! لەو کۆبوونەوەیەدا هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی، لە ژێر کاریگەریی ئەو بارە ناسازگارەدا کەوتنە جۆرێک لە (مزایەدە)ی کرچ و کاڵ و دەست بەرز کردنەوە بۆ بڕیاری کۆتایی هێنان بە (دانوستاندن)، لەگەڵ حکومەتی عێراق و بگرە (بەڵێ) یان بۆ بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شەڕیش کردا! کە بە داخەوە لە دواییشدا کە شەڕ هەڵگیرسایەوە، زۆر لەوانە لە (یەکێتی) دوورکەوتنەوە و ئەرکی شەڕی نابەرابەری (یەکێتی) یان لە دژی عێراق، بەسەر ئێمەدا بەجێ هێشت! لەو کۆبوونەوەیەدا و لەو دۆخەدا بڕیار درا:

کۆتایی بە گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی عێراق بهێنرێ، بەڵام جارێ بڕیاری دەست کردنەوە بە شەڕ دوا بخرێت، تا بتوانرێ خۆسازدان و نەخشە رێگایەکی ورد بۆ سەرەتاکانی ئەو هەنگاوە دا بڕێژرێ!

## بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شەڕ!

لە ڕۆژی ١٥/ ١ /١٩٨٥ دا، (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بەیاننامەیەکی دەرکرد و لەو بەیاننامەیەدا کۆتایی هێنانی دانوستاندنی لەگەڵ ڕژێمدا ڕاگەیاند! یەک ڕۆژ دوای ئەوە و لە ڕۆژی ١٦ /١/ ١٩٨٥ دا، (سعدی مهدی صالح)، کە ئەو کاتە سەرۆکی (ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق) بوو، بە هەلیکۆپتەر هاتە مەرگە، سەرکردایەتی منیان ڕاسپارد بچم پێشوازی بکەم! لەو کۆبوونەوەیەدا بە ئامادە بوونی (مام جەلال)، لەگەڵ ژمارەیەک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی (یەکێتی)، (سعدی مهدی صالح)، هەوڵێکی زۆریدا، کە گفتوگۆکان و پرۆسەی دانوستاندن بەردەوام بێت و لە کوێدا پساوە پێکەوە گرێی بدەینەوە و دەست بکەینەوە بە کۆبوونەوەکان، بەڵام ئەو داوایە پەسەند نەکرا!
لە ڕاستیدا بڕیاری کۆتایی هێنان بە گفتوگۆ مانای بڕیاری شەڕ هەڵگیرسانەوەی دەگەیاند، تەنها ئەوە بوو، کە هەندێ کاتی تر بە دەستەوە بمێنێ بۆ خۆ ئامادە کردن و ڕێکخستنەوەی بارەگاکان لە

شاخەکاندا، بە تایبەتی لە (سێڕوان)، لە ناوچەی مەرگە!

بەڕای من ئەو بڕیارە، بڕیارێکی پەلە و دوور لە لێکدانەوەی بابەتی و سیاسی و ژیرانە بوو، زۆرتر پەرچە کردار و لەژێر کاریگەری ئەو پروپاگاندە ناڕاستەدا بوو، کە بەردەوام دەکرایە سەر (یەکێتی)! بۆیە ئەو بڕیارە تێنەگەیشتن بوو لە تاکتیکی مفاوەزات و لە ئامانج و مەبەستەکانی، چونکە دەبوو لە رووی ئەو بڕیارەدا باش تەماشای تەرازووی هێزی (سیاسی و سەربازی و ئابووری و دیپلۆماسی) و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی عێراق و ولاتانی دونیا و ناوچەکە بکرێ و هاوکات هەڵسەنگاندنێکی وردیش بۆ توانا و هێزی لۆجستی و پێشمەرگانەی (یەکێتی) ش، بکەین! ئاخر ئەوکاتەی، کە ئێمە کۆتاییمان بە گفتوگۆ هێناو ناڕاستەوخۆ بڕیاری هەڵگیرساندنەوەی شەڕمان دا، حکوومەتی عێراق زیاتر لە ٣ فەیلەق سەربازی هەبوو، کە پێک هاتبوون لە ٥٠ فیرقە و نزیکەی ٥٠٠٠ تانک، لەوانە چوار هەزاریان تانکی نۆی و پێشکەوتو بوون و فڕۆکە جەنگییەکانیشی لە ٦٠٠ فڕۆکە زیاتر بوون، ئەوە و جگە لە تۆپخانەیەکی گەورە و کاریگەر، کە مەزەندە دەکرا بە نزیکەی ٧٠٠٠ توپ! هاوکات چەندین ولاتی عەرەبی پشتیوانی بوون و توانای دارایی گەورەیان بە یارمەتی و بە قەرز خستبووە بەردەست! لە سالآنی دواییدا بە تەنها قەرزی ولاتانی کەنداو، کە درابوو بە حکومەتی عێراق گەیشتە ١٢٠ ملیار دۆلاری ئەو کاتە! لەکاتێکدا ئەوکاتە ژمارەی هەموو هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بە هەموو حیزب و لایەنە کوردستانییەکانەوە، نە دەگەیشتە حەوت هەزار پێشمەرگە و بەچەکی سووک و تەقەمەنییەکی کەمەوە! لە رووی داراییشەوە توانای دارایی هێزی پێشمەرگە هەرگیز بۆ بەراورد نەدەشیا!

بۆیە دەبوو بە لێکدانەوەی ئەو هاوکێشەیەی، کە تەرازوی هێزی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، تەماشای هێز و تواناکانی رژێم و رەوتی جەنگی (عێراق - ئێران) بکەین! هاوکات لە پرۆسەی خوێن لەبەر رۆیشتنی مرۆیی و توانای ئابووری و دارایی رژێم لەو قۆناخەدا سەیر بکەین و بابەتییانە تەماشای رووداوەکان و ئەنجام و شوێنەواری شەڕە یەک لەدوای یەکەکانی جەنگەکەمان بکردایە و هاوکات دەبوو لە سێبەری ئاگر بەست و ئەو ماوە پچڕ پچڕەی مفاوەزاتدا، (یەکێتی)، هێزەکانی خۆی و رێکخستنەکانی و پەیوەندییە سیاسی و دیپلۆماسیەکانی خۆی باشتر رێک بخستایە و بەهێز تریان بکات، تا خۆی بۆ ساتی لەبار و گورزی کەمەرشکێن ئامادە بکات، نەک دووچاری شەڕی کیمیایی و رووبەڕوی کارەساتەکانی گەورەی وەک هەڵەبجە و ئەنفال بێتەوە! کە نەک ئەوسا، بگرە ئێستاش شوێنەوارە قووڵ و نەرێیە مرۆیی و سیاسی و کەلتوری و کۆمەڵایەتییەکانی هەر ماوە و هەروا بەئاسانیش ناسڕێتەوە!

## کێشەکان سەر هەڵدەدەن (ئالأی شۆڕش)، بە نموونە!

پاش کۆتایی هاتنی مفاوەزاتەکە و هەڵگیرسانەوەی شەڕ، چەندین گیروگرفت سەریان هەڵدا و بوونە مایەی دەردی سەرییەکی زۆر بۆ (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)! هێزەکانی مەلبەندی ۳ روویان لە هەڵوەرین کرد، تیپی پاراستنی ماکۆک بە کۆمەڵ تەسلیم بە رژێمی عێراق بوونەوە و ژمارەیەک لە فەرماندە و پێشمەرگە لە ناوچەی (دۆڵە رەقە)، وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنا! خودی (سوارەی کوری عەباس ئاغا)ش، کە فەرماندەی بەشێکی هێزەکان بوو، پیاوێکی باشیش بوو، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا بەتەنها مابووەوە، بەلاّم کە پێشمەرگەکانی هۆزەکەی تەسلیم بە حکومەت بوونەوە، ئەویش لە ناچاریدا پێشمەرگایەتی بەجێهێشت و رۆیشتەوە بۆ ناو شار! لە ناوچەکانی سلێمانی و هەولێریش چەندین فەرمانەی کەرت و مەفرەزەی هێزی پێشمەرگە تەسلیم بە رژێم بوونەوە، لەوانە (عومەر عەرەب، غەریب کونجرینی، سەلاح شینە و پشتیوان و هەڵۆ)!

هـەر لـە سـێبەری ئـەو هەلومەرجـە نوێیـەدا، ناکۆکیـی و ململانـێ ناوخۆییەکانـی نـاو (کۆمەڵـە) ش پـەرەی سـەند، بەمـەش ناڕەزایـی و چالاکییەکانـی لایەنـە ناڕازییەکـەی ناوخـۆ تادەهـات زیاتـر و ئاشـکرا تـر دەبوو! چالاکی و پەیوەندییەکانیـان و سـەر پێکەوەنانیـان زیـادی دەکـرد و ناڕازییەکانـی (کۆمەڵـە) یـان، لـە خۆیـان کۆ دەکردەوە و هەندی نووسـین و بڵاوکـراوەی سیاسـی و فیکریـش سـەری هەڵـدا، کـە بۆنـی دروسـت بوونـی پێڵ و ڕێکخراوێکـی سیاسـیی جیـا و نوێی لێدەکرا! لـە سـەرەتادا بە نووسینی چەنـد وتـارێ لـە (گۆڤـاری کۆمەڵـە) دا، وەرامـمان دانـەوە و ئـەو ڕەوتـە چەپڕەوەمـان بـە ڕەوتێکـی بـان چـەپ ناسـاند و خراپییەکانـی چەپڕەوی و توندڕەویمـان لـە بزووتنـەوەی سیاسـی و چەپدا بـاس کـرد و هاوڕێیانـی (کۆمەڵـە) مـان لـە مەترسـییەکانی ئـەو چەواشـە فیکرییـە ئاگادار کردەوە! مـن بـۆ خـۆم، چەندیـن وتـارم بـەو ئاراسـتەیە نووسـی و بـڵاوم کردنـەوە!

مەترسـیی ئـەو کارەی هاوڕێیانـی نـاڕازی بـە جـۆرێ خـۆی دەنوانـد، کـە ڕێکخسـتن لـە نـاو ڕێکخسـتنی (کۆمەڵـە)دا، دروسـت بکـەن! دیـارە ئـەوەش بەپێـی سـەرەتاییترین پرانسـیپی حیزبـی، سـەرباری ئـەوەی، کـە مایـەی قبـوڵ نەبـوو، بەڵکـو زیانەکانـی وەک مۆرانـەی لێدەهـات و وردە وردە جەستەی (کۆمەڵـە) ی کرمـە ڕێژ دەکـرد! بۆیـە دۆسـتانە ناردمـان بەشـوێن کاک (مـەلا بەختیـار) دا، تابێـت بـۆ سـەرەوە بـۆ ناوزەنـگ! کـە هـات (مـام جـەلال و نەوشـیروان) و مـن و هاوڕێیەکـی تـر، کـە ئێسـتا بیـرم نەمـاوە قسـەمان لەگـەڵ کـرد! زۆرتـر قسـەکان پـاش ئامۆژگاریەکانـی (مـام جـەلال)، کاک (نەوشـیروان)، کـردی! (مـەلا بەختیـار)، لـەو کۆبوونەوەیـەدا وتـی: ئێمـە هەمیشـە خۆمـان بـە بەشـێک لـە (یەکێتـی) و لـە ئێـوە زانیـوە، مەگـەر ئێـوە وامـان تەماشـا نەکـەن! دەنـا ئێمـە کۆمەڵێکیـن بیـرو بۆچوونمـان

هاوبەشـە و بەرەبـەرە لەگـەڵ بیـرو بۆچوونـی ئێـوەدا جیـاوازی پەیـدا دەکات! ئێـوەش بـە بوونـی ئێمـە وەک ئاراسـتەیەکی جیـا لەنـاو جەسـتەی (کۆمەڵـە) دا، خۆشـحاڵ نین و ئێمـەش هەست بـە ئازادیی تـەواوی خۆمـان ناکەیـن، بۆیە مـن بـەش بـە حاڵـی خـۆم و برادەرەکانی تریشـمان مەرامـی ناحـەزی و ترازانـی یەکجارەکیمـان نییـە لـە ئێـوە، بـەڵام دەمانـەوێ بـۆ خۆمـان لـە (کۆمەڵـە)، جیـاواز و سـەربەخۆ بیـن!
بـە گشـتی لـەو کۆبوونەوەیـەدا بـە (مـەلا بەختیـار) وتـرا: ئێـوە دەتوانـن بـە ئـازادی هـەر جـۆرە بیـر و رایەکتـان هەبێـت و لـە ئێمـە جیـاواز بێـت، دەتوانن خۆتـان رێکخـەن و رێکخراوی خۆتـان هەبێت، بـەلام رێگە نادەیـن بە نهێنی لە نـاو (کۆمەڵـە) دا بمێننـەوە و بـە دزیـەوە چالاکی رێکخراوەیـی لـە دژی ئێمـە و لەنـاو ریزەکانـی ئێمـەدا دروسـت بکـەن! (مـەلا بەختیـار)، لـە وەلامـدا وتـی: راسـتە جیاوازیی لـە بیـرو بۆچوونمانـدا هەیـە و نکولـی لـێ ناکرێت و قەناعەتەکانیشـمان لـە زۆر رووەوە لەگـەڵ ئێـوە جیـاوازە، بـەڵام تائێسـتا رێکخـراو نیـن و دەچمـەوە لەگـەڵ هاورێکانـم بـەو روونیـە قسـە دەکـەم و جوابتـان دەدەینـەوە، ئیتـر لـە کۆتایـی قسـەکاندا لـەوە هوشـیار کرایـەوە، کـە ناشـێ و ناکرێت دەس بۆ هێزی پێشـمەرگە ببـەن و کەرتـی لـێ بکەنـەوە، چونکـە ئـەوە ئاسایشـی شـۆڕش و ئایندەی دەخاتـە مەترسـییەوە!
(مـەلا بەختیـار)، گەڕایـەوە لای هاورێکانـی و چوونـە بـەری قـەراخ! ئـەوە بـوو ئیتـر لـە ئەنجامـدا بـە جیابوونـەوەی (ئـاڵای شـۆڕش)، لـە (کۆمەڵـە) و لـە (یەکێتـی)، تـەواو بـوو! ئـەو برایانـە کـە جیابونـەوە بۆیـە نـاوی (ئـاڵای شـۆڕش) یـان هەڵبژارد، تـا وای نیشـان بدەن، درێژە پێدەری خەتی شـەهید (ئـارام) و (ئـاڵای شـۆڕش) ەکـەی ئـەو شـەهیدە گەورەیـەن! جیابوونـەوەی ئـەو هاورێیانـە کـەش و هەوایەکـی نـا سـازگار و ناخۆشـی لێکەوتـەوە،

چونکە ژمارەیەک سەرکردەی باش و کاریگەری وەک (مەلا بەختیار، سالار عەزیز، مامۆستا جەعفەر، شێخ عەلی و کادری هەڵکەوتوو بە توانای وەک مامۆستا پشکۆ، عیماد ئەحمەد) و چەندین فەرماندەی ئازا و دیاریشیان لەگەڵ کەوت! لە راستیدا ئەو جیابوونەوەیە خۆی لە خۆیدا زیانێکی گەورە بوو بەر (کۆمەڵە و یەکێتی) کەوت و لەوەش خراپتر ئەوە بوو، کە ئەوان پەیوەندییان بە چەند سەرتیپێکی هێزی پێشمەرگەوە کرد بوو، بەمەش هەم مەترسییان بۆ سەر (یەکێتی) و هەم بۆ خۆیشیان دروست کرد! لە هەمووشی خراپتر ئەو رێگە چارە توندو تیژە بوو، کە ئێمە لە چارەسەری ئەو کێشە سیاسییەدا، لە رۆژی ١ /١١ / ١٩٨٥ دا، گرتمانە بەر و ناچار بووین خۆشەویستی و برایەتی فەرامۆش بکەین و لە ئەنجامدا بە رێگەیەکی نا سیاسی و نا هێمنانە هاورێکانی خەباتی خۆمان زیندانی بکەین و بوار بدەین سووکایەتیشیان پێ بکرێت، کە نایشارمەوە من بۆ خۆم یەکێ بووم لەو بەرپرسە باڵایانەی (یەکێتی)، کە شەریکی هەموو ئەو بڕیارانە بووم، کە دەرهەق بە (مەلا بەختیار و شێخ عەلی و مامۆستا پشکۆ) و سەرجەم ئەو هاورێیانە کرا!

(کۆمەڵە) بۆ بڕیار دان لە چارەنووسیان، لە رۆژی ١٩٨٥/١٢/١٠ دا، پلینۆمێکی بە ئامادە بوونی ٦٠ سەرکردە و کادر و پێشمەرگە و رێکخستن بەست، کە لە دۆخێکی گرژ و هەڵچوودا، کێشەی (ئاڵای شۆڕش و مەلا بەختیار) ی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە! لە ئەنجامدا داواکرا بڕیاری کوشتنی هاورێی دوێنێی سەنگەر و سەرکردەیەکی چالاک و دڵسۆز بە دەستی هاورێکانی (کۆمەڵە)، بدرێ و جێ بەجێبکرێ! خۆ ئەگەر ژیری و دانایی (مام جەلال)، نەبوایە، هیچ دوور نەبوو ئەو بڕیارە بەو ئاقارەدا بڕۆیشتایە، کە پلینۆم داوای کرد بوو! ئەوە بوو

ئەو هاوڕێیانەمان لە زینداندا هێشتەوە و دەستمان کرد بە لێکۆڵینەوە و پاشان ڕێگەمان دا بە گرتنەبەری ترس و تۆقاندن و ئەشکەنجەدان، تا زانیاری و دان پێدانانیان لێ وەربگرین! بەو شێوەیە سووکایەتی بە (مەلا بەختیار) و ئەو هاوڕێیانە کرا! هەرچەندە لاپەڕەکانی ئەو سووکایەتی پێکردنە لای کاک (ئیبراهیم جەلال) مایەوە، بەڵام ئەگەر (نەوشیروان مستەفا)، بە زیرەکانە لێی نەسەندایەتەوە دوور نەبوو ئێستا لە بەڵگەکانی کتێبەکەیدا بڵاوی بکردنایەتەوە، داواشم لە کاک (نەوشیروان) ئەوەیە.. ئەگەر نەیسووتاندون لەناویان بەرێت، تا چیتر پەڵەی چڵکنی ناوچەوانمان دەستاو دەست نەکات!

بەو شێوەیە چارەسەرەی کێشەی ناکۆکیی ناوخۆ و ڕەفتار لەگەڵ تێکۆشەرەکانی خۆماندا، هێندە توندڕەویی و کاڵفامی گرتە خۆ، کە ئێستاش بیرم دەکەوێتەوە لە خەجاڵەتی بەولاوە ناتوانم هەستێکی ترم هەبێت! ئاخر ئەو شێوە کارە جگە لەوەی کە ناڕاست و ناڕەوا بوو، هاوکات نەریتێکی خراپیشی لە ڕێڕەوی خەبات و لە کاری حیزبی و پێشمەرگانەدا جێ کردەوە و دەروازەیەکی گەورەشی بۆ سەرهەڵدان و پەرەسەندنی زەبر و زەنگ و گیانی چز کردنی یەکتری و تاکڕەوی و تەنانەت دیکتاتۆریش کردەوە! کە دواجار هەموو (یەکێتی)، باجەکەی دا و دوو کەرت بوونی (یەکێتی نیشتمانی کوردستانی) لێ کەوتەوە! ئاخر ئێمە کە ڕێکخراوێکی چەپ بووین و لەناو قەوارەی ڕێکخراوێکی نیمچە بەرەییدا، کە پێی دەوترا (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، خەباتمان دەکرد و درێژەمان بە تێکۆشان دەدا! زۆر باسمان لە دیموکراسی و ژیانی دیموکراسی و سیستەمی دیموکراسی لە حیزب و لە کۆمەڵدا دەکرد، بۆیە گەر بەپێی ئەو بانگهێشتە بووایە، دەبوو ئەو کێشەیەمان بە ئاسانترین شێوە و بە دیموکراسیترین ڕێگە و بەوپەڕی برایانە و

هێمنانـه و لەسـەرخۆ چارەسـەر و تەماشـا بکردایـە! هـاوکات دەبـوو ئەوانیش، واتـە (ئـاڵای شـۆڕش)، دەسـیان بـۆ هێزی پێشـمەرگە نەبردایـە! بۆیـە کاری سیاسـی و مرۆڤدۆسـتانە وابـوو، کـە دەبـوو ئێمـە خۆمـان هێزەکانی پێشمەرگەمان وریا بکردایەتەوە و یاسای سـەربازیمان پەیڕەو بکردایـە بـۆ پاراسـتنی ئاسایشـی هێزەکەمـان و هـاوکات سـەرکردەکانی ئەوانیشـمان بـە نامـە و نێردراو جارێکی تـر لـەو هێڵـە سـوورە هوشـیار و ئـاگادار بکردایەتـەوە، نـەک کتوپـر هەڵکوتینـە سـەریان و دەسـگیر و زیندانییـان بکەیـن! لەکاتـی ناچاریشـدا، کـە ئەگـەر گرتنیـان پێویسـتییەکی گرنگی ئاسایشـی شـۆڕش و (یەکێتی) بووایـە، دەبوو بەڕێزەوە رەفتاریـان لەگـەڵ بکرێ و هـەر کارێکی نادروسـتیش گـەر بگیرایەتـە بـەر تەنهـا بـۆ گوشـار بـەکار بهێنرایـە و لـەو سـنوورە تێپـەڕی نەکردایـە!

## هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەگەڵ رژێم!

بەیانەکەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بۆ راگەیاندنی کۆتایی هاتنی (دانو ساندن) لە ١٥ /١ /١٩٨٥ دا بڵاوکرایەوە! دە رۆژ دوای ئەوە بە پیلانێکی جاشەکانی رژێم، (مامە ریشە) ی فەرماندەی ئازا شەهید کرا. ئەو پیلانەی دەزگاکانی رژێمی عێراق بەهۆی هەردوو سەرەک جاش (تەحسین شاوەیس و قالە فەرەج) ەوە، جێبەجێکرا! ئەو کارەی رژێم جەماوەری گەلەکەمان و هێزی پێشمەرگەیان لە ناخەوە هەژاند و بریندار کرد! (مامە ریشە)، فەرماندەیەکی دەست وەشێنی ئازا و چالاک و خۆشەویست بوو، بۆیە داخ و ئارەزووی تۆڵە سەندنەوە، زەمینەی هەڵگیرسانەوەی شەڕی خۆشتر کرد!

سەرکردایەتیی (یەکێتی)، بیری لە چەند ئەگەریکی چالاکی سەربازی کردەوە، تا لەلایەکەوە بۆ رژێمی بسەلمێنێ، کە (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، هەر ئەو هێزە گەورە و گرنگەی سەر گۆڕەپانی کوردستانە و هەم داخ و تاڵاوێکی رەشیش بکات بە گەرووی سەرانی

بەعسدا! بۆ ئەوەش یەکێ لە ئەگەرەکان بریتی بوو لە نەخشەی رزگار کردنی ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و مێرگەپان و شاخی چەرماوەند. نەخشەیەکی تریش رزگار کردنی شاری ماوەت بوو، کە بەرە و رووی خوالێخۆش بوو (جەبار فرمان) و مەڵبەندەکەی کرایەوە و بە باش زانرا، منیش لە گەڵیدا بم!

(جەبار فرمان)، بۆ ئەو مەبەستە بانگ کرا بۆ سەرکردایەتی! رۆژی ١٩٨٥/٢/٨ پێکەوە کەوتینەرێ تا لەنزیک گوندی تەگەرانەوە بپەڕینەوە بۆ بەری ئەوبەری شارباژێڕ و بارەگای مەڵبەندی یەک! لە کاتی پەڕینەوەدا تووشی هاورێ (ئیبراهیم جەلال) بووین، (جەبار فرمان)، بە بینینی خۆشحاڵ نەبوو، بۆیە لێم پرسی ئاخۆ بۆ خۆشحاڵ نییە! لەوەرامدا وتی: (ئیبراهیم جەلال)، زۆر نەگبەتە و دەترسم تووشی رووداوێک ببین، منیش بە سەر سوڕمانەوە وتم: کاک (ئیبراهیم)، تێکۆشەرێکی دڵسۆز و ماندووە و خزمەتێکی زۆری ئەم گەل و نیشتمانەی کردووە و لە سەرەتای لاوێتیەوە پێشمەرگە و تێکۆشەرە، ئیتر نەگبەتی چی! (جەبار فرمان)، دەستی کرد بە پێکەنین و بە هوشیارییەکی زۆرەوە کەوتینەرێ! بەڵام هەر کە گەیشتینە سەر جادە قیرەکە تووشی ئۆتۆمبیلێکی پر لە سەربازی حکومەتی بووین، دنیاش زۆر سارد بوو، ئیتر ئەوان ئێمەیان بە جاش زانیبوو، چونکە ئێمە پیکاب و ئۆتۆمبیلمان پێبوو، قسەیان نەکرد و ئێمەش بە وریاییەوە تێپەڕ بووین و هیچی ترمان نەکرد، چونکە بایی شەڕ پێشمەرگەمان لەگەڵ نەبوو! کە لەو رووداوە رەت بووین، (جەبار فرمان) وتی: پێم نەوتی نەگبەتە! ئەو رێگەیەشمان بە قسەی خۆش تێپەڕاند و گەیشتینە شوێنی ئەمینی خۆمان. لەوێ ئەو چەند رۆژە خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و تەماشا کردنی دۆخەکە بووین، کە ئاگادار کراینەوە هێزەکانمان بەرە

و هەڵـەدن و بەرگەڵـو بـڕوات، ئیتـر چـۆن ڕۆیشـتبووین وا گەڕاینـەوە، بـەڵام ئـەم جـارە بـە هێـزی تـەواوە! مـن چوومـەوە بـو سـێڕوان.

ماوەیـەک بـوو نەخشـە بـۆ گرتنـی رەبیـە و بارەگاکانـی زنجیـرە شـاخی چەرماوەنـد و سـەربازگەی شـەدەڵە دارێـژرا بـوو، ئـەرک و فەرماندەیـی کردنـی ئـەو چالاکییـەش بـەرەو رووی (مـلازم عومـەر) و مەکتەبـی عەسـکەری کرابوویـەوە! لـە رۆژی ١٩٨٥/٢/١٤ دا، بـە هیمەتێکـی گـەورە و ئازایانـە، نەخشـەکە بـە سەرپەرشـتی (مـلازم عومـەر) و بەشـداری کاک (قـادری حاجـی عەلـی) و هێزەکانـی مەڵبەنـدی دوو، کـە پێـک هاتبـوو لـە (تیپەکانـی ٣٧ ی شـارباژێڕ، ٢٥ ی خاڵخـالان، ٣٣ ی سـلێمانی، ٢١ ی کەرکـووک، ٤٧ ی پیرەمەگـرون و تیپـی ٩٣ ی کۆیـە و رەهبـەری سـەید ئیبراهیم)! مەڵبەندی یەکیش بە (تیپەکانی ٥٧ ی سـەگرمە، ١٥ ی هەورامان، ٥١ ی گەرمیـان، ٥٥ ی قـەرەداخ، ٥٣ ی شـیروانە، ١١ ی شـارەزور) و بـە فەرماندەیـی (جەبـار فەرمـان)، بەشـدارییان کـرد و جێبەجێکـرا! هەمـوو ئـەو فەرمانـدە و پێشـمەرگانە ئازایەتییەکـی کـەم وێنەیـان لـە ئـازاد کردنـی ناوچەکـەدا نوانـد. لەبـەر ئـەوەی خـۆم راسـتەوخۆ هیـچ بەشـدارییەکم لـەو چالاکییـە گەورەیـەدا نەبـوو، گێڕانـەوەی ئـەم داسـتانە گەورەیـە بـۆ پیـاوی قارەمانـی وەک (مـلازم عومـەر)، بەجـێ دێڵـم، کـە خـۆی فەرمانـدەی ئـەو داسـتانە بـوو، تـا لـە دەرفەتێکـدا داڕشـتنی نەخشـەکە و چۆنێتیـی دابەشـکردنی هێـزەکان و وردەکاریـی نەبەردەکـە لـە سـەرجەم قۆڵـە جیـا جیاکانـی نەبەردەکـەدا بـە زمانـە شـیرینەکەی خـۆی بگێڕێتـەوە!

ئـەو چالاکیـە داسـتانێکی گرنـگ بـوو، چونکـە ناوچەیەکـی فراوانـی رزگار کـرد و بـەوەش دۆخێکـی لەبـاری بـۆ پاراسـتنی بارەگاکانـی سـەرکردایەتی بەدەسـت هێنـا! ئـەو زنجیـرە شـاخەی چەرماوەنـد، کـە لـە لوتکـەی (سـارا) ی لای دوکانـەوە و بەرامبـەر شـاخی (قـەرە سـرت)، دەکشـێ بـۆ لوتکـەی

(کونیلـه)ی پشـتی سـورداش و بـۆ لوتکـەی (دابـان)ی پشـتی سـەرگەڵو و ئەنجـا لەوێشـەوە بـۆ شـاخی (هـەلاج )ی پشـتی یاخسـەمەر و لـە بەرزاییەکانـی (قوتـەی بـووک) ەوە بـۆ پشـتی (قزلـەر)، تادەگاتـە نزیکـی شـاخی (ئەزمـەڕ)، درێـژ دەبێتـەوە، گرنگییەکـی سـتراتیژی بـۆ هێـزی پێشـمەرگە و بارەگاکانـی سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) هەبـوو! ئیتـر بەوجـۆرە لـە گونـدی کارێزەوە تـا دەگەیشـتە بێدەر و بـەرە و مەرگـە، ئـەو ناوچەیـە هەمـووی بوونـە ناوچەیەکـی ئەمیـن و ئـارام! بـەوەش سـەرکردایەتیی دەیتوانـی بـەرەو سلێمانی هەنگاوێکـی گـەورە بێتـە پێشـەوە! لـە ناوچەکانـی کۆیـە و هەولێـر جگـە لـە مەڵبەنـدی سـێ، کـە داڕووخانێکـی سـەیر رووی تێکـرد بـوو، ئـەوا لـە هەمـوو ئـەو ناوچانـە و لـە بـەری قـەراخ و شـارباژێڕ چالاکیـی بـاش ئەنجـام دەدرا و تواناکانـی هێـزی پێشـمەرگەش تادەهـات گەورەتـر دەکەوتـە بەرچـاو!

ماوەیەکـی زۆر بـوو بارەگاکانـی سـەرکردایەتیمان، ئـەوەی کاک (نەوشـیروان) لـە (ئـاوەژێ) و ئـەوەی (مـام جـەلال و مـلازم عومـەر و دکتـۆر فـۆاد مەعسـوم) و مـن و زۆرێ لـە برایـان لـە سـێڕوان و ئـاوەژێ کەوتبـووە بـەر تۆپبارانـی خەسـت و بۆردمانـی فڕۆکـەی دوژمـن! رۆژێـک لـەو تـۆپ بارانـەدا ئێوارەیەکـی درەنـگ، کاک (حەمـەی فـەرەج)، بـەر تۆپێـک کـەوت، ناچـار لەگـەڵ هەنـدێ لـە هاوڕێکانـدا بـە پەلـە بـە پیـر رووداوەکـەوە چوویـن، بینیمـان پارچـە تۆپێکـی وێـڵ بـەر قاچـی کاکـە (حەمـە) کەووتـوە! ئـەوەش بـوو بەهـۆی ئـەوەی ، کـە قاچێکـی ببڕنـەوە! دکتۆرەکانـی شـۆڕش و دکتـۆر (خـدر مەعسـوم) ،خەریکـی بڕینـەوەی قاچـی بـوون و هێشـتا هۆکانـی بەنـج و سـڕ کردنیشـیان تـەواو نەبـوو، کـە لـە ژێـر دەسـتی ئـەو دکتۆرانـە بـە چـاوی کـراوە و هۆشـی تـەواوەوە تەماشـای دەکردیـن، کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا لەبـەر خـڕە خـڕی مشـاردا ئـەو زاتـە یـەک ئۆفـی

نەکردا! ئیتر لەو کاتەوە ڕێز و خۆشەویستی لەلام زۆر زیادی کردا!
منیش جگە لە (پاکیزە)ی هاوسەرم، (بێستون و شوان)ی کوڕیشم لە
ژێر باری گرانی ئەو تۆپ بارانەدا لەگەڵدا بوون، کونە تەیارەیەکم
بۆ دروست کرد بوون، کە کاتی تۆپ باران لەگەڵ پێشمەرگەکاندا
ئەمبردنە ناوی! شەوێک درەنگ زرم و کوتی تۆپ باران دەستی پێکرد
و بە پەلەپروزێ توانیم بیانگەیەنمە کونە تەیارەکە. کە چوینە ئەوێ
مارێکی گەورە پەپکەی تیادا کرد بوو خەریک بوو لەسەری دابنیشن،
باش بوو (بەختیار)ی پورم، کە پێشمەرگەیەکی زۆر وریا بوو،
دەستوبرد بە قۆناخە تفەنگ کوشتی! لە دڵی خۆمدا وتم.. لە دەست
تۆپ باران رزگارم کردن، کەچی خەریک بوو مار پێوەیانەوە بدات!
ڕوژێک (مام جەلال)، ڕایسپاردم سەردانێکی دۆڵی جافایەتی بکەم و
لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری سەرکردایەتی بۆ گوێزانەوەی بارەگاکەمان بۆ
ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی، جێگەیەکی گونجاو بۆ خۆی و بارەگاکانی و
بۆ خۆشم پەیدا بکەم! کە چووم بۆ ئەوێ بینیم بارەگای کاک (ئیبراهیم
جەلال)ی هاوڕێم، کە لێپرسراوی ڕێکخراوی (کۆمەڵە) بوو، لەسەر
کانی و ئاوێکی خۆش و قەد پاڵێکی قایمی شاخی (لوتکەی هەلاج)ی
چەرماوەند بۆ خۆی چاک کرد بوو، منیش بەباشم زانی سەرێکی
کاک (ئیبراهیم جەلال) و ڕێکخراوەکەیان بدەم و بە هاوکاری ئەویش
شوێنێکی باش بۆ (مام جەلال) هەڵبژێرم! لە ڕاستیدا لەوێ شوێنەکەی
خۆیم زۆر بە دڵدا چوو، جا بەهۆی ئەوەوە، کە ماوەیەکیش بوو نێوانی
(مام جەلال) و کاک (برایم) ساردییەکی تێکەوتبو و (مام جەلال)،
لەگەڵیدا تۆزێ کەم لوتف بوو، ئەوا بە باشم زانی هەم کاک (برایم)
رازی بکەم، کە ئەو پێشنیاری ئەو جێگایەی خۆی بۆ (مام جەلال) بکات
و ئەو شوێنەی بۆ بەجێ بهێڵێت، هەم کارێکی وابکەم، (مام جەلال)

یش بە ناوی سەردانی شوێنەکە رابکێشم بۆ سەردان و دیدەنی کاک (برایم) و رەواندنەوەی تەم و مژی نێوانیان و بەمەش دۆخێکی لەبار ساز بکەم بۆ نە هێشتنی ئەو ساردییەی نێوانیان! زۆریش ئامۆژگاری برایانەی کاک (ئیبراهیم)م کرد، کە ئەگەر (مام جەلال) هات، تا بۆی دەکرێ هەوڵ بدات پەیوەندییە دێرینەکەی خۆی لەگەڵ (مام جەلال) گەرم بکاتەوە!

پاش ماوەیەک لەگەڵ (مام جەلال)، گەڕامەوە بۆ تەماشا کردنی شوێنەکە و سەردانی کاک (برایم) و رێکخراو! قسەشم لەگەڵ (مام جەلال) کرد بوو، کە بە زمانە شیرینەکەی خۆی دڵی کاک (برایم) بداتەوە! کە گەیشتینە ئەوێ، خوا هەڵناگرێ کاک (برایم) میوانداریيەکی جوان و شایستەی کردین و زۆریش قسەی جوان و شیرینی لەگەڵ (مام جەلال) کرد، (مام جەلال) یش شوێنەکە و دەست پیشکەریەکەی (برایم)ی بە دڵ بوو، بە شێوەیەکی گەرم و دۆستانەش دەستی کردە ملی کاک (برایم) و پێی وت : کاک (برایم)، تۆ برادەری دێرین و خوشەویستی منی، نابێت هەرگیز نێوانمان سارد بێت! کاک (برایم) یش وەرامی دایەوە و وتی : هەر من برای تۆ بووم، تۆ هەرگیز منت بە برا و هاوڕێی خۆت دانەناوە، ئەو قسەیە (مام جەلال)ی زیز و تووڕە کرد و ریسەکەی منیشی کردەوە بە خوری! ئیتر ناچار بووم هەوڵ بدەم وەزعەکە پینە بکەم، بۆیە زۆر بە قورسی و بە حاڵێکی خراپ تا توانیم کاریگەری قسەکان کەم بکەمەوە. لە دواییشدا (مام جەلال)، بە میهرەبانی خۆی و تەنها بە وردە گلەیی کۆتایی بە ساردییەکە هێنا و شوێنەکەشی هەڵبژارد و شوێنێکی لە باریشمان بە هاوکاری هەموو لایەکمان بۆ رێکخراو چاک کرد و ئاوەدان کردەوە! منیش لە نزیک بارەگای (مام جەلال) و لە هەمان گوندی یاخسەمەر بارەگای خۆمم

دامەزراند. پاشان کاک (نەوشیروان) یش ماوەیەک هاتە ئەو نزیکە و دواتر لە بەرگەڵو گیرسانەوە! کاک (ئەرسەلان بایز) و راگەیاندنیش هەر لە بەرگەڵو جێگیر بوون. پاش ئەوە بەرەبەرە بارەگا و لێپرسراوەکانی سەرکردایەتی هەموو هاتنە ئەو ناوە!

## دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران!

دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ و ئەو چالاکییە کەمەر شکێنەی، کە پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، لە دام و دەزگا سەربازییەکانی حکومەتی عێراقیان سرەواند، رژێمی عێراق و هێزەکانی تادەهات دڕندانەتر دەکەوتنە وێزەی خەڵکی کوردستان! گرتن و کوشتن لەناو شارەکاندا و تۆپباران و پەلاماردانی گوندەکان و راگواستنی ئەو چەند گوندەی کە لەگوێ شەقامە سەرەکییەکانی نێوان شار و شارۆچکەکاندا مابوون، کردە سیاسەتی فەرمیی خۆی! بۆیە رژێم بەتەواوی هار بوو بوو، وەک ئەوەی، کە ئیتر بڕیاریان دابێ دەست لە کورد بشۆن و کورد وەک لایەنگری دوژمن تەماشا بکەن! هێزی پێشمەرگەش رۆژ لەدوای رۆژ داستان و نەبەردی سەرکەوتووانەی تۆمار دەکرد و چالاکییەکان گۆڕانێکی چۆنایەتییان بەخۆوە گرت! لە هەموو قۆڵەکانەوە پێشمەرگە دەیتوانی رەبیەکانی هێزەکانی عێراق بگرێ و کوشتاری زۆریان لێ بکات و چەک و تەقەمەنییەکی زۆریشی لەو شەڕانەدا دەست بکەوێ!

لە زۆر شوێن توانییان نەبەردی بەرگری سەرکەوتوو بکەن و تاکتیکی شەڕی جەبهەیی تێکەڵ بە شەڕی پارتیزانی بکەن و دوژمن دەرزی ئاژن بکەن!

لایەنە نەیارەکانی (یەکێتی) ش، بە گومانەوە تەماشای ئەو چالاکییانەیان دەکرد و لای ئێران و لە ناو خۆیاندا بە شانۆگەری و ڕێکەوتنی ژێر بە ژێریان لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا لە قەڵەم دەدا! نێوانمان لەگەڵ (حسک)، باشتر بووبوو، چەندین کۆبوونەوەمان بۆ گەرم کردنەوەی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ کردن و پەیوەندیی نێوانمان وردە وردە روویان لە باشی کرد بوو! ئەوان بە پێچەوانەی لایەنەکانی تری (جود)، لای ئێران قسەی باشیان بۆ دەکردین و هەوڵیان دەدا پەیوەندی لە نێوان ئێران و (یەکێتی) دا، دروست بێت!

ئێمەش خۆمان چەند هەوڵێکماندا، هەرچەندە بەهۆی سەردانی کادرەکانی خۆمانەوە بۆ ئێران نەمانتوانی بەستەڵەکی نێوانمان بشکێنین! تا رۆژێکیان لێپرسراوێکی ئێرانی بە ناوی (مستەفەوی) لەگەڵ (سلێمانی قەساب)، هاتن و گفتوگۆی راستەوخۆ و جدییان لەگەڵ (یەکێتی) کرد، (مام جەلال و کاک نەوشیروان)، بە راستگۆیی و بە رۆشنی قسەیان لەگەڵ کرد و ترسی ئەوەیان لا رەوانەوە، کە گەرم بوونی پەیوەندیی ئێران لەگەڵ (یەکێتی)، وا لە (یەکێتی) ناکات، کە وەک تاکتیک و کارتێکی گوشار بۆ گفتوگۆ لەگەڵ عێراق بەکاری بهێنێ! (سلێمانی قەساب و خالە حاجی)، هەر دوو لە (حسک)، رۆڵی باشیان هەبوو لە هاندانی ئەو لێپرسراوانەی کۆماری ئیسلامیی ئێران، بۆ بەردەوام بوونی سەردانەکانیان بۆ لای (یەکێتی)! هاوکات قەناعەتەکانی (نەوشیروان)یش، بۆ سوود وەرگرتنی تەواو لە شەڕی (ئێران - عێراق)، لە دژی (صدام) و رژێمەکەی، دەوری هەبوو لە

خۆش کردنی زەمینەکی لەبار بۆ زیاتر پەیوەندی کردن لەگەڵ ئێران! (نەوشیروان)، نەخشەی پەلاماردانی بیرە نەوتەکان لە مێشکی دا بوو، ئەوەش گەورە ترین دان رۆ کردن و چەشە کردن بوو بۆ لێپرسراوە ئێرانییەکان، بەتایبەتی ئەو شاندەی ئێران، کە (سەردار وەحیدی) لە گەڵیان هاتبووا- وەحیدی ماوەیەک لێپرسراوی ئیتلاعاتی سوپا و ماوەیەکیش فەرمادەی هێزەکانی پیادەڕۆی سوپای پاسدارانی ئێران بوو - !

کە باسی لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکووک کەوتە ناو گفتوگۆکانەوە، رۆژێکیان لە ماڵی خۆمان لە کانی مستەفای چۆخماخ کۆبوونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی کرا بۆ باس لە هاوکاری لەگەڵ ئێراندا و مەسەلەی لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکووک! زۆر لایەن و ئەنجامی ئەو چالاکییە لە رووی سلبی و ئیجابییەوە خرایە روو، مشتومڕی زۆری لەسەر کرا! کاک (کۆسرەت)، نارازی بوو، پێی باش نەبوو، چونکە پێی وابوو ئەوە کێشمان دەکات بۆ باریکە رێی پێچاو پێچی وا، کە ناتوانین بزانین کاردانەوەی (صدام حسین)، چۆن و چەند دەبێت و بە کوێ دەگات! مشت و مڕەکان گەرم و توند بوون، (کۆسرەت) زویر بوو چوە دەرەوە، ناچار شوێنی کەوتم و بە زۆر رازیم کرد بگەڕێتەوە بۆ ناو کۆبوونەوەکە!

## چالاکی لێدانی بیره نەوتەکانی کەرکووک!

ئـەو شـاندەی کـە سـەردانی سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) یـان کـرد و (مـام جـەلال و کاک نەوشـیروان)، قسـەیان لەگـەڵ کـردن، بـە یـاوەری خوالێخـۆش بـوو (شـێخ دارای حەفیـد)، سـەردانی شـاخی بەرگەڵـوو و هەنـدێ شـوێنی تـری هێزەکانـی (یەکێتـی) یـان کـرد، لـەوە تێگەیشـتن، کـە تەنهـا بـە هـاوکاری (یەکێتـی) و لـەو ناوچانـەی (یەکێتـی) یـەوە دەکـرێ پەلامـاری بیـره نەوتەکانـی کەرکـووک بـدرێ! ئیتـر دوای ئـەو سـەردانە ئێـران بـواری دا، نووسـینگەی پەیوەندییەکانـی (یەکێتـی)، لـە شـاری کرماشـان بکرێتـەوە و ئەوانیـش لێپرسـراوێکی خۆیـان بەنـاوی (سـاڵحی)، نـاردە یاخسـەمەر و لەگـەڵ تیمەکەیانـدا نووسـینگەیەکیان کـردەوە، کـە زیاتـر وەک هەنگاوی یەکەمـی ژووری عەمەلیاتـی کۆکردنـەوەی زانیـاری بـوو لەسـەر چۆنێتیـی تەگبیـری پەلاماردانـی بیـره نەوتەکانـی کەرکـووک! ئێرانییـەکان لەگـەڵ (نەوشـیروان مسـتەفا) و هەنـدێ لێپرسـراوی تـر و فەرماندەکانـی پێشـمەرگەدا کەوتنـە کار بـۆ ئەنجامدانـی ئـەو چالاکییـە!

ئەویش بە کۆکردنەوەی زانیاری زۆرتر و بینینی راستەوخۆی هەموو شوێنەکان لە نزیکەوە و لێکۆڵینەوە لە ئەگەرەکان و رێگاکانی هێنانی چەک و تەقەمەنی پێویست و دابین کردنی رێگاکانی گەیاندن و چونێتیی کشانەوەی هێزەکان! ئیتر بڕیار درا ئەو چالاکییە بە سەرپەرشتی (نەوشیروان مستەفا) و بەشداری (جەبار فرمان، شەوکەتی حاجی مشیر و ئازاد حەمە غەریب) جێبەجێ بکرێت و ئێرانییەکانیش نزیکەی ١٥٠ کەسی شارەزایان بۆ بەکارهێنانی رۆکێتی دژە فڕۆکە و کاتیۆشا و هاوەن و کاری فەرماندەیی هێنا بوو! سەرەتا بەشێکی گرنگی کارەکە بریتی بوو لە کاری لۆجستیکی و هێنانی ئەو هەموو چەک و تەقەمەنییە زۆرە بە باری ئێستر و بە شاخی بەرز و سەختدا و پەڕاندنەوەی بە گوریس لە روبار و لە رێگەی دورەوە و هێنان و عەمبار کردنیان و شاردنەوەیان لەچەندین ئەشکەوتی ناوچەکانی نزیک سەرکردایەتی، لە ژێر زەبری بۆردومانی بەردەوامی فڕۆکەی جەنگی و تۆپبارانی خەستی ناوچە و رێگە و بانەکاندا! ئەو بەشە گرنگەی کارەکە بە (جەبار فرمان) سپێردرا کە (مام جەلال) ناوی لێ نابوو (فیلەکەی یەکێتی)، ئەویش ئەو کارەی بە شێوەیەکی سەرکەوتوو ئەنجامدا! من لەو چالاکییەدا دەوری راستەوخۆم نەبوو، تەنها رێکخستنی پەیوەندی و بینینی لێپرسراوە ئێرانییەکان بوو، بۆ چارەسەری کێشە و گرفتێ گەر بێتە پێش، واتە کاری هاوئاهەنگی سیاسی و چارەسەری کێشەکان کەوتبووە سەر ئەستۆی من!

لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکووک، کارێکی گرنک و کاریگەر بوو. پێشتر (بارزانی)، بەر لە رێکەوتنی ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ عێراقدا، هەمان ئەو کارەی کرد، بەسەرپەرشتی خوالێخۆش بوو (سامی عەبدول رەحمان)، لە بیرە نەوتەکانی کەرکووک درا و حکوومەتی عێراقی پێ شڵەژا! ئەم

جاره ئەو کاره لە هەلومەرجێکی تردا جێ بەجێ کرا و کاردانەوەشی جیا بوو!

دارایی عێراق تا ئەندازەیەکی گەوره، بەرهەمی نەوتە! نەوتی ژێر زەوی عێراق بە ١١٢ ملیار بەرمیل زیاتر دەخەملێنرێ. لەوه نزیکەی ١٣٪ ی لە نێوان ١٣ تا ١٤ ملیار بەرمیلی لە کەرکووکدایە! ئەو کاتە کەرکووک یەکێک بوو لە شوێنە گرنگەکانی بەرهەم هێنان و ناردنی نەوت لە عێراقدا. لە کۆندا و لە رۆژگارەکانی سەردەمی پاشایەتیدا، تەنها ٤٤ بیری نەوتی تێدا بوو، ئێستا زیاتر لە ٣٣٠ بیری نەوت هەیە، کە بەرهەم دەدات و بە پێنجەمین ناوچەی نەوتی جیهان لە قەڵەم دەدرێ!

شاری کەرکووک، لە مێژوودا شارێکی دێرینە و تەمەنەکەی دەگەڕێتەوه بۆ نزیکەی ٥٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر! ئەم شاره لەدێر زەمانەوه مەیدانی شەڕ و ململانێی زۆری مێژویی بووه. لەکاتی عوسمانییەکاندا پایتەختی ویلایەتی شارەزور بووه و لە کۆنەوه حەدیدییەکان و هۆزی (عوبید و جبوری)، کە دوو هۆزی عەرەبن بۆ ئەوێیان هێناوه! هەرچەنده مێژوی تەعریب کردنی ئەم شاره دەگەڕێتەوه بۆ سەردەمی فەرمانرەوایی پاشایەتی لە عێراقدا، بەڵام ئەو رێکارانەی، کە بەعسییەکان بۆ گۆڕینی واقیعی نەتەوەی کورد لە گۆڕینی باری جوگرافی و دیموگرافی ئەم شاره بۆ تەعریب کردن و سڕینەوەی ئاسەواری کورد ئەنجامیان دا، لە هەموو سەردەمەکانی تر رەشتر و نەگریستر بووه! بەعسییەکان زۆربەی کوردەکانی ناوچەکەیان بە بیانووی جیا جیا دەرکردووه و لەجێگەی ئەوانیش عەرەبی هاوردەیان بۆ هێناوه، بەمەش چەنده فەرمانڕەوا عەرەبەکان هەوڵی داگیر کردن و بە عەرەب کردنی ئەو شارەیان داوه، هێنده و زیاتریش کورد، کەرکووکی وەک (دڵی کوردستان)

و ( قودسی کوردستان) سەیر کردوە، بۆیە زۆربەی گفتوگۆکانی کورد و حکومەتی بەغدا لەسەر کەرکووک تێکچوە! هەمیشە بەعسییەکان لە کەرکووک، هەر لە سەردەمی کودەتاکەیانەوە تا دوا رۆژی رەشیان، لێپرسراوی گرنگ و بارەگای سەربازیی گرنگیان تیا جێگیر کردوە! سالی ١٩٨٦ بارەگای (مکتب تنظیم الشمال)ی حیزبی (بەعس) و بارەگای (فەیلەقی یەک) و (سەرکردایەتیی هەواڵگریی سەرووی عێراق)، هەر هەمووی لە کەرکووکدا بوون!

ئیتر وردە وردە کارەکان چوونە پێشەوە و نەخشەی چالاکییەکە بە سەرکەوتوویی ئەنجامدرا، کە هێزی پێشمەرگە قارەمانانە گیانبازییان تێدا کرد! بەڵام ئێران لە راگەیاندنەکانی خۆیەوە وای باس کرد، کە ئەوە ( عەمەلیاتی فەتحی یەک) ە و ئێران ئەنجامی داوە!

پێشمەرگە گورزێکی کاریگەری لە رژێمی عێراق وەشاند، ئەوەش بووە هۆی تەکانێکی باش لە پەیوەندیی نێوان (ئێران و یەکێتی) دا! بەڵام ئێران جگە لە تۆمار کردنی نەبەردێکی سەرکەوتوو لە نەبەردەکانی جەنگ لەگەڵ عێراقدا، توانی ئەو کارە وەک کارتێکی گرنگ لە کۆبوونەوەکانی ئۆپیک دا بەکاری بهێنێ، بەوەی کە ئاسایشی نەوتی عێراق لە دەست هێزەکانی ئێراندایە!

دوای ئەو چالاکییە، (مام جەلال) بە فەرمی بانگهێشتی ئێران کرا. لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٦ سەفەرێکی بۆ تاران کرد و منیشی لەگەڵ خۆی برد و هەر یەکە لە (د. کەمال خۆشناو، شێخ دارای حەفید، شێردڵ حەوێزی و مامۆستا رەفعەتی مەلا) یش، ئەندامی شاندەکە بوون! هەر لەسەر سنوورەوە بە بایەخێکی زۆرەوە پێشوازی کراین! لەو سەردانەدا توانرا چاوپێکەوتن لەگەڵ (هاشمی رەفسەنجانی، موحسینی رەفیق دۆست، موحسینی رەزایی) و گەورە فەرماندەکانی

تری سوپای پاسداران بکرێ! لەو ماوەیەدا (مام جەلال)، زنجیرەیەک کۆبوونەوەی لەگەڵ کار بەدەستان کرد و هەموو بەڵێنی پشتیوانی تەواویان بە (یەکێتی)دا. پاش چەند رۆژێک لە رۆژی ۱۹۸٦/۱۱/۷ دا، لە بارەگایەکی سوپای پاسداران کۆبوونەوەیەکی تر بە ئامادە بوونی کار بەدەستانی باڵای سوپای پاسداران لە نێوان ئێمە و (پارتی - مەرحوم ئیدریس بارزانی) دا ریکخرا و هەر دوو لایان ئاشت کردینەوە و بە ریکەوتن گەیشتین، تەنها مایەوە نووسینی ریککەوتنەکە! ئیتر لە رۆژی دواییدا لە ۱۹۸٦/۱۱/۱۸ دا، لە دۆخێکی دۆستانەی خۆشدا بە هاوکاری کاک (فازیل میرانی)، من دەقی ریکەوتنەکەم ئامادە کرد و پاش خوێندنەوەی، هەر دوو زاتەکە ئیمزایان کرد!

ئێرانییەکانیش وادەیەکیان دیاری کرد، کە تیایدا ریکەوتنێکی فەرمی هاوکاری لە نێوان (کۆماری ئیسلامی ئێران و یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا)، ئیمزا بکرێ، کە کورتییەکەی بریتی بوو لە :

* هاوکاریی سیاسی و سەربازی و راگەیاندن بکرێ لە نێوان هەر دوولا، بۆ رووخاندنی رژێمی (صدام حسین)!

* گەلی عێراق سەربەستە لە هێنانی حکومەتێکی هەڵبژاردەی خەڵکی عێراق خۆی!

* پشتیوانی و یارمەتیی تێکۆشانی گەلی کورد بۆ گەیشتن بە مافە رەواکانی خۆی!

* یارمەتیدانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بە چەک و ئازووقە!

* تیمارکردن و یارمەتیدانی پزیشکی و دەرمان و چارەسەری بریندارەکانی (یەکێتی)، لە نەخۆشخانەکانی ئێراندا!

* ریگەدان بە هاتوچۆ و ئاسانکاری لە سەفەری لێپرسراوانی (یەکێتی) بۆ دەرەوەی وڵات و هاتنەوە و ئاسانکاری بۆ ئەو رۆژنامە نووسانەی

سەردانی (یەکێتی) و ناوچەکانی دەکەن!
* ئێران لە شوێنی خۆیدا و لە کاری دیپلۆماسیدا بە باشە باسی ڕەوایی خەباتی کورد، دژی ڕژێمی (صدام)، بکات و پشتیوانی بۆ ئەو خەباتە نیشان بدات!
* لە هۆکانی ڕاگەیاندنی ئێراندا، ڕێگە بە (یەکێتی) بدرێت، دەنگ و باسەکان و چالاکییەکانی خۆی باس بکات!
دوا بەدوای ئەو ڕێککەوتنە هاتوچۆی سەرکردە و کادرەکانی (یەکێتی)، ئاسانکاری بۆ دەکرا و زۆری نەبرد لە ١٩٨٦/١١/٢٧ دا، شاندێک کە پێکهاتبوو لە (نەوشیروان مستەفا، ملازم عومەر، دکتۆر فوئاد مەعسوم، دکتۆر کەمال خۆشناو، خەسرەو خاڵ و شێرکۆ بێکەس)، لە ئێرانەوە سەفەریان کرد بۆ سوریا!
هەرچەندە بەهۆی گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٣ – ١٩٨٤ی (یەکێتی)، لەگەڵ ڕژێمی عێراق، پەیوەندییەکانی (یەکێتی) لەگەڵ سوریا تووشی ساردی هاتبوو، بەلام توانرا ئەو پەیوەندییانە دروست بکرێنەوە! بۆ ئەوەش دەبوو لێپرسراوێکی (یەکێتی)، نووسینگەی شام بەڕێوە بەرێت، بۆیە بڕیار درا، کە (نەوشیروان) و شاندەکە لەو سەفەرەدا، دکتۆر (خەسرەو خاڵ)، لە دیمەشق لەو نووسینگەیەدا جێگیر بکەن و کاک (شێرکۆ بێکەس) یش، وەک شاعیر و ڕوناکبیرێکی گەورە، هەوڵە ڕوناکبیرییەکانی خۆی بخاتە گەڕ بە مەبەستی سوود گەیاندن بە پەیوەندییەکانی (یەکێتی)، لەگەڵ جیهانی عەرەبیدا! ئەو شاندە لە تاران و لە دیمەشق چەند کۆبوونەوەیەکیان ئەنجام دا و سەردانەکەیان سوودی خۆی هەبوو! قسەکانی (نەوشیروان مستەفا) ش بۆ ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی هەلایەکی نایەوە و زۆر لە نووسەر و حیزبە عەرەبییەکان بەو هۆیەوە پەلاماری (یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان) یان دا، لە ئەنجامی ئەوەدا

(یەکێتی)، لەسەر زاری (مام جەلال) ەوە بەرەنگارییەکی گەورەی لەگەڵ هەموو ئەوانە و تەنانەت هەندێ لە نووسەرە کۆمۆنیستەکانی عەرەبی کرد!

لە راستیدا کاک (نەوشیروان)، لەو قسە کردن و چاو پێکەوتنەدا، کە لەگەڵ رۆژنامەی (لۆمۆند) ی فەرەنسیدا کرد بووی، باری سەرنجی خۆی لەسەر ئایندەی عێراق راشکاوانە دەربڕیبوو، و پێی وابوو کە: لە قاڵبدانی پێکهاتەکانی عێراق (کورد و شیعە و سوننە) ی عێراق بەزۆر، نەیتوانیوە عێراقێکی ئارام و پێکەوە ژیانێکی سەرکەوتوو لە نێوان پێکهاتە جیاوازەکانی عێراق پێک بهێنێ و گەلانی عێراق و مەزهەبە جیاوازەکان لە ناکۆکیی و ململانێ و ستەمی نەتەوەیی و ئاینی بە دوور بگرێت. بۆیە رێگە چارەسەری گونجاو ئەوەیە عێراق بکرێ بە سێ ناوچەی فیدرالی (کورد، شیعە، سوننە)، بەوەش یەکێتییەکی فیدرالی بەهێز و رەوا لە عێراقدا دابمەزرێ، تا دوور بێ لە کێشەو ململانێ و ستەم! ئەو بۆچوونە پرۆژەیەکی بەجێ و گونجاو بوو، رێگە چارەیەکی مەنتیقی بوو بۆ پێکەوە ژیان! هەرچەندە بۆ ئەو رۆژگارە و بۆ ئەو سەردەمە تا ڕادەیەک لەگەڵ سیاسەتی سەردەمدا جووت و تەبا نەبوو، بەڵام مێژوو دەریخست کام مۆدێل لە سیستمی حوکمڕانی بۆ عێراق پێویستە! ئەوەتا ئێستا و پاش سیساڵ لەو چاو پێکەوتنەی کاک (نەوشیروان) و دوای رووخانی حوکمی دیکتاتۆری (صدام حسین) و حوکمی باڵا دەستی سوننەی عێراق و ژێردەستەیی کورد و شیعە )، کەچی هەمان نووسەر و روناکبیرانی دوێنێ، خۆیان داوا دەکەن، کە دەبێ سیستمی حوکمڕانی لە عێراقدا، سیستمێکی فیدرالی بێت و ناوچەکانی سوننە وەک هەرێمی کوردستان بە شێوەی حوکمی فیدرالی رێک بخرێ! تەنانەت سەرباری باڵا دەستیی (شیعە)ش، هێشتا زۆر لە

رووناکبیرو سیاسەتمەداران و پەرلەمانتارە شیعەکانی خوارووی عێراق و پارێزگای بەسرە، داوای هەمان چارەسەر دەکەن! واتە پاش ئەو هەموو ساڵە، ئەنجا بەو ئەنجامە گەیشتن، کە (نەوشیروان)، لە ساڵی ١٩٨٧ دا باسی کرد و کەچی لێی کرا بە هەڵا!

## ئاشتبوونەوەی حیزبەکان و گەشەکردن!

حیزبەکانی کوردستانی باشوور، تا توانییان لەگەڵ یەکتر ناکۆک بوون، ململانێی نا راست و نا بەجێ و خوێناوییان لەگەڵ یەکتر کرد! حیزبی (شیوعی) عێراقیش لەو ململانێ و زۆرانبازییە روخێنەرەدا بێ بەش نەبوو، بگرە رۆلی کاریگەری خۆیشی هەبوو!
لە سەردەم و رۆژگاری مەینەتییەکانی گەلەکەماندا، ئەو کاتانەی، کە حوکمی زۆردار و خوێنرێژی عێراق کوردستانی خاپوور دەکرد و گوندەکانی رادەگوێزا، کەرکووک و ناوچەکانی تری بە عەرەب دەکرد و واقیعی نەتەوەیی گەلی کوردی دەسڕیەوە، ئەو سەردەمەی بەعس چنگی لە بینی گەلانی عێراق و ئازادییەکانی خەڵک گیر کرد بوو، ئەو رۆژانەی شاڵاوی مەرگچێنی لەشکری رژێم بەربووبووە کوردستان و هەڕەشەیان لە بوونی نەتەوەیی کورد و کوردستان دەکرد، ئەو کاتەی رژێم خەڵکی عێراق و نیشتمانەکەی خستبووە ناو ئاگری جەنگێکی ترسناک لەگەڵ ئێراندا، ئەو کاتەی، کە ئاشتی و برایەتی

بۆ یەکخستنی تواناکانی کورد و هێزە دیموکراتەکانی عێراق زەرور و پێویست بوو، ئەو کاتەی، کە دەبوو هەلومەرجی تووشبوونی رژێمی عێراق بە جەنگەوە، بکەینە دەرفەتی زێرین بۆ یەکخستنی تواناکان و جوولاندن و وروژاندنی هەموو هێزە دیموکرات و ئازادیخوازەکانی عێراق و خەڵکی کوردستان بۆ دەرباز بوونی کورد لە چەوسانەوەی نەتەوایەتی و رزگار کردنی عێراق لە چنگی دیکتاتۆری، ئەو کاتەی، کە ئاشتی و یەکخستنی وزە و تواناکانی هەموومان ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی بوو، کەچی هەمووومان سیاسەتێکی پێچەوانە و نادروستمان دەگرتە بەر و هیچ نەما بە یەکتری نەکەین و رێگە نەما بۆ چۆڕ بڕ کردنی هێز و تواناکانی یەکتری نەیگرینە بەر! هیچ ئامراز و هۆیەک نەما بۆ سووک کردن و ناو زڕاندنی یەکتر، پەنای بۆ نەبەین! سەد مەخابن خوێنێکی زۆر بە خۆڕایی رژێنرا، ژمارەیەکی زۆر لە رۆڵە قارەمانەکانی گەلەکەمان و لە پێشمەرگە گیانبازەکانی شۆڕش، بە کوشت دران! درەنگ هاتینەوە سەر خۆمان و درەنگ هۆشمان هاتەوە بە بەردا، ئیتر ئەوکاتە پرۆسەی ئاشتەوایی لە کوردستان دەستی پێکرد!

سەرەتا لە شارەزوور پێشمەرگەکانی (حسک و یەکیتی)، لە رووی هێرشێکی دوژمندا لە ٩ / ١ / ١٩٨٦ دا، ئاشتبوونەوە و هاوکاری یەکتریان کرد! لەو کارە جوامێرانەدا (شێخ محەمەدی شاکەلی)، کە ئەندامی سەرکردایەتیی (حسک) بوو، رۆڵێکی جوانی نواند. پاش ئەوە (حسک)، بە دەنگ داوای ئاشتەوایی (یەکێتی) یەوە هات و (شێخ محەمەدی شاکەلی)، سەردانی (مام جەلال) ی کرد و دوای ئەویش (حەمەی حاجی مەحمود)، هات بۆ لای (مام جەلال) و بەوەش زەمینەیەکی لەباری بۆ ئاشتبوونەوە خۆشتر کرد! ئەنجا شاندێکی (حسک)، لەسەر بانگهێشتی

(یەکێتی)، لە ١٩٨٦ /٤/٨ دا، کە پێک هاتبوو لە (قادر جەباری، شێخ محەمەدی شاکەلی و حەمە رەحیم، کە بە خاڵە حاجی) ناسرا بوو، هاتنە سەردانی (یەکێتی) و لەو سەردانەدا بە فەرمی ئاشتبوونەوەی نێوان (یەکێتی و حسک) راگەیەندرا و هەر دوولا رێککەوتن لەسەر :

* ئازادی کاری (پێشمەرگەیی، سیاسی، رێکخراوەیی و راگەیاندن)، لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی (یەکێتی) و ناوچەکانی تریشدا. هەر دوولا وەک یەک!

* پێکەوە هاوکاریی پێشمەرگانە و چالاکییەکانی یەکتری بکەن دژی رژێمی عێراق!

* رێزگرتنی (حسک)، لە واقیعی ناوچەکانی (یەکێتی)، واتە دەست نەخستنە کاروباری ئەنجومەنی گوندەکان و کاری دادگاکان!

* کادر و فەرماندەکانی (حسک)، دەست نەخەنە کاروباری گومرگەکانەوە، بەرامبەر ئەوەش (یەکێتی)، بەشی پێویستی ئەوان لە داهاتی گومرگەکاندا رەچاو و دابین بکات!

لە رۆژی ١١/ ٧ /١٩٨٦ دا، خوالێخۆش بوو (رەسول مامەند)، سکرتێری (حیزبی سۆسیالیستی کوردستان)، لەگەڵ شاندێکی یاوەریدا هاتنە سەردانی (مام جەلال) و لەگەڵ مەکتەبی سیاسی ریککەوتنەکەیان فراوانتر و پتەوتر کرد و لە راگەیاندنێکی هاوبەشدا، ئەم خاڵانەیان دووپات کردەوە :

* نەهێشتنی شەڕی یەکتر بکەنە بناغەی سیاسەتی هەمووان، بەرەو پێکهێنانی بەرەی کوردستانی!

* ئەو تەقەلایە لەسەر بناغەی ئیرادەی سەربەخۆی کورد بێتەدی!

* خەباتی هاوبەش دژی رژێمی فاشی، لە پێناوی دیاریکردنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد!

لەو کۆبونەوەیەدا شاندی (حسک)، داوایان لە (مام جەلال) کرد، کە زۆرتر لەگەڵ (پارتی)، هەوڵ بدەن بۆ ڕێککەوتن! بۆ ئەوەش لەسەر ئەوە ڕێککەوتین، کە ئەوان زەمینەی کۆبوونەوەیەک خۆش بکەن، تا شاندی هەر دوولا بە مەبەستی ڕێککەوتن کۆببنەوە! ئەوە بوو (یەکێتی)، شاندێکیان بە لێپرسراوی (فەرەیدون عەبدول قادر) و ئەندامێتی شەهید (ئازاد هەورامی) و خوالێخۆش بوو (شێخ دارای حەفید)، خستە ڕێ، تا لە بارەگای (حسک)، لەگەڵ کاک (فازیل میرانی و عیزەدین بەرواری) و برایەکی تردا کۆببینەوە! لەو کۆبونەوەیەدا قسە لەسەر پەیوەندییەکانی هەردولا کراو زەمینە خۆشکرا بۆ هەنگاوەکانی داهاتوو!

دوای ئاشتبوونەوە لەگەڵ (حسک)، هەوڵدرا لەگەڵ (پاسۆک) یش، ئاشتەوایی بکرێ! بۆ ئەوەش هەنگاوێکی باش نراو لە ڕۆژی ١٠ /٥/ ١٩٨٦ دا، برایانی (پاسۆک)، سەردانی مەکتەبی سیاسیی (یەکێتی) یان کرد و لە ١٢ ی ئەو مانگەدا ڕێککەوتن لەنێوان هەر دوولا ئیمزا کرا و دوای ئەو ڕێککەوتنەش (پاسۆک)، بارەگاکانی هێنایەوە نزیک بارەکاکانی (یەکێتی)!

هەر لە مایسی ئەو ساڵەدا لەگەڵ حیزبی (شیوعی) عێراقی ڕێککەوتنێک لەگەڵ (مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی) ئیمزا کرا. بەڵام سەرکردایەتی (حشع)، نەچوونە ژێر باری ئەو ڕێککەوتنەی، کە لەگەڵ ئەو نوێنەرەیاندا ئەنجامدرا، تا لە کۆتا مانگی ساڵی ١٩٨٧ دا، لە سەفەرەکەی (نەوشیروان مستەفا)دا لە شام، ڕێکەوتنێکی فەرمی ئیمزا کرا! هەر لەو سەفەرەشدا لەگەڵ حیزبی (گەل)، کە (سامی عەبدول رەحمان)، سکرتێری بوو، ڕێککەوتنێ ئیمزا کرا و بەو ڕێککەوتنەش پێی خوالێخۆش بوو (سامی عەبدول رەحمان)، بۆ سەردانی (مام جەلال)، لە یاخسەمەر کرایەوە!

ئیتر بەوجۆرە دەتوانین بڵێین ساڵی ١٩٨٦، ساڵێکی بەخێر بوو بۆ

هێزە کوردستانییەکان، چونکە لەو ساڵەدا ئاشتبوونەوەی حیزبە کوردستانییەکان ڕاگەیەندرا و ئەوەش هەنگاوێکی گەورە و گرنگ بوو بۆ گەلەکەمان و بۆ شۆڕش و چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە! لەو ساڵەدا باری دارایی ئێمە و هێزە کوردستانییەکان وردە وردە رووی لە بووژانەوە کرد، چونکە گومرگەکانمان گەشەیان کرد و داهاتیان زیادی کرد! لەو ساڵەدا پێشمەرگە لە هەموو شوێنێکی گرنگ و لە قوڵاییدا و ڕوو لە خەتی سنووری کوردستان و لەسەر جادەی ئامەرلی و کفری، لە دەشتی هەولێر و ناو هەولێر و سلێمانی و لە دەشتی کەرکووک، چالاکیی گەورە و جۆرا و جۆری ئەنجام دا، کە دەنگ و سەدایەکی گەورەی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا نایەوە، بۆ نموونە :

* لە ڕۆژی ٩/٣/ ١٩٨٦دا، پێشمەرگەکانی (یەکێتی) بە هێزیکی گەورە و تۆکمەوە پەلاماری شارۆچکەی (سەنگاو)یان دا و زۆربەی دام و دەزگاکانی دوژمنیان لە شارەکەدا گرت و زیانێکی زۆریان بە دوژمن گەیاند!

* لە ڕۆژی ١٧ /٧ / ١٩٨٦ دا، پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەک، پەلاماری فەوجی دەمرکانی نزیک (عەربەت و سلێمانی) یان دا و تەواوی فەوجەکەیان گرت و سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا!

* لە ڕۆژی ١ / ٩ / ١٩٨٦ دا، هێزی پێشمەرگە پەلاماری شارۆچکەی (کارێزە) یان دا و ناحیەکەیان گرت!

* لە ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/١٠دا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بە هێزێکی گەورەوە پەلاماری دامەزراوە نەوتییەکانی شاری کەرکووکیان دا، بەوەش زیانێکی گەورەیان بە دوژمن گەیاند و دەستی پێشمەرگە گەیشتە گرنگترین سەنتەری هێزی ئابووریی ڕژێمی عێراق!

* لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٦، چالاکی گەیشتە ناو شاری هەولێر

و لێدانی قوشتەپە!

* لە ڕۆژی ١٩ / ٣ / ١٩٨٦ دا، لێدانی پارێزگاری کەرکووک لە نزیک ماڵی خۆیان، کە لەو کاتەدا بە یاوەری بەڕێوەبەری ئەمنی موصل، کە گارد و حیمایەی زۆریشیان لە گەڵدا بوو، سەدایەکی گەورەی نایەوە!

* لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٦ دا، لە ناو شاری هەولێر و لە گەرەکی باداوا، پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، گورزێکی کەمەر شکێنیان سرەواندە گەلە جاشێک، کە بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر و بە دەست هێنانی ١٥ چەک!

* جارێکی تر و لە ڕۆژی ١٩٨٦/١٢/٣ دا، گرتنەوەی سەنگاو و وەشاندنی زەبری کاریگەر لە دوژمن، هەرایەکی گەورەی نایەوە!

* لە ڕۆژی ٢٥ /٩ / ١٩٨٦ دا، لێدانی هێزێکی ڕژێم لە پەنا قادر کەرەمی کەرکووک، بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٥٠ سەرباز و ئەفسەر!

* داستانی بەرگری (قەیوان ماوەت)، کە نزیکەی ١٠٠ ڕۆژ شەڕی خایاند و نزیکە ٨٠٠ چەکداری ڕژێمی تێدا کوژرا. لەو شەڕەدا، کە زۆربەی سەرکردە و فەرماندەکانی (یەکێتی) تیایدا بەشدار بوون، توانییان بە جۆرێ هێز و توانای خۆیان لە شەڕێکی جەبهەیی فراواندا نیشان بدەن، کە دوژمن بە هەموو توانا و بە بەکار هێنانی چەکە ئاسمانی و زەمینییەکانی خۆیەوە، نەیتوانی ڕێ لە سەرکەوتنی پێشمەرگە بگرێ! لەو شەڕانەدا چەندین لێپرسراو و فەرمانەدەی وەک (ملازم عومەر، کوسرەت ڕەسول، قادری حاجی عەلی و جەبار فرمان)، بەشدار بوون! یەکێک لە بیرەوەرییە تاڵەکانی ئەو نەبەردە، لەتەک شەهید بوونی دەیان فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمان و کوڕی ئازا و بە جەرگدا، کاک (کۆسرەت) لە نێرینەی شەڕەکاندا و لە جەبهەدا بوو، هەواڵی

بۆردومانی فڕۆکەکانی ڕژێمی لە سماقوڵی پێگەیشت، کە دوو ڕۆڵەی لێ فڕاند و جەرگی سوتاند! لەگەڵ ئەوەشدا دەیویست جەبهەکە بەجێ نەهێڵێ، تا هێنامانە ماڵی خۆمان لە یاخسەمەر و بە زۆر ڕازیمان کرد بگەڕێتەوە! ئیتر ئەویش لەگەڵ شەهید (ڕێباز و مامۆستا بەکر) گەڕایەوە بۆ سماقوڵی!

ساڵێک دوای ئاشتبوونەوەی هێزەکانی کوردستان، سەرەڕای نابەرابەرییەکی گەورە لەنێوان هێزەکانی دوژمن و هێزەکانی کوردستاندا، کەچی هێزی پێشمەرگەی کوردستان توانی دەیان چالاکی لە پانتایی کەرکووک و لە دەشتی هەولێر و لە دەشتی کۆیە و لە سلێمانی و لە گەرمیان ئەنجام بدات و لە ناوچەکانی بادینانیش بە هەمان شێوە! ئیتر ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و لە هەموو شوێنێک هێزی پێشمەرگە و چالاکییەکانیان بووبوونە ویردی سەر زمانی خەڵک!

* لە ڕۆژی ١٣ و ١٤/ ٤ / ١٩٨٧دا، لە داستانی ڕزگاریدا، گرتنی زیاتر لە ١١٢ ڕەبیە و ٤ فەوجی سەربازی و ٤ سریە و بارەگای سریە و زیاتر لە ١٨٠ دیل لە دوژمن گیران!

* لە شەوی ١٩ لەسەر ١٩٨٧/٤/٢٠ دا، بە هاوکاری (پارتی و حسک و حشع)، پەلاماری ناحیەی قەراخ درا و لەو نەبەردییەدا، جگە لە چەندین دەسکەوتی گەورە، سێ (زرێپۆش) یش، دەست کەوت بوو!

* لە ڕۆژی ٥/٢٥ / ١٩٨٧ دا، پەلاماری گوندی زڕگوێز درا، کە بووە هۆی کوشتنی نزیکەی ١٥٠ چەکداری ڕژێم!

* لە ڕۆژی ٢٥ /١٩٨٧/٥دا، هێزەکانی پێشمەرگە پەلاماری شاری (تەقتەق) یان دا، کە لە شاری کەرکووکەوە زۆر دوور نەبوو، زیاتر لە ٦٠ کەسی دوژمن کوژران!

* لە ڕۆژی ١٩٨٧/٥/٢٩ دا، هێزی پێشمەرگە، کە پێکهاتبوو لە تیپەکانی

مەڵبەندی ٤ و بەری کۆیە، پەلاماری شاری (تەق تەق) دەدەن و لە هەموو قوڵەکانەوە دەچنە ناو شارەوە و زەبرێکی کاریگەر لە دوژمن دەوەشێنن!

* لە رۆژی ١٩٨٧/٦/٣ دا، تیپەکانی مەڵبەندی چوار، پەلاماری قاتیعێکی جەیشی شەعبی دەدەن و دەیگرن، کە زیاتر لە ٢٠٠ پارچە چەک دەستکەوتیان دەبێ!

* لە رۆژی ١٩٨٧/٩/١دا، پەلاماری شارۆچکەی دێگەڵە درا، کە بووە هۆی گرتنی ٢ فەوجی چەکداری رژێم!

* لە رۆژی ١٩٨٧/٩/١٨ دا، پێشمەرگەکانی لقی یەکی (پارتی)، بە هاوکاریی پێشمەرگەکانی مەڵبەندی چواری (یەکێتی)، شارۆچکەی کانی ماسی ئازاد دەکەن و زیانێکی زۆر لە دوژمن دەدەن!

* لە رۆژی ١١/٨ / ١٩٨٧ دا، هێزی پێشمەرگە پەلاماری سەربازگەی چەرمەگا دەدەن!

* رزگار کردنی شاری هیران و پێنج رەبیەی گرنگ و گەورەی فەوجێکی سەربازی، یەکێ لە چالاکییە دیارەکانی ئەو ساڵە بوو!

* لە رۆژی ١٩٨٧/٩/٦ دا، شەڕی یانزە رۆژەی بەرگری لە دۆڵی سماقوڵی دەستی پێکرد، دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە و بە پشتیوانی تۆپخانە و فڕۆکەی جەنگی و هەلیکۆپتەر، پەلاماری دۆڵی سماقوڵی دا، بە مەبەستی گرتنی دۆڵەکە و بارەگاکانی مەڵبەندی چواری هەولێر! بەڵام بە فەرماندەیی (کوسرەت رەسول) و بەشداری سەرجەم تیپ و فەرماندەکانی مەڵبەند و بەشداری هێزەکانی (حیزبی سوسیالیستی کوردستان و حیزبی شیوعی و پارتی)، بە درێژایی یانزە رۆژ توانرا بەرگرییەکی گەورە بکرێت و دوژمن نەتوانێ سەرکەوتن بە دەست بهێنێ، تا بە شکاوی گەڕایەوە!

* گرتنی فەوجی دۆڵی ئاکۆیان!
* لە رۆژی ١٩٨٧/١١/١٢ دا، هێزەکانی مەڵبەندی چوار بە سەرکردایەتی (کۆسرەت رەسول)، پەلاماری (میشراق ) یان دا، کە دوور و جێگەیەکی گرنگ بوو!
* لە رۆژی ٢٨ /١ / ١٩٨٨دا، پەلاماردان و گرتنی (سەری رەش) لە چالاکییەکی کەم وێنەدا و بە سەرپەرشتی راستەوخۆی کاک (کۆسرەت)، زیانێکی گەورە لە دوژمن کەوت و پێشمەرگەش دەسکەوتێکی زۆری وەدەست هێنا، کە زیاتر لە ٣٠٠ پارچە چەک کەوتە بەر دەستی هێزی پێشمەرگە!

## پایزی قۆناخی خەباتی چەکداری سیاسی!

دوا بەدوای لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکووک و ئەو هەموو چالاکییە کرنگ و گەورانەی، کە پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، لە قوڵایی دەسەڵاتی رژێمدا لە دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی حکومەتی بەعسیان دەوەشاند، پێگە و سەنگی (یەکێتی)، تا دەهات لای کۆماری ئیسلامی ئێران بەهێزتر دەبوو! بۆ درێژەدان بەو پەیوەندییانە، رۆژی ١٩٨٧/١١/١٠ لەسەر بانگهێشتی لێپرسراوانی ئێران، (مام جەلال)، بە رێگەیەکی ناخۆشی دۆڵی سەفرەدا سەفەری کرد بۆ ئێران! ئێرانییەکان لەو بانگهێشتەی (مام جەلال)، وایان نیشاندا، کە دەیانەوێ پەیمانێکی دوو قۆڵی لەگەڵ ئیمزا بکەن، کە درێژە بە نەبەردەکانی شەڕ دژی حوکمی دیکتاتۆری (صدام)، بدرێ و هیچ لایەنێک بە تەنها، گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی عێراقدا نەکات !

لە ئێران (مام جەلال)، لەگەڵ سەرانی سوپا چەند رۆژێک خەریکی ئامادە کردنی رەشنووسی رێککەوتنێک بوو، کە تیایدا رێککەوون لەسەر

ئەوەی، کە هەر دوولا هاوپەیمانیی یەکتر بن بۆ خەباتی هاوبەش تا رووخاندنی رژێمی (صدام حسین)، بەمەش پشتیوانیی ئێران لە خەباتی گەلی عێراق و پشتیوانیی سیاسی خەباتی گەلی کورد بۆ هێنانەدی مافە نەتەوەییەکانی، بەردەوام بێت و هاوکات هیچ لایەک نەتوانێ بە تەنها لەگەڵ عێراق شەڕ رابگرێت و گفتوگۆ بکات! بەڵام ئێرانییەکان، هەر ئەمڕۆ و سبەیان بە (مام جەلال)، دەکرد و قسە کردنیان لەو پەیماننامەیە دوا دەخست! ئیتر، لەو ماوەیەدا بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشتن و لە تارانەوە (مام جەلال) چوو بۆ شام!

جەنگی (عێراق - ئێران)، لە ٢٢ /٨ /١٩٨٠ دا، دەستی پێکرد، تا هاوینی ساڵی ١٩٨٨، نزیکەی هەشت ساڵی خایاند! ئێران لەو جەنگەدا و لە سەدان شەڕی گەورەدا زەبری کاریگەری بە هێزەکانی عێراق گەیاند، بەڵام خۆشی زەبرێکی ئێجگار زۆری (مرۆیی، ئابووری، سەربازی) بینی و تووشی وێرانکارییەکی گەورە بوو! عێراق بە نهێنی و بە ئاشکرا، پشتیوانیی سیاسی و دارایی و تەنانەت سەربازیی ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتانی عەرەبی پێدەگەشت! لەگەڵ وڵاتی روسیاش چەندین پەیمانی هەبوو، بۆیە ئەویش پشتی بەر نەدەدا! بەڵام ئێران بەو ئەندازەیە پشتیوانی (دارایی و سیاسی و عەسکەری) ی نەبوو، ئیتر نیشانەکانی شەکەتی و ماندوو بوون بە نەبەردەکانی جەنگەکەیەوە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٨٧ وە دەرکەوت! باری ئابووریی بەتەواوی لاواز بووبوو، رۆکێت باران و هێزی ئاسمانی عێراق، مەترسییەکانی ئاسەواری جەنگیان گەورە تر کرد! چونکە رۆکێتە دوور هاوێژەکانی عێراق تا دەهات باشتر و وردتر ئامانجەکانیان دەپێکا، بەوەش شارە گرنگەکان و تارانی پایتەختی خستبووە مەترسیەوە! نەخشەیەک دارێژرا بۆ ئەوەی بە چەکی کیمیایی پەلاماری تارانیی پایتەختی ئێران بدرێت،

بەڵام بوونی تەلارە بەرزەکانی، کە بە شێوەیەکی ستونی بە ئاسماندا هەڵچو بوون، بواری دەدا بە خەڵکی سفیل، کە بچنە نهۆمە بەرزەکان و بە ئاسانی خۆیان لە گازی کیمیایی بپارێزرێن! چونکە ئەو گازە بەهۆی قورسیەوە کە توانای بەرزبوونەوەی نییە و لە نزمایی نەبێ کاریگەری نابێ، ئاڵۆزی بۆ نەخشەکە دروست کرد بوو! ئیتر رژێمی عێراق بیری لەوە کردەوە، کە بە رۆکێتی بەهێز و قورس لەو شارانە بدات تا بتوانێ شووشەی پەنجەرەکان بشکێنێ و بەوەش رێگە بکاتەوە بۆ بڵاوبونەوەی گاز لە ناو ماڵەکاندا! (حطام البوابە الشرقیە - وفیق السامرائی). بەو هۆیانەوە رەوتێک لە فەرماندە باڵا و ئاگادارەکانی ناو سوپا و حکومەت سەری هەڵدا بوو، کە ترس و دڵە راوکێیان لە درێژە کێشان و ئەنجامە ترسناکەکانی جەنگ هەبوو!

چاودێرە بە ئاگا نزیکەکانیش لەهەر دوولا، هەم لە ئێران و هەم لە عێراق هەستیان بەوە کرد بوو، کە توانای درێژە کێشانی نەبەردەکانی ئێران رووی لە کزی کردووە! لە عێراق (موکەڕەم تاڵەبانی)، کە سەردەمانێ بوو تێکۆشەرێکی ناو ریزەکانی حیزبی (شیوعی) بوو، کاتی خۆی وەزیر بوو ئاشنایەتیی خۆشی لەگەڵ (صدام حسین)، پاراستبوو ئاگاداری رەوتی رووداوەکان بوو! لە دڵسۆزی خۆی چەند نامەیەک بۆ سکرتێرەکانی (یەکێتی، پارتی، حسک و حیزبی شیوعی)، دەنێرێ و پێشنیاری دەست پێشکەریەکیان لێ دەکات بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا. ئەو نامەیەی بۆ (مام جەلال)، نووسرا بوو بە رێگەیەکی نزیک لە حیزبی (شیوعی)، رەوانە کرا بوو! بەهۆی ئەوەوە، کە (مام جەلال)، لە سەفەری ئێران و سوریا بوو لە وڵات نەبوو نە نامەکە گەیشتە دەست ئەو و نە کارێکیشیان کرد، تا بە ئێمە بگات! یەکێک لەو نامانە دزەی کرد بوو گەیشتبووە بەشی ئیتلاعاتی

پاسدارانی ئێران! هەر لەبەر ئەوە لەو سەفەرەدا ئێرانییەکان بە تایبەتی ئەو لایەنەی سوپا، کە سوور بوون لەسەر درێژە کێشانی جەنگ، دەیانویست لە ناخی (مام جەلال) بگەن، تا بزانن ئاخۆ هیچی ژێر بە ژێری لەگەڵ رژێمی عێراقدا هەیە، یاخود نا! ئیتر کەوتنە جێبەجێ کردنی پلانی تێکدانی ئەو پەیوەندییە، کە گومانیان لەسەری هەبوو! بۆیە گفتیان بە (مام جەلال) دا، کە یارمەتی دانی (یەکێتی)، زیاتر بکەن! لە کۆتایی یەکەمین مانگی ساڵی ١٩٨٨ و لە ١٩٨٨/١/٣٠ دا، ئێران بۆ یەکەمین جار و بە هەلیکۆپتەر لە بەرگەڵو، شاندێک بۆ سەردانی (یەکێتی)، هات و نیشتنەوە، شاندەکە لە قسەکانیاندا وتیان: دەمانەوێ پێتان بڵێین کە ئێمە لە دۆخەکە و لە وەزعی ئێوە دەگەین، بۆیە بڕیارە یارمەتی چەک و تەقەمەنیی تەواوتان بۆ بنێرین، بەڵام لەبەر زستانی سەخت و بەفری زۆری رێگا و بانەکان ناتوانین بە رێگەی زەمینیدا ئەو کارە ئەنجام بدەین، بۆیە بۆ دەست و برد کردن لە کارەکان بە هەلیکۆپتەر شتەکانتان بۆ رەوانە دەکەین! ئیتر لەسەر داوای ئەوان لە گەڵیان رێککەوتین، کە هاوئاهەنگی بکەین و جێگە و رێگەی پێویست و رێکوپێک بۆ نیشتنەوەی هەلیکۆپتەر و عەمار کردن و هاتووچۆ ئامادە و دابین بکەین! لە گەڕانەوەیاندا بە مەبەستی ئەو هاو ئاهەنگییە، من لە گەڵیان گەڕامەوە بۆ ئێران! هەر زوو چەند بارێکیان بە هەلیکۆپتەر نارد، لە نزیک بەرگەڵو و لە دۆڵێکدا هەلیکۆپتەرەکان دەنیشتنەوە، ئیتر هێندەی نەبرد ئەو ناوە بووە کاروان سەرای هاتوچۆی هەلیکۆپتەر! بارەکانیش شتی سەیر و تەقەمەنی کەم و ئازوقە و کەمپوت و قتو و کەرەسەی سەیر بوون، کە پێویست نەبوو! ئاخر کاتی بارکردنی ئەو شتانە لە ئێران، چونکە شتەکان پێچراوە بوون، ئەوا ئێمە نەماندەزانی ئەو کەرەسە سەیرانەیە، تا رۆژێکیان کاک (نەوشیروان)، ئاگاداری

کردین، ئیتر لە دواییدا تێگەیشتین، کە ئەو هەلایەی هەلیکۆپتەر هەر بۆ ترساندنی دەزگا هەواڵگرییەکانی عێراق بووە، تا رژێمی عێراقمان لێ بورووژێنن، ئەگەر قسەیەکی ژێر بە ژێرمان لەگەڵ عێراق هەبێت تێکی بدەن! بە راستی عێراقیش هاتوچۆی ئەو کاروانە زۆرانەی هەلیکۆپتەری ئێرانی بۆ ناوچەکەمان، بە ئەگەری نەخشەی شەڕێکی گەورە و کتوپڕی دەزانی، بۆیە ئەوانیش پەلەیان کرد لەو هێرشەی، کە بە نیاز بوون بۆ بنکەکانی سەرکردایەتی (یەکێتی)، ئەنجامی بدەن! رژێمی عێراق دەستی کرد بەجمووجۆڵ، تا دەهات زیاتر لوتکەی شاخ و شوێنی گرنگی لە ناوچەکانی مەڵبەندەکان دەگرت و شوێنی لە دەستی پێشمەرگە دەردەهێنا! لە سەرەتای ساڵی تازەوە و لە کۆتاییەکانی مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٨٨وە، عێراق جۆرێ لە دڵنیایی پەیدا کرد، کە ئیتر جەبهەکانی جەنگی عێراق بەرامبەر ئێران مەترسیی گەورە و جدییان لەسەر نییە و توانا سەربازییەکانی ئێران ترسناک نین! (صدام) و سەرکردایەتیی هێزەکەی کەوتنە تەگبیر لە جووڵانەوەی کورد و نەخشە دانان بە مەبەستی پەلاماردانی بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتی! بۆ ئەوەش بەرەبەرە هێزێکی زۆریان ناردە سلێمانی و هەموو گەورە فەرماندە و بەرپرسە بەعسییەکانی کاروباری باکووریان رژانە کەرکووک و سلێمانی و تەنانەت (علی حسن المجید) خۆشی هاتە ئەوێ!

* لە رۆژی ٢/٢١ / ١٩٨٨ دا، خڕ کردنەوە و گەلە کۆمەکێی هێزەکانی عێراق بە تەواوی ئامادە بوون بۆ هێرشەکەیان!

* لە رۆژی ٢٢/ ٢/ ١٩٨٨ دا، هێزەکانی عێراق دەستیان کرد بە بۆمبا باران و تۆپ بارانی خەست، بە چەکی کیمیایی و تیکەڵ!

یاخسەمەر و بەرگەڵوو!

ئاشنایەکمان چەند مانگێک بوو لە یاخسەمەر باری کرد بوو لە سلێمانی جێگیر بووبوو، جارو بار بۆ سەردان لەکاتی خزمەتی رەز یا ترێ چنینەوەدا دەگەڕایەوە بۆ یاخسەمەر! رازیمان کرد، کە تۆزێ دەسکاری خانووەکەی بکەین و چاکی بکەین و تێیدا دانیشین، خوا هەڵناگرێ دەستی بە روومانەوە نەنا! ئەو خانوەمان چاکرد، لە پشتی خانووەکەوە، کە بناری شاخەکە بوو، جێگەیەکیشمان بۆ بارەگای پێشمەرگەکان چاک کرد. چەند کونە تەیارە یەکیشمان لەناو خانووەکەدا و لە پشتەوەی بە کۆنکرێت دروست کرد! زۆری کەرەسەکانی ئەو خانووەم لە شیش و چیمەنتۆ بە هۆی هاوڕێی خۆشەویستم، کاک (حەسەنی شەرەفی)، کە لە مەکتەبی سیاسی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) بوو، پەیدا کرد، چاکەی ئەو هاوڕێیە هی لەبیرچونەوە نییە، بۆیە ئێستاش باسی دەکەم، ماڵ و منداڵم هەموو لەو خانووەدا بوو!

من بۆ خۆم لەو رۆژگارەوە، کە خەباتی شاخم هەڵبژارد و دوای ئازاد بوونم لە زیندان یەکسەر رووم کردە چیا بۆ لای هاوڕێکانم، لەگەڵ چەندین پێشمەرگەی ئازا و قارەمان ئاشنایەتیم هەبووە، لەگەڵیان ساردی و گەرمیم چەشتوە و رۆژی خۆش و رۆژی تەنگانەمان دیوە، تیایاندا بوو هەر زوو شەهید بوون، یا لە نەبەردێکدا بەشێ لە جەستەیان لە دەست دا، هەشیان بوو رۆژی ئازادی و راپەڕینیان دی و پاشان بەهۆی کارەساتی دڵ تەزێنەوە یا شەهید بوون یا کۆچیی دواییان کرد! بۆیە ئێستا پێم خۆشە وەک وەفایەک بۆ ئەوانەی کە رۆژگارێکی سەختمان پێکەوە گوزەراند، بەتایبەتی ئەو هاوڕێیانەی، کە لە دەستەکەی خۆمدا بوون، لایەک بکەمەوە و بۆ مێژوو دوو قسەیان لەسەر بکەم!

پێشمەرگەکانی دەستەکەم (مارف سیتەکی)، سەرپەرشتی دەکردن، کە

لە دەست درێژییەکی کتوپڕی (پاسۆک)دا لە شاربازێر، تەقەی لێ کرا و چاوێکی لە دەستدا و بە رێکەوت لە مەرگ دەربازی بوو، حەیف لەو ساڵانەی دواییدا بە رووداوی ئۆتۆمبیل گیانی لە دەستدا! یەکێکی تریان کوڕێک بوو بە ناوی (کەریم بەگ)، کە خەڵکی سەرچناری سلێمانی بوو، برای شاعیری لاو (قادر سەرچناری) بوو، لە شەڕەکانی قوڵی قزلەردا شەهید بوو! نازناوی (بەگ)ی کاک (کەریم)، لە رۆژگارەکانی خڕی ناوزەنگەوە سەری هەڵدا، ئاخر ئەو دەمە لە ترسی دەزگا ئەمنییەکان، تا نەتوانن پێشمەرگەکان بناسێتەوە و کەسوکاریان لە شارەکاندا بگرێت و بیانخاتە زیندانەوە، ئەوانەی دەهاتنە دەرەوە ناوەکانیانمان دەگۆڕی، رۆژێک لە کاک (کەریم)م پرسی.. ناوێک بۆ خۆت هەڵبژێرە. ئەویش وتی.. من بە هەموو تەمەنی باوکم و خۆم هەر زەحمەتکێش بووین، خۆ کفر نابێت لەمەودوا نازناوی (بەگ)م بەرکەوێت، ئیتر لەمەودوا پێم بڵێن.. (کەریم بەگ)! قوتەیەکیش لە شانی راستی بارەگاکەمان لە ناوزەنگ هەبوو، کە شوێنی (حەرەسیات) بوو، لەبەر خۆشەویستی ئەو لە ناو پێشمەرگەدا تا ئێستاش پێی دەوترێ قوتەی (کەریم بەگ)! ئەو لاوە شەهیدە نموونەی رەوشتی بەرز و خاکی بوون و ئازایەتی بوو! دوو کوڕی تریش هەبوون، بەناوی (هوشیار و سالار)، کە هەر دووکیان پورزای خۆم بوون، دوو کوڕی گورج و گۆڵ و ئازا بوون، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی ترماندا، کە ناوی (کامیل سابیر) بوو، کوڕێکی روو خۆش و خۆشەویست بوو، برای هونەرمەندی ناسراو (کەمال سابیر) بوو، حەیف هەر سێکیان لە کوردستانی باکوور بە دەستی سوپای تورک شەهید کران! (وەستا عەبدول)، پێشمەرگەیەکی وریا و ئازا و دڵسۆز بوو، لەبەر ئەو ئاکارە جوانانەی ماوەیەک لە هێزی پاراستنی (مام جەلال) دانرا. یەکێکی تریشیان ناوی (کەمال) بوو، ئێستا

فەرماندەیەکی باشی هێزی پاسەوانی سنووره! (خالیدی مەلا قادر)، یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی، کە خزمی خۆم بوو، کوڕێکی دڵسۆز و چاو نەترس بوو، خۆشبەختانە ماوە و ئێستا بەڕێوەبەری بانکی نیشتەجێبونە! یەکێک لە پێشمەرگە نایابەکانی تر، کە قاچێکی پەڕیوە، ئێستا بەڕێوەبەری ئاسایشی قەزاکانە و ناوی (عومەر ئاوە کورتێی) یە! پێشتریش کوڕێکی چاکمان لەگەڵ بوو ناوی (ئازادی حاجی عەبدوڵا) بوو، ئەویش نموونەی پیاوی بە هیمەت و دڵسۆز بوو! کوڕێکی باشیش هەبوو ناوی (عەلی مەحمود)بوو، کە بە (عەلی بوڵە بۆڵ) ناسرا بوو، هاتە جێگەکەی ئەوو ماوەیەکمان پێکەوە گوزەراند! کاک (زاهیر غەریب)، کە ئێستا لە بواری شانۆدا کار دەکات و لە تەلەفزیون بەرنامەی پلار ئامێزی هەیە، یەکێک بوو لە پێشمەرگە چاکەکان! (ئاراسی حەمە زرگوێزی و سەیوان و نەبەز و نەورۆز)، لە کوڕە نایابەکانی (حەمە زرگوێزی)، بوون و هەموویان لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەر بوون! چەند هاوڕێیەکی ترمان هەبوو بە ناوەکانی (وەستا شیروان، یاسینە رەش، کەمال شێخە، کەمالی گورچیلە، سەرداری وەستا عەبدول)، هەموو ئەو کوڕانە پێشمەرگە بوون و کوڕی ئازا و خەمخۆری (کۆمەڵە و یەکێتی)، بوون و لە رۆژگارێکدا چەکی مەردایەتییان کردبووە شان، کە کورد واتەنی جادەکەی زۆر تەسک بوو!.

(ئاراس)، نەوسن بوو، ئەو کاتانەی کە لە شارەوە خواردنێکی خۆشمان بۆ دەهات، دا دەنیشت دوعای دەکرد و دەیوت: خوایە زوو تێری لێ نەخۆین! برا گەورەکەشیان، (سەیوان) کە ئێستا لێپرسراوێکی بە توانای مەشقی هێزی تایبەتە، لە رۆژگاری ناوزەنگ لەگەڵ (کەریم بەگ و شەماڵی بەهجەت کابان)دا، لە پێشمەرگە و کادیرە نایابەکانی ئێمە بوون لە (ناوەندی کۆمەڵە)! چەند هاوڕێیەکی تریشمان هەبوو،

کە ئەوانیش هەموو پێشمەرگە و کوڕی ئازا و بە جەرگ بوون، لەوانە (هیوا حەمە شەریف، عوسمانی مەلا داود، سەید مەحمودی گەلاڵی، شێرزادی بێتەل، عەلی وەستا ئەحمەد)، کە برایەکی ئەفسەریشی لە شۆڕشی ئەیلولدا شەهید بوو! هەموو ئەوانە پێشمەرگەی دڵسۆز بوون، کوڕی ئازا و لەخۆ بوردوو بوون! (دلاوەر و نەهرۆ)، کە دوو برا بوون، نموونەی کەسانی رەوشت بەرز و خەڵکی بە هیمەت بوون! (دلاوەر) یان، ئێستا فەرماندەیەکی ناسراوی هێزەکانی پۆلیسە لە سلێمانی! چوار پێشمەرگەی تر بە ناوەکانی (شیروان و سۆران و ئارام و ئاری)، هەبوون، کە خزمی خۆم بوون و لە پێشمەرگە باشەکانی ئەو رۆژگارە بوون، کە بەداخەوە زۆر ئاگام لە هەواڵیان نەماوە! (عومەرە سوور)، کە ئێستا لە سویدە، ئەویش کوڕێکی ئازا و بەهیمەت بوو! (کامەران)ی براشم یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵ خۆمدا بوو، لەگەڵ (رازاو)ی خێزانیدا لە بۆردومانی گوندەکەدا کەوتنە ژێر دار وبەردی خانوویی روخاوەوە و بە سەلامەتی رزگاریان بوو! (کامەران)، پێشمەرگەیەکی بە پشوو بوو لەگەل (خۆشناو)ی برامدا لەگەڵم بوون. لە زۆربەی رووداوەکاندا بەشدارییان کردووە! (کاروان)ی براشم کە کاری بێتەلی بۆ دەکردم، پێشمەرگەیەکی هوشیار و زیرەک بوو ئێستا مامۆستای کۆلیجی یاسایە! دوو هاوڕێی تر بە ناوەکانی (بەرزانی قالەی خەڵوز و شەماڵی بەهجەت کابان)، ئەو دوو پێشمەرگەیە بوون، کە سەر بە بارەگاکەمان بوون و هەر دووکیان ژووریان هەبوو خەریکی کاری کۆکردنەوەی زانیاری بوون! (شەماڵ) کاروباری چاپەمەنی و راگەیاندنی (کۆمەڵە)ی دەکرد! ئەو دووانە پێشمەرگەی بە هیمەت بوون، بەلام (شەماڵ)، تۆزێ دڵی ناسک بوو جارو بار تووڕە دەبوو! (ناسری شاکەرەم)، کە پێشمەرگەیەکی تر بوو، دەنگی خۆش بوو ماوەیەک

لـە گەڵمـان بـوو، ئیتـر دوورکەوتـەوە و دابـەزی بـۆ تیپەکانـی خـوارەوە! کوڕێکـی بـە توانـاو ئازامـان لەگەڵـدا بـوو، بـی کـەی سـی کار بـوو، زۆر کوڕێکـی دڵسۆز بوو، لە رووداوێکدا شـەهید بوو! زۆری کەشمان لەگەڵ بوون، کە ماوەیـەک لـە گەڵمـان دەبـوون و دواتـر دەچوونـە تیپەکانـی تـر! (سـالار)ی براشـم گەرچـی کادر بـوو لـە دیـوی قزلـەر، بـەڵام هەمیشـە وەک پێشـمەرگەی بارەگاکـە وابـوو، سـاڵانی پێشـووتر وەک کوڕێکـی ئـازا و ژیـر و لـە رۆژە سـەختەکاندا لەگـەڵ (شـەماڵی بەهجـەت کابـان)دا، زۆر خزمەتـی بارەگاکەیـان و کاروبـاری (ناوەنـدی کۆمەڵـە) یـان دەکـرد!

لـەو بارەگایـەدا دەیـان کۆبوونـەوەی گرنـگ کـراوە، هاوڕێکانـم (کوسـرەت رەسـول، ئـازاد هەورامـی، حەسـەن کوێسـتانی، دلیـری سـەید مدجیـد، عەبدولـرەزاق، ریبـاز، مامۆسـتا بەکـر، جەبـار فرمـان، سـەفین، جوامێـر و شـیخ جەعفـەر و حامیـدی حاجـی غالـی و کاک مسـتەفا چـاو رەش)، هـەر هەموویـان تێیـدا بەشـدار بـوون! کاتـی نەبـەردەکان بـۆ پشـوودان و سـەردان و بـاس و خـواس و تەگبیـر دەهاتنـە ئـەوێ. لەوێـدا گەلـێ جـار تووشـی تـۆپ بـاران و بۆردومانیـش دەهاتیـن، بـە داخـەوە ماوەیەکیـش لـە رووداوەکانـی (ئـاڵای شـۆڕش) دا، مامۆسـتا (پشـکۆ)، لـەو شـوێنەدا دەسـت بەسـەر بـوو!

جارێـک کاک (کۆسـرەت و مامۆسـتا بەکـر) و هاوڕێکانـی هێزەکانـی هەولێـر، هەمـوو لـە ماڵمـان میـوان بـوون، فڕۆکەیـەک هـات و هیـچ بۆردومانـی نەکـرد، تەنهـا بـە دووکەڵەکـەی خەتێکـی کێشـا، خێـرا پێـم وتـن: برادەرینـە سبەی ئێرە بۆردومـان دەکرێـت، هوشـیاری خۆتـان بـن! رۆژی دوایـی لەگـەڵ کاک (شـێخ جەعفـەر)، لـە سـەردانی جەبهـە بوویـن زانیمـان، کـە گوندەکـە و ماڵـی ئێمـە بۆردومـان کـراوە و هەنـدێ لـەو هاوڕێیانـە و مامۆسـتا (بەکـر)، هێشـتا لـە ماڵـی ئێمـە بـوون، گوندەکـەش

ئاگری تێبەر بووبوو. لەگەڵ (شێخ جەعفەر)، بە پەلە گەڕاینەوە یاخسەمەر بۆ لای هاوڕێکان و منداڵەکانم، روانیمماڵمان و گوندەکە بە سەر یەکدا داڕوخاوە و ئاگری تێبەر بووە، هاوڕێم (ملازم عومەر) بە پەلە گەیشتە سەر شوێنەکە و کە بۆی دەرکەوت شکور سەلامەتن، نوکتەیەکی خۆشی بۆ رێکەوتبوو!

نوکتەکەش ئەوە بوو (مام جەلال)، لە (ملازم عومەر)ی پرسیبوو: کاک (عومەر) ئەوە وەزعی (فەرەیدون)، لەو ماڵ سووتان و بۆردومانەدا چۆنە! ئەویش بە هێمنی وتبوی: وەڵا (مام جەلال)، (پاکیزە خان)ی خێزانی بۆ ماڵەکەی و شتەکانی دەگریا و (فەرەیدون) یش بۆ ئەوەی، کە (پاکیزە)خان بە سەلامەتی دەربازی بووە! ئیتر (مام جەلال) لەو رووداوە ناخۆشەدا بەو نوکتەیەی (ملازم عومەر)، زۆر کەوتبووە پێکەنین! من بۆ خۆم بەو قسەیەم نەزانیبوو لە دواییدا (مام جەلال)، خۆی بۆی گێڕامەوە! (مام جەلال)، ئاگاداری هەموو نوکتە و کەتنەکانی (ملازم عومەر) بوو، هەمیشە بە دڵی پاکەوە بۆی دەگێڕامەوە! بۆ خۆشی هەوڵی دەدا، بەجۆرێ کەتن و پەندەکانی ئەوم بۆ بگێڕێتەوە، کە درزێک لە نێوانماندا دروست بکات، بەڵام سوودی نەدەبوو! جارێک پاش شەڕەکانی قەندیل لە ساڵی ٢٠٠١دا، (مام جەلال)، زانی زۆر ماندوو بووم، مۆڵەتێکی پێدام بۆ دەورەیەکی فێربوون لە ئەمریکا، پاش دەورەکە خێزانەکەشم ببەمە لەندەن! هێشتا چوار رۆژ بوو لە پشووەکەمدا بووم، (ملازم عومەر) فرسەتی لە تەلەفۆنە تایبەتەکی (مام جەلال)، هێنا بوو بە ناوی (مام جەلال) ەوە داوای لە نوێنەری لەندەنمان کرد بوو، کە ئاگادارم بکات بە پەلە بگەڕێمەوە چونکە شەڕە و دەبێت زوو ئامادە بم. بە جۆرێک بە پەلە گەڕامەوە خەریک بوو لەسەر ئەو گەڕانەوەیە لەگەڵ خێزانەکەشمدا تێک بچم! کە هاتمەوە

پاش ماوەیەکی زۆر ئەنجا (مام جەلال)، سوێندی خوارد، کە ئاگای لەو تەلەفۆنە نەبووە و ئەوە کەتنی کاک (عومەر)، خۆی بووە!

لە چالاکییەکانی ناوچەکانی قەراخ و گەرمیان و هەورامان و شارەزوور و شارباژێڕدا کۆمەڵێ فەرماندەی هەڵبژاردەی ئازا و قارەمان رۆڵی کاریگەریان نواند لە گەرم کردن و پەرەپێدانی چالاکییەکانی ئەو ناوچانەدا لەوانە (جەعفەر شیخ مستەفا، عوسمانی حاجی مەحمود، شەهید حەمەرەش، مەحمود سەنگاوی، عادل شکور، مامۆستا جەلال، حامیدی حاجی غالی ، شەوکەتی حاجی موشیر، ئاوات قارەمانی ، وەهابساڵح، شۆڕش ئیسماعیل، ئازاد حەمە غەریب، مامۆستا جەمال، حەمە هەژار، عەلی چوارتایی، مام رۆستەم، محەمەدی حاجی مەحمود، ئەنوەر دۆلانی، عەدنانی حەمەی مینە، بەکری حاجی سەفەر، سلیم ئاغا، حەمەی وەتمان، رەسول حاجی شێخە، هیمنە رەش، حەمەی حەمە سەعید، مامۆستا شاهۆ ، عبدالرحیم، رابەری سەید برایم و بابە تایەر شەهید سالار و دەیان فەرماندەی دلێری تر، کە رەنگە ئێستا هەموو ناوەکانم لە بیر نەبێت! لە چالاکییەکانی سەرکردایەتی و بەری مەرگەو دوکان و سورداش و خاڵخالان و دەشتی کەرکووک، رۆستەم کەرکووکی، مەلا ئاراس، عەلی بچکۆل، غەریب سەعید، دانا ئەحمەد مەجید، سیروان کوێخا نەجم، لەو هاورێ و فەرماندانە بوون، کە نموونەی کەسانی خۆنەویست و قارەمان بوون!

## داستانی رزگاری!

لە ساڵی ١٩٨٦ دا و لە گەرم بوونی بەرەکانی جەنگی (عێراق - ئێران) دا، حکومەتی عێراق و سوپاکەی بە سێ مانگ شەڕی بەردەوام، کە بە شەڕەکانی (قەیوان - ماوەت) ناسرا بوو، توانی کۆنترۆڵی ژمارەیەکی زۆر قوتە و ملەی شاخ و شوێنی گرنگی ناوچەکە بکات و چەند شاخێکی ستراتیژیش بخاتە ژێر دەستی هێزەکانی خۆیەوە! ئێمەش ماوەیەک بوو لە سەرکردایەتی لە بیری ئەوەدا بووین، کە چۆن ئەو شوێنانە هەمووی لە دەستی رژێمی عێراق دەربهێنین و ئارامییەکی زیاتر و دڵنیایی بۆ ناوچەکە و سەقامگیری سەرکردایەتی مسۆگەر بکەین!

ئێران و فەرماندەکانی لە چەند سەردانێکدا باسیان لەوە دەکرد، کە لە بەرەکانی کوردستانیشەوە نەبەردێکی گەورە ئەنجام بدەن، تا لە پرۆسەی جەنگەکەدا لە باشوور و لە باکوری عێراقەوە و هاوکات و هاو ئاهەنگ لە یەک کاتدا، تەنگ بە رژێمی (صدام حسین)، هەڵچنن! ئێمەش بە باشی لەو پێشنیارەمان کۆڵیەوە و بە هەلێکی باشمان زانی،

کە بە نەخشـەیەکی سـەربازی ڕێـک و پێک ڕزگار کردنی ناوچەکە هـەر لـە سنوورەوە تـا دەگاتـە شـاخی ئەزمـەڕ و گۆیـژە بخەینـە بەرنامـەی ئەو کارەوە و گـەر توانیشمان، ئەوا لـە هەنگاوەکانی داهاتـودا سلێمانیش بخەینـە نەخشــەی ڕزگار کردنـەوە! ئێرانییـەکان وایـان نیشـان دا، کـە هـاوکاری دەکـەن و لانـی کـەم ئـەوان پەلامـاری شـاخێکی گـەورە و عاسـی وەک شـاخی (گمـۆ) دەدەن و ئیتـر هەمـوو ناوچەکانـی چوارتـا و مـاوەت بـە یەکجـاری ڕزگار دەبێت!

کات و سـات و ئەرکـەکان دیـاری کـران، کـە لـە ئێـوارەی ١٣ لەسـەر ١٤/٤/ ١٩٨٧ دا، هێرشـەکە دەسـت پـێ بـکات! لەگـەل یەکەمیـن تاڵەکانـی ڕووناکیـدا هێـزی پێشـمەرگە زۆربـەی ئـەو شـوێنانەی کـە بۆیـان دیـاری کـرا بـوو گرتیـان! شـاخی (گمـۆ) و هەمـوو ئـەو هێزانـەی عێـراق، کـە لەسـەر شـاخەکە بـوون، کەوتبوونـە پشـت شـوێنی هێـزی پێشـمەرگە! ئیتـر بـە هیـوای ئـەوەی، کـە هێزەکانـی ئێـران پەلامـاری دەدەن و دەیگـرن و بەمـەش پشـتی پێشـمەرگە ئەمیـن دەبێـت، لـە چاوەڕوانیـدا بوویـن! کەچـی هێزەکانـی ئێـران نەجـووڵان و هیـچ هاوکارییەکـی هێزەکانـی ئێمەیـان نەکـردا!

ئـەو شـوێنانەی، کـە هێـزی پێشـمەرگە هێرشـی بـۆ دەکـردن زۆر فـراوان بـوون، کـە نزیکـەی ١١٢ تـا ١١٨ ڕەبیـە و ٨ بـارەگای فـەوج و سـریەی تێدا گیـرا! ئیتـر هـەر لـە شـاخی (گۆیـژە و ئەزمـەڕ و گـەرووی ئەزمـەڕ و جادەکـەی قەیـوان و ڕێگـەی دووکانیـان و کارێـزە و شـاخی بایـز بەگـی شـانی کارێزە و زنجیرە شـاخەکانی دوو بـرا و خەجە لەرزۆک و کۆرەنگ و لای ولاخلـو و حەسـەن بـەگ و گوجـار و دۆڵـی گـەلاڵ و دۆڵـی سـەفرە و زەروونـەوە تـا دەگەیشـتە مـاوەت)، هەمـووی لـە هێزەکانـی دوژمـن پـاک کرانـەوە و کەوتنـە بـن دەسـتی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان!

حکومەتی عێراقیش هێزیکی زۆری هێنا و لە سلێمانی خڕی کردنەوە بە نیازی ئەوەی هێرشی بەر پەرچ بداتەوە! (نزار خزرجی)، خوی و فەیلەقی یەک و سەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق، فەریق (سعدی عزیز) و جێگرەکەی فەریق (سابت سولتان) و بەرێوەبەری گشتی هەواڵگری سوپای عێراق لیوا (سابیر الدوری) و هاوکات (عبدالجبار شنشل)، وەزیری کاروباری جەنگ و پاشان (عزت دوری و علی حسن المجید)، هەموو لە سلێمانی کۆبوونەوە بە مەبەستی دانانی نەخشەیەکی سەربازی و پەلاماری هێزی پێشمەرگەی کوردستان بدەن! لە پێشدا بە فڕۆکە و تۆپی دوور هاوێژ تۆپ بارانی خەستی ناوچەکەیان کرد و بە تەقەلایەکی زۆر و شەڕێکی گەورە، ئینجا توانییان لای کارێزە بگرنەوە بەبێ ئەوەی بتوانن شاخی ماوەت و قەشان بگرن! ناچار لیوا روکن (کامیل ساجید و حکم حسن تکریتی)، کە دوو لیوای هێزی تایبەتی گاردی کۆماری بوون، لە بەغداوە هاتن، بێ ئەوەی بتوانن سەرکەوتنێکی بەرچاو بە دەست بهێنن، گەڕانەوە بۆ بەغدا! لەو شەڕانەدا فەرماندەی لیوای ٦٠٥ بە دیل گیرا، فەرماندەی فیرقەی ٤٤ لیوا روکن (جاسم محمد صالح) و چەندین ئەفسەری گەورەش کوژران، هەر لەو ماوەیەشدا فەرماندەی فیرقەی ٢٤ (زوهیر یونس)، بریندار کرا! داستانی (قەیوان ماوەت)، نەبەردییەکی گەورەی پێشمەرگەکانی (یەکێتی) بوو، بۆیە جەنەراڵ (نزار خزرجی)، لە کتێبی (الحرب العراقیة - الایرانیة ١٩٨٠ - ١٩٨٨)، بە درێژی باسی ئەو نەبەردییە دەکات!

## شەڕەکانی ئەنفال بۆ لە ناوبردنی کورد!

لە مانگەکانی ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧ و لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٨٨ دا، ڕژێمی عێراق لەلایەکەوە زیاتر هەستی بە باڵا دەستی خۆی لە جەنگی (عێراق - ئێران) دا، دەکرد و لەلایەکی تریشەوە هەستی بە مەترسیی چالاکییە گەورە و بەرفراوانەکانی هێزی پێشمەرگە دەکرد! بۆیە بە نەخشەیەکی ڕەش دەستی کرد بە جموجۆڵ و بەمەش تادەهات زیاتر لوتکەی شاخ و شوێنی گرنگی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی (یەکێتی)، دەگرت و شوێنی گرنگی لە دەستی پێشمەرگە دەردەهێنا!

ئیتر لە سەرەتای ساڵی نوێوە و لە کۆتاییەکانی مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٨٨ دا، عێراق جۆرێک دڵنیایی لەوە پەیدا کرد، کە ئیتر جەبهەکانی جەنگی عێراق بەرامبەر ئێران مەترسیی گەورە و جیددییان لەسەر نەماوە و و تواناکانی ئێران ناتوانێ وەک جاران ببێتە هەڕەشە بۆ سەر سوپا و هێزەکەی! (صدام) و سەرکردایەتیی هێزەکەی کەوتنە تەگبیر لە جووڵانەوەی کورد و دانانی نەخشەی چڕوپڕ و

بـه هێـزی گـەورەوە بـۆ پەلاماردانـی بنكـە و بارەگاكانـی سـەركردایەتیی (یەكێتـی)! بـۆ ئەنجامدانـی ئـەو نەخشـەیەش بەرەبـەرە هێزێكـی زۆریـان نـاردە سـلێمانی و هەمـوو گـەورە فەرمانـدە و بەرپرسـە بەعسـییەكانی كاروبـاری باكووریـان ڕژانـە كەركـووك و سلێمانی و تەنانـەت (علـی حسـن المجیـد) و سـەرۆكی ئەركانـی سـوپا و پاشـان (عـزت دوری)، هەموویـان لـە سـلێمانی خـڕ بوونـەوە!

لـە ڕۆژی ١٩٨٨/٢/٢١ دا، گەلـە كۆمەكێـی ڕژێمـی عێـراق بـۆ لـە ناوبردنـی جووڵانـەوەی كـورد دەسـتی پێكـرد و یەكەمیـن زنجیـرەی ئـەو هێرشـەش بۆ لـە ناوبردنـی سـەركردایەتیی (یەكێتـی نیشـتمانی كوردسـتان) بـوو، كـە لـە مێـژووی ڕەشـی بەعسـییەكانی عێراقـدا ئـەو هێرشـانە بـە شـاڵاوەكانی (ئەنفـال)، ناسـراون! ڕژێـم یەكەمیـن جـار بـۆ سـەركردایەتیی (یەكێتـی) و (هەڵەبجـە) و دواتریـش بـۆ سـەر مەڵبەنـدی یەكـی (یەكێتـی) و ناوچەكانـی سـنووری ئـەو مەڵبەنـدە، دەسـتی پێكـرد! ئەنجـا بۆ سـەر دەڤـەری ئاغجەلـەر و گۆپتەپـە و نـاو شـوان و بـۆ كۆیـە و تەقتـەق و لەوێشـەوە بـۆ سـەر هێـز و بارەگاكانـی مەڵبەنـدی هەولێـر و باڵەییـان و دواتریـش بـۆ شـاخی كونـە كۆتـر و بنـاری قەندیـل و دوا ئەنفالیـش ڕووی كـردە ناوچەكانـی بادینـان! ئـەو شـاڵاوانەی ئەنفـال بـە تەنهـا ڕووی نەدەكـردە لەنـاو بردنـی هێـزی پێشـمەرگە، بەڵكـو بـۆ تـاڵان كـردن و لـە ناوبردنـی مـەڕ و مـاڵات و ئاژەڵ و كانـی و كارێـز و ڕەز و بـاخ و بێسـتان بـوو! بۆ تەخـت كردنـی گوندەكان و شـارۆچكەكانی كوردسـتان بـوو، بـۆ سـووتماك كردنـی خاكـی بـوو بـە چەكـی كیمیایـی و بـە فڕۆكـەی جەنگـی و تـۆپ و تانـك و ڕۆكێـت! ئـەو شـاڵاو و پەلاماردانـەی ڕژێـم، كـە بـە نـاوی (ئەنفـال) ەوە نـاوزەدە دەكـرا، مەبەسـت و شـێوازەكەی لـە سـوورەتێكی قورئانـی پیـرۆزەوە وەرگیـراوە، كە كاتی خـۆی و لە سـەردەمی سـەرەتاكانی ئیسـلامدا بۆ شـەڕی كافرەكان

تەرخان کراوە و بۆ بەرز کردنەوەی دەسەلات و شکۆی ئاینی ئیسلام دژی کافرە بێ باوەڕەکان بەرپا کراوە! رژێمیش بۆ حەلال کردنی سەر و مالی گەلەکەمان، کوردی خستبووە خانەی کافرانەوە و خۆشیانی بە لەشکری ئیسلام و پەیامەکەیشی بە گەیاندنی پەیامەکەی (محەمەد)، لە قەلەم دا بوو!

یەکەم ئەنفال لە رۆژی ۲۱ و ۱۹۸۸/۲/۲۲ دا، دەستی پێکرد: هێزەکانی عێراق بە تەواوی ئامادە بوون بۆ هێرشەکەیان و دەستیان کرد بە تۆپ باران لە پشتی قزلەر و قەیوان. پاش ئەوەی رژێمی عێراق هێزێکی گەورەی لە هێزەکانی هەر دوو فەیلەقی یەک و پێنج و فەوجەکانی جاش کۆکردەوە، بە پشتیوانیی فڕۆکەی جەنگی و هەلیکۆپتەر دەستی کرد بە نمایشی هێزەکانی خۆی، ئیتر نەخشەکەی دەرکەوت، کە رژێم دەیەوێ لە چوار قۆلەوە هێرش بکات :

* لە ناوچەکانی دوکان و سووسێوە، سەرەتا بە تۆپ باران هەول دەدات بەرزایی و هێزەکانی شاخەکانی هەلاج و دابان و هەموو زنجیرە شاخی چەرماوەند، کە پارێزگاری لە قومەرغان و قەمچوغە و سەرگەلوو و بەرگەلوو و شەدەلە و هەلەدن و یاخسەمەر و چۆخماخ و قزلەر دەکات، بخاتە ژێر چنگی خۆیەوە و بەوەش ئەو هێزانەی، کە پاراستنی شوێنە ستراتیجییەکانیان گرتبووە ئەستۆ، هەراسان و بێ توانایان بکات و پەکیان بخات! شاخی سارا و پیرە مەگرون ، ئەنجا دوایی هەول بدات لوتکە گرنگەکان بگریت!

* لە کارێزە و قەلاچوالانەوە روو بکاتە گاپیلۆن و بالخ و گەرەدێ و ولاخلو و گۆمە زەل!

* لە ماوەتەوە بەرە و دۆلی سەفرە و زەروون و شاخی گردە رەش و زینۆی سپی و برزوت و بالۆسە وە مل بنێ!

* لە مەرگەوە بۆ کانی توو و شاخی ئاسۆس و بنگرد و لەویشەوە بۆ شاخی گوجار و ژیلوان، هێرش بەرێ!

لە ١٩٨٨/٢/٢١ وە، هێزەکانی عێراق دەستیان کرد بە بۆمبا باران و تۆپ بارانی خەست، بە چەکی کیمیایی و تێکەڵ لە سەرگەڵوو و بەرگەڵوو و گوێزیلە و یاخسەمەر و لە زۆر شوێنی ناوچەکەیان دا! هێزەکانی مەڵبەندەکان و لێپرسراوەکانیان بە درێژایی شاخ و بەرزاییە گرنگەکانی ناوچەکە، شوێنەکانی بەرگرییان قایم کرد، بە سەرکردایەتی کاک (نەوشیروان) و یارمەتیی چالاکانەی (ملازم عومەر)! لە قوڵی پشتی شاخەکانی شەدەڵە و سەرگەڵویشەوە بەرە و بەرزاییەکانی قەمجوغە بە سەرپەرشتی کاک (کۆسرەت و حەسەن کۆیستانی) و چەندین فەرماندەی وەک (رێباز و مامۆستا بکر و شەهید عبالرزاق و عەبدوڵا بۆر و شاخەوانی شەهید و کاک قادری حاجی عەلی و سامان گەرمیانی و مەحمود سەنگاوی و کاک رۆستەم)، هاوکارییان کردن! بە پانتایی دامێن و بەرزاییەکانی گاپیلۆندا بۆ گەڕەدێ و باڵخ و گەورەدێ، لای راستیشیانەوە کاک (بەکری حاجی سەفەر و شێخ جەعفەر و حامیدی حاجی غالی)، لە مالوومە بۆ لای دۆڵە روت و پشتی قزلەر و خەجە لەرزۆک و دووبرا. خوالێخۆش بوو (جەبار فرمان)، بە یارمەتی (علی بچکۆل)، لە قوڵی مەرگەوە تا لای سێدەرو قەرەنگوێ! هەموو ئەو سەرکردانە و فەرماندە و بە تەواوی هێزەکانی پێشمەرگەوە لەو ناوچەیەدا، نزیکەی چوار هەفتە بەرگرییەکی کەم وێنە و قارەمانانەیان ئەنجامدا! بەرگری لە بەرانبەر هێزەکانی پیادە و میکانیکی یەک فەیلەق سەرباز و دوو لیوای گاردی کۆماریدا بە تۆپخانە و چەکی کیمیایی و فرۆکەی هەمە جۆری جەنگییەوە، ئەو بەرگرییە بۆ پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، لەو رۆژگارەدا داستانێکی کەم وێنە بوو!

هەرچەندە هەر لە سەرەتای ئالۆز بوونی دۆخەکەوە، من رەوانەی ئێران کرام بۆ هاوئاهەنگی و پەیدا کردن و ناردنی چەک و تەقەمەنی و کاری لۆجستی بۆ بەرەکانی بەرگری!

هێشتا لە ئێران خەریکی جێ بەجێکردنی ئەو کارانە بووم، کاک (نەشیروان)، جوابی بۆ ناردم بچم لە گەڵ کاک (شەوکەت و حامیدی حاجی غالی)، هاوکاری بکەم، چونکە خۆی جوابی بۆ ناردوون، کە نەخشەی هەڵەبجە پێش بخەن و شەڕێک لە قۆڵی هەڵەبجەوە دابمەزرێت و کارێکی وا بکرێت، کە بتوانێت گوشاری هێرشەکەی عێراق بۆ سەر سەرکردایەتی کەم بکاتەوە، تا عێراق ناچار بکرێت هەندێ لە هێزەکانی بکێشێتەوە بۆ ئەو قۆڵەی هەڵەبجە! کاک (دکتور فوئاد مەعسوم)، بە راسپاردەی برایانی مەکتەبی سیاسی نامەیەکی بۆ ناردم، کە من لە رووی سیاسییەوە سەرپەرشتی بکەم، کاک (نەوشیروان) یش کاک (شەوکەت)ی ئاگادار کردۆتەوە جارێ لە سەقز بمێنێتەوە و نەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی خەریکی قۆڵی هەڵەبجە بێ! بە پەلە خۆم گەیاندە لای کاک (شەوکەت) و ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ باس کرد و پێم وت: راستە نەخشەیەکی گەورە هەبوو لە قۆڵی قەلادزێوە کارێکی گەورە بکرێ ئەنجا لە قۆڵی هەڵەبجەوە هێرشێکی تر بکرێتە سەر دوژمن و شاری سلێمانی رزگار بکەین، بەڵام ئێستا هێرشی رژێم بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی هێندە بەربڵاو و سەختە دەبێ ئەو نەخشەیە دوانەکەوێت، بۆیە رای کاک (نەوشیروان) و مەکتەبی سیاسی وایە، کە ئەوەی هەڵەبجە پێش بخرێت! ئێوە دەمێکە خەریکی کۆکردنەوەی زانیارین بۆ هێرشی ئەو قۆڵەی هەڵەبجە! خۆیشت باش دەزانی، کە هەڵەبجە دوورە لە سەرکردایەتییەوە و نەخشەی راکێشانی هێزی دوژمن بۆ ئەو ناوە، هێزی دوژمن پەرت دەکات و لە

سەرکردایەتی دووری دەخاتەوە! ئەویش وتی.. نامەیەکی دکتور (فوئاد مەعسوم) یش هەیە لەو بارەیەوە، بەلام دەبێت من خۆم فەرماندەکانی (یەکێتی)، هەڵبژێرم و هەر خۆیشم دەسەلاتی یەکەمم هەبێت بەسەر هێزەکەماندا و پێویستییەکانم بۆ دابین بکەن!

پاش ئاگادار کردنەوەی دکتۆر (فوئاد مەعسوم)، رۆژی دوایی ١٩٨٨/٢/١٤ کۆبوونەوەیەک لەگەڵ لێپرسراوی لایەنەکانی بەرەی کوردستانی کرا و ئەنجا کۆبوونەوەمان لەگەڵ ئێرانییەکان بۆ ئەو مەبەستە کرد! ئەوەی بیرمە (محمدی تهرانی و شەهلایی) و هەندێ فەرماندەی تریش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوون! ئیتر رێککەوتین لەسەر ئەوەی لایەنە کوردستانییەکان و ئەوانیش (قاسمی و تەهرانی) و یەکێکی تر بەشداریان بکات، ئەوەی پێمان لەسەر داگرت و لە سەری رێککەوتین بریتی بوو لە:

* ئۆردوگا و شارەکان کاک (شەوکەت و کاک حامید) و برادەرانی تری بەرەی کوردستانی لێی بەرپرسیار بن و ئێرانییەکان لەو شوێنانە دوور بن و رێگا سنوورییەکان لە مین پاک بکەنەوە!

* ئێران ئازوقەی خەڵکی هەمو سنوورەکە دابین بکات، چونکە تووشی گەمارۆ دانی ئابوری دەبن لە لایەن رژێمی عێراقەوە! چەندین خاڵی گرنگی تر لەو رێککەوتنەدا هەبوون، بەتایبەتی پاراستنی گیانی ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی لە ناوچەکە!

دوای ئەوە زنجیرەیەک کۆبوونەوە لە نێوان کاک (شەوکەت) و نوینەرانی (پارتی و سوسیالیست و بزووتنەوەی ئیسلامیدا) کرا، بۆ شێوەی جێ بە جێکردنی کارەکە! هێزەکانی ئێمە لەو کارەدا نزیکەی ٥٠٠ پێشمەرگە بوو، لەناو ئۆردوگاکان و لە هەڵەبجەش لەو ژمارەیە زیاترمان هەبوو، بارەگاکانی تیپی ١١ ی هەورامانی (یەکێتی)، دەمێک

بوو لەو سنوورەدا بوون، لە گریانە و هاوار و بۆین، بارەگایان هەبوو! کاک (شەوکەت) مان راسپارد، کە لە کاتی گونجاودا حیزب و هێزە ئێرانییەکانی ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی لە ناوچەکەدا ئاگادار بکات، کە تەواو هوشیاری خۆیان بن. ئیتر شەوی ١٤ لەسەر ١٩٨٨/٣/١٥، نەبەردەکە دەست پێ بکات! ئەوە بوو نەخشەکە جێبەجێ کرا و کاک (شەوکەت) و هێزەکەی خۆیشی لە (باوە کۆچەک) ەوە خۆیان کرد بە ناو شاری هەڵەبجەدا و لەو شەڕەدا ئەوەی بە ئێمە وترا نزیکەی ٦٠٠ ئەفسەر و سەرباز بە دیل گیران! بەڵام بە داخەوە هێزەکەی ئێران خراپ پروپاگاندەیان بۆ ئەو نەبەردە کرد و لە راگەیاندنەکانی خۆیاندا، وەک شەڕ و سەرکەوتنێکی خۆیان بڵاویان کردەوە! لە رۆژی ١٩٨٨/٣/١٦دا، رژێمی عێراق بە فرمانی (صدام حسین و علی حسن المجید)، بە کیمیایی شاری هەڵەبجەیان بۆردومان کرد و زیاتر لە ٥٠٠٠ مرۆڤی کوردیان تێدا شەهید کرد، جگە لە بریندار کردنی هەزاران کەس لە خەڵکی مەدەنیی دەڤەرەکە! لەبەر دەمی ئەو تاوانە کۆمەڵکوژییەی (بەعس) دا، زۆربەی زۆری وڵاتانی عەرەبی و ژەهر فرۆشی دنیا بێ دەنگ بوون، بەڵام چونکە ئێران خۆشی مارانگازی دەستی چەکی کیمیایی رژێمی عێراق بوو، بۆ ئەوەش کە ئەو راستییە بۆ جیهان و بۆ رای گشتی بسەلمێنێ، کە (صدام حسین) و سوپاکەی گازی ژەهراویی و چەکی کیمیاییان لە جەنگەکەدا دژی هێزەکانی بەکار هێناوە، زۆر بە باشی قسەی لەسەر ئەو کارەساتە کرد و هەر زوو لە رێی راگەیاندنەکانی خۆیەوە دەنگ و رەنگی ئەو کۆمەڵکوژییەی بە جیهان ناساند!

ئەو شەڕە گەورەیەی هەڵەبجە و ئەو هەموو کوژراو و بریندار و دیلەی، کە لە سوپای عێراق کەوت لە ناوچەکانی هەڵەبجەدا، گوشاری نەخستە سەر هێرشەکانی عێراق بۆ ناوچەکانی سەرکردایەتی و هیچ

هێزێکی گرنگی نەکێشایەوە بۆ هەڵەبجە! تاکە کاردانەوەی رژێم، ئەو بۆمبا بارانە بوو، کە کارەساتی کیمیا بارانی هەڵەبجەی لێ کەوتەوە! ئیتر هێرشەکانی سوپای عێراق بۆ سەر ناوچەکان و بارەگاکانی سەرکردایەتیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، تا دەهات سەختتر و قایمتر دەبوون، بۆیە سەرکردایەتیی بەرگرییەکەش ناچار بوون بڕیاری کشانەوە بدەن! من هەر لە ئێران مابوومەوە و خەریکی شوێنەواری کارەساتی هەڵەبجە بووم، تا ئەو رۆژەی کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کادر و ئەندامانی پەیوەندییەکانی ئێران هاتمە ناوچەکانی سنوور بۆ پێشوازی و هاودەردی لەگەڵ کاک (نەوشیروان) و براکانی ترم لە سەرکردایەتی و فەرماندە و تێکۆشەرەکانی (یەکێتی)، کە بەرەو ناو سنووری ئێران دەکشانەوە!

ئەو کاتە خەڵکی سنوورەکانی مەرگە تا کانی توو، مەرگە تا بەرگەڵوی و هەموو دۆڵی جافەتی چەند رۆژێک بوو هەر خەریکی هاتن بوون! ئەو رۆژەش هێزەکان و بریندارێکی زۆر بەر لە کاک (نەوشیروان) و هەڤاڵەکانی تر گەیشتنە ئەو سنوورە. کەچی لەو لێقەومانەشدا هێشتا فڕۆکەکانی رژێم وازیان لە ژن و منداڵ و خەڵکی ئاوارە نەدەهێناو بەردەوام دەهاتنە سەریان و بە کیمیایی بۆمبا بارانی ئەو خەڵکەیان دەکرد و فڕۆکەکانیش سنوورەکانی شاناخسێ و ئاوە کورتێیان سیخناخ کرد بوو لە ژەهری کیمیایی!

لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی چووینە سەقز، یەکەمین رووبەڕوو بوونەوەی (نەوشیروان) و من لەگەڵ فەرماندە باڵاکانی ئێران بوو بە بێتەل لەسەر رەفتاریان بەرامبەر حیزبە کوردییەکانی ئۆپۆزیسۆنی ئێرانی! ئێمە زۆر تووڕە و نارەحەت بووین و توند قسەمان لەگەڵ سەرکردایەتی سوپا کرد، خەریک بوو لەسەر ئەو کارە زۆر پەیوەندی

تێک بدەین، تا ئەوان ناچار بوون لە دواییدا هەڵوێستی خۆیان ڕاست کردەوە! ڕۆژی دوایی بە مەبەستی لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لە ڕاستی ڕووداوەکانی هەڵەبجە پێکەوە (نەوشیروان) و من بە یاوەری کاک (حەمە تۆفیق و بەختیار مستەفا)، چووینە هەڵەبجە، تا هەڵە و کەمو کورتییەکانی فەرماندەکانی خۆمان بزانین و ئەوەی لە دەستمان دێت بۆ کەم کردنەوەی ئازاری خەڵکی هەڵەبجە ئەنجامی بدەین! پاش ئەوە گەڕاینەوە کۆبوونەوەی سەرکردایەتیمان لە سەقز کرد و لەو کۆبونەوەیەدا:

* ئاوڕێکمان لە سەرجەم کارەکان و هاوپەیمانییەکانی ڕابوردوو دایەوە و لایەنە باش و خراپەکانیانمان هەڵسەنگاند و دەستمان خستە سەر هەموو خاڵە لاوازەکانی!

* بە کۆی دەنگ بڕیارمان دا، کە کۆڵ نەدەین و بوار نەدەین شکست لەو نەبەردانەدا ببێتە شکستی تەواوی خەباتی چەکداری جووڵانەوەی کورد، کۆڵ نەدەین و خۆمان کۆبکەینەوە و بە زوویی خۆمان ڕێک بخەینەوە!

لەو کۆبوونەوەیەدا و لە بەردەمی ئەو زیانە گەورەیەدا، کە تێک چوونێکی بە پەلەی لە تەرازوی هاوکێشەکاندا دروست کرد، کاک (نەوشیروان)، زۆر جوان و زۆر بە ورەی بەرز و مەسئولانە هاتە گۆ و دڕی بە خەمەکانی شکستی بەردەم چەکی کیمیایی دا و ئازایانە باسی لە پێویستی بەرگە گرتن و جارێکی تر تێهەڵچوونەوە کرد! من بۆ خۆم دوای ئەو قسانە، دونیام لا ڕووناک بووەوە و شانازیم کرد، کە تێکۆشەرەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، لە تەنگانەدا هێندە مەرد و پیاون! ئیتر بڕیار درا بە پەلە ڕادیۆ و ڕاگەیاندنمان بخەینەوە گەڕ و نەخشەیەکی نوێ بۆ ڕێکخستنەوەی هێزەکانمان جێ بەجێ بکەین!

* لەگـەڵ ئێـران خەریـک بیـن و قسـەیان لەگـەڵ بکەیـن، تـا وەفـادار بـن بـۆ بەڵێنەکانـی پێشـوویان و خەڵکـە ئاوارەکانمـان بـە باشـی نیشـتەجێ بکەن و ژیان و گوزەرانیان دابین بکەین و بە شێوەیەکی باش لە سەر سـنوورەکان و لـە شـوێنەکانی تـر ڕێکیـان بخەیـن!
* لـە قاسـمە رەشـی سـەر سـنوور، بـارەگای مەکتەبـی سیاسـی و هەنـدێ مەکتەبـی سـەرکردایەتی لـە نزیکیـەوە دامەزرێنینـەوە!
سـەرەتا لـە کانـی زەردی سـنووری ئێـران، پێشـمەرگەکانی دەسـتەکەی خـۆم شـوێنێکیان گرتبـوو بـۆ ماڵـی ئێمـە، ماوەیەکـی کـورت لەگـەڵ کاک (نەوشـیروان)، چووینە ئەوێ و بە بێتەل کارمان دەکرد تا بارەگا و شوێنی تـر ئامـادە دەبێـت! کوتاییەکانـی مانگـی ١٩٨٨/٣ ئەنفالـی سـەر مەڵبەنـدی یـەک گـەرم بـوو، هێزەکانمـان دووچـاری زیانـی زۆر هاتـن، بۆیـە ڕژێمـی عێـراق لـە ١٩٨٨/٤/٢ دا، داگیرکردنـی ناوچەکانـی سـنووری مەڵبەنـدی یەکـی لـە قـەرەداغ و سـەنگاو گەرمیـان، ڕاگەیانـد! ئێمـە بـۆ خۆمـان بـەردەوام لـە پەیوەندیـدا بوویـن لەگـەڵ لێپرسـراو و فەرماندەکانیانـدا، کـە هەرچییەکیـان کـردووە هـەوڵ بـدەن جەمـاوەری ناوچەکـە لـە زیانـی گەورە بپارێزن و دەرفەتـی دەرباز بوونیـان بـۆ ئاسـان بکەن! ئـەوە بـوو ئیتـر لـە ڕوژی ١٩٨٨/٤/١٤ دا، هێزەکانـی مەڵبەنـدی یـەک دەسـتیان کـرد بـە کشـانەوە لـە ناوچەکـە! سـەرانی ڕژێمیـش تـا دەهـات زیاتـر لەخـۆ بایـی دەبـوون، چونکـە سـەرباری ئـەو گـورزەی کـە لـە هێـزی پێشـمەرگە و سـەرکردایەتیی (یەکێتـی) یـان وەشـاند، هێزەکانیشـیان لـە بەرەکانـی جەنگدا سـەرکەوتنیان بـە دەسـت دەهێنـا! بـۆ نموونـە لـە ١٩٨٨/٤/١٧ دا، هێزەکانی عێراق توانییـان (فـاو)، لـە دەسـت هێزەکانی ئێـران وەربگرنـەوە و ئـەو شـوێنە سـتراتیجییە بخەنـەوە ژێـر چنگـی خۆیـان!
(مەحمـود سـەنگاوی) و هێزیکیش توانییـان لـە ١٩٨٨/٤/٢٤دا، بگەنـە تۆتمێ

و باليسان، كە هێشتا کاک (کوسرەت و ملازم عومەر)، لە ناو هێزەکاندا خەریکی بەرگری و خۆراگرتن بوون! پاش ئەوە لە سەرەتای مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٨ دا، (مەحمود سەنگاوی)، هاتە لای ئێمە، کە ئەو کاتە کاک (نەوشیروان) و من بارەگایەکی کاتیمان لە گوندی کانی زەرد لە ماڵی خۆمان دانا بوو، بە درێژی هەلومەرجەکانی کشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندی یەکی بۆ گێڕاینەوە و بە درێژی باسی کاک (کۆسرەت و ملازم عومەر) و هێزەکانی مەڵبەندی هەولێر و دۆخەکەی بۆ کردین!

شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ سەر کوردستان، لە پاش ناوچەکانی سەرکردایەتی هەر بەردەوام بوو وەیشوومەی زۆریان خستەوە! بەری قەراخ و گەرمیان، سەنگاو و هەموو شارباژێڕ و شارەزور و هەورامان و دەشتی کەرکووک و لای خاڵخالان و بەری کۆیە و قەرەچوخ و دەشتی هەولێر، هەموو بەر ئەو شاڵاوە کەوتن! مەلبەندی یەک کشانەوە، بەلام بە سەختی هیزەکانیان دەرباز کرد! دەیان هەزار هاوولاتی ئەنفال و بێ سەرو شوێن کران و مەڵبەندی چواری هەولێر کەوتە ژێر رەحمەتی تەنگ پێ هەڵچنین و گەمارۆ دانەوە! کاک (کۆسرەت و ملازم عومەر و حەسەن کویستانی و عەبدولرەزاق) و فەرماندەکانیان لەبەر مەترسی و هەڕەشەی چەکی کیمیایی و مەرگدا بوون! لەگەل کاک (نەوشیروان)، زۆر لەگەڵیان خەریک بووین، کە بکشێنەوە، بەلام جوامێریی و ئازایەتییان بواری نە دەدان بکشێنەوە!

پاش کارەساتی گوندی گۆپتەپە و زیانەکانی تر و پاش ئەوەی عێراق توانی لە ١٩٨٨/٥/٢٥ دا، شەلەمچەش لە چنگی هێزەکانی ئێران دەربهێنێ و سەرکەوتنی بەرچاو بە دەست بهێنێ! لەگەڵ کاک (نەوشیروان) تەگبیری ئەوەمان کرد، کە بارەگا لە قەندیل دابنێین و سەرەتا لە ناوچەی گوێزێی قەندیل خێوەتمان هەڵدا و لەوێ چەند کۆبونەوەیەکی

بە سوودمان ئەنجام دا! بڕیارمان دا، کە لە بناری قەندیل و لە تیپی ٧٨ لە باڵەییان بارەگایەک وەک بەردەباز بۆ هێزەکانی ئەمبەر بۆ سنووری مەڵبەندی چوار و کاتی پێویست و لەو بەرەوە بۆ ئەمبەر دابنێین! چوومە ناوچەکە و لەگەڵ (ئازاد هەورامی)، ئەو بارەگایەمان دانا و یەکەمین هێز کاک (سامان گەرمیانی) بوو، کە بەلای ئێمەدا لەو بەردە بازە پەڕییەوە بۆ ئەوبەر! لە ڕۆژی ١٩٨٨/٦/١٠ دا، کاک (مەحمود سەنگاوی)، هاتە لام، باسی گەڕانەوەی لەگەڵ کردم وەک هێزێکی پارتیزانی بۆ گەرمیان! ئەوە ئەو بوو لە بەمۆوە پەڕینەوە و خۆیان گەیاندەوە سنوورەکانی خۆیان، دوای ئەویش (ئازادی سەگرمە و مام رۆستەم)، بە مەفرەزە پارتیزانەکانی خۆیانەوە خۆیان گەیاندەوە بەری قەرەداغ! لەگەڵ ئەوەشدا رژێمی عێراق هێرشە یەک لەدوای یەکەکانی بۆ سەر ناوچە و هێزەکانی هەولێر هەر بەردەوام بوو! هێزەکانی رژێم، هێرشەکانیان بۆ سەر جوانەگا و مەلەکان و بۆ سەر کاروخ و گەرەوان و بۆ شاخە سوور و لای شەقڵاوە و بۆ دۆڵی سماقوڵی و بۆ سەر مێرگە سوور و بۆ زیوە و هەرتەل، بەردەوام بوو و نەخشەی گەمارۆدانی هێزەکانی هەولێریان جێبە جێ دەکرد! شەهید (حەسەن کوێستانی، شێخ جەعفەر، ڕێباز، سەفین، مامە غەفە، عەولا بۆر، مامۆستا بەکر، شاخەوان، ڕەهبەری سەید برایم و سەعیدی حەمە زیاد) سەرکردایەتیی تیپە قارەمانەکانی مەڵبەندی سێ و مەڵبەندی چوار، بەرگری قارەمانانەیان کرد و شەڕەکان تا ڕۆژی ١٩٨٨/٨/١٢ درێژەیان کێشا! ئیتر بە بێ کشانەوەی هێزەکانی رژێم لە خۆوە بەرەکانی شەڕ ئارام بووەوە و جموجووڵە دیپلۆماسیەکان بۆ ڕاگرتنی جەنگی (عێراق - ئێران)، سەریان هەڵدا! وەزیری دەرەوەی جەزایر بە ڕێگەی ئاسمانەوە بوو بۆ ئێران بۆ ناوبژی، کە فڕۆکەکەی

لـە لایـەن هێزەکانـی عێراقـەوە خرایـە خـوارەوە، ئیتـر ڕووداوەکان وایـان نیشـان دەدا، کـە جەنگـی (عێـراق - ئێـران)، ڕا دەگیـرێ!

(موکـەڕەم تاڵەبانی)، نامـەی بۆ (مـام جـەلال) و سـەرانی کورد ڕەوانە کرد بـوو، کـە دەرفەتێک بـۆ دەربـاز کردنـی کـورد لـە مەنگەنـەی ڕێککەوتنەکـە بدۆزنـەوە! بـەڵام نامەکـەی (موکـەرەم)، ئێسـتا و ئەوسـاش نـە بـە (یەکێتـی) و نـە بـە (مـام جـەلال)، نەگەیشـت!

## ڕۆشتن بەرەو پیری مەرگ!

لەگەڵ کاک (نەوشیروان)، بڕیارمان دا، من بچمە بالیسان بۆ مەڵبەندەکەیان، تا تەگبیری کشانەوەیان بکەین! بۆ ئەو مەبەستە سەرەتا شەهید (ئازاد هەورامی) و من چووینە بناری قەندیل و لە بناری شێخ ناصر لە نزیک دامێنی ئەو شاخە لای تیپی ٧٨ کارۆخ بارەگایەکمان دانا، کە ببێتە بەردەباز بۆ پەڕینەوەی هێز بۆ سنووری مەڵبەندی چواری هەولێر لە کاتی پێویستدا و پێشوازی لە هێزەکانی مەڵبەندی هەولێریش بکات لە کاتی کشانەوەدا و ببێتە پشتیوانێکیش بۆ ئەو هێزانەی، کە لەسەر شاخی کونە کۆتر بەرگری دەکەن! پاش ئەوە کاک (نەوشیروان) یش هات لە قەندیل بارەگایەک دانێت! لە سەرەتادا چاوێکی بە هەندێ شوێندا گێرا و لەوێ هەندێ پەیوەندیمان لەگەڵ شاری سلێمانی کرد و کارو بارەکانمان ڕێکخست! کاک (نەوشیروان)، ئامۆژگاریی پێویستی بۆ شارەکان ڕەوانە کرد! لەو هەلومەرجەدا دامو و دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم هەوڵیان دابوو بەهۆی چەند خۆفرۆشێکەوە

پیلانێک بۆ تیرۆر کردنی کاک (نەوشیروان) بگێڕن! ناچار بە ڕێگەی ئوسولی کەوتینە لێکۆڵینەوە لە هەموو سەرە داوەکانی پیلانەکە و ئەو دەستەیەمان دەستگیر کرد و پیلانەکەمان لەناو برد! ئیتر کاک (نەوشیروان)، شێخ ئایشی پەسەند کرد بارەگای لێ دابنێت، منیش لەگەل مامۆستا (عەبدولا) ی شۆڕشگێڕان کەوتمە ڕێ بۆ پەڕینەوە بۆ سنووری مەڵبەندی چوار، بە هاوکاری و یارمەتیی شەهید (عەلی نەبی)، کە هەرچەندە لەو کاتەدا تەسلیم بووبوویەوە و لەلای ڕژێم بوو، بەلام بە نهێنی هاوکاری خۆمان بوو! گەیشتمە شوێنی ئەمینی سنووری هێزەکانی خۆمان لە مەڵبەندی چواری هەولێر، ئیتر لەوێوە مەنزڵ بە مەنزڵ ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای کاک (کۆسرەت و کاک ملازم عومەر)! لە ڕاستیدا لەلای ئەوان و بە چاو پێکەوتنی ئەوان هەستم بە ئارامی و خۆشییەکی تایبەتی کرد! نەخشەکەمان وا دارشتبوو، کە نیشانی هەموو لایەک و هێزەکانمانی بدەین، کە ئێمە بۆ مەسەلەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم چووینەتە ئەو ناوە و هەولێ لە ئارادایە گفتوگۆ و (مفاوەزات)، لە نێوان حکومەت و سەرکردایەتیی شۆڕشدا زیندوو بکرێتەوە! ئەوەش بۆ دروست کردنی جۆرێ لە هیوا و دۆخێکی ئارامی و دڵنیایی بوو لە ناو هێزەکانماندا، تا لەوێوە بە شێنەیی نەخشەی ڕێکخستنی ناوچەکە و کشانەوەی هێزەکان جێبە جێ بکرێت! لەو ماوەیەدا جگە لە قسە و باسی سێ قوڵی لە نێوان (ملازم عومەر و کوسرەت و من) دا، لەگەڵ هەموو هاوڕێکانی تریش پرس و ڕا و تەگبیری زۆرمان کرد. زنجیرەیەکیش کۆبوونەوە لەگەڵ ڕێکخراوی (کومەلە و شۆڕشگێڕان) و لەگەڵ فەرماندەکانی تر کرا و تەگبیر لەو مەفرەزە و کەسانەش کرا، کە لە هەندێ ناوچەدا بە شێوەی پارتیزان بمێننەوە!

لە مانگی تەموزدا لەگەڵ ئەو برایانە و فەرماندە و لێپرسراو و پێشمەرگەکانی هێزەکانی هەولێر بووم! لە رۆژی ١٩٨٨/٧/١٩ دا، کۆماری ئیسلامی ئێران بڕیاری ٥٩٨ ی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانی بۆ راگرتنی جەنگ پەسەند کرد و لە رۆژی ٨/ ١٩٨٨/٨ دا، جەنگی (عێراق - ئێران)، بە رەسمی راگیرا! بەر لە راگرتنی فەرمیی جەنگ، لە مەڵبەندی سێ (ملازم عومەر)، کۆبوونەوەیەکی بە هێزەکان کرد بۆ خۆش کردنی زەمینەی تاکتیکی نوێی شەڕ، واتە شەڕی پارتیزانی پێشمەرگە و وازهێنان لە شەڕی جەبهە لەگەڵ دوژمن!

ئێوارەی ئەو رۆژە، ئێمە (ملازم عومەر، حەسەن کویستانی، کوسرەت رەسول، مامۆستا عەبدولا)، کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ هەندێ لە فەرماندەکان کرد و یەک یەک راو بۆچوونیانمان وەرگرت، کە چی بە باش دەزانن، شەهید (رێباز)، کوڕێکی ژیر و بە هۆش بوو بە جیا بانگمان کرد و کاتێکی خۆشمان پێکەوە بردە سەر! ئێمە رامان وابوو لە فەرماندەکان (رێباز و سەفین)، بۆ سەرکردایەتی هەندێ لە هێزەکان لە ناوچەکەدا بمێننەوە و مەفرەزەکانی پارتیزانی رێکخەن، بەڵام نەمان دەویست ئەو نهێنییە بە هەمووان بڵێین، بۆیە بە تەنها قسەمان لەگەڵ ئەو دوو هاوڕێیە کرد! ئیتر بە گوێرەی ئەو نەخشەیەی، کە لە سەری پێکهاتبوین، لە رۆژانی ٢٦ و ٢٧ ی تەموزی ١٩٨٨دا، هێزەکان جووڵەیان پێکرا بۆ پەڕینەوە بەرەو قەندیل!

عەسرێکی درەنگ لە هەموو لایەکەوە تۆپ بارانی ناوچەکە دەستی پێکرد بوو، کە لە گەرووی مەنجەڵ لەگەڵ کاک (ملازم عومەر)، پێکەوە دەڕۆیشتین و خۆش خۆش قسەمان دەکرد، لە ناکاو یەک تۆپی دەبابە بە بەردەمی هەردووکماندا فیشکەی کرد و رێک لە شاخە بەردەکەی دا، دەنگێکی زۆر گەورەی لێ بەرزبویەوە، هەردووکمانی ناچار کرد

لەسەر زەوی چیچکە بکەین، (ملازم عومەر)، کە هەمیشە پیاوێکی ئازا بوو، هەڵسایەوە و ئاسایی کەوتینەوە رێ! ئەو شەوە کە لە وەرتێ دەپەڕینەوە بەشێ لە هێزەکەمان، کە لە هەزار پێشمەرگە زیاتر بوون، تووشی چەند ئۆتۆمبیلێکی زیلی سەربازی بوون، چونکە بە جاشیان زانیبوون، ئیتر بێ ئەوەی یەک تەقە بکرێ بە سەلامەتی رەد بوو بوون!

وابزانم لە کشانەوەی ئەو هێزە گەورەیەدا بە ناو قولایی دوژمندا، تەنها یەک شەهید و دوو بریندارمان هەبوو! شەو درەنگ بە شەهید (ئازاد هەورامی)، گەیشتینەوە، بەڵام شەڕ لەسەر شاخی کونە کۆتر زۆر گەرم بوو. رۆژی دوایێ چووینەوە بارەگای کاک (ئازاد هەورامی)، کە پێشتر پێکەوە بارەگامان لە قەد پاڵی شاخێکدا لە نزیک بارەگای تیپی ٧٨ کارۆخ دانا!

یەک دوو رۆژ لەو بارەگایە ماینەوە، بەڵام بەهۆی بێتەلە کانمانەوە رژێم شوێنەکەمانی دۆزیەوە و بەردەوام تۆپ بارانی دەکرین! بۆ رۆژی دواتریش فرۆکەی پیلاتۆزی نارده سەرمان و بۆردومانی کردین، ئەو رۆژە رۆکێتێکی بچکۆلە لە نێوان (خەلیل سەرکانی) و منیدا، باش بوو نەتەقیەوە ئەگینا هەردوکمانی شەهید دەکرد! ئێوارەکەی بڕیارمان دا، ئەو بارەگایە چۆڵ بکەین و بچینە شێخ ئایش، بەڵام رۆژی ئایندە فرۆکە هاتەوە سەرمان و بواری نەداین! لەو کاتەدا من بەرێگاوە بووم بۆ شێخ ئایش و نزیکی بارەگاکەی کاک (نەوشیروان) ببومەوە، شەهید (عەبدولرەزاق)، ئاگاداری کردم، کە فرۆکەکان کاک (ئازاد هەورامی) یان بریندار کردووە، بە راستی هەواڵێکی بروسکە ئاسای زۆر ناخۆش بوو، ئیتر هێندەی نەبرد بە سەر ولاخێکەوە هێنایان، منیش (کاروان و خۆشناو)ی برام لەگەڵ دانا و لەگەڵ پێشمەرگەکانی تر بە رێمان

کردن و خۆشم بە پڕتاو و زۆر بە خێرا کەوتمە ڕێ، تا بتوانم پێش گەیشتنی کاک (ئازاد)، هاو ئاهەنگییەک ڕیکخەم! چونکە پێشتر لەگەڵ لێپرسراوانی ئێرانی ئەو قۆڵە ئاشنا بووم، بەڵکو وابکەم ئامڕازی فریاکەوتنی خێرا ئامادە بکەین و بیگەیەنینە نەخۆشخانەیەکی باش! بە ڕواڵەت برینەکەی زۆر مەترسی نەبوو، شکاوی ئێسقان بوو، بەڵام بە داخەوە لە ڕێگا هەندێک وردە چەوری چوبووە دەمارەکانی خوێنیەوە و دڵی گەورەی ئەو زاتە شۆڕشگێڕ و ئازا و لە خۆبوردووەی لە لێدان خست و بەمەش یەکێک لە باشترین سەرکردە لاوەکان و ڕۆڵەیەکی هەرە قارەمانی گەلەکەمان لە کیس چوو!

شەهید بوونی کاک (ئازاد هەورامی)، کارەساتێکی ناخۆش بوو، کە لە پایزی شۆڕشەکەماندا ڕووبەڕوومان بویەوە، ڕووداوێکی جەرگبڕ و ئەژنۆ شکێن بوو، بڕوام وایە ئەگەر تا ئێستا کاک (ئازاد) بمایە، سەرکردەیەکی زۆر کاریگەر و بلیمەت دەبوو، دەیتوانی ڕۆڵێکی گەورە لە ئاراستە و بەرنامەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دا بگێڕێ!

دکتۆر (هێمن)ی خاڵۆزام و (شنۆ)ی هاوسەری بە برینداری و (حاجی کەمال و خەسرەو و شێرکۆی شێخ نوری و سەلامی ئەحمەد فارس و عەبدولا عەلی)، کاک (ئازاد) یان، بە هەڵبەستراوی و بە شێوەیەکی پزیشکی دروست هێنایە شێخ ئایش و شێخ شەروێ، کاک (نەوشیروان و عەبدولرەزاق) و من وەرمان گرت! بە پەلە دکتۆر شەهید (هێمن) و (کاروان)ی برام و (خۆشناو) و پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم لەگەڵ دانا، کە ئاگایان لێی بێت و بە سەلامەتی بگاتە سەر سنوور!

(کاروان)ی برام، کە یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی، کە لە نزیکەوە ئاگاداری کاک (ئازاد هەورامی)، بوو تا دوا هەناسەشی لەگەڵی مایەوە و لەو سەفەری مەرگەدا یاوەری بوو، بۆی گێڕامەوە و وتی:

کاکـە.. تەندروسـتی کاک (ئـازاد) بـاش بـوو، هیـچ لـەوە نەدەچـوو چارەنووسـی بـە مـەرگ کۆتایی بێت، قسـەی خۆشـی بۆ دەکردم، منیش بـە فرسـەتم زانـی و وتـم.. بەخـوا چـاک بیتـەوە، دەبێت ژنـم بـۆ بهێنیت بـا بـۆ خـۆم خێزانێـک پێکـەوە بنێـم، ئەویش لـە وەرامـدا نوکتەیەکـی بـۆ گێڕامـەوە، کە گوایا کاتی خۆی جووتیارێک زوو زوو بە ئاغاکەی دەڵێ .. بەخـوا ئاغا دەبێت ئـەم بەهـارە بۆ ژن هێنـان مشـوورێکم لۆ بخۆیت.. ئاغـاش لەبـەر ئـەوەی سـەری جەنجاڵـە بـە چەندیـن گرفتـەوە، تـووڕە دەبێت و دەڵێت.. مشـوری چیت لۆ بخۆم، حاڵی خۆم نابینی، وەڵا مەگـەر .... لۆ بخـوم! (کاروان) وتـی هەردووکمـان تێر پێکەنیـن و کاتێکی کەمـی پێچـوو ئیتر کاک (ئـازاد)، لـە قسـە کـەوت، کـە ورد بومـەوە و رام تەکاند، بەداخـەوە روانیـم تـەواو بـووە!

سـەد مەخابـن بـۆ ئـەو خەسـارەتە گەورەیـە و بـۆ ئـەو کۆسـتە پـڕ لـە ئـازارە، کە هەرگیـز بیـر ناچێتـەوە! ئاخـر کاک (ئـازاد) لـە خـەزان و گـەڵا رێزانـی جووڵانەوەکەمانـدا گیانـی پاکـی سـپارد، لـە کاتێکدا جێی هێشـتین هـەر گیـز هێنـدەی ئـەو کاتـە پێویسـتمان پێی نەبوو! سـەرکردە و هاوڕێی لاو و بـە هیمـەت و گـەورە، کاکـە (ئـازاد هەورامـی) ئـاوا بـوو! ئەنفالی ئـەم جـارە نەیتوانـی هێزەکانـی هەولێـر و پێشـمەرگە قارەمانەکانـی هەولێـر و تیپەکانی لـە نـاو بـەرێ، بـەڵام پەلامارەکـەی ئـەو ئەنفالـە و بەرگرییەکانـی کونـە کۆتـر و بنـاری قەندیـل بـە خوێنـی زیاتـر لـە ٦٤ شـەهید و (ئـازاد هەورامـی)، سـەرکردە و قارەمـان تـەواو بـوو!

## شێوازی نوێی خەبات و بەرگری!

خەباتی چەکداری گەلی کورد بۆ پاراستنی کورد و کوردستان لە شاڵاوی داگیر کەران، هەمیشە هەلومەرجێکی سەختی هەبووە! چونکە تەرازووی هێزەکان لە نێوان داگیر کەران و کوردا بەردەوام لا سەنگ بووە، بۆیە زۆر جار پیلانی لێ گیراوە و تووشی شکستی کاتی هاتووە! دوژمنی داگیرکەر هێزی زۆر و تفاقی جەنگی زۆری هەبووە، چەکی باشتر و بەهێزتر و پێشکەوتووتری هەبووە و خاوەنی تۆپخانەی زۆر و تانک و فڕۆکەی جەنگی بووە! توانای مالی و دارایی زۆرتر و ڕاگەیاندنی فراوانتر و پشتیبوانی ناوچەیی و جیهانی زۆرتری هەبووە! بەڵام جووڵانەوەی کورد، تەنها ڕەوایی داخوازی و ئیرادەی لە دوژمن بەهێز تر بووە!

حکوومەتەکان و وڵاتانی جیهانیش لەبەر ڕۆشنایی عورفێکی سیاسیدا کار دەکەن، کە لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان و حکوومەتەکەیاندا هەموو ڕەوایی و ڕاستی و مۆراڵێک وەلا دەنێن و دەیخەنە ژێر پێ!

لـە یەکەمیـن بەرگـری و شۆڕشـی (شـێخ عوبێدیلـلای نەهـری) و دواتـر شۆڕشـی (دەرسـیم و بەدرخـان)، تـا دەگاتـە (سـمکۆ و شـێخ مەحمـود و پێشـەوا و بارزانـی)، سـەرەڕای ڕەوایـی و هەقـی کـورد لـە ململانێکانـدا، کەچـی لـە دواییـن بڕیـاردا، وڵاتـان بەرژەوەندییەکانـی خۆیـان زاڵ کـردووە بەسـەر هەمـوو پرانسـیپە مرۆیـی و مۆراڵییەکانـدا و چاویـان لـە خنکاندنی جووڵانـەوەی کـورد و لـە قەتل و عـام پۆشـیوە و لەگـەڵ داگیر کـەران و بەرژەوەنـدی خۆیانـدا وەسـتاون و بـێ بەزەییانـەش تەماشـای لـە ناوبردنـی ڕۆڵەکانـی گەلەکەمـان و جووڵانەوەکەیـان کـردووە! لـە دوێنێـدا و لـە کوردسـتانی باکـوور، شـێخی (نەهـری)، کرایـە قوربانـی ئـەو بەرژەوەندیانـە! لـە کوردسـتانی باشـووریش، (شـێخ مەحمـود)، کرایـە قوربانـی پەتـرۆل! دوو دەیـە دوای (شـێخ مەحمـود)، کۆمـاری کوردسـتان و بەرگـری تێکۆشـەرەکانی و (قـازی محەمـەد) کرانـە قوربانـی بەرژەوەندییەکانـی حکومەتـی سـۆڤیەت! لـە چارەکـی کۆتایـی سـەدەی ڕابردوشـدا لـە کوردسـتانی عێـراق، شۆڕشـی ئەیلول و (بارزانـی)، کرانـە قوربانیـی بەرژەوەندییەکانـی (شـا)ی ئێـران و ئەمریـکا!

ئەمـڕۆش لـە ئاسـتی شـاڵاوەکانی ئەنفـال و کیمیـا بـاران و جینۆسـایدی کـورد و کوردسـتان و هێـزی پێشـمەرگە، حکومەتـەکان و دەوڵەتانـی گـەورە و زلهێزانـی دونیـا بوونەتـە تەماشـا کـەر و بگـرە هەنـدێ جاریـش بوونەتـە یارمەتیـدەری ڕژێمـی عێـراق لـە ئاسـتی ئـەو کۆمەڵکوژیـەی کورسـتاندا! بـێ دەنگیـی دەوڵەتانی گـەورە و وڵاتانـی عەرەبی و ئیسـلامیش لـە بەرامبـەر لـە ناوبردنـی خەڵکـی کـورد و هێـزی پێشـمەرگە و بەرگـری خەڵکـی کوردسـتاندا، تـا مێـژوو مـاوە نەنگـی و پەڵەیەکـی ڕەشـە بـە نێـو چەوانیانـەوە! دیـارە هـەر بەرژەوەندیـش بـوو، کـە چـاوی پـێ نوقانـدن و بـێ دەنگییـان لـەو کارەسـاتە مرۆییـە گەورەیـە پێکـردن!

ئـەم جـارەش وەک جـاران و لـە سێبەری نـا بەرامبەریـی هێزەکانی کـورد و داگیرکـەردا و لـە بەرامبـەر چەکـی کیمیایـی و بـێ دەنگیـی وڵاتـان لـە تاوانەکانـی رژێـم، هێـزی پێشـمەرگە تووشـی شکسـتێکی کاتـی هـات و هێـزەکان بـەرەو سـنوورەکان کشـانەوە! بـەڵام سـەرکردەکان بڵاوەیـان لـێ نەکرد و بواریـان نـەدا ورەی نزم و ماندو بـوون دوچاری شکسـتی یەکجارییان بکات و سوور بوون لەسەر درێژەدان بە خەبات و تێکۆشـان! هەلومەرجـی تـازەی پـاش وەسـتاندنی جەنگـی (عێـراق - ئێـران) و بڕیـاری نەبەزیـن و کۆڵنـەدان و درێـژەدان بـە خەبـات پێویسـتیی بـە گۆڕانـکاری لـە شـێوەکانی خەباتـدا هەبـوو. بـەو مەبەسـتە ئـەم نەخشـەیەمان دانـا :

١- جەمـاوەری خەڵکـی ناوچـەکان و ئاوارەکانـی بـە رێکوپێکـی لەسـەر سنوورەکان نیشتەجێ بکەین و داوامـان لـە ئێران کرد، کە لـەو بارەیـەوە بەڵێنەکانیـان جێبەجـێ بکـەن بـە مەبەسـتی دروسـت کردنـی ئـۆردوگا بۆیـان و دابینکردنـی ئازووقـە و خواردەمەنـی و رێوشـوێنی خوێندنـی منداڵەکانیان! بۆ دابینکردنی ئەو ئەرکە و کار ئاسـانیی ژیانـی ئـەو خەڵکە ئاوارەیـە، چەندین کۆمیتـە و لیژنـەی کارا و بـە توانامـان دروسـت کرد، کە ئەندامێکـی مەکتەبـی سیاسـی خـۆی سەرپەرشـتی دەکـرد!

٢- داوامـان لـە هەڤـاڵ (مـام جـەلال) و نوێنەرەکانمـان و تێکۆشـەرەکانمان لـە وڵاتانـی عەرەبـی، بـە تایبەتـی سـوریا و لیبیـا و وڵاتانـی ئەوروپـا و تەنانـەت لـە ئێرانیش کرد، کە بایەخـی زیاتر بدرێ بـە چالاکیی راگەیاندن و هـاوکات کاری سیاسـی و دیپلۆماسـی بـاش رێکخرێت و رێوشـوێنی کارا کردنـی چالاکییـەکان دیـاری بکـەن، جـا بـەو حوکمـەی (مـام جـەلال)، لـەو کاتـەدا لـە دەرەوە بـوو، ئـەوا ئـەو سەرپەرشـتی ئـەو کارەی دەکـرد! ئیتـر ئـەو سـەردەمە زۆرتـر سـەردەمی خەباتـی سیاسـی و دیپلۆماسـی بـوو، بۆیـە ئێمـەش هـەم شـێوەی خەباتمـان تاڕادەیـەک گـۆڕی و هـەم بایەخـی

زیاترمـان بـەو شـێوە خەباتـە دا!
٣- بایـەخ دانێکـی زیاتـر بـە رێکخسـتنی شـارەکان و پاراسـتنیان و ئاراسـتە کردنیـان، بـە مەبەسـتی بـاش رێکخسـتنی پەیوەندییەکانیـان بـە سـەرکردایەتییەوە!
٤- نوێنەرایەتیمـان لـە ئێران لـە ئاسـتێکی بـەرزدا و باشـتر رێکخسـت و کادری باشمان بۆ تەرخان کرد!
٥- بەهێزکردنـی پەیوەندییەکانمـان لەگـەڵ (پارتـی) و هێزەکانـی تـری کوردسـتان و بیرکردنـەوە لـە پێکهێنانـی بـەرەی کوردسـتانی!
٦- رێکخسـتنەوەی هێـزی پێشـمەرگە بـە شـێوەیەکی نـوێ و گونجـاو، کـە لەگـەڵ هەلومەرجـی تـازەدا بگونجـێ! ئەویـش بـە دروسـت کردنـی بەتالیۆنەکانـی مەڵبەندەکانـی جـاران لەسـەر سـنوورەکان و هـەر یەکەیـان لـە سـنوورێکی نزیـک ناوچەکانـی خـۆی! بـۆ نموونـە بەتالیۆنـی یـەک لـە میـری سـوور دانـرا بـوو، هـەر بەتالیۆنێکیـش ٣ کـەس دەسـتەی فەرماندەیی بوون، کە کاری ئیسناد و زانیاری و سیاسییان دەگرتـە خۆ و تەنانـەت لـە بەتالیۆنەکانـدا بەشـی هەندەسـە و کیمیایی بۆ دانـرا بـوو، هـەر بەتالیۆنـە بـەلای کەمـەوە لـە ٣ تیـپ پێـک هاتبـوو! شـایەنی باسـە ئـەو نەخشـەیە لەلایـەن کاک (نەوشـیروان) ەوە بەشـێوەیەکی رێکوپێـک دانـرا بـوو!
٧- هێزەکانـی پارتیزانـی بـۆ قولایـی ناوچەکانـی پێشـوی مەڵبەنـدەکان نێـردران، تـا بـە بەرنامەیەکـی تایبـەت گەشـە بـە هێـزە پارتیزانەکانـی خۆیـان بـدەن !
٨- بـە مەبەسـتی مەشـق و پـەروەردە کردنـی هێزەکانمـان و بـۆ بەرزکردنـەوەی تواناکانیـان، داوامـان لـە ئێـران کـرد، کـە دەورەی مەشـق بـۆ فەرماندەکانمـان بکاتـەوە! بـۆ ئـەوەش بـە کـردەوە دەیـان فەرماندەمـان

لـەو دەورانـەدا پـەروەردە كـردا!

٩- دەستمان كرد بـە دروست كردنـی خانووی ڕێكوپێک بۆ سـەركردايەتی و دەزگاكان لە قاسمە ڕەش و دەور و پشتی!

١٠- دەزگای ڕاگەیاندنـی (یەكێتـی نیشـتمانی كوردسـتان) مـان ڕیكخست و مـن بۆ سەرپەرشـتی ئـەو دەزگایـە دانـرام!

لـە زنجیـرەی كاری دیپلۆماسـیدا، لـە ڕۆژی ١٩٨٩/١/٧ دا، كۆنگرەیـەک بەسترا، كـە زیاتـر لـە ١٠٠ دەوڵـەت دژی بـەكار هێنانـی چەكـی كیمیایـی تیایـدا بەشـدار بـوون، بیـر لـە هاندانـی دۆستـەكانمان كرایـەوە، كـە هـەوڵ بـدەن بـۆ بەسـتنی كونگرەیەكـی لـەو جـۆرە بـە هاوبەشـی لەگـەڵ گەلـی كـوردا!

(مـام جـەلال)، پـاش چەنديـن هـەوڵ و چالاكـی سـەركەوتووی دیپلۆماسـی لـە شـوباتی ١٩٨٩ دا، گەڕایـەوە! هـەر لـەو مانگەشـدا مەفرەزەیەكـی ئـازا و قارەمانـی پارتیزانیمـان، كـە شـەهید (مـەلا ئەحمـەدی كـەلار) ی و حـەوت پێشـمەرگەی هاوڕێـی بـوو، لـە ژێـر هـەرەس و ڕووخانـی ئەشـكەوتێكدا شـەهید بـوون و لـە ناوچـوون، ئـەوەش بـۆ ئێمـە و بـۆ ئـەو سـەردەمە زیانێكـی گـەورە و كەسـەرێكی ئەوتـۆ بووكـە بیرناچێتـەوە!

لـەو ماوەیـەدا زۆر خـۆم مانـدوو كـرد، لەلایـەک خەریكـی نووسـین و كاری ڕاگەیانـدن بـووم، لـە لایەكیـش سـەردانی خەڵكەكانـی خۆمـان بـووم لەسـەر سـنوور و لـە نـاو ئـۆردوگاكان، بـە مەبەسـتی تێگەیشـتن لـە گرفتەكانیـان و چارەسـەر كردنـی كێشـەكانیان! لـە هەمـان كاتـدا زوو زوو سـەردانی میحـوەرەكان و بەتالیۆنەكانـم دەكـرد و لەسـەر نەخشـەی نوێـی كاری سیاسـی و پێشـمەرگایەتی و ڕێكخراوەیـی قسـەم بـۆ هەمـوو لایەكیـان دەكـردا!

لـە ڕۆژی ١٩٨٩/٤/٢٥ دا، پێكـەوە لەگـەڵ كاک (نەوشـیروان)، سـەردانێكی

هێزە سنووریەکانمان کرد و دەستەیەکیشمان لە فەرماندەکان ئامادە کرد، کە لە رۆژی یەکی ئایارەوە دەست بکەن بە مەشق لە دەورەیەکی فەرماندەییدا! لە رێگا باسمان لەوە دەکرد، کە ئەو لە خۆبایی بوونەی (صدام) و هێزەکانی، بوار نادات هەر ئاوا بەئاسانی و بێ ئاژاوە دانیشێ، بۆیە دوور نییە رووداوی تری گەورە نەخاتەوە!
هەر لەو سەردانانەدا بووین، کە هەواڵی تیاچوونی (عدنان خیرولا) ی وەزیری بەرگری عێراق و برای (ساجیدە) ی هاوسەری (صدام)، بڵاوکرایەوە، کە گوایە بەهۆی کێشەی کەش و هەواوە فڕۆکەکەی کەوتۆتە خوارەوە و تیا چووە! لە هەقیقەتدا ئەو هەواڵە دوور بوو لە راستییەوە و بەڵکو بەهۆی پیلانێکەوە، کە (صدام)، خۆی دایڕشتبوو تیا چوو!
ماوەیەک بوو شەپۆلی چاکسازیی (غۆرباشۆف) و هەواڵەکانی (گلاسنۆست و بیرسترویکا)، رەنگدانەوەی خۆی لەسەر سیاسەتی دونیا و هێزەکان و ململانێی شەڕی سارد خستبووە بەر باس و لێکۆلینەوە! کاک (نەوشیروان)، هەمیشە باسی ئەوەی لەگەڵ دەکردم، کە ئیتر (مارکسیزم - لینینیزم)، تین و تاوی خۆی لە دەست داوە و لە کوردستانیشدا ناتوانێت وەک جاران کاریگەر بێت! بۆیە پێی وابوو، کە چیتر (کۆمەڵە)، بەو بیرو باوەڕەوە ناتوانێت جووڵانەوەیەکی فیکری بکاتە هێزیکی ماددیی بەکار بۆ داهێنانێکی نوێ لە خەباتی کوردستاندا! لە (یەکێتی) شدا، کە (کۆمەڵە) زۆربەی و کادر و فارماندە و هێزەکانی و رێکخستنەکانی (یەکێتیی) پێک دەهێنێت، رەوای هەق نییە ئەو هەموو مەرکەزی بڕیارە قبوڵ بکەین! نایشارمەوە منیش بڕوام بەوە هێنا بوو، کە ئەگەر (کۆمەڵە و شۆڕشگێران)، هەمووی بکەین بە (یەکێتی)، ئەوا (کۆمەڵە)، دەبێتە خاوەنی (یەکێتی) و توانای سەرکردایەتی و

ئاراستە کردنی هەموو (یەکێتی)، دەکەویتە دەس! گەرچی ئەو بۆچوونە زۆر راستی تێدا بوو، بەڵام ئەو کاتە نەمدەزانی کە تاقەت و پشووی کاک (نەوشیروان)، بوار نادات سەرکردایەتی پرۆسەکە بەو ئاقارەدا بەرێت، کە بە ئەنجام بگات !

لە رۆژانی ٢ تا ١٩٨٩/٦/٥، کۆبوونەوەیەکی فراوانی (شۆڕشگێڕان)، بەسترا و لەو کۆبونەوەیەدا وتارێکی گرنگم لەبارەی ئەگەری یەکخستنی هەموو (یەکێتی)، باس کرد! لەناو بەشدارانی کۆبونەوەکەدا پێشوازییەکی گەرم لە بیرو راکانم کرا!

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩، (مەحمود سەنگاوی و کوردو قاسم)، بۆ جاریکی تر بە هێزێکی پارتیزانییەوە رەوانەی قووڵایی گەرمیان کرانەوە! کاک (مەحمود سەنگاوی)، بە ورەیەکی گەش و ئارەزوویەکی ئەوتۆوە خۆی ئامادە دەکرد، کە من بۆ خۆم بەشەرمم دەزانی لە گەڵیان نەچمە خوارەوە! بەڵام بەداخەوە ئەو ئەرکانەی، کە سەرکردایەتی خستبونیە ئەستۆم بواری ئەو کارەیان نەدام! زۆری پێ نەچوو لە مانگی تەممووزدا، کاک (عوسمانی حاجی مەحمود) و هێزێکی تری پارتیزانی رەوانە کران، کاک (عوسمان)، یەکێک بوو لە خۆشەویستەکانم، بۆیە بە دیاری قەناسەکەی خۆمم پێشکەش کرد! هاو زەمان لەگەڵ ئەوەدا (حەمە رەش) و دەستەیەکی تر لە قووڵایی گەرمیاندا کاری خۆیان دەکرد! شەهید (حەمە رەش)، یەکێک بوو لە فەرماندە قارەمان و ژیرەکانی گەلەکەمان و (یەکێتی)، کە لە راپەڕیندا رولێکی گرنگی گێرا! سەد حەیف ئەو کوڕە ئازا و بە جەرگە لە دووز شەهید کرا! هەروەها کاک (ئازادی سەگرمە) ش، کە ئەو کاتە یەکێک بوو لە فەرماندە قارەمان و پارتیزانەکان، لە قووڵایی گەرمیاندا خەباتی دەکرد! لە ٢٣ تەموزی هەمان ساڵدا، هێزیکی تری پارتیزانیمان

ڕەوانـەی قوولایـی کـردەوە!

لـەو سـەردەمەدا، کـە ئێمـە بـە کێشـە و گرفتەکانـی خەباتـەوە سـەرقاڵ بووین، هەواڵـی تیـرۆر کردنـی سـەرکردەی گـەورە، دکتـۆر (قاسـملۆ) لـە ڤیێننا بڵاو بویەوە! بـە راسـتی ئـەو هەواڵـە ژانی کردە دڵی هەموو دڵسۆز و تێکۆشـەرێکی نەتەوەکەمانـەوە و ئـەو راسـتییەی لـەلا زەق کردینـەوە، کـە زنجیـرەی تیـرۆر کـردن و لـە سـێدارەدانی سـەرکردەکانی کـورد بـەو شـێوەیە و بـەو پیلانـە، چەنـد زاڵمیەتـی زۆردار و مەزلومـی و بێکەسـیی کورد نیشـان دەدا!

دکتـور (قاسـملۆ)، سـەرکردەیەکی گـەورەی کـورد و کاریگـەر بوو، من خۆم جگـە لـە خۆشەویسـتی و هاوڕێیەتیم لـە گەڵیدا، هەمیشـە بـە مامۆسـتای خـۆم و بـە سـەرکردەیەکی زۆر ژیـر و دڵسـۆز و کارامـەی سـەنگەری کوردایەتیـم دەزانـی! حەیـف شـەهید بوونـی ئـەو سـەرکردە مەزنـە، بۆشـاییەکی هێنـدە گـەورەی خسـتەوە، کـە بـە کەسـی تـر پـڕ نەکرێتـەوە! لەگەڵ ئـەو زاتـە گەورەیـەدا زۆر کۆبوونـەوە و یادگاریـی گرنگـم هەیـە، کـە جارێکیـان بـۆ داڕشـتنی سـتراتیجی جووڵانـەوەی نەتەوایەتـی کـورد بـوو، کـە یـاوەری (مـام جـەلال) بـووم، لـەو گفتـو گۆیـە و دواتـر باقیەکەیمـان، کـە لەگـەڵ سـەرکردەی گـەورە و ئـازا (عەبـدولا ئـۆج ئـالان)، لـە بیقاعـی سـووریا تـەواو کـرد، بەشـدار بـووم!

تەقـەلاکان بـۆ بەسـتنی کۆنگرەیەکی گـەورە دەربـارەی کـورد و پشـتیوانی لـە دۆزی کـورد، لـە ١٩٨٩/١٠/١٤ بـە هیمەتـی (فرانـس لیبەرتـی) و خاتـوو (دانیـال میتـەران) و ئەنسـتیوتی کـورد و کاک (کەنـدال) سـازکرا، کـە لـەو کۆبوونەوەیـەدا خێزانەکـەی (زاخـارۆف)، ئامـادە بـوو، وتارێکـی نایابیشـی بـە نـاوی (زاخـارۆف) ەوە خوێنـدەوە! (مـام جـەلال)، لـەو کۆبونەوەیـەدا ئامـادە بـوو، توانـی رۆڵێکـی گـەورە بنوێنێ!

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٩ دا، (صدام حسین)، هاتە سلێمانی، تا نیشانی بدات، کە هیچ جووڵە و وزەیەکی بەرگری کورد نەماوە و سلێمانی بۆ ئەو و دەسەڵاتی (بەعس)، ئەمین بووە! زۆری نەبرد لە درێژەی ئەو گۆڕانکارییانەی، کە وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵاتیان گرتەوە، دیکتاتۆری رۆمانی (شاو شیسکۆ)، لە لایەن خەڵکەوە لە سێدارە درا!

کاک (نەوشیروان)، کە ماوەیەک بوو لە دیمەشقی پایتەختی سوریا بوو، لە مانگی شوباتی ١٩٩٠ دا، گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی! لەو ماوەیەدا دوو حاڵەتی ناخۆش تووشی هاوڕێ پارتیزانەکانمان لە خوارەوە بوونەوە، یەکەمیان (مەحمود سەنگاوی)، تووشی نەخۆشیەکی وا بوو، کە هێندەی نەما بوو گیان لە دەست بدات! دووەمیش هاوڕێیەکی تر، کە فەرماندەیەکی پارتیزان بوو، بە ناوی کاک (ئازادی سەگرمە)، پاش ئەوەی لە هێرشی کۆپتەرەکانی رژێم لە شەڕێکدا کە لە قولیجان رووی دا بە خەستی بریندار دەکرێ، بەڵام (عوسمانی حاجی مەحمود و شەهید حەمە رەش)، دەگەنە فریای کاک (ئازاد) و (حەمە رەش)، زۆر قارەمانانە (ئازاد)، دەکاتە کۆڵ و رزگاری دەکەن! پاشان بەهۆی رێکخستنە نهێنییەکانی (کۆمەڵە) وە، رەوانەی سلێمانی و دواتر بەغدای دەکەن بۆ تیمار کردن و هەر هاوڕێیانی رێکخستنیش بە هاوکاری برایانی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)، لە هاتووچۆ پێکردنیدا دەورێکی باشیان دەبێت و رەوانەی سەرکردایەتی و لای خۆمانی دەکەنەوە!

بۆ کۆبوونەوەکانی بەرەی کوردستانی، چەند جارێک لەگەڵ کاک (نەوشیروان) و چەندین جاری تریش بە تەنها لە کۆبوونەوەکانی لایەنەکاندا بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی بەشدارییەکی کاریگەرم کرد! لەو ماوەیەدا دۆستایەتی و برایەتیم لەگەڵ کاک (مەسعود بارزانی) و کاک (فازیل میرانی) و برایانی تردا گەشەی کرد!

پاش ئیمزا کردنی بەرەی کوردستانی، کە بە نوێنەرایەتیی (یەکێتی)، یەکەم رەشنووسی ئیمزا کرا و راگەیەنرا! رۆژێک کاک (نەوشیروان)، وتی: مادەم (مام جەلال) لێرە نییە بۆ کاک (مەسعود)، بانگ نەکەین بۆ سەرپەرشتی کۆبوونەوەی هاوبەش و بەرەی کوردستانی! بۆ ئەوەش پێی باش بوو، کە من بچم و بە فەرمی بانگهێشتی بکەین، منیش چومە راژان و ئەو ئەرکەم جێ بەجێ کرد!

لە رۆژی ١٩٩٠/٣/٧ بە سەرپەرشتی (مەسعود بارزانی)، هەر دوو مەکتەبی سیاسی (یەکێتی و پارتی) و نوێنەرانی لایەنەکانی تر لە بارەگای (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، کۆبوونەوەیەکی چڕو پرمان کرد! ئەو کۆبوونەوەیە بڕیاری باشی بۆ هاوکاری کردنی یەکتر دا و هەنگاوی زیاتری نا، بە ئاراستەی باشتر چوونە پێشەوەی پەیوەندییەکانمان! بە بیرم دێت کاک (فازیل و ملازم عومەر) و من، کە دۆستایەتیمان گەرم بوو، لە کۆبوونەوەکەدا لە قوژبنێکدا دانیشتبوین و بەشداری کۆبونەوە هاوبەشەکەمان دەکرد! کاتێ کۆبوونەوەکە بەرەو کوتایی دەڕۆشت کەوتینە نوکتەو قسەی خۆشمان دەکرد، پاش کۆبوونەوەکە کاک (مەسعود)، بانگی کردین و وتی.. ئەوە چیە ئێوە هەمیشە پێدەکەنن! وتمان: کاک (مەسعود)، ئێمە دۆستی یەکترین و کە یەکتر دەبینین، قسەی خۆش دەکەین و بۆ خۆمان هەندێ سوعبەت دەکەین! تەماشایەکی کردین و وتی: منیش حەزم لە قسەی خۆش و نوکتەیە، با شتێکتان بۆ بگێڕمەوە، ئیتر نوکتەیەکی رۆژانی گفتوگۆی ساڵی ١٩٧٠ ی بەغدای لەگەل (حەبیب محەمەد کەریم) دا، گێڕایەوە، کە قسە خۆشەکان لەو سنوورەی ئێمە تێپەڕیان کرد بوو، وتم کاک (مەسعود) گیان، بەخوا هێشتا ئێمە نەگەیشتووینەتە ئەو دەرسە! پێکەنی و وتی.. دیارە ئێوە لەوە وریا ترن، کە من دەزانم!

## داگیر کردنی کوێت لەلایەن (صدام)ەوە!

بەرەبەیانی ١٩٩٠/٨/٢ هێزەکانی رژێمی عێراق، میرنشینی ( کوێت ) یان داگیر کرد!

پاش گرفتی زۆر لە گفتوگۆکانی نێوان عێراق و ئێران، لەسەر ئەو قەرزانەی، کە کەوتبونە سەر ئەستۆی عێراق، سەرانی رژێم و لە سەرووی هەموویانەوە خودی (صدام حسین)، منەتی بەسەر هەموو وڵاتانی عەرەبیدا دەکرد، کە گوایا ئەمان بە خوێن گەلی عەرەب و سەرجەم وڵاتانی عەرەبیان لە دەست پاوانخوازی ئێران پاراستووە و خۆیان گوتەنی ئەمان نەبوونایە (دەروازەی رۆژهەڵات - البوابة الشرقية)، لە رووی شاڵاوی (فارسە مەجوس) ەکاندا دەکەوتە مەترسییەوە! بۆیە دەبێ گەلی عەرەب و حاکمانی عەرەب ئەو راستییە باش بزانن و بۆ دانەوەی چاکەی عێراقییەکان هەمیشە دەستیان ئاوەڵا بێ! بۆ ئەوەش چەندین کۆبوونەوە و سەردانی ئاشکرا و نهێنی لە نێوان سەرانی رژێم و وڵاتانی کەنداو ئەنجامدران، بە مەبەستی سووک کردنی باری

## داگیر کردنی کوێت لەلایەن (صدام)ەوە!

بەرەبەیانـی ١٩٩٠/٨/٢ هێزەکانـی رژێمـی عێـراق، میرنشـینی ( کوێـت ) یـان داگیـر کـرد!
پـاش گرفتـی زۆر لـە گفتوگۆکانـی نێـوان عێـراق و ئێـران، لەسـەر ئـەو قەرزانـەی، کـە کەوتبونـە سـەر ئەسـتۆی عێـراق، سـەرانی رژێـم و لـە سـەرووی هەموویانـەوە خـودی (صـدام حسـین)، منەتـی بەسـەر هەمـوو وڵاتانـی عەرەبیـدا دەکـرد، کـە گوایـا ئەمـان بـە خوێـن گەلـی عـەرەب و سـەرجەم وڵاتانـی عەرەبیـان لـە دەسـت پاوانخـوازی ئێـران پاراسـتووە و خۆیـان گوتەنـی ئەمـان نەبوونایـە (دەروازەی رۆژهەڵات - البوابة الشرقية)، لـە رووی شـاڵاوی (فارسـە مەجـوس) ەکانـدا دەکەوتـە مەترسـییەوە! بۆیـە دەبـێ گەلـی عـەرەب و حاکمانـی عـەرەب ئـەو راسـتییە بـاش بزانـن و بـۆ دانـەوەی چاکـەی عێراقییـەکان هەمیشـە دەسـتیان ئـاوەڵا بـێ! بـۆ ئـەوەش چەندیـن کۆبوونـەوە و سـەردانی ئاشـکرا و نهێنـی لـە نێـوان سـەرانی رژێـم و وڵاتانـی کەنـداو ئەنجامـدران، بـە مەبەسـتی سـووک کردنـی بـاری

ئەو قەرزەی، کە عێراق کەوتۆتە سەر شانی! بەڵام دواجار دەرکەوت، کە ئەو هەموو کۆبوونەوە و دانوستاندن و چاوپێکەوتنەی نێوانیان، نەیتوانی کێشەکان بە ئاراستەی ویستی (صدام)، چارەسەر بکات! بەڵکو لە کۆبوونەوەی سەرانی عەرەبدا، (عزت دوری)، بە توندی قسەی کرد و کێشەی نێوان عێراق و وڵاتی کوەیتی زیاتر بەرز کردەوە بۆ ئاستێکی ئاڵۆز تر و مەسەلەی رادەی بەرهەم هێنانی نەوت و مەسەلەکانی ئاڵۆز تر کرد و بواری دا گیانی فراوانخوازی (صدام حسین)، سەروەری وڵاتی (کویت)، بخاتە ژێر زنجیری تانک و پۆستاڵی سەربازەکانیەوە !

ئەو کارەی، کە (صدام حسین) کردی، ئاسۆیەکی نوێی خستە بەردەم جووڵانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد و هەلومەرجێکی وای خستە بەردەم هێزە کوردستانی و عێراقییەکان، کە بە ئاقارێکی نوێ و بەرنامەیەکی نوێوە خۆیان بۆ هەر گۆڕانکاری و ئەگەرێ ساز و ئامادە بکەن!

لە شام کاک (نەوشیروان و ملازم عومەر) و من زنجیرەیەک کۆبوونەوەمان بۆ لێکدانەوەی ئەگەرەکان ساز کرد! چونکە ئەو دۆخ و ئەو هەلومەرجەی، کە لەو کارەی (صدام) کەوتەوە، عێراق و ناوچەکە و کوردی خستە بەردەم چەندین ئەگەری جیا جیاوە، بۆ نموونە :

* ئایا عێراق ناچار دەبێت بکشێتەوە، یان لەسەر کردارەکەی خۆی سوور و بەردەوام دەبێت!

* ئەگەر بکشێتەوە چ رەنگدانەوە و شوێنەوارێکی دەبێت و ئەگەر نەکشێتەوە و مل بە رای گشتی و ویستی نێودەوڵەتی نەدات، ئاخۆ رووداوەکان چ ئاقارێک دەگرنە بەر!

* سەرجەم هێزە کوردستانی و عێراقییەکان، (یەکێتی، پارتی، لایەنەکانی

